د. گوینتەر دێشنەر
Dr. Günther Deschner

# كورد: گەلی لە خشتەبراوی غەدرلێ کراو

Dr. Günther Deschner

Kurden

...ene Volk

د. كونتر دشنر

احفاد صلاح الدين الايوبي

الكورد: الشعب الذي يتعرض للغدر والخيانة

ترجمة
عبد السلام مصطفى صديق



گۆڕینی لە ئەڵمانی یەوە بۆ عەرەبی
عبدالسلام بەرواری

گۆڕینی بۆ کوردی
حەمە کەریم عارف

دکـتـۆر گـوینتـەر دێشنەر
Dr. Günther Deschner

# کورد: گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو
# Kurden : Das Betrogene Volk

گۆڕینی لە ئەڵمانی‌یەوە بۆ عەرەبی

**عبدالسلام بەرواری**

گۆڕینی بۆ کوردی

**حەمە کەریم عارف**

چاپی دووەم

١٩٩٩

"... مرۆڤ چۆن دەتوانێ باوەڕ بە بەردەوام بوونی چەوساندنەوەی گەلێک بکات، کەسورە لە سەر وەدەست هێنانی ئازادی خۆی و ئامادە بێ لە پێناوی ئەم ئازادی یەدا هەر قوربانی یەک، چەند گەورە بێ، بیدات؟"

جەواهێر لال نەهرۆ
دەربارەی کورد/ ١٩٣٥

# ناوەرۆکی کتێب



## فەسلی یەکەم

*نیستا خانووی هاوچەرخیان دەست دەکەوێ*



## فەسلی دووەم

*مرۆڤ لە پر هەست بە هێزێکی شاراوە لە بەددنی خۆیدا دەکات کە هانی دەدا پر بداتە نزیکترین بەردو بە هەموو هێز و توانایەوە بیوەشێنێ*

## فەسڵی سێیەم

*ئەگەر کورد یەک بن، کەس بە سەریاندا سەرناکەوێ*



## فەسڵی چوارەم

*لویەکی شێریەنجەی پیسە و ددبێ ببردرێ*

## فەسلی پێنجەم

*وەزعی کورد لە تورکیادا پاش دووەم جەنگی جیهانی*



## فەسلی شەشەم

*جەنەراڵ (سالم ئاتاکیخوف)...و سەفەری (باکۆ)*



## فەسلی حەوتەم

*سوێندە پیرۆزەکەی سەر لوتکەی (دەلانپەر)*

## فەسڵی هەشتەم

### *کۆماری پانزە مانگ*



## فەسڵی نۆیەم

### *خەباتی کوردی عێراق لە رای ئۆتونومی دا*

## فەسڵی دەیەم

*"...لە نەزانانەوە فێر بووم..."*



## فەسڵی یازدەیەم

*بۆ یەکەمجار کورد یەک دەگرن*

## فەسڵی دوانزەیەم

*"گەورەترین هەڵەی ژیانم ئەوە بوو کە باوەڕی تەواوم بە ئەمرکا کرد"*

# ووتەیەک

*گەر بۆن بە هەناسەی مێژووی کوردەوە بنەی تەنیا بۆنی مەرگی لێدێت!*

بێگومان مێژووی کورد، یەکێکە لە کارەساتنامە گەورەکانی رۆژهەلات و، هەرچی رژێمی ئەم سەرزمینە هەیە، کەم و زۆر، راستەوخۆ بەشدارییان لەم کارەساتنامەیەدا کردووە.

عەرەب، تورک، عەجەم، سۆڤیەت، روس، فەرەنسا، ئەمریکا، بەریتانیاو...هتد. جا هەرکاتێک ئەو دنیایە مەرامێکیان بە کورد بووبێ، هاتونەتە پێشێ و گەلەک گفت و بەڵێنی چەور چەوریان داونەتێ، تا جێ پێ ی خۆیان قایم کردوە و ئەوجا بە هەموو شێوەو شێوازێک بەربونەتە گیانی کورد و پاکانەیان بۆ دڕندانەترین رەفتاری خۆیان دژ بە کورد، هێناوەتەوە، بۆیە کوردیش وێڵ و سەرگەردان و ناچار بووە دەست بداتە چەک و بەرگری لە بوون و مانی کۆمەلایەتی و نەتەوەیی خۆی بکا و ناسنامەی نەتەوەیی خۆی نەدۆڕێنێ.

کورد هەرگیز بەو مەبەستە دەستی نەداوەتە چەک تا خاک و مافی خەڵکانی دی داگیرو پێشێل بکات. بەڵکو لە پێناوی ئازادی و سەر بەخۆیی خۆیدا خەبتیوەو گەر بە ناچاری بەکەمترین ماف رازی بووبێ هەر پێ ی رەوا نەبینراوەو بە ئاگرو ئاسن و ژەهری کوشندەو قەتڵ و عام وەلام دراوەتەوە.

خۆ ئەگەر لە قوناغێکی خەباتیدا هێزێکی پەیدا کرد بێ، خێرا فیتنەو تەفرەقەیان خراوەتە نێوان و نیدی پیشەی کورد بووە بە بەرگری لە بوون و مانی کەسی و کۆمەلایەتی و نەتەوەیی و نەی پەرژاوەتە سەر هیچی دی، هەر کە ویستبێتی بێتە ناو مێژووەوە خێرا پیلانێکی چەند لایەنەی بۆ رێکخراوەو توڕدراوەتەوە دەرێ ی مێژوو. بەلام بەوەی باشە کۆڵی نەداوەو هەوڵی داوە ماقولیەت بە خەباتی خۆی بدات و تاریخیەتی پێ ببەخشێت، ئەگەر چی بە ناهەق توڕ دەدرێتە دەرێ ی مێژوو.

هەڵبەتە ئەم کارەساتنامەیە، زۆر خاڵی نادیارو ئاڵۆزو بەتەم و مژی تێدایە و پێویستیان بە رونکردنەوەو ساغ کردنەوەو راستکردنەوە هەیە تا ببێ بە پەندو دەرسو ئامۆژگارییان لێوە هەڵێنجرێ. . حەقیقەتێک هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئێمە وەکو کورد کەمتر پەرژاوینەتە سەر ئەوەی سەر بورو روداو و قەوماوەکانی خۆمان بخەینە سەرکاغەز و بیکەین بەتۆمارێک بۆ خۆمان و نەوەکانی ئایندەمان، بۆیە لە زۆر فەسڵی ئەم کارەساتنامەیەدا بێگانان هاتوون و شتێکیان تۆمار کردووە.

هەڵبەتە ئەو بێگانانە هی وایان هەن دڵسۆزانەو واقیعیانەو دۆستانە سەربوورو قەوماوەکانیان تۆمار کردووە، هەن بە پێچەوانەوە، سەرەڕای ئەو هەموو غەدرەی لە سەر زەوی واقیع دا لێمانکراوە، لە سەر لاپەرەکانی ئەو کارەساتنامەیەش غەدرێکی تری لێ کردوین و وا شێواندووینی کە رووی مەجلیسمان نەمێنێ. بەهەرحاڵ بێگانە، بێگانەیە، چەند دڵپاک و دڵسۆزو دۆست بێ، مەبەستی تایبەتی خۆی فەرامۆش ناکات و کەم و زۆر لە نوسینی دا رەنگ دەداتەوە.

بۆیە کاتی ئەوە هاتووە قۆڵی لێ هەڵماڵین و بکەوینە تاقیب و سۆراخ و ساغکردنەوەی ئەم کارەساتنامەیەمان و هەر چییەک لەم بارەیەوە لە لایەن بێگانانەوە تۆمارکراوە، بیکەین بە زمانی کوردی و چاک و خراوی، دروست و نادروستی لێکدی هەڵاوێرین و تەتەڵەی بکەین و پوختەی کارەساتنامەکەمان بخەینە بەردەست گەلی کوردی قارەمان، تا لەوێنەدەرەوەو بە دیدێکی رەخنەگرانەوە، مێژووی خۆمان بخوێنینەوەو هەڵەو پەڵەکانمان راست بکەینەوەو هەڵبگرینەوە و بسرینەوەو دەرسی لێوەربگرین و بکەوینە سەر راستە رێگای بیرکردنەوەو تێگەیشتن، چونکە هەر گەلێک کەوتە سەر راستە رێگای بیر کردنەوەو حاڵی بوون و تێگەیشتن، ئیدی بەو ئاسانی بە فریو نادرێ و رێگەی لێ نابەسترێتەوەو جا خوێنەری ئازیز ئەم کتێبەی لە بەر دەستت دایە، بەشێکە لە مێژووی کوردو ئەمیش وەکو سەر لەبەری کارەساتنامەکەی ئێمەی کورد گەر بۆن بە هەناسەیەوە بنەی، تەنیا بۆنی قارەمانێتی و مەرگ و مەرگ وەمەرگی لێدێت.

بەو مەبەستانەی سەرێ کراوە بە کوردی، و هیوادارم کەلێنێک لە کتێبخانەی کوردیمان پڕ بکاتەوەو فێری ئەوەمان بکات کە خۆمان تازە بکەینەوە، چونکە هەر کەس وگروپ و تیرەو میللەتێک نەتوانێ خۆی تازە بکاتەوە، مەحکوم بە نەمانە.

حمەکریم عارف
سلێمانی ١٩٩٨/٥/١

## پێشەکی چاپی عەرەبی

*هەقە خوێنەرانی عەرەب حەقیقەتەکان بخوێننەوە*

ئەم کتێبە یەکەمجار، بە زمانی ئەڵمانی لە ساڵی ۱۹۸۳دا، لە لایەن بلاوخانەی (شتراوبە)وە، بە ناونیشانی (رۆڵەکانی سەلاحەدین) چاپ و بلاوکرایەوە. پاشان لە ساڵی ۱۹۸۹ دا، و دوای ئەوەی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی بۆ زیاد کرا، چاپی دووەمی بەم ناونیشانی نیستای، (کورد، گەلی لە خشتە براوی غەدر لێکراو-
(Kurden: Das betrogene Volk- کرایەوە

لە ئاخرو ئۆخری ساڵی ۱۹۹۱ دا چاپی سێیەمی ئەم کتێبە بە ئەڵمانی کرایەوە. بایەخی زانستی ئەم کتێبەو نێوەرۆکە دەوڵەمەندەکەی کە دەشێت ببێ بە ژێدەرێکی گەورەی ئەوتۆ کە هەموو لایەنەکانی مەسەلەکە لە خۆ بگرێ و ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە لە مێژە کتێبخانەی عەرەبی پێوەی دەناڵێنێ، وای لێکردم دەگۆ وەرگێرانی بجم و بیخەمە بەر دەستی خوێنەران و ئاشقانی ناسینی کوردو ئارەزومەندانی تێگەیشتنی مەسەلەی کوردی.

هەوڵم نەداوە خۆم بەوەرگێرانی ووشە بەووشەی کتێبەکەوە ببەستمەوە، چونکە زمانی ئەڵمانی جۆرە رەوانبێژییەکی تایبەتی خۆی هەیەو دەبێتە مایەی ئەوەی کە وەرگێرانی ووشە بە ووشە زۆر ووشک بێت و بگرە زۆر جار دوور بێ لە تێگەیشتنەوە، بۆیە هەوڵم داوە بە پێ ی توانا نێوەرۆکی گشتی رستەو پەرەگرافەکان وەربگێرم. بەلام وەکو وەفادارییەک بۆ هەوڵو کۆششی نووسەر، هەوڵمداوە شێوازی تایبەتی گێرانەوەو گوزارشتی ئەو بپارێزم ، کە ئەلهەقی شێوازێکی سوارو رەوان و بێ گرێ و گۆڵە.

هەروەها بە ئانقەست خۆم لە تۆمار کردنی تێبینی و پەراوێزی شەخسی بواردوە؛ هەر چەندە ئەمە کارێکی پێویستەو هەقە بکرێ، بە تایبەتی لەو شوێنانەدا کە زانیاری یە نەقڵ کراوو نوسراوەکان، راست کردنەوەو دەستکاری دەخوازن، بۆیە داوای بووردن دەکەم، ئەگەر خوێنەری شارەزای دۆزی کوردی، توشی هەندێ زانیاری و ئاماژەی نابەجێ هات. هەروەها بە پێویسم زانی لێرەدا ئاماژە بۆ خاڵێک بکەم کە بەلای منەوە کێشەیەکە دێتە رێ ی هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێ کتێبێک لە زمانی بیگانەوە بگۆڕن بۆ زمانی عەرەبی، ئەویش کێشەی وەرگێرانی ئەو ناوو زاراوانەیە کە هەندێ پیت و دەنگیان تێدایە کە لە ئەلفبای عەرەبی دا نی یە، بۆیە رێگەم بەخۆدا لە وەرگێرانی ئەو ناوو زاراوانەدا پەنا وەبەر ئەم پیتانە بەرم: (پ،چ، ژ، ڤ، گ).

کورد، رۆڵەی نەتەوەیەکی دێرینی ئەم ناوچەیەن و هەموو ئەو بنەما مێژوویی و شارستانیانەیان تێدایە کە بتوانن جڵەوی کاروباری خۆیان بگرنە دەست و خۆیان بەرێوەبەرن. بەلام لەگەڵ ئەوەش دا لە کۆنەوەو تا ئەمڕۆ بوون بە قوربانی قەدەرو رەوشی جوگرافی تایبەتی خۆیان و نەگەیشتونەتە مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان.

هەر لەم پێوەندانگەوە کورد هەر لە کۆنەوە هەوڵی داوە بە ئاشتی و دۆستانە لەگەڵ دراوسێکانیا، واتا لەگەڵ عەرەب و فورس و تورک بژی. هەمیشەش ئەوەیان سەلماندوە کە رۆڵەی گەلێکن دەتوانن بەرگری لە ناسنامەی نەتەوەیی و تایبەتمەندییە خودییەکانی بکا، و لەگەڵ خەڵکانی دیدا بگونجێ و بژی، بە تایبەتی پاش ئەوەی کوردستانی نیشتمانیان، لە دوای یەکەم جەنگی جیهانەوە بە یەکجارەکی بە سەر پتر لە دەوڵەتێکی دراوسێیدا دابەشکراوە لە هیچ یەکێک لەو وولاتانەدا زۆربەی هاو وولاتیان پێک ناهێنن.

هەر چەندە کوردیش، وەکو عەرەب و فورس و تورک، مافی ئەوەیان هەیە بە خۆیان چارەنوسی خۆیان دیاری بکەن، بەلام تێگەیشتنیان لەو واقیعە تایبەتی یەی کە تێیدا دەژین، وایکردوە رەو و رێبازە سەرەکی یەکانی بزاڤی رزگاریخوازی کورد، بۆ پێکەوە ژیانی ئارەزومەندانە لەگەڵ گەلانی دراوسێیدا خەبات بکات و داوای مافی ئیداری و رۆشنبیری و ئوتونومی بکات لە چوار چێوەی ئەو وولاتانە دا کە نیشتمانی کوردیان بە سەردا دابەشکراوە. وێرای ئەم رەوتە ئیجابی یەش، هەمیشە ئەم داوا سادە و ساکارانەی کورد بە ئاگرو ئاسن و گازی ژەهراوی و کۆچاندن وقەتڵ وعام وەڵام دراونەتەوە.

ئەوگۆڕانکارییە مێژووییە گرنگانەی کە لە چەندین ساڵی رابردودا دنیا بە خۆوەی دیتن، سەلماندیان کە بەردەوامبون لە سەرسیاسەتی سەرکوتکرن و چەوساندنەوەو زەوتکرن و خەفە کردنی ئازادی یە کەسی و نەتەوەییەکان مەحاڵە، هەروەها ئەم مەنتیقەی کە پاش کۆتایی جەنگی سارد هاتۆتە ئاراوە و ئەو هەوڵانەی لە رێگەی مینبەرە سیاسی یە نێو دەوڵەتی یەکانەوە دەدرێن بۆ چارەسەری کێشە هەرێمی یەکان و کارکردن بۆ نەهێشتنی ئەو هۆکارانەی بونەتە مایەی سەر هەڵدانی ئەو کێشانە، وا لە هزرڤانان و سیاسەتوانانی ناوچەکە دەکات کە بە سەرلەبەری ئەو شێوازانەدا بچنەوە کە بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی و کەمینە نەتەوەیی و تیرەی ئاینی گیراونەتە بەر لە رۆژهەلاتی ناڤین دا.

ئەو کوردانەی داوای پێکەوە ژیان دەکەن و بەرگری لە ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان دەکەن توشی شێوازی هەمە جۆری سەرکوتکردن و قەتڵ و عام دەبنەوەو تۆمەتی وەکو بەکرێگیراو و خیانەتکاریان دەدرێتە پاڵ. ئەم کتێبە هەوڵێکی بچوکە بۆ خستنەرووی حەقیقەتەکان و بانگەوازێکە بۆ حاڵی بوون لە کارەساتی ئەم گەلەو کار کردن بۆ بە پیرەوەچوونی بانگەوازی راستگۆیانەی بۆ پێکەوە ژیان بە ئاشتی. هیوادارم بەم کارە خزمەتێکم کردبێ و بەشدارییەکی بچکۆلەم لەم بوارەدا کرد بێ.

عبدالسلام بەرواری

ڤییەنا - ١٩٩٢

# فەسڵی یەکەم

*ئێستا خانووی هاوچەرخیان دەست دەکەوێ!*

## گازی ژەهراوی، دژی کەلێکی بێ دەوڵەت

دەنگی فڕۆکە شەڕکەرەکانی عێراق بە گوێ ی خەڵکی ئاشنا بوو. فڕۆکەی پێشکەوتوی وەکو سۆخۆی و تۆپۆلیف و میراجی سەر بە هێزی ئاسمانی عێراق، تەنیا سەنگەری ئێرانی یەکانی بۆردومان نەدەکرد. گوندە کورد نشینەکانیشی بۆردومان دەکرد. بۆیە خەڵکەکە ناچار بوون لە ترسی بۆمباو پارچە بۆمبا هەڵێن وخۆ لە پەناگا یان ماڵەکانیان بخزێن کە سادەترین هۆی بەرگریان تێدا نەبوو.

ئەم جۆرە هێرشە بۆ خەڵکی شاری هەڵەبجەی سەر سنوری نێوان ئێران و عێراق شتێکی تازە نەبوو. چونکە پیرەمێرد و پیرێژنانی ئەو شارە هێشتا بۆردومانەکەی ساڵی (١٩٧٥)یان بیرماوە، کاتێ رژێمی بەغدا شارەکەیانی بەبۆمبا داپێژا. تەنیا لەبەر ئەوەی کورد داوای ئازادی زیاتریان دەکرد. بەڵام ئەوەی کە لە ئێوارە وەختەیەکی زوی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٨٨دا قەوماو روویدا، رویەکی تری جەنگی ئاسمانی دژی خەڵکی مەدەنی کەشف کرد کە لە قۆناغ و هەوڵەکانی پێشوتردا کەشف نەکرابوو: دەنگی تەقینەوەی بۆمباکان وەکو جاران بەرز نەبوو. بەو جۆرە نەبوو کە کوردی مەدەنی پێ ی راهاتبون. چونکە فڕۆکە عێراقی یەکان دەهاتن و لەهەواوە کۆمەڵە بەرمیلێکی رەنگ کراوی کەسک و زەردیان هەڵدەدایە خوارەوە و پاش ئەوەی دەکەوتنە سەر زەوی ئەوسا دەتەقینەوە و دەنگێکی گەورەیان لێ هەڵدەستا.

فڕۆکەکان رۆیشتن، تەمێکی لێڵ و بۆر بەری ئاسمانی شاری گرت. خەڵکی وەکو خوی هەمیشەییان لە نێو داروپەردوی ماڵەکانیانەوە دەرپەرین و بە ناو شەقامەکان کەوتن تا پەنایەکی ئەمین و سەلامەت بدۆزنەوە و خۆی تێدا حەشار بدەن. لێ بەر لەوەی فریا بکەون و خۆ دەرباز بکەن هەستیان کرد چاویان دەسوتێتەوە، کۆکەی توند ئەوکی گرتن و بەدەنی هێنانە لەرزین و لەشیان گرژ گرژ بوو، زۆربەیان پرزەیان لێ براو دەست و لاقیان سست بوو. راپۆری شاندێکی پزیشکی ئەم حاڵەتەی واهی وەسف کردوە:

خەڵکی بۆنی هەمەجۆریان بەکەپودا چوو، وەکو بۆنی پیوازی گەنیو، خەردەل و بۆنی جەنازەی بۆگەنیو. هەر هەموو ئەمە بۆنی مەرگ بوو، مەرگی بێدەنگ وخامۆش: گازی کوشندە کە لە هەوا قورسترە، بە بێدەنگی و کپی لە شاخەکانی دەوروبەری شارەوە خۆی بە شەقامەکانیدا کرد تا خۆی بەو ماڵ و پەناگایانەدا بکات کە لە سادەترین هۆو ئەوزاری بەرگری مەدەنی بەدەر بوو. رژێمی دکتاتۆرەکەی عێراق، سەدام حوسەین،

کورده مەدەنی یەکانی بەر گازی تابون دا کە گازێکی کوشندەی نەعسابە. گازی خەردەلی بە سەردا رشتن کە هەموو جۆرە جوڵەیەک خەفە دەکات و هەموو جۆرە جوڵەدارێک لە پەلوپۆ دەخات.

پاش نیو سەعات، وەختێ ئەو تەمە زەردە ئامال بۆرەی سەرشار رەوی یەوە، (٥٠٠٠) ژن و منداڵ و پیاوی کورد لە نێو شەقام و ماڵەکاندا خنکان و سوتان: هەر هەمویان بە چەکی کیمیاوی مردن.

بۆمبای گازی کوشندە بۆ یەکەمجار و دوا جار لە یەکەم جەنگی جیهاندا بە کار هات و چیدی بە کار نەهێنرایەوە.تەنانەت لە شەڕە تووش و دژوارەکانی دووەم جەنگی جیهانیش دا، پەناوەبەر بە کار هێنانی ئەم چەکە سامناکە نەبرا، وێرای ئەوەی جبەخانە و عەماری چەک و تەقەمەنی هەموو وڵاتانی ئەڵمانیاو بەریتانیا و ئەمریکا و سۆڤیەت پڕ بوون لەو چەکە. تەنانەت هیتلەر و ستالین و رۆزفلت و چەرچل، کە لەو شەڕانەیاندا، هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتیان پێ شێل دەکرد، تەنانەت واتیش زاتیان نەکرد پەناوەبەر بەکارهێنانی گازی ژەهراوی بەرن. بەڵام سەدام حوسەینی یەکە پیاوی عێراق، بۆ یەکەمجار لەوەتای یەکەم جەنگی جیهانی یەوە لە دوا قۆناغەکانی جەنگی کەنداودا، کە هەشت ساڵی خایاند، گەرایەوە سەر بە کار هێنانی ئەو چەکە سامناکە.

بڵاو کراوەی کاروباری سوپایی ئەوروپی لەم بارەیەوە دەڵێ: هەموو ئەو پێشکەوتن و پێشڕەویانەی لە دوا هێرشەکانی ساڵی ١٩٨٨ دا وەدەست هاتن، بەزەبری گازی ژەهراوی بە دەست هاتن. رەنگە هەر ئەمەش هۆی روخانی ورەی جەنگی سەربازانی ئێرانی بووبێ لە بەهاری ئەو ساڵەدا.

بەڵام کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی تا دوای قەتڵ و عامەکەی هەڵەبجە بەڵگەی بنج بڕی بە دەستەوە نەبوو کە عێراق گازی ژەهراوی بە کار هێناوە. ئیدی لە کارساتی هەڵەبجەوە دەرفەت بۆ پەیامنێرو وێنەگرانی رۆژنامەگەری جیهانی رەخساو توانیان مەوداو قەوارەی کارسات و تراژیدیاکە بە تەواوەتی و بە بەڵگەوە تۆمار بکەن.

فلیمێک کە لە لایەن تێزگەی تەلەفزیونی ئەڵمانیای رۆژاواوە (WDR) تۆمار کرابوو، وێنەیەکی تەواوی ئەو دۆزەخەی نیشان دا: شەقامەکانی هەڵەبجە، یەکپارچە جەنازە بوون. زۆر باوک بەدەم مەرگەوە و بە مەبەستی پاراستنی خۆیان بەسەر منداڵەکانیاندا داهبوو. خوشک و برا تەنانەت لە مەرگیش دا دەستی یەکیان گرتبوو. شاندێکی پزیشکی ی سەر بە کۆمەڵەی (پزشکانی خزمەتگوزاری مافی مرۆڤ) توانی پاش پشکنین و مالیجەی بریندارانی زیندوو، نیشانەکانی پێکران بەچەکی کیمیاوی دەست نیشان بکەن، لەوانە برینی پێست و ئەنجامەکانی پشکنینی سی و سیپەلاک.

## وێنەو دیمەنی دووبارە بووەی کارەساتەکە

سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان (پ. د.ک) مەسعود بارزانی کە کوڕی قارەمانی ئازادی خوازی کوردان مستەفا بارزانی یە، ئەو مستەفایەی بووە ئەفسانەیەکی نەمر و جاویدان، لیستێکی بە ناوی ٦٥ شوێنی دی یەوە کە هێزەکانی عێراق بەگازی ژەهراوی لێیان دا بوون، بلاو کردەوە. ئەم راپورو لیستە ناوی ئەو گوندو شارۆچکانەی تێدا بوو کە مەرگی خامۆش و سامناک رۆحی کوردانی تێدا درۆینە کردووە. مرۆڤ کە ئەو لیستە دەبینێ مۆچوڕکەی پێدا دێت: بابیرێ، بوسیا، دەرگەلێ، داکا، دووکەرە، ئەکنەنال، ئەرمان، هەروەها لیستەکە ئامارێکی ژمارەی قوربانی یەکانی لە خۆگرتوە: ٧٧ کوژراو لە کانی یە سینێ، ٢٦ کەس لە هێسێ، دوو هەزار لە شێخان.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٨ دا سەرکردەیەکی تری کورد، جەلال تاڵەبانی ی سکرتێری یەکێتی ی نیشتمانی کوردستان، کە پیاوێکی چەپە، یان مەیلی چەپگەرایەتی هەیە، لە شارانی: بۆن، لەندەن و پاریس دا چل فلیمی ڤیدیۆی پیشاندا کە ئەندامانی حیزبەکەی لە گوندەکانی کوردستاندا گرتبوویان. من خۆم ئەو فلیمانەم بینی و نزیکەی چل سەعاتێک دەخایەنێت. ئەم فلیمانە پیشاندا ئەوەی دوبارەی هەمان کارەسات و ترلژیدیا بوون: وێنەی جەنازەی وەها کە ج زامیکی دەرەکییان پێوە نەبوو. کەلاکی حەیوانا تی ئاوساو. هەوی پێست، حالاتی ئیفلیجی مەوزوعی کە بە خێرایی بلاو دەبنەوەو مرۆڤ لە جوڵە دەخەن و دەیکەن بە جەنازەیەکی بێ هەست و خوست. بە تایبەتی ئافرەت و مندالانی برینداری هێشتا نەمردوو.

سەرانی کورد، داوای کۆمەکیان لە نەتەوە یەکگرتوەکان کرد، کەچی رێ بە هیچ چاودێرێکی (UN) نەدرا کە سەردانی عێراق بکات. چونکە بەغدا قایل نەبوو دەست لە کاروباری ناوخۆی وەربدرێ. تا شۆینەوارو ئاسەواری قەتڵ و عامەکە لانەبراو نەسڕدرایەوە، رێگە بە هیچ فەرەنگی یەک نەدرا بچێتە خاکی عێراقەوە.

تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٨، رێ بە هیچ فەرەنگی یەک نەدرا ئەو واقیعە سامناکەی ناو عێراق بدینێ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، واقیعە سامناکە کە زۆر بەروونی لەو دیانانەدا دەردەکەوێ کە پەیامنێری گۆڤاری (شتێرن) ی ئەڵمانی لەئوردوگایەکی پەنابەران کردویەتی و دەڵێ: "ئەوانەی دیانەم لە گەڵ کردن، لە گوندی جیاواز جیاوازەوە هاتبوون، بەلام ئەوەی لە مەڕ قەتڵ و عامەکە دەیانگێرایەوە، وێنەیەکی دەقاو دەقی ترلژیدیا سامناکەکە بوو:

لە سەرەتادا دەنگدانەوەیەکی هێدی، ئەوجا تەمێکی سپی ولژی چڵکن کە بەرە بەرە دەهاتە خوارەوەو وێنەو دیمەنی ئەو خەڵکانەی دەستیان بە دەموچاویانەوە دەگرت و بە پێچەوانەی رەوتی بایەکە هەڵدەهاتن، بۆ وەی گازی کە متریان بەگەرو و کەپواندا

بچێت،بەدەم ڕاکرنەوە گوێیان لە هاواری خەڵکی دەبوو. هاوارەکان گوێیان ئازار دەدان. یان بە سەر جەنازەی مردوواندا دەکەوتن، یان بە سەر کەلاکی حەیواناتدا دەڕمان. ئەوانەی توانیان هەڵێن و بگەنە ترۆپکی چیایەکان، بە چاوی خۆیان هێزی عیراقییان دەبینی کە دەچوونە گوندەکانی ئەمانەوەو دەیان سوتاندن".

سروشتی کوێرانەی ڕەوت و ڕەوڕەوی مێژووی دنیا، بە تەواوەتی لەو کارسات و تراژیدیایەدا بە دیارکەوت کە ئەو دەمە بە سەر کوردا هات. یەکێک لەگاڵتە جاڕییەکانی ئەم مێژووە کوێرە ئەوە بوو کە لە کاتێکا هەموو دنیا چەپڵەی خۆشییان لێ دەداو هەناسەی ئۆخەیان بە بۆنەی وەستانی شەڕی نێوان عێراق و ئێران، لە مانگی ئابی ١٩٨٨ دا هەڵدەکێشاو مژدەی تەواو بوونی جەنگی هەشت ساڵەی کەنداوی ڕادەگەیاند، ڕێک لەوکاتەدا، سەدام حوسەین هێزەکانی خۆی لەبەرەکانی شەڕی کەنداووە بەرەو باکوری ڕۆژ هەلاتی وولاتەکەی ڕەوان کرد. مەبەستی ئەم جم وجوڵە تازەیە ئەوەبوو ئەو ئاوات و ئامانجانە بێنێتەدی کە بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو بە تۆپباران و لە شکرکێشی گەورە وهەموو جۆرە ڕاوەدونانێک، و بە هەموو شەڕە خوێناویی یەکانی دژبە کورد بەدی نەهێنابوو. دەیویست ژێراوژێرو بە دوور لە چاوی دنیای خارجی "چارە سەری یەکجارەکی" کێشەی کورد بکات.

هێزەکانی سوپای عێراق، تەنیا ئەوەیان مەبەست نەبوو کە هێزی پێشمەرگەی کورد نەهێڵن و هیواو ئاوات و ئامانجەکانیان زیندە بە چاڵ بکەن. بەڵکو دەیانویست هەمووجۆرە ژیانێک لە ناوچەکەدا پاکوو بدەن و نەخشەکەیان بە مجۆرە بووکە:

ئەگەر کوردەکان لە بەر سوپای عێراق هەڵێن، ئەوا خۆ بە خۆ دەکەونە بەر شەپۆلی هێرشەکەو لە نێو دەچن، ئەگەر بەرگریش بکەن، ئەوا دەرەقەت نایەن و لە نێو دەچن و بەمجۆرە، ئاواتی دێرینەی ڕژێمی عێراق کە بریتی یە لە لەنێو بردن و پاکسازی کوردان، بە ئاسانی و بەخشەکەیی دێتە دی.

خۆ ئەگەر بەم حاڵەشەوە هەندێکیان مان و نەمردن، ئەوا ڕایان دەگوێزنەوە بۆ ئۆردوگای دەستە جەمعی و دەخرێنە ژێر ئێشک و چاودێری توندی سوپاییەوە.

بە هەر حاڵ کاردانەوەی کورد هەرچی یەک و هەر چونێک بێ، ئەوا هێرشی سوپای عێراق بە گوێرەی ئەم سێ ئەگەرە ئامانجەکانی خۆی بەدی دێنێ و ناوچەکە لە هەموو بوونێکی کورد پاکسازی دەکرێت. بارزانی، لەو یاداشتینامەیەیدا بو (UN) ڕای گەیاند کە پتر لە سێ هەزارو پێنج سەد گوندی کورد، یان بە هۆی کۆچاندنیان یان بە هۆی سوتاندنی ماڵەکانیان و ناچار کردنیان بەوەی هەموو ناوچەکە بە جێ بهێڵن، پاکسازی کراون و لە خەڵکەکەی چۆڵ کراون.

## غەوارەی گومان لێکراو

پتر لە سەد هەزار کورد، توانیان لە ناوچە شاخاوی یە سەختەکانی سەر سنوری عێراق- تورکیا- ئێرانەوە هەڵێن و خۆ بە تورکیا و ئێراندا بکەن. لەوێندەر وەکو غەوارەی گومان لێکراو خرانە ئوردوگای تەلبەند کراوەوە. ئەو رستەو زاراوانەی کە کارل مای بەر لە سەد ساڵێک و لە رۆمانی (کوردستانی کێوی) دا بەکاری هێناون، ئەمرۆکەو لەم کاتەدا لەهەر زەمان و کاتێکی دی واقیعی تر دەنوێنێ: "بۆنی خوێن، روباری خوێنی رژاو. بۆسۆی دیهاتی سوتاو لە دۆڵ و نیهالەکانی کوردستانەوە بۆ ئاسمان هەڵدەکشێ". جگە لە هەندێ حاڵەتی کەمی نائاسایی، ئیدی هەر هەموو جیهان قوڕو قەپیان لێکرد و بەرانبەر بەتاوانی کوشتنی پێنج هەزارکوردی شاری هەڵەبجە، بێدەنگ بوون.

هەڵبەتە هەڵوێستی ئەمریکاو بەریتانیاش لە نارەزاییەکی نوسراو هێوەتر نەچوو. کەچی بەرهەم هێنەران، لە هەموو لایەکی دنیاوە پێشبڕکێیان دەکرد بۆ بەشداری کرن لە پێشانگەی بەغدای پیشەسازی کە لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٨٨دا کرایەوە. بێ گومان ئەم رەفتارە رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی ئاکاری ئابوری ی بەدەر لە هەر ئعتبارێکی ئەخلاقی یە:

ئایا ماقوڵە پیاوپەیوەندی ئابوری خۆی لەگەڵ ئەم وولاتە پڕنەوتەدا لەبەر خاتری چەند ملێون کوردیک تێک بدات و بیشێوێنێ؟

لەکۆتایی ساڵی١٩٨٨دا گوڤاری (دیرشپیگل) دیمانەیەکی لەگەڵ طارق عزیزی وەزیری دەرەوەی عێراقدا کردووەو عەزیز لەو دیمانەیدا بێ پەردە نیازو نیەتی عێراق دەردەخات کە بە تەمای چ مامەڵەیەکە کە لە ئایندەدا لەگەڵ کوردی بکات: وەختێ دێرشپیگل دەربارەی قەتڵ و عامی کوردان پرسیاری لێکرد، وەزیری عێراقی گوتی:

- ئێمە هەر ئەوەندەمان کردوە کە کۆتاییمان بەو یاخیگەری یە هێناوەکە لە مێژ بوو بەرپا بوو بوو.

- کەواتە بۆچی هەزاران کورد، بۆ تورکیا هەڵاتن؟

- بارزانی پرۆسەیەکی هەڵاتنی دەستە جەمی ساز کرد تا سەرنجی رای گشتی جیهانی رابکێشێت.

- ئەدی بۆ چی ئەو کوردانەی کە ماونەتەوە لە شوێنی خۆیان، لە باکورەوە بۆ شوێنانی تری ناو وولات رادەگوێزن؟

- ئەو کردەوەیە قازانجی خۆیانە و لە بێداویستی یەکانی پێشکەوتنە، کورد لە گوندەکانی خۆیاندا نە کارەبایان هەبوو، نە رێگاوبانی هاوچەرخ و نە ئاوی

لولەکێشی...هتد. ئەوەتا ئەوڕۆ دەچنە خانوی هاوچەرخەوەوە و دەتوانن دەست بە ژیانێکی هاوچەرخی باشتر بکەن.

لە وڵامی پرسیارێک دا، دەربارەی بە کار هێنانی گازی ژەهراوی لە لایەن عێراقەوە، وەزیری عێراقی گوتی :

- هەڵاتوان وا ئیدیعا دەکەن کە چەوساوەن و راوەدودەنرێن، بەڵام ج کەسێک تاکو ئێستا نەیتوانیوە دروستی ئەو ئیدیعایەیان بە بەڵگەوە بسەلمێنێ. هەروەها تا ئێستا تاقە چۆلەکەیەک دیاری نەکراوە کە لە ئەنجامی بە کارهێنانی چەکی کیمیایی دا مردبێ.

عێراق، لە سەردەمی گەیشتنی گەلان بە مافی چارە نووسی خۆیاندا، سورە لە سەر ئەوەی نەک هەر مافی چارەنووس بەڵکو ئۆتونومیش بە کورد نەدات. بەڵام تەنیا لە عێراقدا ئەمە حاڵیان نی یە، بەڵکو ئەم گەلەی کە لە رووی ژمارەوە گەورەترین گەلی بێ وڵاتە، دەیان وەدەیان ساڵە لە پێناوی مافی نەتەوەیی و ئازادی رۆشنبیریی خۆیدا دەخەبتێ. بە سەر پێنج وڵاتدا دابەش کراوە ئەمڕۆکە ژیانێک بە سەر دەبەن لە ئازادی چۆلەکە دەچێت، هەوڵی راوەدونان و تواندنەوەی نەتەوەییان دەدرێ و لە مافەکانیان مەحروم دەکرێن.

پەندێکی کۆنی کوردی هەیە دەڵێ: "کورد دۆستی نی یە". مێژوی ئەم گەلە چیاییە جەنگاوەرەی کە بۆ چوار هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە، دروستی ئەم پەندەی سەلماندوە کە کورد لە ئەنجامی چەندین تەجرەبە و ئەزمونی تاڵ و خوێناویدا تێ ی گەیشتون. نێوی کورد لە هەندێ نوسراوی سۆمەریدا کە بۆ ساڵی ۲۳۰۰ پێش زایین دەگەڕێتەوە، هاتووە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە کورد رۆڵەی کۆنترین گەلانی دنیان لە شارستانیەتی مرۆڤایەتی دا.

باس و لێکۆلینەوە زانستی و مێژوویەکان ، کورد بە نەوەو نەتیرەی میدیاییەکان دەزانن. بگرە هەندێک پێیان وایە کە میدی یەکانیش کوردن. کاردۆخی یەکانیش، کە سەرکردەو مێژوونوسی گریکی (زەینەفۆن) باسیان دەکات و باسی کشانەوەی خۆی و سوپاکەی لە ساڵی ٤٠١ پ.ز بەو ناوچەنەدا دەکات و زۆر دڵبەندی ئازایەتی و دلاوەرییان بووە، ئەمانەش باب و باپیرانی کوردن.

سەرەڕای ئەوەی کورد هەمیشە ناچار بوون بەرگری لە مافەکانی نەتەوەیی هەرمشە لێکراوی خۆیان بکەن. دژی داگیرکەرانی مەغۆل و تورک و فورس بجەنگن، بەربەرچی هەرمشەی قەتڵ و عام و لە نێو بردن و تواندنەوەی نەتەوەیی بدەنەوە، ئەوجاش ژمارەیەکیان توانیویانە لە سایەی ئەو دەوڵەت و ئیمپراتوریەتانەی کە دەسەڵاتیان بە سەر کوردستاندا کێشاوە. باڵاترین پلەو پایە وەدەست بێنن.

یەکێک لەوانە سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی یە کە توانی لە ساڵی ١١٨٧ز قودس لە دەستی سەلیبیەکان دەربێنێ. ئەم پیاوە کە لە ئەوروپادابە یەکێک لە دیارترین کەسایەتی یەکانی سەدەکانی ناوەراست دەژمێردرێ، بێ گومان کورد بووە.

## "ئەگەر کورد، قسەی یەک بخات، کەس پێ ی ناوێرێ"

ئەگەرچی زمانی کوردی و، کە زمانێکی هندۆ ئەوروپی یە، مێژووی خوێناوی هاوبەش، دوو فاکتەری گرینگن و هەموو کورد یەک دەخەن، لێ ئەوەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی لە کۆنەوە تاکو ئەمرۆ پارچە پارچەن و بە سەر تیرە و تایفە و میرنشین و حیزبانی ناکۆک و دژ بەیەکدا دابەش بوون، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا یەکێکە لەو فاکتەرە خودییانەی، وای کردووە بە مافە رەواکانیان نەگەن، هەڵبەتە نابێ فاکتەرە بابەتی و دەرەکی یەکانیش فەرامۆش بکەین.

(هیلموت فون مولتکە)ی ئەڵمانی کە لە سوپای-پروسی دا گەییە پایەی مارشال، ئەم حەقیقەتە تاڵەی دەرک کردووە و دەڵێ: "ئەگەر کورد قسەیان یەک بخەن، مەحاڵە کەس بە سەریاندا سەربکەوێ". ئەم قسەیەی لە سی یەکانی سەدەی رابردوودا کردوە، کاتێک کە گەشتێکی بۆ کوردستان کردو هێشتا کوردستان لە سایەی حوکمی عوسمانیدا دەینالاند.

کورد، ژیانێکی نەتەوەیی تایبەتی دەگوزەرێنن. لە ناوچەیەکدا دەژین کە لە رۆژاواوە لە زنجیرە چیاکانی (تۆرۆس)ی تورکیای ناوەراستەوە دەست پێدەکات و لە رۆژهەلاتەوە دەگاتە هەڵەتەکانی ئێران، لە باکورەوە لە چیای ئاراراتەوە دەست پێ دەکات و لە باشورەوە دەگاتە دەشتی دیجلە و فورات. پانتایی ئەم ناوچەیە پتر لە پێنج سەد هەزار کیلۆمەتری چوار گوشەیە واتا بەرانبەر بە نیوەی پانتایی ئەڵمانیای فیدرالی دەبێت. پتر لە ٢١ ملیون کورد لەم ناوچەیەدا دەژین. دیارە ئەو دەولەتانەی ئەم ناوچانە دەکەونە چوار چێوە و سنوری سیاسیانەوە، بە هەمو شێوەیەک هەوڵدەدەن گومان لە دروستی ئەم ژمارەیە بکرێ بەهەمو توانایەوە هەوڵ دەدەن کەمتری بکەنەوە و تورکیا، لەم روەوە بە پلەی یەکەم دێت، چونکە بەلای کەمەوە هەشت ملیون کوردی تێدایە. هەروەها ئێران کە ژمارەی کوردەکانی دەگاتە شەش ملێون. بەلام عێراق لە دوا ئامارو سەر ژمێری رەسمی خۆیدا دان بە بوونی پتر لە سێ ملیۆن کورد دەنێ. هەروەها نزیکەی چارەکە ملێونی کورد لە سوریادا هەن، دیارە ئەم ژمارەیە لە رووی بایەخی سیاسی یەوە سەنگێکی ئەوتۆی نی یە.

لە یەکێتی ی سۆڤیەتدا، بە پێ ی دوا ئامارو سەر ژمێری رەسمی ژمارەی کورد لە سەد هەزار کەس تێ ناپەرێ. زۆربەی هەرە زۆری ئەم سەد هەزار کوردە لە کۆماری ئازربایجاندا دەژین. کوردی ئەوێندەر لە چوارچێوەی سۆڤیەتدا جۆرە ئوتۆنۆمیەکی

رۆشنبیریـیان دراوەتێ .هەروەها کوردی یەکێتی ی سۆڤیەت، وێڕای کەمی ژمارەیان ئوتابخانەی تایبەتی خۆیان و رۆژنامەو بلاوەخانەی کوردی هەمە جۆریان هەیە.

سەدەی نۆزدە بۆ کورد، وەکو چۆن بۆ هەمووگەلانی (رۆژهەلاتی ناڤین)ش وا بوو، قۆناغێکی مێژوویی دیارە. هەستی نەتەوەیی گەشەی سەندو بە دیارکەوت. لە نێو کورداندا بزاڤێکی ئاشکرا نەشونمای کرد، هەوڵی دا گیانی وابستەگی نەتەوەیی و شانازی کردن بە تایبەتمەندی نەتەوەییەوە لای کوردان بچەسپێنێ .. وەکو گوزارشت لەم هەستە نەتەوەییە، کورد چەندین هەوڵی دا بۆ بەرپاکردنی شۆڕش و ڕاپەڕین و بزاڤی چەکداری، زۆر لەگێ بوو ئەو بزوتنەوەیە بکەوێتە گۆشەیەکی تاریک و نوتەک و خامۆشی گوشەکانی مێژووەوە، ئەگەر روداوێکی مێژوویی گرینگ جارێکی دی تیشکی نەخستبایەتەوە سەرو ئەوەی وەبیری دنیا نەهێنابا وە کە لەو ناوچەیەدا گەلێکی رەسەن و نەسڵ دەژی و لە هەموو مافێک مەحروم و بێ بەشە، روداوەکەش ئەوە بوو کاتێ کە دەولەتانی میحوەر لە یەکەم جەنگی جیهان دا بە سەر ئەڵمانیا و هاوپەیمانە پیرەکەیدا (دەولەتی عوسمانلی) دا سەرکەوتن، پێیان وا بوو کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەر بە خۆی کورد، جۆرە هاوسەنگی یەک لە ناچەی رۆژهەلاتی ناڤین دا دەستەبەر دەکات. ئەوەبوو پەیمانی سیڤەری نێوان دەوڵەتانی میحوەرو دەوڵەتە دۆڕاوەکان، چەندین بەندی گرتەخۆ لەمەڕ زەروورەتی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی ئوتونومیداری بەرین.

لێ پاش یەکەم جەنگی جیهان، خەون و خۆزیای ژمارەیەک لە گەلانی دنیا، بە تایبەتی گەلانی رۆژهەلاتی ناڤین پوچەڵ بوەوە کە بە تەمابوون بەشی خۆیان لە بەروبومی ئەو سەرەتایانە بێ بیبرێ کە لەو سەرو بەندەدا بوو بوون بە باو، وەکو سەرەتای خودموختاری و مافی دیاریکردنی چارەنووس. ئەو خەونانەیان بەوە پوچەڵ بوەوە وەختێ ئەو راستی یە بە دیارکەوت کە دەوڵەتە سەرکەوتووەکان پێشوەختەو بەپێ ی پەیمانانی نهێنی بڕیاریان لە سەر دابەشکردنی میراتی یە زۆرو زەبەندەکانی عوسمانیان دابوو.

کوردی تورکیا، یەکەم کەس بوون کە لوتیان تەقی بەم حەقیقەتە تاڵەوە کە تەواو پێچەوانەی ئەوخۆزیایانەیان بوو کە خەونیان پێوە دەدی.هەڵبەتە زۆر فاکتەری دەرەکی رۆڵی بنچیریان بینی لە هەڵوەرینی ئەو خەونانەو جێ بەجێ نەکردنیان، بەتایبەتی ئەو بەندانەی پەیوەست بوون بە دامەزراندنی دەوڵەتی سەر بەخۆی کورد، لە پەیمانی سیڤەردا. بە تایبەتی پاش هاتنە سەر حوکمی (کەمال ئەتاتورک)ی دامەزرێنەری تورکیای تازە.هەروەها دوای ئەوەی بەریتانیا بۆی دەرکەوت کەزەخیرەیەکی یەکجار زۆری پترۆڵ لە عێراقدا هەیە، ئەو عێراقەی تازەو لە پاش دابەشکردنی میراتی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی هاتبووە دامەزراندن و خرابوە عۆدەو رکێفی بەریتانیاوە.

زمانی کوردی قەدەغە کرا. هەرکەسێک ووشەی "کوردی" یان "کورد"ی بەزاردا بهاتبوایە بە پێ ی یاساسزا دەدرا. لە ئەنجامی ئەمەدا لە تورکیا، چەندین ڕاپەڕینی چەکدارانەی کوردی یەک لە دوای یەک بەرپا بوو، کە وەکو هەمیشە بە کوشتنی دەیان هەزار کورد و کۆچاندن و ڕاگوێزانی سەدان هەزار کورد بۆ ناوچەی ڕۆژاوای تورکیا کە زۆربەی دانیشتوانی تورکن، کۆتایی هات.

بەلام لە عێراقدا، داوای ڕەوای کوردەکان و سووربوونیان لە سەر ئازادی و سەر بەخۆیی، بە گەورەترین لەشکرکێشی بۆ سەر گوندەکانیان وەلام دەدرایەوە. لەو هێرش و لەشکرکێشیانەدا، خانووەکانیان دەسووتێنران و ماڵەکانیان بە سەریاندا دەروخێنران، ئەمەش بەزەبری تۆپبارانی تۆپ و بۆردومانی فرۆکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی. تەنانەت کۆماری مهابادیش کە لە کوردستانی ئێران و بەرەزامەندی ستالین لە سالی ١٩٤٦ دا دامەزرا، لە ١١مانگ پتر دەوامی نەکرد.

لە عێراقا، لە سالی ١٩٥٨ دا ڕژێمی پاشایەتی ڕوخاو ڕژێمی کۆماری دامەزرا. گەورەترین دەستکەوتی ئەم شۆڕشە بۆ کورد گەڕانەوەی (مستەفا بارزانی) بوو لە وولاتی سوڤیەتەوە، ئەو مستەفا بارزانی یەی بەڕاستی و بە درێژایی مێژوو گەورەترین پێشمەوا ناودارترین کەسایەتی کوردە.

پاشان گفتوگۆ لەگەل ڕژێمی کۆماری تازەدا دەست پێکرا دەربارەی ئۆتونومی بۆ کوردی کوردستانی عێراق لە چوار چێوەی کۆماری عێراقدا. ئەمە بووە هۆی بوژاندنەوەی هیواو ئاواتەکانی کوردی تورکیا و ئێران کە بە چاوی پڕ هیواوە دەیانڕوانی یە برا کوردەکانی عێراقیان و دەستکەوتی کوردی ئێرەیان بە سەرەتایەک دەزانی بۆ گۆڕانێکی بەرفرە لە تێکڕای بارودۆخی کوردی هەموو پارچەکانی کوردستانی دابەشکراو دا.

کەچی هەموو ئەمە لە سێ سالان پتری نەخایاند. یەکە پیاوی بە هێزی تازەی عێراق زەعیم عبدالکریم قاسم، کەوتە ناردنی فڕۆکەی بەریتانی و سۆڤیەتی بۆ بۆردومان کردنی گوندەکانی کوردستان. بە مجۆرە شەڕێک لە نێوان هەردوو لادا بەرپا بوو، نزیکەی دە سالی خایاندو ئاگری ئەم شەڕە نەکوژرایەوە تا شەڕەکە هەردوولای شەکەت و ماندوو کرد. ئەوسا حکومەتی عێراق ناچار بوو لە سالی ١٩٧٠ دا گفتوگۆ لەگەل شۆڕشگێرانی کوردا بکات و بە شێوەیەکی جدی لە چۆنیەتی جێ بە جێ کردنی ئۆتونومی کوردستانی عێراق بکۆلنەوە بەلام سالانی پاش پەیمانەکە زۆر گیروگرفتی بەردەوامی نێوان هەردوو لای بەخۆوە بینی.

گەلێک کیشە و گیرو گرفتی لاوەکی و زێدەگافی و خروقانی ئاگربەست روویدا. زۆر جار هەراو هەنگامە وئاژاوە زۆر ناوچەی دەگرتەوە. ئەمە جگە لە هەندێ شەڕی چەکدارانەی سنووردار. هەموو ئەمانە لە کەشو هەوایەکدا بوو کە پتر لە هەولێک بۆ

تیرۆر کردنی بەرپرسانی کوردی بارزانی درا، ئەمە جگە لە پەلپ و بیانوو گرتن و یەکدی تاوانبار کردن و هەڕەشەی واز هێنان لە پەیمانەکە.

شای ئێران، ئەم بارودۆخەی قۆزستەوەو بە دەرفەتێکی چاکی زانی تا گفتوگۆ لەگەڵ کوردەکاندا بکات، وا خۆی نواند کە ئامادەیە هەموو یارمەتی یەکی کورد بدات لە کاتی هەڵگیرساندنەوەی شەڕدا لە پێناوی گەیشتن بەو ئامانجانەی لە پێناویدا دەخەبتن. هەمان ئەو ئامانجانەی کە هەمان شا، بەزەبری ئاگر و ئاسن لە کوردی ئێرانی قەدەغە دەکرد. دیارە کە شا لە رووی دڵسۆزی و هاوسۆزی و هاوکاری و پشتیوانی یەوە یارمەتی کوردی عێراقی نەدەدا. بەڵکو پتر بمەبەستی خولقاندنی گیرو گرفت و کێشەی پتر بوو بۆ رژێمی بەعسی حوکمڕان، کە خۆ بەخۆ دوژمنێکی تەقلیدی شا بوو.

هەروەها (کیسنجر)ش بە راشکاوی رای گەیاند کە ئامادەیەبێ هیچ شەرت و مەرجێک کۆمەکی پێویست بە کوردی عێراق بکات، ئەمەش لەو قەناعەتە باوەی ئەوسای واشنتۆنەوە هاتبوو کە رژێمی عێراق، رژێمێکی چەپە و بەڵگەیش ئەو کۆمەکە سوپایی و ئابوری یە یە کە لە یەکێتی ی سۆڤیەتی وەردەگرێت.

بەم جۆرە، لە ساڵی ١٩٧٤ دا و پاش وەرگرتنی چەک لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و وەرگرتنی کۆمەکی دارایی و سوپایی لە ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل، بارزانی کەوتە قوناغێکی تازەی شەڕەوە و لە کوردستانی عێراقدا شەڕ لە نێوان هێزی سوپای حکومەت و هێزی پێشمەرگەی کوردا هەڵگیرسایەوە. هەر چەندە سوپای عێراق لە رووی هێز و رێکخستن و مەشق و چەکەوە، بەهۆی کۆمەک و ئامۆژگاری سوڤیەتەوە بە هێزتر بوو بوو.

ئەوەی لە ١٩٧٥/٣/٦ دا روویدا، هەر چەند کوردەکان پێ ی دەڵێن "خەنجەر لێدان لە پشتەوە" ئەنجامێکی مەنتیقی ئەم وەرچەرخانە سەیرە بوو لە هاوسەنگی نێوان هێزەکاندا. هەردوو دوژمنە تەقلیدی یەکە، واتا شای ئێران و سەدام حوسەینی جێگری سەرکۆماری عێراق، دەستیان دەنێو دەستی یەکدی ناو دەستیان لە ملی یەکتر وەریناو زەمینەیان بۆ پەیمان و رێک کەوتنێک خۆش کرد کە زۆر خێرا بەندەکانی هاتنە جێ بە جێ کردن و پەیمانەکە بریتی بوو لە چارە سەرکردنی ناکۆکی یە سنوری یە لە مێژینەو دژوارەکانی نێوان هەر دوو وڵات. ئەمە لە پەراوێزی کۆنگرەی رێکخراوی ئۆپیک لە جەزایردا کرا. بەمجۆرە شا دەستبەرداری کورد بوو، کردنی بە قوربانی یەکی راستەوخۆی ئەم پرۆسە دبلۆماسی یە. ئەو کۆمەکە دارایی‌یەی کە شاو ئەمریکا بە کوردیان دەکرد، وەستا. هەروەها شا دەستوری دا کە سنور لە جەنگاوەرانی بارزانی دابخرێ، لە کاتێکدا پتر لە ٣٥٠ هەزار خێزانی کورد پەنایان وە بەر ئێران بردبوو. بارزانی لە تەعلیقێکی دا دەربارەی ئەم رووداوە دەڵێ: "گەورەترین هەڵەی ژیانم ئەوەبوو کە باوەڕم بە بەڵێنەکانی وڵاتە یەکگرتوەکان کرد".

## تاران پێویستی بە کورد بوو

ئەم بادانەوە فێلاوی یەی شا، بوو بە تەوقی شەڕو لە ملی خۆی هالا. چونکە کوردی ئێرانی دانیشتوی شارەکانی ورمێ و کوردستان و کرماشاه، بۆیە لەشاو ڕژێمی شا بێدەنگ بوون، چونکە یارمەتی برا کوردە عێراقی یەکانیان دەدا. ئەوەبوولە ماوەیەکی کەمدا وڕوژان و هەڵوێستی دژیان لە شاو لە ڕژێمە بێزراوکەی وەرگرت.

سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی کوردی ئێران موسوڵمانی سوننی مەزهەبن. بەڵام یەکجار کەیف خۆش بوون بەروخانی ناپڕوبەری ڕژێمی شاو ئەوچارەنووسە پڕ شەرمەزاری یەی کە خودی شا توشی بوو، پێشوازییان لە هاتنی ڕێبەری شیعە، ئیمام خومەینی کرد. چاوەڕوانی ئەوەیان لە شۆڕشی ئیسلامی دەکرد، بە تایبەتی بە هۆی هەڵوێستی ئیجابیان لە مەڕ شۆڕشی ئێوبراو، بە لای کەمەوە ئوتونومی یەکی ڕۆشنیریان بداتێ. بەڵام ئەزموون و تەجرەبەی تاڵی درێژایی مێژووی کورد، ئەمجارەش دووبارە بوەوە. هەر کە ڕژێمی تازە جێ پێ ی خۆی قایم کرد، یەکەم هەنگاوی ئەوە بوو کە شارو پارێزگا کوردنشینەکان کۆنترۆڵ بکات.

ئەوە بوو پەیوەندی نێوان کوردو ڕژێمی ئێران هێمن نەبوەوە تا پاش هەڵگیرسانی جەنگی کەنداو، چونکە تاران پێویستی بەو کوردانە بوو کە ئەوانیش لە لای خۆیانەوە ئەم بارودۆخەیان بە هەل زانی تا پتر پێ لە سەر داواکاری یەکانی خۆیان لە عێراقی دراوسێ ی، دابگرن.

مەسعود بارزانی، هەوڵێ دا بە کۆمەکی ئێرانی بگاتە ئەو ئامانجانەی کە بابی (مستەفا بارزانی) نەیتوانی لە ساڵی ۱۹۷۵دا بەدییان بهێنێ. بارزانی ئەمجارەش توانی بەزەبری هێزی پێشمەرگە، ناوچەیەکی کوردی فراوان لە باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراق و بە درێژایی سنوری ئێران رزگار بکات. بەڵام وەستانی شەڕوکۆتایی هێنانی جەنگی کەنداو لە ساڵی ۱۹۸۸دا، ئەم هەوڵە تازەیەی کوردی لە بار بردو نەگەیشتنە مافی دیاری کردنی چارەنوس.

هێمنی لە کوردستاندا، هەمیشە ئارامی و هێمنی بەر لە هەڵکردنی باهۆزە. قۆناغی چاوەنۆڕکردنی دەرکەوتن و پەیدا بوونی دەرفەتێکی نوێ یە بۆ دەست پێکردنەوەی خەبات لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا. دیارە هەمیشە کۆمەڵێک دەوڵەتی بچوک و گەورە لە ناوچەکەدا، بە قوڵی بیر لە چۆنیەتی استغلالی هەراو هەنگامەو بشێوێنی یە هەڵگیرساوەکان دەکەنەوە و دەیانەوێ مەسەلەی کورد بە بێ چارەسەر وەمێنێ و بە قازانجی خۆیان ئاراستەی بکەن.

کارل مای و زۆر گەڕیدە و سیاحەتچی ئێودار، لە کۆتایی سەدەی بوری دا نێوی کوردستانیان هێناوە و بە خاکی بەیارو رەعەمەل نەهێنراو وەسفیان کردەوە. هەروها

نێوی کوردیان وەکو گەلێکی سەرکێشی بوێرو ئازا بردەووە. ئەگەر ئەمڕۆکە بروانینە ناوچەکە و خەڵکی کورد، دەبینین گەلێک لەو راوبۆچونانەی ئەو نووسەرانە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش ڕاستی خۆیان لە دەست نەداوە و بە دەقی خۆیانەوە ماونەتەوە. بەڵام زۆر پێویستە ئەمڕۆ خەباتی خۆیناوی ئەو گەلە ئەبەزەی کە ئامادە نی یە ملکەچی واقیعی تراژیدیاو ئەسکۆکانی پتر لە سەدەیەک بێ، بخرێتە بەر وردەبینی لێکولینەوەوە. ئەو گەلەی چەندین ساڵە لە پێناوی وەدەست هێنانی سەر بەخۆیی نەتەوەیی و بوژانەوە و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابوری و رۆشنبیری دا دەخەبەتێ. هەروەها لیکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی بایەخی هەرە گەورەی ئەم گەلە دەربارەی گەیشتن بە وەدی هاتنی سەقامگیری یەکجارەکی لە ناوچەی رۆژ هەڵاتی ناڤینی هەمیشە هەڵایساودا.

کورد و کوردستان، دوو ووشەن کە مرۆڤ گوێ ی لێیان دەبێ، بیری بەلای کەش و هەوایەکی پڕ لە سەر کێشی و شۆڕش دا دەچێت، واقیعێکی وەخەیاڵدا دێ کە دەشێت ببێ بە بنەماو کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکەکانی سیاسەتی دەولی (نێو نەتەوەیی).

# فەسڵی دووەم

مروڤ لە پڕ هەست بە هێزێکی شاراوە لە بەدەنی خۆیدا دەکات کە هانی دەدا پڕبداتە نزیکترین بەردو بە هەموو هێزو توانایەوە بیوەشێنێ.

## مستەفا بارزانی، بەدرێژایی تەمەنی هەر شۆڕشگێڕ بوو

دەهاتن، لە هەموو شوێنێکی سەر زەمینەوە بەپەلە دەهاتن، لە هەر شوێنێکەوە، کوردی تێدا بوو، دەهاتن: لە کۆساره سەختەکانی کوردستانی عێراقەوە، کە گەورەترین شۆڕشی سەر تا سەری مێژووی کوردی بە خۆوە دیتبوو، ئەو شۆڕشەی کە ناچار بوون لە ساڵی ١٩٧٥دا رای بگرن. لە ناوچەکانی عەنە دۆڵی رۆژ هەڵاتی پاشکەوتوی تورکیاوە سنورە کراوەکانیان دەبڕی، ئەو سنورانەی کە رژێمە یەک لە دووی یەکەکان بە درێژایی رۆژگار بۆیان کۆنترۆڵ نەکرا بوو: هەندیکیان بە ئوتومبیلی کرێ دەهاتن یان بە جێبی ئەفەر بەری بێ جام دەهاتن. خەڵکانی دی بە پێیان هاتبوون یان بە سواری قاتر لە هەر چوار نکالی کوردستانی ئێرانەوە هاتبوون، ئەوکوردستانەی لەوەتای رژێمی شا روخا بوو، بە شۆڕش ئاوس بوو. خەڵکێکی زوریش بە فڕۆکە لەو وولاتە رۆژاواییانەوە دەهاتن کە وەکو پەنابەر تێیدا دەژیان، لە وولاتانی وەک :وولاتە یەکگرتوەکان، ئەڵمانیا، ڤیەنا، لەندەن و ستوکهۆم.... هتد وە هاتبوون.

لە تارانەوە بۆ ورمێ، بە فڕۆکە وەرێ کەوتم، لەو سەفەرەم دا کە کەمتر لە سەعاتێکی خایاند، هەلم بۆ رەخسا هەندێک لەوانە بدینم کە لە وولاتانی رۆژاواوە هاتبوون. ورمێ ئەو شارە بوو کە بە درێژایی پتر لە پەنجا ساڵ حوکمرانی بنەماڵەی پەهلەوی، بە ناوی رەزا شای یەکەمی باوکی شاوە کە شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ دا کۆتایی بە حوکم و دەسەڵاتیان هێنا، پێ ی دەگوترا رەزاییە. جەماوەری خەڵک پاش شۆڕش هەر بەوەوە نەوەستان کە پەیکەرەکانی شا برووخێنن و وێنەکانی لە مەیدانەکان و دایەرەو تەلارە رەسمی یەکان لابەرن، بەڵکو ناوی شارەکەشیان گەڕاندەوە سەر ناوە کۆنەکەی (ورمێ). دیەنی کیژە خزمەتچی یەکەی نێو فڕۆکە کە زۆر سەرنجی راکێشام، کە رای دەگەیاند فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی ورمێ دەنیشێتەوە، بە توێزی زەردەخەنەکەی سەر لێوی پێ دەشاردرایەوە. رەفتارو گوفتاری، شێوازی هەڵسوکەوتی کە بەر لە شۆڕشی ئیسلامی نێو بانگێکی چاکیان بۆهێلێ هەوایی ئێران پەیدا کرد بوو، مایەی سەرنج بوو، چاکەتە بۆرەکەی و جل و بەرگە هاودامانەکەی رەنگدانەوەی پەیڕەوی کردنی ئامۆژگاری یەکانی رژێمی ئیسلامی بوو.

لەو کاتەدا ئەو دوو پیاوەی کە لە نزیکی منەوە دانیشتبون و هەردوکیان بە ئینگلیزی یەکی رەوان دەدوان و جل و بەرگی رێک و پێکی مۆدێ ئەوروپاییان لەبەر بوو، ئەو

کاغەزانەی بەردەستیان کە بەدرێژایی رێگە سەرنج و تێبینی خۆیان لە سەر تۆمار دەکرد، پێچاپەوەو خستیانە جانتا دبلۆماسی یەکانیان و پشتێنی نەمانیان بەست.
راستە من بە درێژایی سەفەرەکەمان قسەم لەگەڵدا کردن، بەڵام خۆمان لە موناقەشەو باسی سیاسی دوورگرت، چونکە مرۆڤ دەیزانی ئەوە چەند مانگێکە لە ئێران دا چ باسە، بۆیە دەبوایە سڵ بکرێتەوە. بەڵام من دڵنیا بووم کە ئەو دوو پیاوە کوردن و پەنابەری یەکێک لە دەوڵەتە رۆژاواییەکانن، چونکە بە حوکمی سەفەری زۆر و دیانەی بێ شومارم وام لێهاتبوو ئەم جۆرە سیمایانە، بەرواڵەتی پڕ لە عیزەتی نەفس و بە چاوی زیتەڵ و نیگای زیرەک و شێوازی موناقەشەی کورت و ئاماجداریانەوە بناسمەوە. دڵنیا بووم بە هەمان مەبەستی من رێگەی سەفەری ئێرەیان گرتبووە بەر.

ئەمە لە ١٩٧٩/٣/٤دا بوو. هەموو دەزانین چەند رۆژێک لەوەبەر ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهانی هەواڵێکیان بڵاو کردەوە کە بریتی بوو لەوەی: پێشەواو سەرۆکی ئەفسانەیی کورد مەلا مستەفا بارزانی بە نەخۆشی دڵ، لە هەوەڵین سەعاتەکانی بەیانی رۆژی ١٩٧٩/٣/١دا لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی زانستگەی جۆرج تاون لە واشنگتون، کۆچی دوایی کرد.

بارزانی، پاش نسکۆی شۆرشی کورد (١٩٧٥) کە دژی رژێمی بەعسی عێراقی رێبەرایەتی دەکرد، ناچار بوو لە ژێر گوشاری رژێمی شادا پەنا وەبەر وڵاتە یەکگرتوەکان بەرێ و تا رۆژی وەفاتی لەوێندەرو بەگوشەگیری بژی.

بەڵام هەواڵی وەفاتی سەرۆک وپێشەوای کورد، بەلای زۆر کەسەوە، بە تایبەتی ئەوانەی لە نزیکەوە ئاگایان لە باری تەندروستی ئەو هەبوو، شتێکی کوتوپڕ و چاوەنۆڕ نەکراو نەبوو. دکتۆر (محمود عثمان)ی پزیشکی تایبەتی بارزانی بەر لە چەند ساڵێک حاڵەتێکی نەخوشی ی ئاڵۆزی لە بڕبڕەی پشتی دا کەشف کرد بوو کە ماکەکەی دەیدایە لاقی، لە ئەنجامدا گەییە دیاریکردنی نیشانەکانی شێرپەنجەی خوێن. هەڵبەتە پاش ئەوەی پێشەوای سیاسی ناچار بوو ژیانی تاراوگە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا قەبوڵ بکات، لە مایوکلینیک دا فەحسی بۆ کرایەوە و هەمان ئەنجامی فەحسەکەی دکتور محمود عثمان دەرچوو، تاقە شتێک کە دکتۆرە ئەمریکی یەکان بۆیان زیاد کرد، ئەوە بوو کە شێرپەنجەکە لە حاڵەتی گەشەکردندایە و مالیجەی نی یە.

پێشەوای جەنگاوەری، گەلێکی تێکۆشەر، لە شوباتی ١٩٧٩دا دوابڕیاری گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆدا. هەرچەندە ئەو زام و ئازارو ژانەی دوا نسکۆکە خستبویە دڵی سارێژ نەبوو بوو، و ئەو سەدمەیە لە دڵی دەرنەچوو بوو کە ئەمریکی یەکان بە ناوی دۆستایەتی یەوە دەرهەقیان کردبوو. هەموو ئەو ژان و ئازارانە لەبەر دەم سۆزی بۆ وڵات و گەلی خوی دا، بەرگەیان نەگرت. لە دوا رۆژەکانی ژیانیدا دەیگوت: "هەموو

توانایەکی من ئەوەندەیە بۆ کوردستان بگەڕێمەوەو لە خاکی کوردستاندا، مادامێکی ناتوانم تێیدا بژیم، چاوەڕوانی مەرگ بکەم".

**لە خاکی کوردستان دا**

یەکێک لە کوڕەکانی، بە یارمەتی محمد دۆسکی ی سەرۆکی کۆمەڵەی دۆستایەتی کورد- ئەمریکا، توانی هەموو ئەسبابێکی سەفەری سەرکردەی نەخۆش فەراهەم بکات. لە رێگەی کۆمەڵە کەناڵێکی دیپلوماسی یەکجار ئاڵۆزەوە، توانرا ئێران رازی بکرێ لە سەر گەڕانەوەی بارزانی، ئەوجا بلیتی سەفەر بڕا. کەچی دۆسکی دوای دوو رۆژ لە رێکخستنی هەموو کارو بارەکانی سەفەر، ناچار بوو، هەواڵی وەفاتی سەرکردەی تەمەن ٧٦ ساڵە بە ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهانی رابگەیەنێ و دوپاتی بکاتەوە کە دوا ئاوات و ئارزووی ئەوە بوو لە نێو رۆڵەکانی گەلی خۆی و لە خاکی نیشتمانی خۆیدا، لە کوردستاندا بنێژرێ و خاکی کوردستانی بە نسیب ببێ.

رێکخراوە کوردی یە سیاسی یە جۆراو جۆرەکانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران و هەروەها چەندین رێکخراوی کوردستانی تورکیاو پەنابەرانی کورد لە ئەوروپا و وولاتە یەککرتوەکان دەستبەجێ هەواڵەکەیان بە هەموو دنیادا بلاو کردەوە. هەروەها رۆژنامەنوسان، بە تایبەتی ئەوانەی بایەخی تایبەتیان بە بارزانی و خەباتی گەلەکەی و دۆزی رەوای گەلەکەی دابوو، ئاگادار کرانەوە وپێیان راگەیەنرا کە رێ و رەسمی بە خاک سپاردنی زەعیمی کۆچکردوو لە رۆژی ١٩٧٩/٣/٥دا لە نزیکی گوندی شنۆی سەربەپارێزگای ئازربایجانی رۆژاوا، لە کوردستانی ئێراندا ئەنجام دەدرێ. ئەمە ئەو هۆیە بوو کە پێی لێکردم سواری فڕۆکەی بۆینگی ئێرانی ببم، وەکو پاشتر بۆم دەرکەوت، هەر هەمان هۆ ئەو دوو پیاوە کوردەی نزیکی منیان هاندا بوو لە لەندەنەوە بۆ ئێرە بێن.

هەرکە فڕۆکەکە، لە فڕۆکەخانەی ورمێ نیشتەوە، هەر هەمان فڕۆکەخانەکەی سەردەمی شابوو، لە لایەن پاسدارانی شۆڕشەوە تەفتیش کراین. خەڵکێکی یەکجار زۆرم لە ماتەم گێران بینی، دەمروانی یە هەر شوێنێکی شار، دیمەنی جلی خاکی و جامانەی کوردی لە دیمەنی هەر جۆرە جلێکی دی زاڵتر بوو. هەر چەندە زۆربەی خەڵکی ورمێ ئازەرێ و بەزمانی تورکی دەدوێن، بەلام کەمینەیەکی کورد و کەمینەیەکی ئاسوری مەسیحیشی تێدایە. بەلام ئەم ژمارە زۆرەی کورد، نیشانەی ئەوەبووکە هاندەرێکی گەورە پاڵی پێوەناون روو بکەنە ئەم شارە یان پێیدا رەت بێن.

یەکەم کەسێک کە بە بیرمدا هات، رۆژنامەنوسی ئاسوری (جەرجیس فتح الله)ی ئەوکات بوو، کە لە رۆژانی پاش هەرەسی شۆرشی کورد (١٩٧٥) ئاشنای بووم و یەکترمان ناسی.ئەو دەمانە جارێک پێکەوە دانیشتین، بەدەم چاخواردنەوە کۆمەڵێک

نامەی دامێ کە بۆچەند سیاسەتمەدارێکی ئەڵمانیای فیدراڵی نووسی بوونی، داوایێن لیدەکات توانا و هەوڵی خۆیان وەگەڕ بخەن و دەستی یارمەتی بۆ کورد و هاوپەیمانە ئاسوری یەکانی درێژ بکەن. داوای لە من کرد کە ئەم بابەتە بڵاو بکەمەوە، چونکە باوەڕی بە تواناو کاریگەری رۆژنامەگەری هەبوو لە گەڵاڵە کردنی رای گشتی دا لە ئەورووپا. لە دڵی خۆمدا و بەدەم یادکردنەوەیەوە پرسیم: "داخۆ لە سایەی ئەم رژێمە ئیسلامی و زروفە تازەیەی ئێران دا رۆژی بە چ رۆژگارێک گەیی بێ ؟ بە تایبەتی پاش تەقینەوەی ناکۆکی یەکانی نێوان کوردی کوردستانی ئێران و رژێمی خومەینی".

– وا چاکە بچی بۆ ئوتێل و لە وێندەر بپرسیت.

ئەمە وەڵامی یەکێک لە فەرمانبەرەکانی فرۆکەخانەی ورمێ بوو وەختێ لیم پرسی کە ئاخو تاکسی دەست دەکەویت یان نا.کە گەیە ئوتێل، سەیرم کرد هێشتا شۆڕش نەگەییوەتە ئەوێندەرو پاشماوەی رژێمی شا هەر لە جێ ی خۆیەتی. تابلۆیەکی کارەبایی شوشەشکاو بە رووی ئوتیلەکەوە هەلواسرا بوو، و بە ئینگلیزی لە سەری نوسرا بوو (ئوتیلی رەزاییە). جگە لەم تابلۆ شکاوە ئیدی هەموو شتەکان وەکو خۆیان مابوونەوە، کە لە دوا سەفەرم دا ، بەر لەچەند ساڵێک دیبومن ئوتێلەکە خەمباری لێدەباری، هێندە پیس بوو مرۆڤ دڵی لێ تێک هەڵدەهات..

پێشخزمەت و بەرێوەبەری ئوتێلەکە گوێ ی بە هیچ نەدەدا. تاقە شتێک کە گۆڕا بوو، وێنەی شا لە ژوری پێشوازی لا برا بوو، و وێنەیەکی گەورەی رێبەری شۆڕش ئیمام خومەینی لە جێدا هەڵواسرابوو.

بیرم دێ ئالەم ئوتێلەدا، لە ساڵی ١٩٧٤، ١٩٧٥ دا لەگەڵ سەفیری تازەی ئەڵمانیای فیدراڵی دا لە ئێران ڕێزدار(فیک) ئاشنایەتیم پەیدا کرد. لەو سەفەرەم دا وێنەگری گۆڤاری (شتێرن) ڕیزدار (فولکرهێنز) و وێنەگری (سفێن سیمون) ڕێزدار (کلاوس سیبان)م لەگەڵدا بوون. ئەوەی راستی بێ لە ژیانم دا میوانی (ئوتیل)ی بێ دەسەڵات و دەستەپاچەی وەکو سەفیری ئەڵمانیم لەو رۆژەدا نەدیتوە. حەپەساوو ئەبلەق لە دیمەن و چۆنیەتی پێشکەش کردنی خواردنی ئوتێلەکەی دەڕوانی، کە گوایە باشترین ئوتێلی شارە و لە لایەن دەزگای حکومەتی یەوە بەڕێوە دەبرێ. پەردەیەک بە سەر مێزی نان خواردنەکەوە بوو لە زەردێنەی هێلکە دا ڕەق بوو بوو، لەوە دەچوو پتر لە مانگێک بێ نەشۆرابێت.

قاپەکان لە پیسی دا رەق بو بوون، میوانەکان فنجانی قاوە یان ئاوی گەرمیان بە هەزار پاڕانەوە و دەم بۆڵەو هەڕەشە وەدەست هێنابوو، و لە نێو خۆیاندا بەشیان دەکرد. یان بە پێ ی دابە رۆژهەڵاتیی یەکە دەچوون لە پەناوە بیست تمەنێکیان لە دەستی یەکێک لەپێشخزمەتەکان دەناو کاری خۆیان رایی دەکرد.

رەنگە ئەمە ئاسایی بێتە بەر چاو، بەڵام بەراوردێکی رەوتەنی وخێرای بارودۆخی ئەم نوتێلە لەگەڵ نوتێلێکی نمرە یەکی تاران وخواردنگە تازە و مودێرنەکانی ئەوێندەردا، بە ئاشکرا ئەوە دەردەخات کە رژێمی شا چ بایەخێکی زۆر بە تارانی پایتەخت دەدات و چۆن ناوچەکانی تری ئێران، بە تایبەتی پارێزگاکانی ئازربایجانی رۆژاوا و کوردستان پشت گوێ دەخات و چ ئیدارەیەکی خراپی هەیە.

چونکە من هەندێ شارەزاییم لە بارودوخی ئێران هەبوو، بۆیە هیچ پێم سەیر نەبوو کە لە ساڵی ۱۹۷۹دا دیتم هەموو شتەکان هەر وەکو خۆیانن و گۆڕانیان بە سەردا نەهاتووە. بە هەر حاڵ کارگێرانی ئوتێلەکە نەیانتوانی تاکسیم بۆ پەیدا بکەن. بۆیە لێبڕام بگوازمەوە بۆ ئوتێلێکی دی کە کوردی لێ دادەبەزین و ئامۆژگاری میوانەکانیان دەکرد بچن بۆ ئەوێندەر. ئەم ئوتێلە کەوتبوە نزیکی مزگەوتێکی شارەوە کە لە سەدەی ۱۳ ز دروست کرا بوو.

بەراستی لەوێندەر، پێویستی یەکانی خۆمم دەست کەوت: جگە لە ژوورێکی باش، شوفێرێکیش هەبوو سبەی بەیانی بە سێ سەد تمەن بۆ دەرێ ی شارم بەرێ و لە بازگە زۆر و زەبەندەکان دەربازم بکات. ئەو بازگانەی کە پاسداران و گرووپی دی دایان نابوون، هەر یەکەیان بۆ خۆی حکومەتێک بوون. من دەمویست بۆ شنۆ بچم کە دوو سەعاتێک لە (ورمێ)وە دورە. پێدە چوو شوفێرەکە چونی رۆژنامەوانانی بێگانەی بۆ شنۆ "بەبۆنەی مەلا مستەفا" وە پێ سەیر نەبێ.

چونکە لە هەر چوار نکالی دنیاوە خەڵکی بە "بۆنەی مەلامستەفا"وە رویان لەوێندەرکرد بوو. بەڵام خۆی لە هەموو موناقەشەیەکی سیاسی دور دەگرت، ئیدی لەمەڕ رژێمی تازە یان خومەینی یان کوردیان شا بوایە. لە رێگەدا دەمویست وەبیری خۆمی بێنمەوە کە چەند جار بەم رێگەیەدا بۆ شنۆ چووم و لەوێندەرەوە بە تولە رێگا تۆناو تونە دژوار و سەختەکانی سنوردا بۆ کوردستانی عێراق چووم، پێنج یان شەش جار.

جارێکیان لە سەردەمی ئاشتی پاپەیمانی۱۱/۳/ ۱۹۷۰دابوو زۆر جاریش لە کاتی شەڕو شۆرشی چەکدارانەی ساڵانی ۱۹۷٤و۱۹۷٥دا بوو، ئەو شەڕانەی کورد دژی سوپای عێراقی پڕچەک بە تازەترین چەکی سۆڤیەتی، دەیانکرد، یەکێک لەم سەفەرانەم بەر لە شەش ساڵێک بوو.

رێک لە ٦/۳/ ۱۹۷٥دا بوو.ئەو رۆژە بوو کە شای ئێران، ئەو شایەی تا ئەو رۆژە کۆمەکی سوپایی و دارایی کوردەکانی دەکرد، وەکو کوردان خۆیان دەڵێن بای دایەوەو لە پشتەوە خەنجەری لێدان. شا، ئەو رۆژە وەکو ئاشکرایە دەستی لە ملی جێگری سەرکۆماری عێراق سەدام حسێن کردو لەگەڵی رێک کەوت کە هەموو ناکۆکی یەکانی نێوان هەر دولا وکێشەی بەردەوامیان لە سەر شەتی عەرەب چارە سەر بکەن، ئەویش

له سەر حیسابی کوردان. دوا سەفەریشم بۆ ئەو ناوچەیە پاش هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد و رەهەندە بوونی کورد بە خۆو خێزانیانەوە بۆ ئێران، بوو. (بارزانی)ش ناچار بوو بارەگا قایمەکەی خۆی لە حاجی ئومەران بە جێ بێڵێ و لەگەڵ هەردوو ژنەکەی و نۆ منداڵەکەی و ۱۵۰ کەس لە گاردە تایبەتی یەکانی خۆی پەنا وەبەر ئێران بەرێ.

مەبەستی من لە بڕینی ئەم رێگەیە، چ لە سەردەمی ئاشتی و چ لە سەردەمی شەڕدا، هەمیشە ئەم پیاوەبوو کە بۆ ماوەی پتر لە نیو سەدە رێبەرو پێشەوای گەلی خۆی بوو: چەندە رۆڵەکانی گەلەکەی خۆشیان دەویست، ناحەزان و دژمنانیش ئەوەندە رقیان لێ ی بوو. وێڕای ئەوەی کە گەلێک لایەن شەڕی ئەو پیاوەیان کردووە، بەڵام هەر هەموو ئەولایەنانە بە ناچاری رێزیان گرتوە و حیسابی پێشەواو سەرکردەیەکی بێ هاوتاو بێ وێنەی گەلی کوردی چەوساوەیان بۆ کردووە.

## جەنگ تەوەری سەرەکی ژیانی بوو

بارزانی، دوا سەفەری خۆی لە وولاتەیەکگرتوەکانەوە کە هیواکانی دابە دەم رەشەباوە، بۆ باوەشی نیشتمانی خۆی، کوردستان، بۆ ناو گەلی خۆی، کرد. ئەو گەل و نیشتمانەی لە حاڵەتێکی پاشکەوتەیی دووفاقیدا دەژی و بە سەر وولاتانی تورکیا و ئێران و عێراقدا دابەش کراوە و خاکە بەپیت و بەرەکەتەکەی هێشتا هەر بەیارە و رەعەمەل نەهێنراوە..

ئەو نیشتمانەی کە بارزانی تیایدا لە دایک بوو، بەڵام مەخابن ئەوەندی لە دەربەدەری و ئاوارەیی و جێ گۆڕکێ ی بەردەوام دا ژیا، ئەوەندە لە ناو ئەو نیشتمانە دا نەژیا. تەنانەت دەرفەتی ئەوەی دەست نەکەوت لە سەر خاکی ئەو نیشتمانە وەفات بکات، بەڵێ دوا سەفەری کردو گەڕایەوە تا بە یەکجارەکی لە ژێر ئەو خاکە دا چاو لێک بنێ.

هەزاران کورد لە باشوری رۆژئاوای ورمێ وە، خوێندکارانی زانستگەکانی تاران و تەورێزو، نوێنەری ێکخراوی چەپەکانی کورد، جوتیاری دواکەوتوترین گوند، لە دورترین ناوچەی شاخاوی و عاسی یەوە هاتبوون و لە شنۆ دا خڕ بووبوونەوە تا بەشداری رێ ورەسمی بە خاک سپاردنی بارزانی بکەن (سەرچاوەو ژێدەرەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، ژمارەی بەشدارانی ئەم رێ و رەسمەیان بە پتر لە سەد هەزارکەس قەبلاندووە)

مەفرەزەی چەکدارای سەر بە حیزب و رێکخراوە کوردی یە جیاوازەکان، بە جلی سەربازی تایبەتی و هەموو چەکەکانیانەوە، لە سەرتاسەری ناوچەکەدا دابەش بوو بوون، تا زەبت و رەبت رابگرن و ئەمن و ئاسایشی ماتەم گێران بپارێزن. دەنگی هوراکێشان دەگەیە کەشکەلانی فەلەک و دەنگی سرودی (ئەی رەقیب) کە لە ساڵی ۱۹٤٦ دا

داتراوه تابیێ به مارشی نەتەوەیی گەلێکی بێ دەوڵەت، لە دوا ساتەکانی ئەو ئێوارەیەدا دڕی بە خامۆشی و کپی و سام و هەیبەتی ڕێ و رەسمی ناشتنەکە دەدا.

تەنانەت بەوەرەترین جەنگاوەرانی کورد، ئەوانەی لە ناو جەرگەی بۆتەی خەبات و شەڕی سەخت و دژواردا قاڵ بوو بوونەوە، هەمووچەک بەشان و رەخت و فیشەکدان لە پشت، خەنجەر لەبەر پشتێنیان، تەنانەت ئەوانەش خۆیان پێ نەگیراو کە دەیان بینی دوا رابەرو سەرۆک و پێشەوای سیاسی و سوپایی مەزنی کورد، بە خاکی کوردستان دەسپێردرێ، خۆیان پێنەگیراو وفرمێسک وەکو بارانی بوهارێ لە چاوانیان دەهاتە خوارێ.

پاش تەواو بوونی رێ و رەسمی بە خاک سپاردن، (ئیدریس بارزانی) کە یەکێک لە کوڕەکانی "شێری بارزان" یان "شێری کێوان" وەکو رۆژنامەوانانی بێگانە بە بارزانییان دەگوت، گوتەیەکی ماتەمینی پێشکەش کرد، کە تێیدا گوتی: "ئەوەی لێرەدا بە چاو دەیبینین، کارێکە زۆر زەحمەتە بەووشە گوزارشتی لێ بکرێ، ئەمە خۆی لە خۆیدا پێوەرێ ئەو خۆشەویستی و رێزە زۆرەیە کە گەلی کورد لە مەرحومی دەنەن".

بەراستی جەنگ هەموو ژیانی پڕ کرد بووە، هەر لەو رۆژەوە کە دەستی چەکی گرتبو، هەڵبەتە زۆر کارامەش بوو لە بە کارهێنانی چەکدا. لە سەرەتادا شەڕی عێراقی یەکانی کرد، پاشان شەڕی هاوپەیمان و ئینگلیزەکانی عێراقی کرد. ئەوجا شەڕی فورس و هەرهەموو حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی بەغدای کرد کە هەر هەمویان لە یەک خاڵی هاوبەشدا یەکیان دەگرتەوە، ئەویش خاڵی دژایەتی و بە گژا چوونی کورد بوو.

بارزانی، بە درێژایی تەمەنی بۆی هەڵنەکەوت تامی ئازادی سیاسی بچێژێ. هەر لە منداڵی دا بەر زەبری چەوسانەوەو راوە دوونانی عوسمانیان کەوت. ئەو دەمە گوندی بارزان سەر بە حوکمی عوسمانیان بوو. تورک، باب و باپیریان ئیعدام کردن، چونکە مل کەچی دەسەڵاتی وان نە دەبوون، بە خۆیشی لە تەمەنی پێنجساڵی دا لەگەڵ دایکی دا لە زیندان خران. بۆیە لەگینە شۆڕشگێرێتی بەشیری دایکی یەوە خواردبێ وهەر لەو رۆژانەوە بە گیانی شۆڕش و تێکوشان دژ بە چەوساندنەوە و ئەو زوڵمەی کە گەلەکەی پێوەی دەناڵێ، پەروەردە بووبێ.

تەنانەت لە سایەی رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق ، کە پاش روخانی ئیمپراتوریەتی عوسمانی هاتنە سەرحوکم ، بارزانی و بارزانی یەکان تامی ئازادییان نەچەشت، هەروەها لە دوای روخانی کۆماری مهابادش کە دوای چەند مانگێک لە دامەزراندنی ١٩٤٦ بە دەستی سوپای ئێران لە نێو برا، بارزانی و هاوەڵەکانی رویان کردە وولاتی یەکێتی سۆڤیەت و لە وێندەرش هەر تامی ئازادییان نەچەشت. لە ساڵی ١٩٥٨دا حوکمی پاشایەتی عێراق روخا. بارزانی بۆ عێراق گەرایەوە. زۆری ئومێد

بەوە هەبوو ئەمجارە هەندێ بە ئاسودەیی و ئازادی بژی. هەر بۆیە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی کۆماری تازەدا دەربارەی دابین کردنی ئۆتونومی بۆ کوردستانی عێراق.

بەلام ئەم خەونەش زۆری نەخایاند، دوای دوو ساڵ و چەند مانگێک سەر لەنوێ هەراو هەنگامەو بشێوێنی دەستی پێ کردەوە. بارزانی، لە ماوەی سالآنی ١٩٦١-١٩٧٥دا ڕێبەرایەتی شۆڕشی چەکدارانەی گەلی خۆی، دژی حکومەتە یەک لە دووی یەکەکانی عێراق کرد، ئەو شۆڕشەی کە پتر لە ١٤ ساڵی خایاند. دیارە ئەم ١٤ ساڵە، ئاوە ئاوە ماوەیەکی کورتی ئانارامی ئاگربەستی تێدەکەوت. سۆڤیەت، لە قۆناغەکانی هەوەڵی شۆڕش دا کۆمەکیان دەکردو لە کۆتاییدا ئەمریکایەکان ئەمەیان دەکرد. هەندێ جارێش ئێران ئەم ئەرکەی دەگرتە ئەستۆ. تەنانەت حزبی بەعسی سوری، کە باڵێکی ناحەزو دژ بە حزبی بەعسی حوکمڕانی عێراقە، ئەویش لە هەندێ ماوەی کەمدا بەشداری کۆمەک کردن بەم شۆڕشەی کوردی کردووە.

"ئەی شێر پشت بە چنگ و بازووی خۆت ببەستە، چاوەڕوانی ڕەحمەتی پیاوچاکان بە تەنیا، بێ سوودە". ئەم پیاوە بە درێژایی تەمەنی خۆی بەپێ ی ئەم پەندە کوردی یەکۆنە چووە بەڕێوە. جۆری بیرکردنەوەو شێوازی ژیانی دەقاودەق ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەوکارەسات و تراژیدیاکانی گەلی کورد بووە. هەموو ژیانی ئاوێنەیەکی بالآنمای ڕاستەوخۆی کوڵ وکۆڤانی ئەم گەلە بوو.

شەوێک، لە بارەگای سەرەکی بارزانی، لە حاجی ئۆمەران و ساڵێک بەر لە نسکۆی ١٩٧٥ دیمانەیەکم لەگەڵ بارزانیدا کرد کە شەوێکی تەواوی خایاند، هەردوو کوڕەکەی (ئیدریس ومەسعود) و تەرجومانی کورەی - ئەمریکی (شەفیق قەزاز)ی زمان ڕەوان لەم دیمانەیەدا ئامادەبوون. بارزانی کە ئەو دەمە تەمەنی ٧٢ ساڵ بوو، لەم دیمانەیەدا بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ نسکۆی ئایندە کرد. ئەم پێشبینیی یە زادەی ئەزمونی پتر لە نیوسەدە کاری ڕێبەرایەتی و سیاسی و تێکۆشانی بەردەوام بوو لە پێناوی وەدی هێنانی ئامانجەکانی گەلی کوردو دەستەبەرکردنی مافی.

*"...وەرە بە چاوی خۆت مەرگ بدینی بەرەو رووت بێت، تۆش چاوەڕوانی بکەیت و ئەوجاش هەر ببینی...وەرە هیوات بەسەرکەوتنی یەکجارەکی هەبێ و لە پلەی هەرە خوارەوەی هەرەس هێنان دا بێت..."* بەو ڕستەو دەستەواژانە، بارزانی دەستی بە وەسفی بارودۆخی گشتی ئەو دەمانە کردو لەسەری ڕۆیی:

*"...کارەکە هەمووی لە مۆتەکەیەک یان خەونێکی ناخۆش دەچێت: بێگومان زۆر ناخۆشە خۆت بدینی لە جێدا کەوتوویت و چ ئەوزارێکی بەرگریت لەبەردەست دا نەبێ یان هیچ توانایەکی جوڵانت نەبێت بەم حاڵەشەوە بدینی و هەست بکەی دووپشکێکی کوشندە خۆی بە نێو جلەکانت دا بکات و بەسەر لاقت دا سەربکەوێ و بگاتە سەر*

*سنگت و سوور بزانی پێویت: دەدات و دەتکوژێ و هەرچی یەک بکەیت هەر لەناو دەچێت. ئەو دەمە چ مەفەڕێکت نامێنێ تەنیا ئەوە نەبێ چاوان بنوقێنی و چاوەنۆڕی مەرگ بکەی. ئەوجا لە پڕێکدا وەکو ئەوەی خوا فریات بکەوێ و نەیەوێ بمری، دوویشکەکە لەسەر سنگت لابکەوێ و لێت دوور بکەوێتەوە. لەم ساتەدا هەموو گومانەکانت دەڕەوێتەوە. هەست بە هێزێکی نهێنی دەکەی، بەهێزێک نازانی سەرچاوەکەی لە کوێوەیە، هەست بەو هێزە شاراوەیە دەکەیت بە گیانتدا دێت، بەناو بەدەنت دەکەوێ، هەڵدەستێت و دەست بۆ نزیک ترین بەرد دەبەیت، هەڵی دەگریت و بە هەموو هێزو تواناتەوە بە دوویشکەکەیدا دەدەیت".*

سەدەی بیستەم پتر لە دوویشکێکی لەو بابەتەی بەخۆوە بینی کە هەوڵی دا بەسەر سنگی گەلی کورد بکەوێ، هەموو جارێک کورد ناچار دەبوون پڕ بدەنە بەردو هێندەیان زات و توانا هەبووە بە دوویشکەکەیدا بکێشن.. بارزانی یەکان هەمیشە، وخودی مەلا مستەفا، باب وباپیرانی یان منداڵ و نەوەکانی، لەم ڕووەوە لە ڕێزی پێشی پێشەوە بوون.

## ئەو عەشیرەتەی بەتوانای بەرزی جەنگاوەری ناسراوە

لەو ناوچە شاخاوی یە عاسێ یەی باکوری ڕۆژهەلاتی هەولێردا، لە ڕەخی چەپی ڕووباری زێ ی گەورەدا کە دەڕژێتە دیجلەوە، تا لەوێدا موریدانی شێخی بارزان دەژین. بارزان چ جیاوازی یەکی لەگەڵ گوندە کوردنشینەکانی تری دەوروبەری خۆیدا نی یە، یان دیمەن و شوێنەوارێکی ئەوتۆی تێدا بە دی ناکرێ کە سەرنجی ڕێبوار ڕابکێشێت. بەڵام ئەم گوندە سەرچاوەیەکی تایبەتی بزاڤێکی سیاسی یە کە چەندین ساڵە دەستی پێ کردوە هێشتا بەردەوامە، ئەم بزاڤە ڕۆڵێکی سەرەکی لە بلاوکردنەوەی هوشیاری نەتەوەیی کوردا دیتووەو هانی داون سووربن لەسەر داوای خودموختاری لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا.

مێژووی بارزان لە سەرەتای سەدەی ڕابردووەوە دەستی پێ کرد، ئەویش کاتێ بوو کە تەریقەتی سۆفیاتی نەقشبەندی لە زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی دا، سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناو توانی تاجدین ناوێک بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و بیکات بە موریدی خۆی لە گوندی بارزان. زۆری نەبرد ئەم سۆفی یە نێوبانگی دەرکردو خەڵکی دەوروبەری گوندەکەی بوون بە موریدو گوێ ڕایەڵی، چوونکە بیری هەرمەزی بلاو دەکردەوەو هەندێ سروت و دابی خواپەرستی داهێنا کە بە سەماو دەفەوە ئەنجام دەدران هەندێک چالاکی یان دەکرد کە لە گەمان دەچوو. هەروەها سەرجەلە کە بزێتی یە لەو ئەڵقانەی موریدانی تەریقەتەکە بە یەکەوە دەبەستێت، بارمەتی تاجدین-ی دا کە شۆرەت و دەسەلاتی پتر پەیدا بکات، ئەوە بوو نەک هەر بوو بە یەکەم شێخی بارزان و

بنەماڵەی بارزانی یەکانی دەوروبەری گوندی بارزان (نزیکەی ٧٥٠ خانەوادەبوون)، بەڵکو دەسەڵاتی پەرەی سەندوو تیرە دراوسێکانی وەکو (شێروانی، ١٨٠٠ خێزان، (مزووری) و (دۆلەمەری) شی گرتەوە.

(مارک سایکس)ی ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی کە لە ساڵی ١٩٠٠دا سەردانی ئەو ناوچە کوردنشینەی کردووە کە ئەمڕۆکە شریتی سنووری نێوان تورکیاو عێراق پێک دێنێ، ئەم ڕۆژهەڵاتناسە لێکۆڵینەوەیەکی لەمەڕ پێکهات و داب و نەریتی عەشایەری کورد ئەنجام داوەو ئەم لێکۆڵینەوەی تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بایەخی گەورەی مێژوویی خۆی هەیە. ئەم پیاوە ئەوەی دەرخستووە کە بارزانی یەکان عەشیرەتێکی جەنگاوەرو بە تواناو لێهاتووی وەهابوون، عەشیرەتەکانی دەوروبەر لێیان ترساون، بەتایبەتی عەشیرەتی هەرکی ی کۆچەر کە ساڵانە بۆ گەرمیان و کوێستان دووجاران بە بارزاندا ڕەت بوون.

سەرەڕای ئەوەی کە پەیوەندی پتەوی عەشایەری لەم ساڵانەی دواییدا زۆر کزو لاوازبوون، کەچی بارزانی یەکان، کە ژمارەیان لە بیست هەزار کەس پترە، تاکو ئێستا پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناوخۆیان لە پەیوەندی عەشیرەتەکانی دی پتەوو کۆکترە.

هەموو ئەو شەڕانەی کورد لە پێناوی بەدەست هێنانی ئازادی خۆیاندا، لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە کردویانەو هەندێ جار کێشەی دەسەڵاتی شەخسی شێخان و سەرانی عەشایەریشی تێ کەوتووە، سەرەتا لە (بارزان)ەوە سەری هەڵداوە. خەباتی بارزانی یەکان لە سەرەتادا دژی عوسمانی یەکان بووە، ئەو عوسمانی یانەی کە زۆربەی خاکی کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بووە، ئەوجا ئاراستەی ئەو دەوڵەتانە کراوە کە لە دوای ئەوان حوکمی کوردستانیان کردووەو هەوڵیان داوە سنووری خۆیان لە ناو خاکی کوردستاندا دیاری بکەن. ئەمە تا ساڵی ١٩٢٠ کە ساڵی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەرە، درێژەی کێشا.

## تفەنگ گرنگترین موڵکی شەخصی یە

شێخ عبدالسلام بارزانی، یەکەمین بارزانی بوو کە لە ڕووی داگیرکەرانی عوسمانی هەڵگەڕایەوەو توانی ناوچەکەی خۆی لە زوڵم و زۆریان بخەلەسێنێ و نوێنەریان لە ناوچەکەدا ترۆ بکات. هەروەها شێخ عبدالسلام پەیوەندی بە رووسەکانەوە کرد. ئەو رووسانەی کە لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردووەوە کەوتنە بایەخدان بە کورد. بەتایبەتی لەسەردەمی شەڕیان لەگەڵ عوسمانیان دا. بەڵام عوسمانیەکان توانیان لە ساڵی ١٩١٤داو بەبێ مەحکەمەودادگایی لە شاری موسڵ ئیعدامی بکەن.

شێخ ئەحمەدی بارزانی، کوڕە گەورەی، کە لە دوای ئەو سەرۆکایەتی و ڕێبەراتیەتی بارزانی یەکانی کەوتە ئەستۆ، هەمان ڕێبازی ئەوی گرتەبەر. بەڵام شێخ ئەحمەد شەڕی

عوسمانی یەکانی نەکرد، بەڵکو شەڕی بەریتانی یەکانی کرد کە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا سەرکەوتنییان وەدەست هێنابوو، و بە تۆبزی خۆیان وەکو دەم ڕاست بە سەر عێراقدا سەپاندبوو، ئەو عێراقەی کە دوای دابەشکردنی میراتی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی هاتە دامەزراندن. ئەم دەمڕاستی و ئینتیدابە تا ساڵی ۱۹۳۰خایاندو لەوە بەدواوە حوکمێکی پاشایەتی بەکرێگیراوی بەناو سەربەخۆ جێ ی گرتەوە کە ئەرکی سەرەکی بریتی بوو لە پاراستنی بەرژەوەندی یەکانی بەریتانیا.

ئەو حکومەتەی لە بەغدا دامەزرێنراو کەوتە هەنگاونان بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو عێراقدا بسەپێنێ، پێ ی وابوو دەتوانێ بە کۆمەکی بەریتانی یەکان، ناوچەی بارزانی مەڵبەندی شۆڕشی هەڵایساو بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و دای بمرکێنێتەوە، بۆیە هێزێکی سوپایی بۆ ناوچەکە نارد، ... ئەوەی حیسابی ئەوە بکات کە شێخ ئەحمەد خۆی سازو تەیار کردبوو، بۆ بەربەرچدانەوەو غافڵکردنی ئەو هێزە:

ئەوەبوو قافڵەیەکی سوپایی عێراق کەوتە کەمینێکەوە کە بارزانی یەکان بۆیان نابوەوەو پاش ئەوەی زیانێکی گەورەیان لێدا ناچاریان کرد بۆ ڕێگەی هەڵاتن و خۆدەربازکردن بگەڕێ. لەم شەڕە سەرکەوتووەدا، گەنجێکی تازە پێگەیشتوو، کە هێشتا تێوبانگی دەرنەکردبوو، ڕێبەرایەتی بارزانی یەکانی کرد، ئەویش برا بچوکەکەی شێخ ئەحمەد، مەلا مستەفا بارزانی بوو.

وێڕای ئەوەی عێراق خودانی سوپایەکی بەهێزو مەشق دیدەی تازە بابەت بوو، بەڵام چ سەرکەوتنێکی ئەوتۆی لە دژی شۆڕشگێرانی کورد وەدەست نەهێنا، ئەمە عێراقی یەکانی ناچار کرد کە هێزی ئاسمانی بەکار بهێنێ. دیارە هەموو حکومەتە جیاوازەکانی عێراق، لە هەموو قۆناغە مێژوویەکاندا پەنایان وەبەر بەکار هێنانی ئەو چەکە، دژی کوردان بردووە. حکومەتی عێراق ئەمجارە هانای وەبەر هێزی ئاسمانی بەریتانی بردو وەکو دوا کارتی دەستی خۆی بەکاری هێنا: بەم جۆرە ساڵی۱۹۳۱و ساڵی پاشتریش، هێرشی ئاسمانی دڕندانەی فڕۆکە بەریتانی یەکانی بەخۆوە بینی کە چۆن دیهاتەکانی کوردستانیان وەبەر پەلامار دەداو گوندەکانیان بۆردومان دەکردو ماڵی جوتیارانیان دەسوتاندو دەیانکرد بە خۆڵەمێش.. بەمجۆرە بەغدا توانی بە پشتیوانی ڕاستەوخۆو کاریگەری هێزی ئاسمانی بەریتانیا مقاوەمەت و بەرگری کوردان لاواز بکات و دای بمرکێنێتەوەو ئەوجا ڕێ بۆ یەکە سوپاییەکانی خۆش بوو کە بچنە ناو بارزانەوە.

هەرچەندە شێخ ئەحمەدی بارزانی و ئەو پیاوانەی لەگەڵیدا مابوونەوە مقاوەمەتێکی قارەمانانەیان کرد، بەڵام هەر ناچار بوون بەرەو سنوری تورکیا پاشەکشە بکەن. هێزی تورکیش لە دەرفەتێک دەگەڕا تا پەلاماری شێخی شۆڕشگێڕ بدات. لە ڕاستیدا توانی لە پشتەوە هێرشی بکاتە سەرو دەستگیری بکات و لە ساڵی ۱۹۳۵دا بیداتەوە بە حکومەتی عێراق. لەسەرەتادا شێخ ئەحمەد و کۆمەڵێک لە فەرماندەو سەرکردە

کوردەکان بۆ شاری حللەی ناوەڕاستی عێراق نەفی کران و پاشان بۆ شاری سلێمانی کە ئەو سەردەمە مەڵبەندی سیاسی و شارستانی کوردستانی عێراق بوو.

## شێری بارزان

نێوبانگ ودەسەڵاتی سیاسی و هێزی سوپایی بارزانی لە ساڵی۱۹٤۳دا بەرادەیەک پەرەی سەندو بڵاو بووەوە کە حکومەتی بەغدا قەناعەتی تەواوی هێنا کە مەحاڵە بتوانێ بە هێرشی سوپایی و بەزەبری چەک، کێشەی کورد لە باکوری عێراقدا چارەسەر بکات و ئاگری ئەو بزاڤە چەکداری یەی کە لەوێندەر هەڵایسابوو بتەمرێنێ، ئەو بزاڤەی بووە بە هەوێن و بەشێک لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، بۆیە وەزارەتخانەی عێراقی بە سەرۆکایەتی نوری السعید هەستی کرد ناچارە گفتوگۆ لەگەڵ بارزانی دا بکات، هەر بۆ ئەم مەبەستە وەزیرێکی کورد، بە پلەی وەزیری دەوڵەت دامەزرێنرا کە هەموو ئەرکێکی بریتی بێ لە گفتوگۆ لەگەڵ شۆڕشگێرانی بارزانی دا.

یەکەم سازش کە حکومەتی عێراق لەگەڵ بارزانی دا کردی بریتی بوو لە دان نان بەجۆرە ئیدارەیەکی ناوچەیی لە بارزان داو ڕێگەدان بەخەڵکی بارزان کە چەکی شەخسی خۆیان پێ بێ. بەڵام وەزیرە عێراقی یە ڕەگەزپەرستەکان، هەستیان کرد ئەم کارەی نوری السعید ڕێگە بۆ تەنازولی زیاترو لەبەر داهێنانی پتر بۆ کوردان خۆش دەکات وئەمەش لە ئایندەیەکی نزیکدا دەبێتە مایەی هەرەشەکردن لە یەکێتی ی و یەکپارچەیی خاکی عێراق.. دیارە ویستی ئەم وەزیرانە لە ئەنجامدا سەرکەوت و گفتوگۆیەکە گەیە کوێرە کۆڵان و پاشان بە یەکجارەکی دەستبەرداری بوون، ئەمەش بووە مایەی سەرهەڵدانی حاڵەتی هەڵایسانی شەڕوکوشتار بە درێژایی سنوری ناوچەکە. بەڵام بارزانی، سەرەڕای تێکچون و هەرەس هێنانی پەیوەندی هەردوولا، بەردەوام بوو لەسەر پەیوەندی کردن لەگەڵ دەوڵەتداو توانی لە ئەنجامدا قەناعەت بە دەوڵەت بکات کە ژمارەیەک ئەفسەری سوپای عێراقی بە ئەسڵ و فەسڵ کورد، وەکو ئەفسەرانی پەیوەندی دابمەزرێنێ کە ئەرکیان ئەوەبێ ڕێگەیەکی گونجاو بدۆزنەوە بۆ دەرچون لەو کوێرە کۆڵانەو ئەگەر کرا بۆ چارەسەری هەموو مەسەلەکە بە ڕێگەی ئاشتی.

رائد عزت عبدالعزیز ئامیدی کە موراسلی تایبەتی وەسی بوو، لەگەڵ موقەدەم امین ڕەواندوزی دا، بوونە جێ ی متمانەی بارزانی و عێراق و بەریتانی یەکان کە بەڕێوەبەری ڕاستی حوکمی تازە بوون. ئەو ئەفسەرانە توانیان شێخ ئەحمەد بارزانی کە هێشتا هەر ڕێبەری ڕەسمی عەشیرەتەکەبوو، ئازاد بکەن و لە تاراوگە بیگەڕێننەوە. چەند بارزانی یەکان لە دەوری ئەو ئەفسەرانە ڕازی بوون، بەغدا ئەوەندە لێیان ناڕازی بوو، بەتایبەتی کاتێ کە حکومەت بۆی دەرکەوت کە هەردوو ئەفسەری نێوبراو ئەندامی کۆمەڵەی نهێنی (هیوا) بوون، ئەو کۆمەڵەیەی کە هەڵبژاردەترین کوردی شارەکان و ڕۆشنبیران و ئەفسەرانی کوردی ناو سوپاو پۆلیسی لە ڕیزەکانی خۆیدا ڕێک خستبوو.

لەلایەکی ترەوە، پایەی سوپایی بارزانی، بە حوکمی هێرشە سەرکەوتووەکانی بۆ سەربازخانەو مەخفەری پۆلیس، بەرز بووەوە، لە باری سیاسیشەوە، پایەی تەولو بەرز بووەوە، بەتایبەتی کە عەشیرەتەکانی دی بەرێزەوە ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە بەگەڵی بکەون و گوێ رایەڵی بن.

هەموو ئەمە کردی یە کارێک کە پتر متمانە بەخۆی پەیدا بکات و هەڵوێستی توندتر بنوێنێ و داوای پتر لە دەوڵەت بکات. دیارە دەوڵەت ئەمەی بە زیادەڕۆییەکی زۆر زانی و ئیدی لە حەوسەڵەیدا نەما، بەتایبەتی کاتێ کە بینی ناوچەی پتر دەچنە ڕیزی شۆڕشەوەو گوێ رایەڵی و پشتیوانی خۆیان بۆ بارزانی ڕادەگەیەنن، بۆیە بە مەبەستی تەمبێ کردن هێرشێکی سوپایی بۆ ناوچەکە ڤرێ کردو سەرەتا لە دەشتەکانی دیجلەو فوراتەوەو بە پشتیوانی یەکی چڕی هێزی ئاسمانی بەریتانی یەوە دەستی پێ کرد.

ئەفسەرێکی گەنج بە ناوی عبدالکریم قاسم، فەرماندەیی ئەم هێرشەی دەکرد. بارزانی بۆ یەکەمجار لە ژیانیا خۆی لە بەرانبەر ئەفسەرێکی لێهاتوودا بینی یەوە کە لە چەند نەبەردو مەیدانێک دا بەسەریدا سەربکەوێ و ناچاری بکات پاش هەندێ تەق وتۆق و سوکە شەڕ پاشەکشە بکات.

کاتێ بارزانی بۆی بە دیار کەوت کە چ مەفەرێکی نی یە، بڕیاری دا بەرەو سنوری ئێران پاشەکشە بکات و پاشان لەگەڵ نزیکەی سێ هەزار پێشمەرگەو نۆ هەزار ڕۆڵەی عەشیرەتەکەیدا، پەنا وەبەر ئێران بەرن. هەر کە چوونە خاکی ئێرانەوە، بارزانی پەیوەندی بە هێزی کۆماری مەهابادەوە کرد کە تازە لەوێندەر دامەزرابوو. بارزانی لە خزمەتی کۆماری مەهابادا مایەوە تا ئەو ڕۆژەی هێزو نیروی ئێرانی لە ناوی برد، هەنگێ بارزانی بە خۆو نزیکەی( ٥٠٠ ) سەد کەس لە باشترین یاوەرو جەنگاوەرانی یەوە پەنای وەبەر یەکێتی ی سۆڤیەت برد.

بارزانی، بە خەونیش ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات کە .ئەم ئەفسەرە عێراقی یە گەنجە، عبدالکریم قاسم، ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبێتە هۆی گەڕانەوەی وی لە یەکێتی سۆڤیەت، دوای یازدە ساڵ غەریبی، ئەویش گەڕانەوەی قارەمانێکی سەرکەوتوی ڕێزدارو بایەخ پێدراو.

عبدالکریم قاسم، توانی بە هۆی کودەتایەکی سوپاییەوە کە خۆی ڕێبەرایەتی کرد، لە بەرە بەیانی ١٩٥٨/٧/١٤دا حوکمی پاشایەتی هاشمی بڕوخێنێ و ڕژێمی کۆماری ڕابگەیەنێ. ئەوەبوو بارزانی پاش زنجیرە ڕووداوێکی پڕ لە هیواو بێ هیوایی جارێکی دی بۆ عێراق گەڕایەوە.

پەندێکی کۆنی کوردی هەیە کە ئەم حاڵەتی بێ هیوایی و هیواداری یە بەمەرجێک لە مەرجەکانی گەیشتنە مراد دەزانێ و پەندەکە دەڵێ: "پاش حەوت ساڵان ڕێکردن، پاش

درانی حەوت پێڵاوی ئاسن، پاش گۆڕانی حەوت شتان و ئەنجامدانی حەوت ئەرکان، پاش هەموو ئەمانە ئەوجا دەتوانی بگەیە مرادی خۆ."

## ئەڵمەنی بەشە

ادریس بارزانی، بە دیار گۆڕە کراوەکەوەو لە ڕۆژی٥/٣/١٩٧٩دا هەموو ئەم قۆناغانەی ژیانی بارزانی بۆ ئاپورای ماتەمباران و ماتەمگێران گێڕایەوەو. هەروەها لە خوتبەکەیدا باسی پەرەسەندنەکانی وەزع وحاڵی ناوخۆی عێراقی کرد، پاش ئەوەی عبدالکریم قاسم شۆڕشی.١٩٥٨ی بەرپا کردو پاشان گەڕانەوەی بارزانی و یاوەرەکانی. لە غوربەتی یازدە ساڵە. دیارە زۆربەی ئامادەبووان ئەو ڕووداوانەیان لە بیر مابوو. لە دوو ساڵی یەکەمی پاش ئەم شۆڕشەدا گەلێک هەوڵ درا بۆ وەدی هێنانی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە سەر بناغەی بەرەی نیشتمانی کە نوێنەری هەردوو گەلی عەرەب وکورد لە عێراقدا بگرێتە خۆو هەوڵ بدات ئوتونومی بۆ کوردستانی عێراق بهێنێتە دی.

بەڵام هەموو ئەم هەوڵ و کۆششانە بەفیڕۆ چوون، لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیانەی کە لە مەڕ بەشی ناوچە کوردنشینەکان لە دەرامەتی نەوتی بیرە نەوتەکانی کەرکوک و خانەقین، چێ بوون. لەم ناکۆکی یەدا کوردەکان لەسەر هەق بوون، چونکە ئەم بیرە نەوتانە لە خاکی کورداندا بوون.

ئا بەمجۆرە حاڵەتێکی لە بابەتی شەڕی ئەهلی بە درێژای ساڵانی ١٩٦٠-١٩٧٠ چێ بوو. ئەم حاڵەتە پاش شەڕو کوشتارێکی خوێناوی دژواری ئەوتۆ کە خەریک بوو هەردوولایەنی شەڕەکە لە نێو بەرێ، بە هوودنەیەکی چوار ساڵی کۆتایی هات، کە دەبوایە لەو چوار ساڵەدا بەپێ ی ئەخشەیەکی زەمەندار، داخوازی یەکانی کورد لە بەشە دەرامەتی نەوت بهێنرێتە دی.

کاتێ کوردان، لە ساڵی١٩٧٤دا سەیریان کرد مەحاڵە ئەمجارەش بە مافەکانی خۆیان بگەن، ناچاربوون جارێکی دی دەست بدەنەوە چەک، بەتایبەتی دوای ئەوەی شای ئێران و وەزیری دەرەوەی ئەو ڕۆژگارەی ئەمریکا (د. هنری کیسنجر) گەلێک بەڵێنی چەوریان دا کە هەموو جۆرە کۆمەکێکی کورد دەکەن تا بتوانن ڕووبەڕووی عێراقی یەکان بوەستنەوەو خۆبگرن، بگرە لەمەش هەڵیان بوارد و بەڵێنی کۆمەکێکی وەهایان دا کە بتوانن بە سەرعێراقی یەکاندا سەر بکەون. من هەلم بۆ ڕەخسا بەر لە ساڵ و نیوێک لە هەڵایسانی شەڕەکانی بەهاری ١٩٧٤دا کە بەدژوارترین و سەخت ترین شەڕی مێژووی کورد.دەژمێردرێ، دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ بارزانی دا ساز بدەم. لە شوێنێکی تری ئەم کتێبە دا دێمەوە سەر ئەو دیمانەیەی کە چەند دیمانەیەکی تری بە دوودا هات.

سەفەرکردن بۆ کوردستانی عێراق لەو قۆناغەدا و لە سایەی هودنەی ئاشکرادا کارێکی ئاسان بوو. سوپای ئێران و ساواکی ئێرانی ڕێگەی هەر ڕۆژنامەنوسێکی ڕۆژاوایمان دەدا کە بیەوێ سەری کوردستانی عێراق بدات، لە مەرز ئاودیو ببێ، بە مەرجێ نوسراوی تایبەتی بۆ سەرکردایەتی کورد پێ بوایە، چونکە سەرکردایەتی کورد، بە بێ نوسراوی تایبەتی ڕێیان بە کەس نەدەدا بێتە خاکی عێراقەوە.

هەر کە لە ئوتێلی (تاران هیلتون) لام دا، ئوتێلێک بوو ئەو دەمانە هەموو مەرج و پێوەرێکی ئەوروپایی تێدا بوو، کوردیک هاتە لام و داوای ئەو نوسراوو ڕاسپێریانەی لێکردم کە لە دەزگاکانی دەرێ ی شۆڕشی کوردم هێنا بوو. زۆر بەوردی کەوتە پشکنینی ئەو کاغەزەی کە زۆر بە چاکی بە تیپی ئاوی پێچرابوەوە، پاش ئەوەی دڵنیا بوو لەوەی کە هەموو شتێکم تەواوە. قۆناغەکانی تری سەفەرەکەی بۆ شەرح کردم، تێ ی گەیاندم کە سبەینێ لە فرۆکەخانەی ڕەزاییەی ئازربایجانی نزیکی ناوچە کوردی یەکان پێشوازی دەکرێم. ئیدی لەوێوە دەبرێم بۆ سەر سنوررو لەوێشەوە دەپەڕمەوە و دەگەمە سەرکردایەتی کورد. بەمجۆرە قۆناغەکانی تری سەفەرەکەم بێ چ کۆسپێک بڕی.

(قەڵەو و باریک) کە تیمی نمونەیی پیاوانی ساواک بوون، لە فرۆکەخانەکەدا چاوەنۆڕم بوون. کابرای باریک، کە قاتێکی ئیتالی و کراسێکی حەریری لە بەر بوو، من و وێنەگرەکەی هاوڕێمی لە بازگەی پشکنینەوە، بێ ئەوەی تەفتیش بکرێین ، بەڕێ کرد، بەڵام ئەوەی تریان کە دەتگوت کسایەتی یەکی تاوانبارە و تازە لە فلیمیکی جاسوسی هەڵاتووە، قەڵەوێکی کەتە بوو، ئامادە بوو بۆ جێ بە جێ کردنی هەر داوایەک کە لێ ی بکرێ. جانتاکانی هەڵگرتێن و خستنی یە ناو جیبێکی لاندروفەرەوە کە لە بەردەم فرۆکەخانەکەدا چاوەڕوانی دەکردین. لاندرۆڤەرەکە هیچ ڕەقەمێکی عێراقی یان ئێرانی پێوە نەبوو.

عومەر پیشەوەری، کە لە نزیکی لاندرۆڤەرەکە وەستابوو، یەکەم پێشمەرگە بوو کە چاوم پێ ی کەوت. خۆ ئەگەر جلەکانی نەبوایە وامدەزانی سەربازێکی یەکەیەکی سوپای جەوەلی یە لە (بایرن) یان (شتایەرمارک) یان یەکەیەکی سوپای نەمساکاتلەندی، بە قژە زەردو چاوە شینەکانیا. تۆزێ دیقەتی داین و پرسی: ئەلمانین؟ دوای ئەوەی سەرم بۆ لەقاند گوتی: "ئەڵمانی باشن". جگە لەم دایەلۆگە کورتە، ئیدی ئاشنایەتیمان لە سنوری خێرهاتن و جگەرە بە یەکتردان تێ نەپەڕی. ئەم پێشمەرگەیە، بەلاندرۆڤەرەکەی، بەرێگەیەکی قیرتاودا بردینی کە دوای ماوەیەک بوو بە گڵ. لە پێشدا بە مهابادا و ئەوجا شنۆ و پیرانشاردا تێ پەڕی و بە ڕێگەیەکی باریکی تۆناو تونی شاخاوی ناوەندی دۆڵێکی قوڵ دا بردینی. هێندە بە خێرایی لاندرۆڤەرەکەی داژۆت پیاو هەترەشی دەچوو، ئاوە ناوەش سەیرێکی منی دەکرد، وەکو ئەوەی بیەوەی

بزانێ کە داخو ئەم ئەڵمانی یەی تەنیشتی لەم سەفەرە پڕ مەترسی و ڕێگە تووشە دەترسێت یان نا.

لە چەند بازگەیەکی ئێرانی دا.لاندرۆڤەرەکەیان ڕاگرتین، ئەم بازگانە بە بێ نوسراوو ئیزنی تایبەت ڕێ ی تێ پەڕبوونی ج ئوتومبیلێکیان نەدەدا. ئەو نوسراوەی ئێمەپێمان بوو، لە هەموو بازگەکان دەیخوارد. بازگەیەکی ترمان بڕی و ئەوجا ئوتومبیلەکەمان ڕاوەستا تا دوای سەفەرێکی سێ سەعاتی پشوویەک بدەین.

تاریکی، بەرە بەرە هێرشی بۆ ئەو قەڵا ئێرانی یە دەهێنا کە جێمان هێشتبوو. بینایەکی زۆر گەورە بوو. پێ دەچو بەر لە هەزاران ساڵ رۆنرابێ.کۆمەڵە شاخێکی رووتەنی ڕک و ڕژد دەیڕوانی یە ئەو جادە خاکی یەی بە نێو دۆڵەکەدا تێ دەپەڕی. لە دووری پێنج سەدمەتری ئێمە، جوتیارێکی کورد، بە جوتێک گاجوت، زەوی دەکێلا. بێدەنگی باڵی بە سەر ناوچەکەدا کێشابوو، ئەسرتە، ئەخشپەی پەلکی دەرختان و ئەجریوەی پاساری چۆلەکان دەهات. تەنیا دەنگی مەکینەی ئوتومبیلەکە ئەم بێدەنگی یەی شەق دەکرد. دوای پشویەکی کورت، وەڕێ کەوتینەوە. کە چوینە گەرووی دۆڵەکەوە، عومەر پێچی کردەوە و ڕێگەیەکی لاوەکی گرتەبەر کە بەرەبەرە وپێ بە پێ ی شاخەکەی بەرانبەرمان بەرزو بەرزتر دەبوەوە.

لە پڕ چەند ماڵێکی لەدارو حەسیر دورست کراوی قوڕە پەست کراومان لێ بە دیار کەوتن. دەوروبەری ماڵەکان لە سەرەتاوە چۆڵ و هۆڵ بوون و بەنی بەشەری لێ دیار نەبوو. کە چی لە پڕێکاو پاش ئەوەی ئیشارەتێکی بچوک لە ئوتومبیلەکەی ئێمەوە درا، ئەو ناوچە کپ.و خامۆشە گۆڕاو بوو بە پورە هەنگێکی چالاک.

پاش یەک دەقیقە رەتلێکی سێ ریزی کە نزیکەی ٣٠ پێشمەرگە دەبوو، لەبەر دەمماندا قوت بۆوە و بە حەرەکەیەکی سوپایی خێرا تفەنگەکانیان خستنە سەر شان و ئەوجا دایان نایەوە سەر زەوی. ئەوجا عومەر ئەمرێکی سوپایی پێکردن و بوون بە دوو گرویەوە. گروپێکیان بە خێراییەکی سەر سوڕهێنەرکەوتنە هەڵوەشاندنەوەو لێکدانەوەی تۆپێکی رەشاشی ناوەنجی. گروپی دووەمیش کەوتنە هەڵوەشاندنەوە و لێکدانەوەی تۆپێکی دژەتانک.

هەر چەندم کرد، بزانم مەبەست لەم نمایشە سوپاییە چی بوو، بێهودە بوو. کاتێ عومەر بەشانازی یەوە سەیری کردین و پرسی: "باشە؟ بە دڵتان بوو؟" ئەوجا لە مەسەلەکە حاڵی بووم. تومەز میوانەکانیان "ئێمە" لە ئەڵمانیاوە هاتوون و ئەڵمان هەمیشە سەربازی چاک بوون،تا ئابەم جۆرە حوکم لە سەر توانای زەبت و رەبتی پێشمەرگە بدەین و هەڵی بسەنگێنین. لە راستیدا نمایشە سوپاییەکە زۆر چاک بوو، بۆیە وەڵاممان دایەوە: "بەڵی باشە".

بارزانی، بەخۆی یەکێک بووە لەوانەی کە ئەڵمانی خۆش ویستووەو بە چاوی رێزەوە سەیری کردوون. من لە سەر چاوەی باوەڕ پێکراوەوە بۆم دەرکەوت کە مەسەلەکە تەنیا بەوەندەوە نەوەستاوە کە کورد، بە تایبەتی نەوە کۆنەکان، کوردو ئەڵمانیان بە خزم و هاونەژاد زانیوە و هەردوو میللەتیان بە هندو- ئەڵمانی زانیوە، بگرە بارزانی سوور بووە لە سەر ئەوەی بە گوێزانی ئەڵمانی ردێنی بتراشێت.

## گەشتێک بۆ نێو پیاوانی ئازا

بە تاریکی گەیشتینە حاجی ئومەران، گەیشتینە ئەو بارەگا سەرەکی یەی کە دیمانە رۆژنامەوانی یەکەمان تێدا لەگەڵ بارزانیدا کرد، ئەم شوێنە لە سالآنی ئاشتی دا خۆشترین هاوینە هەوار بوو بە لای خەڵکی دەوڵەمەندو پایە داری بەغداوە، و دەکرا راوە پڵنگ و گورگی تێدا بکرێ .بەلآم دە سالێک بوو، بوو بوو بە پاش بارەگای گەرۆکی سەرکردایەتی کورد.

دیمەن و رواڵەتی بارزانی، رێک لە دیمەن و رواڵەتی ئەو کوردانە دەچوو کە کارل مای لە رۆمانە بە نێو بانگەکەیدا (گەشتێک لە کوردستانی کێوی) دا، وەسفی کرد بوون..نوسخەیەکی خاکی لە جلی نەتەوەیی، کراسێکی دەڵبی کورت، شەرواڵێکی فش و فۆڵ، پشتێنێکی قوماشی رەنگاو رەنگ کە بارزانی خەنجەرەکەی پێدا کردبوو، دارجگەرەیەکی درێژ، جامانەیەکی سور، دیمەنی بارزانی جگە لەمانە، جورئەت و زیرەکی دەنواند.

هەر چەندە ژەنەراڵ هەندێ کورتە بالآ بوو، بەلآم کەسایەتی یەکی بە هێزو کارێگەری هەبوو، لە یەکەم چاوپێکەوتن دا ئەمەم بۆ بە دیار کەوت. چاوە ڕەشەکانی کە پرشنگیان دەدا، هەموو سوچێکی ژوورەکەی بەوردی دەپشکنی. لۆچە قوڵەکانی دەموچاوی سام و تام و هەیبەتێکی پرجورئەتیان پێ دەبەخشی. بە درێژایی دانیشتنەکەمان، ئەم سام وتام وهەیبەتە لە سیمای ئەرەوی یەوەو باڵی بە سەر دانیشتنەکەدا کێشا. ئەو وێنەیەی لەم دانیشتنەدا، دەربارەی بارزانی لە لام دروست بوو، وێنەیەک بوو گوزارشتی لەجوامێری یەکی جەنگاوەری سەر کێشی چارەنوس ئاڵوزو دژواری رۆمانسی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی کە ژیانی بارزانی زۆر دوور بوو لە هەموو رۆمانسییەتێکەوە.

هەر چەندە بارزانی، لە مندالی وگەنجیدا سادەترین پلەکانی خوێندن وفێر بوونی لە سەر دەستی مەلاکانی گوندی خۆیان تەواو کرد بوو، کە ئەو مەلایانە بە خۆیان نیمچە خوێندەوار بوون، ئەوجاش توانا و بەهرەیەکی یەکجار گەورەی هەبوو لە موناقەشە کردندا، زۆر بە جوانی بابەتە جۆراو جۆرەکانی پێکەوە گرێ دەدان ، تیشکی دەخستە

سەر جەوهەرو ناوەڕۆکی بابەتی دیاریکراو. جگە لە بلیمەتی ی سوپایی، شارەزاییەکی تەواوی لە پێداویستی یەکانی مناوەری سیاسیدا هەبوو لە پێناوی دۆزی کوردا. بە حوکمی ژیانی ئاڵوزو پڕ دەربەدەری فێری زمانی فارسی و عەرەبی و روسی بوو بوو. سەرەڕای ئەوەی متمانەیەکی زۆری بە خۆی هەبوو، و بەخۆی دەنازی، دیارە ڕۆژانی تەمەنی درێژو و دەستکەوتە زۆرەکانی هەقیانەتی ئەم سیفەتانەیان دەسەلماند. ئەوجاش زۆر بە وردی سنوری خوی دەناسی و دەزانی.

زۆر بە وریایی گوێ ی لەبەرانبەرەکەی دەگرت، بە تایبەتی ئەگەر باسەکەی لەمەڕ بابەتێک بوایە ئەو شارەزایی لێ نەبوایە یان پێشتر نەی بیستبوایە. هەروەها پرسیاری لە میوانە ئەوروپاییەکانی، دەربارەی هەندێ بابەتی دوری تایبەت بە ئاسۆی دورتر لە واقیعی کوردستان و ناوچەکە دەکرد. هەرگیز لە زانیاری تێر نەدەبوو، هەر ئەمەش هانی دەدا دەرفەتی هاتنی ئەو جۆرە میوانانە لە دەست نەدات و زانیاری تازەیان لێ وەربگرێ و بیخاتە سەر زانیاری یە بەرفرەو هەمە لایەنەکانی خۆی.

یەکەم دیدارم لەگەڵ بارزانی دا شەش مانگێک بەر لە دەست پێکردنەوەی شەڕی ساڵی ١٩٧٤ بوو. کەش و هەوای گشتی بە ئاشکرا ئەوەی دەردەخست کە شەڕ دەبێتەوە. مەفرەزەکانی رەشاشی برێنی ئینگلیزی و دۆشکای روسی، شەو و رۆژ لە سەنگەرەکانی خۆدا بوون و سازو تەیار بوون بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی زەمینی یان ئینزالی ئاسمانی لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە.

لەم دیدارەدا بۆم دەرکەوت کە بارزانی چەند تینوی زانیاری و شارەزا بوونە. زیاد لە جارێک رووگیر وشەرمەزاری ئەوە بووم کە نەمدەتوانی وەکو پێویست وەلامی پرسیارەکانی لەمەڕ هەندی بابەت کە لە راستیدا کاری خەڵکی تایبەتی و پسپۆڕ بوون، بدەمەوە. چونکە دەمزانی زۆری حەز لە بابەتی فەلەکی یە، بۆیە تەلسکوپێکی ئاسمانی دوا مۆدێلی کۆمپانیای (زایس)م بە دیاری بۆ هێنا بوو.

من حەزم دەکرد راستەوخۆ لەگەڵ بارزانی دا بکەومە باسی ئەو بابەتە سیاسی و سوپاییانەی کە خۆمم بۆ ئامادە کردبوون، بەلام ئەو سەرگەرمی تەلسکۆپەکە بوو، بۆیە ناچار بووم بۆ وەلامی ئەو پرسیارانەی بگەڕێم کە دەربارەی مەودای دیتن و توانای گەورە کردنەوەی تیشکۆ و لایەنەکانی تری تەلسکۆپەکە، دەیکردن.

هەروەها حەزی دەکرد رای من دەربارەی ململانێ و ڕکابەری کۆمپانیا ئەڵمانی و کۆمپانیا یابانی یەکانی تەلسکۆپ سازی بزانێ و ئاخۆ کاردانەوەی ئابوری ئەڵمانی لەو روەوە چ دەبێت. ئاخۆ ئەوحیمایە گومرکی یەی کە ئەڵمانیا دایناوە کافی یە بۆ پاراستنی بەرهەمەکانی لەو مونافسەدی کە لە ئەنجامی هێنانی کەلوپەلی هەرزانەوە چێ

دەبێت. لەگەڵ زۆر پرسیاری دیدا کە ناچار بووم بکەومە موناقەشەکردنی، بەڵام کە خۆم لەگەڵ تەرجومانە کوردی یەکەدا بەراورد دەکرد، زۆرم کەیف بە خۆم دەهات، چونکە حاڵی من زۆر لەو باشتر بوو.

ئەو پیاوە قانونی دەولی لە زانستگەی هارڤەردی ئەمریکی خوێند بوو، رێک لەم بارودوخەدا کە شەڕ بەردەرکەی بەکوردان گرتبوو، و هەرساتێ هەڵگیرسابا، هەڵدەگیرسا، لەبەر پێویستی کورد بەخەڵکانی وەکو ئەو، پەیوەندی بە شۆڕشی کوردەوە کرد بوو. ئەم بەلەنگازە هەرگیز باوەڕی نەدەکرد ناچار بێ ئەم بابەتە زانستیانەی کە لە بنەرەتدا کاری ئەو نەبوون و خۆیشی بۆ ئامادە نەکردبوو، بەو شێوە کوت و پڕە کەوتنە ناو موناقەشەکەی من و بارزانی یەوە، تەرجەمە بکات.

شتێکی دیم لە بارزانی بینی کە زۆرم بە دڵ بوو، ئەویش ئەوە بووکە لەرادە بەدەر قەدری ئەو کوردە خاوەن پلە زانستی و خوێندەوارانەی دەگرت، هەمیشە لە رێزی پێشەوەی دادەنان و لە شۆڕشدا پلەو پایەی دەدانێ. (دانا شمیث) رۆژنامە نوسی (ئەمریکی)ش هەستی بەمە کردووە و لە کتێبی (گەشتێک بۆ ناو پیاوانی ئازا) ئاماژەی بۆ کردووە.

## کلاشنکۆف وەکو نیشانەیەکی پلەی شەخسی

هەر لەبەرئەم هۆیە بوو، زۆر جار ئەو قوتابییانەی دەیانویست پەیوەندی بەریزەکانی شۆڕشەوە بکەن، روو بەرووی کەسانێک دەبوونەوە کە پێیان دەوتن بارزانی وای بە چاک دەزانێ کە بگەڕێنەوە بۆ قوتابخانەکان و خوێندن تەواو بکەن تا لە دوا رۆژدا وکاتێ سەربەخۆیی وەردەگرین، خزمەتی زیاتری گەلی کورد بکەن. وام بۆ رێکەوت ژمارەیەک لەو قوتابیانە بدینم، کە لە لایەکەوە شانازییان بەوە دەکرد کە بارزانی ئەوەندە قەدری زانست و فێر بوونی لایە، و لە لایەکی دی یەوە دڵیان بەوەوە نەبوو بەردەوام بن لە سەر خوێندن و خوێندیان پێ چاکتر بێ لە پێشمەرگایەتی.

لە ئاخرو ئوخری هاوینی ١٩٧٤ و پاش ئەوەی جارێکی دی شەڕ لە کوردستان هەڵایسایەوە، سەرکردایەتی کورد (طارق. ن)یان وەکو تەرجومان بەگەڵ خستم، تا بە درێژایی مانەوەم لە کوردستاندا یاوەریم بکات. طارق، هێشتا ٢٤ساڵی پڕ نەکردبوەوە. دوومانگ بوو لە ئەمستردام هاتبووەوە، لەوێ ئەندازەی کارەبایی خوێند بوو، و خۆی ئامادە دەکرد کە لەقەبی ئەندازیاری کارەبایی وەربگرێ.

طارق، جگە لە زمانی ئینگلیزی، زمانی هۆڵەندیشی دەزانی، کە خۆشبەختانە منیش بابی ئەوەم دەزانی کە کاروباری خۆمی پێ رایی بکەم. ئەم کوڕە کلاشینکوفێکی تازی وەرگرتبوو، هەڵبەتە ئەم تفەنگە وەکو نیشانەی پایەیەکی تایبەتی، مایەی شانازی و سەر بەرزی خاوەنەکەی بوو.

سواری لاندرۆڤەر بووین، بەرێگەی هاملتون دا بردینی. ئەم رێگەیە بە ناوی ئەو ئەندازیارە نیوزیلاندی یەوە نێونرا بوو کە لە سی یەکانی ئەم سەدەیەدا سەر پەرشتی کردنەوەی کرد بوو. لاندرۆڤەرەکە بەو رێگەیەدا (هاملتون) بەرەو رۆژ هەلاتی بردین. روباری رەواندوزی بە گێژەن و پر شەپۆل، شان بە شانی جادەکە نشێو دەبوەوە. کە لاندرۆڤەرەکە چووە نێو دۆلە قۆلەکەی ئەم بەرو ئەو بەری جادەکەوە، لە پر راوەستا. نزیکەی ۳۰ خێوەتی سپی گەورەو ریزە خێوەتێکی تایبەت بە کۆر وکۆبونەوەم بەر چاوکەوت.

چەندین کۆمەلە لاو بەریز دانیشتبون و گوێیان لە ماموستاکانیان دەگرت. ئەم دیمەنە ئاشتی یەو ئەو کەش و هەوا شەراوی یە کوجا مەرحەبا. بە تایبەتی کە هێزی ئاسمانی عێراق، هەر جولەیەکیان لە دۆلەکەدا بەدی بکردایە، بێ سێ و دوو بە موشەک وبۆمبا دای دەبێژا. بەلام ئەم سەرسامی یەم زۆری نەخایاند، تومەز ئێرانی یەکان تۆرێکی موشەکی (هەنتەر- هوک)ی دژە فرۆکەیان لە سنوری ئێران و عێراقداو لە دووری چەند کیلۆمەتری ئێرەوە داناوە. دیارە ئەم موشەک و رۆکێتە کاریگەرانە پێشتر چەند فرۆکەیەکی سیخوی و (توپولیف)ی عراقیيان کە ویستبویان لە سنوری دەولی نزیک بینەوە، خستبووە خوارێ. بۆیە لەو ساوە فرۆکەوانە عێراقیەکان بە سەر ئەم ناوچەیەی خاکی کوردستاندا نەدەفرین.

طارق، لە لاندرۆڤەرەکە دابەزی. بە کلاشنکۆفەکەی و هەر بە ئاسمانەوە بازنەیەکی کێشا کە هەموو خێوەتەکانی گرتەوە: "لەوێدا دەتوانی ئەو قوتابیانە بدینی کە ناچار کراون مەسەلە بیرکاری یەکان بخوێنن، یان رێزمان و دەستوری زمانی عەرەبی و کوردی بخوێنن، پاش ئەوەی ژەنەرالێ قاییل نەبوو بێن بە پێشمەرگە."

پاشان لە دانیشتنێکی چا خواردنەوەدا، لە بەرپرسی زانستگەکەم زانی کە خۆی و دەستەی ماموستایان و هەموو قوتابی یەکانی زانستگەی سلێمانی ناچار بوون لە بەهاردا لەتاو زەبرو زەنگی حوکمرانانی بەغدا هەلێن و پەیوەندی بە شۆرشی کوردەوە بکەن. "نەخێر هەلنەهاتین" بەرپرسەکە بەو جۆرە رستەکەی خۆی راست کردەوەو لە سەری رۆیی: "ئیدی زانستگەمان گواستەوە بۆ ناوچە رزگار کراوەکان. دوای ئەوەی شەر بە سەرکەوتنی ئێمە کۆتایی دێت، جارێکی دی زانستگە، کە تاقەدەزگای فێر بوونی بالایە لە کوردستاندا، بۆ سلێمانی دەگوازینەوە. بەمەش کارێکی وەهامان کردووە کە سالێک لە کیسی قوتابی یە لاوەکامان نەچێت".

وا دیارە بەر پرسی زانستگەکە ئەو ساکە نەیدەزانی چ چارەنوسێک چاوەنۆری خۆی و قوتابی یەکانیتی. شۆرش بە چ کارەساتێک کۆتایی دێت: ئەوە بوو نسکۆکە، پاش کەمتر لە سالێک لەو قسانەمان، بەرۆکی کوردی گرت و ئەو ناوچە ئازادەی کە کورد بەرێوەیان دەبرد، نەما. قوتابی یەکان خۆیان لە بەردەم گێژاوی شکست و گێژەنگی

هەرەس دا بینی یەوە کە چۆن بیرەحمانە لێکدی دادەبڕین و دەی پلیشاندنەوە، دیارە ئەمە دابی شکستە لەگەڵ تێک شکاواندا.

## سامی رەحمان و رێگای عیراقی تایبەتی

بەدەم رێ ورەسمی ناشتنی تەرمی مەلامستەفا بارزانی یەوە، لەو رۆژەی بەهاری ساڵی ١٩٧٩دا، هەموو ئەم بیرەوەریانەم لە لا وروژان و زیندوو بوونەوە. بە ئاشکرا ئەوەم بۆ بە دیارکەوت کە جەماوەری ماتەم گێران و ماتەمباران، تەنیا دوا نیگای جەنازەی سەرکردەی کۆچکردوو ناکەن، بەڵکو مالاوایی لە گرینگترین کەسایەتی سیاسی وعەسکەری کورد بە درێژایی مێژوو لەوەتای سەلاحەدینی ئەیوبی یەوە دەکەن. ئەم مالاوایيە لە لایەکی ترەوە، وەکو رووداوەکانی دواتریش سەلماندیان، مالاوایی بوو لەو فیکرەی کە بارزانی گەلاڵە و بەرجەستەی کردو بۆ ماوەیەکی کورتیش پیادەی کرد، مالاوایی بوو لە فیکرەی یەکخستن و رزگار کردنی کوردستان.

بارزانی بە درێژایی تەمەنی هەوڵی داوە هاوسەنگی و تەبایی لە نێوان رێچکە و رێبازە سیاسی و فیکری یە جیاوازەکانی ناو بزاڤی رزگاریخوازی کوردی دا، دروست بکات. کە ئەمە بۆ خۆی تەجرەبەیەکە و ئەمڕۆکە و لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بە تاقیکردنەوەیەکی دژوار دا دەڕوا:

هاو ئاهەنگی لە نێوان (چەپ) و (ڕاست)، لە نێوان سوسیالستان و فیودالەکان، لە نێوان توندڕەواتی خوازیاری دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی یەکگرتووی گەورەو سیاسەتوانانی واقیع بینانی قایل بە ئوتونومی لە چوارچێوەی حکومەتەکانی عێراق وتورکیاو ئێران. زۆر چاک دیاربوو کە ئەم گونجان و هاوسەنگی و هاوئاهەنگی یەی نێوان ئەم هەموو رێبازانە، وێڕای هەموو هەوڵە چڕوپڕەکان بۆ پاراستنی، لەبەردەم گۆڕە هێشتا دانەپۆشراوەکەی بارزانی دا دەلەرزی و بەلادا دەهات.

هەرچەندە کوڕەکەی بارزانی، لە خوتبەکەیداو ڕوو لە جەماوەری ماتەمگێر گوتی: "ناکۆکی لاوەکی وەلا بنێن و ڕیزەکانتان یەک بخەن لە پێناوی وەدیهێنانی ئامانجی هاوبەشماندا". بەڵام بە ئاشکرا دیاربوو کە ئەو یەکڕیزی یەی بارزانی بە هەوڵی فەرهادانە وەدی هێنابوو، ڕوو لە داڕوخان و هەڵوەشاندنەوەی بەرە بەرەیە. هیچ شتێک ئەم هەموو رێبازە ناکۆک و جیاوازە کوردییانەی یەک نەدەخست تەنیا دروشمی (ئازادی بۆ کوردستان) نەبێ. ئاشکرایشە تەفرەقەو دووبەرەکی نێوخۆی کوردان، شتێکی باوەو لە کۆنەوە کورد بەوە ناسراوە کە: "عەشایەرە کوردەکان ناتوانن لە نێوخۆیاندا یەک بگرن، چونکە هەر یەکەیان دەیەوێ ئەویتر دوای بکەوێ و کەسیان گوێ ڕایەڵی کەسیان نابن".

هەڵبەتە کوردی عێراق، یەکەم کەسن کە تالاوی ئەم دووبەرەکی یەیان چەشت، هەرچەندە حزبەکەی بارزانی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە دوای بارزانیش لە

مەیدانی سیاسیدا مایەوەو هەردوو کورەکەی ادریس (لە سالی١٩٨٧دا مرد)و (مەسعود) ڕێبەرایەتیان لە ئەستۆ گرت، و حالی حازر مەسعود بارزانی سەرکردایەتی حیزب دەکات، بەلام (یەکێتی ی نیشتمانی کوردستانی) هەڤرک کە جەلال تالەبانی ڕێبەرایەتی دەکات و دەورێکی زۆر دیاری لە هەولەکانی ئانەوەی تەفرەقەو دوبەرەکی یەکانی ئەم دواییەدا بینی و داوای شۆرشێکی عێراقی هاوبەشی دەکرد کە عەرەب و کورد پێکەوە بیگێڕن، توانی لایەنگرانێکی زۆر بۆخۆی پەیدا بکات. تەنانەت خودی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە دوو بەرەکی ئەخەلەسی و لە سالانی١٩٧٩و١٩٨٠دا بوو بە دوو بەشەوە.

لە کاتێکدا ادریس بارزانی بریاری دا کە سووکە پەیوەندییەک لە گەل ئێران دا بهێلێتەوەو وەزع و حال و چارەنوسی سەدان هەزار کوردی پەنابەری ئێران ڕەچاو بکرێ. (سامی عبدالرحمن)ی سکرتێری حیزب ئەم بابەتە هەلوێستەی بەگەشەکردنێکی خەتەری ئەم ڕێگە عێراقی یە تایبەتە دەزانی.

رحمن، کە ئەندازیارو یەکێک بوو لەو (٥) وەزیرە کوردەی وەزارەتخانەی عێراقی سالانی ١٩٧٠-١٩٧٤، بەیەکێک لەسەرە زیرەکەکانی کورد دەژمێردرێ. ئەو وای دەبینی کە هاوکاری هەموو کورد لە سنورەکانەوە لە هەر مەسەلەیەکی دی گرینگترەو زۆر ئاساییە پێشمەرگەی کوردستانی عێراق بەشداری ئەو شەڕانە بکەن کە کوردی ئێران دژی هێزی ئێران و پاسدارانی شۆرشی ئیسلامی دەیانکرد.

لە دیانەیەکی ڕۆژنامەوانی دا، کە ڕۆژنامەنوسی ئەمساوی (فرتس ستە) لە سالی١٩٧٩دا لەگەلی کردی، رحمن بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە: "چاودێرانی دوور لە کوردستان، زەحمەتە لە وەزعی ئێمە تێ بگەن، هەروەها گەلێک لە کوردەکانیش لەوە حالی نەبوون کە چ شتێک کوردی ئێرانی هاندا پەناوبەر چەک بەرن بۆ وەدەست هێنانی خودموختاری، لە کاتێکدا، دەشیا، وەکو ئەوانە پێیان وایە، ئوتونومی یەکی لە بابەتی ئەوەی کوردانی عێراق لە ڕێگەی گفتوگۆ دایەلۆگ لەگەل ڕژێمی خومەینی دا بە دەست بێ، بێ ئەوەی پێویست بەشەڕ هەبێ. بەلام کوردەکان بە خۆیانش ڕێک نین لە نێوخۆیاندا لەسەر چۆنیەتی و هۆی ئەو پرسیار کردنەو وەلام دانەوەشی، چونکە ئەم بابەتە لق و پۆپ بۆ زۆر مەسەلەی گرینگی دی دەهاوێژێ".

زۆرگرووپی سیاسی کوردی ئاکۆک و ئاتەبا دەستیان بەسەر ئەو ڕێبازەداگرت کە داوای خودموختاری بۆ کوردستانی ئێران دەکرد، بەلام دەورو جلەوی سەرۆکایەتی دیار، بەدەست دوو ڕێبازو دوو کەسایەتی ئاکۆکەوە بوو: ئەو سەرکردە کوردەی گەورەترین جەماوەری بە دەورەوە بوو، بەتایبەتی لە نێو ئەو گوردانەدا کە چالاکی یەکی سیاسی ئەوتۆیان نەبوو، ئەم سەرکردەیە، ئاین پەروەرو سیاسەتوانی کورد (عزالدین حسەینی) تەمەن شەست سالە بوو.

هەندێ لە شارەزاو پسپۆرانی مەسەلە کوردی یەکان. لە سالی ١٩٨٠دا جەماوەری ئەو پیاوەیان بە ٦٠-٧٠٪ی کورد دەقەبلاند. (حوسەینی) کوڕە جوتیارێکی ناوچەی (بانە)ی نزیکی سنوری عێراق بوو. کاتی خۆی ئەندامێکی چالاکی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) بوو کە پاشان بوو بە (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، لە سەردەمی کۆماری مهابادا.

لە پەنجاکاندا لایەنگری سەرۆک وەزیرانی ئێرانی (دکتور مصدق)ی کۆماری خوازو دوژمنی سەر سەختی شا بوو: لە سەرەتای شەستەکاندا بوو بە سەرۆکی هەموو کوردی سوننە وئیمامی مزگەوتی مهاباد، کە هەر لەوێندەردا، دوای روخانی رژێمی شا، بە سەرۆکی وەفدێ کورد و یەکە نوێنەری کوردی ئیران هەڵبژێردرا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ناوەندی دا لە تاران.

## ئەو پارتیزانەی، چێشتچی تایبەتی خۆی هەیە

دکتۆر (عبدالرحمن قاسملو)، کە لە سالی ١٩٨٠ بە دواوە پایەی میللی زیادی کرد و خەریک بوو شان لە شانی (حوسەینی) بدات و ببێ بە گەورەترین هەفرکی ئەوپیاوە، یەکێک بوو لەو بەشدارانەی کە (حوسەینی)یان بە نوێنەری کوردیی ئێران هەڵبژارد. بەلام هەر زوو لەم پەیمانە پاشگەز بووەوە و پای دایەوە. بە پێچەوانەی (حوسەینی)یەوە کە بە جلی ئاینی و مەدەنی یەوە دەردەکەوت، (قاسملو)ی پەنجا سالە، سور بوو لە سەر ئەوەی بە جلی سوپایی گورج و کۆڵەوە دەربکەوێ وجلی خاکی و جامانەی کوردی لەبەر دەکردو دەمانچەی هەڵدەگرت.

(قاسملو)، خەلکی ناوچەکانی دەوروبەری شاری (رەزاییە) بوو، لە گەنجی دا ئەندامێکی چالاکی بزاڤی رزگاری کورد بوو. بەلام بە پێچەوانەی (حوسەینی) یەوە، چونکە بە سیاسەتی کۆمۆنیستی گۆش کرا بوو، هیچ بەلایەوە گرینگ نەبوو رەخنە لەو شێواز و ئامانجانە بگرێ کە حیزبە کۆمۆنیستە هاوچەرخەکان پەیرەوییان دەکردو لە سەری دەرۆییشتن. هەروەها چونکە ئەندامی حیزبی (توده) بوو، ئەوحیزبەی لە سالی ١٩٨٣ بەدواوە لە ئێراندا قەدەغە کرا، هەر کە خوێندنی ئامادەیی تەواو کرد، لە سەر حیسابی حیزب و لە چیکوسلوفاکیادا زەمالەیەکی وەرگرت و ئابوری-سیاسی لە وێندەر خوێند.

(قاسملو)، لە کۆتایی پەنجاکاندا بۆ ئێران گەرایەوە، لەوێ گیراو بۆ ماوەی دوو سالان حوکم درا، کە حوکمەکەی تەواو کرد، جارێکی دی بۆ (پراگ) گەرایەوە و لە زانستگەیەکی ئەوێ دا درێژەی بە خوێندن داو پاشان کورسییەکی مامۆستایەتی وە دەست هێنا تا دەرسی ئابوری- سیاسی بلێتەوە. لەم ماوەیەدا هاو سۆزی و پشتیوانی خۆی بۆ ئەو رێبازە ریفورمیستی یە دەربری کە (دوبچیک) لە سەری دەرۆیی، ئەوە

بوو وەکو نارەزایی دەربارەی تەدەخولی سۆڤیەتی سالی ١٩٦٨ لە کاروباری چێکوسلوفاکیا، ئەو وولاتەی بە جێ هێشت.

لە بەغدا بە گەرمی پێشوازی لە قاسملو کرا، وەکو چون ئەم جۆرە پێشوازی یە لە هەموو سەرکردە کوردەکانی ئێران دەکرا، هۆی ئەمەش ئەوە بوو کە عێراق دژی رژێمی شای ئەو رۆژگار و وەختە بوو. هەروەها رێزی زۆری گیراو بە فەرمانبەر لە وەزارەتی نەخشەو پلانی عیراقیدا دامەزرا. لەم سەروبەندەدا بە رەسمی لە حیزبی (تودە) کشایەوە و پەیوەندی بە (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)ەوە کرد.

لە سالی ١٩٧٣ دا و لە کۆنگرەیەکی نهێنی دا کە لە (بەغدا) بەسترا، بوو بە سکرتێری گشتی (حیزبی دیوکراتی کوردستانی ئێران). پاش ئەوەی قەناعەتی تەواوی هێنا کە مەحالە هیچ چالاکی یەکی سیاسی بە قازانجی دۆزی کورد، دژی رژێمی شا ئەنجام بدرێ، جارێکی دی و لە سالی ١٩٧٦ دا رووی کردەوە ئەوروپا و لە (سۆربون) دا کورسییەکی مامۆستایەتی وەدەست هێنا بۆ گوتنەوەی وانەی ئەدەبیات و زمانی کوردی. لە دوا رۆژەکانی حوکمی شا دا، لە (پاریس)ەوە چوو بۆ ئێران و بەشداری یەکی چالاکانەی لە شۆڕشی (خومەینی) دا کرد. رۆژنامەنوسێکی سویسری شارەزا لە کاروباری کوردان، لە گوتارێکی دا لە رۆژنامەی (نویە تسوریخە تساتیونگ)دا وای وەسف کردوە کە لە جوملەی شۆڕشگێرە جەنتلمانەکانی کوردی ئیرانە، پێشمەرگەیەکە دیمەن و روالەتێکی جیهانی هەیە.

(قاسملو)، بە حوکمی ئەوەی حەوت زمانی بە رەوانی دەزانی، لە بار بوو بە هۆی پەروەردە زانستی یە بالاکەیەوە بیێ بە روویەکی دیاری دۆزی کورد و بتوانێ دۆزی کورد بخاتە بەردەم سیاسەتوانان و رۆژنامەنوسانی بێگانە، ئەمە جگە لەوەی پیاوێکی خۆش مەشرەب بوو، و توانایەکی سەیری هەبوو لە چۆنیەتی نزیک بوونەوە لە میوانەکانی و وەدەست هێنانی سۆزو خۆشەویستییان. ئەم پیاوە رێ ی بە خۆی دەدا، لە بنکەی پێشمەرگەکاندا چێشتچی تایبەتی خۆی هەبێ. بە کورتی، لە هەر سەرکردەیەکی کوردی هاوچەرخی دی لە بارتر بوو کە دەوری رێوی بە فێل و فەندو زیرەک بدینێ. (قاسملو)، لە بنەماکانی گەمەی سیاسیدا وەستا بووە، وەکو چۆن بارزانی لە پێش ئەودا وابوو.

(قاسملو)، زۆر چاکی دەزانی کە چۆن پەیوەندی یەکانی خۆی لەگەل عیراقا بەکار دێنێ، هەرچەندە نکۆلی لەوە دەکرد کە پەیوەندی نهێنی لە نێوان ئەوو یەکێتی ی سۆڤیەتدا هەبێ، بەلام ئەم پەیوەندی یە بەلای چاودێرانەوە مەسەلەیەک بوو کە گومان لە بوونی نەدەکرا. خۆ ئەگەر یەکێک باسی پەیوەندی یەکانی دەرەوەی لەگەلدا بکردایە، زۆر بە هێمنی وەلامی دەدایەوەو دەیگوت:

"گەلی کورد، کە دوا گەلی خاوەن شارستانیەتی رەسەن و کۆنەو تا ئێستا دەوڵەتی تایبەتی خۆی نی یە، ناتوانێ لە سایەی ئەم بارودۆخەدا کە ئێستا پێیدا دەڕوات، ئازاد بێ لە هەڵبژاردنی ئەو لایەنەدا کە یارمەتی و کۆمەکی لێ وەردەگری. (بارزانی) لەسەرەتادا یارمەتی لە (ستالین) وەرگرت، ئەوجا لەلایەن سەرۆکی ئەمریکی (نیکسون) و وەزیری دەرەوەی ئەمریکی (کیسنجر)ەوە یارمەتی درا.

هەروەها (ماوتسی تونگ)، ئەگەر هاوپەیمانی لەگەڵ (چان-کای-شیک) دا ئەکردباو کۆمەکی ئەمریکی وەرنەگرتبا نەیدەتوانی شەڕی نێوخۆ بە قازانجی خۆی یەک لایی بکاتەوە. خۆ ئەگەر یارمەتی یەکانی (بەریتانیا)ی سەرمایەداری، فریای (تیتۆ)ی کۆمۆنیست نەکەوتبا، (تیتۆ) لە دووەم جەنگی جیهاندا نەدەچووە خانەی سەرکەوتووانەوە. تەنانەت (لینین) بە خۆی، ئەو کۆمەکەی ڕەتز نەکرد کە ئەنجومەنی ئەرکانی تزاری ئەڵمانی (فیلهیلم)، پێشکەشی کرد.

لەلایەکی ترەوە پەندێکی ئەورووپی هەیە دەڵێ: "ئەوەی لەگەڵ ئەهریمەندا نان بخوات پێویستی بە مراگی درێژە". (بارزانی)، بۆ وێنە، متمانەی تەواوی بە ئەمریکی یەکان کرد، ئەوەبوو لە ساڵی١٩٧٥دا شۆڕشەکەی هەرەسی هێنا. بەڵام بە یارمەتیت، با مەبەستەکەمت بۆ دووپات بکەمەوە: ئێمە بەرانبەر بە گەلی کورد هەست بە مەسئولیەت دەکەین، ئێمە جگە لە سەربەخۆیی بۆ ١٥ ملیۆن کوردی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بە چ شتێکی دی قایل نابین، و بۆ وەدی هاتنی ئەم ئامانجە هەر کۆمەک و هەر ڕێگەیەکی سەرکەوتوو و لە بار، بەڕای ئێمە کۆمەکێکی پەسەندەو ڕێگەیەکی ڕەوایە".

# فەسڵی سێیەم

*"ئەگەر کورد یەک بن، کەس بەسەریاندا سەرناکەوێ"*

**ڕیشەو مێژووی گەلی کوردو باری سەرنجی گەشتیارانی نێودار**

"... چەند ڕۆژێکە خۆم لە وەزع وحاڵێکی وروژاوی ئەوتۆدا دەبینم کە پێشتر خۆم بەو حاڵە نەدیتوە. پێم وانی یە چ شوێنێکی ئەم دنیایە بە ئەندازەی ئەم ناوچەیەی کە لەم ساتەدا نەسیبەکەم پێ ی پێدا دەنێ مەتەڵ ئامێزو پرسیار وروژێن بێ. ناوچەیەکە دژمنایەتی نەتەوەیی و خێلایەتی و تۆڵەو خوێن کردنەوە تیایدا باوەو پۆل پۆل ڕوح لە سۆنگەی ئەم حاڵەوە هەڵوەریون".

مرۆڤ دەیتوانی لە ئەڵمانیاداو بەر لە سەد ساڵان ئەم دەستەواژەو ڕستانە لەڕۆمانێک دا بخوێنێتەوە کە گۆڤاری (گەنجینەی ناو ماڵی ئەڵمانی) بەزنجیرە بڵاوی دەکردەوە. قارەمانی ڕۆمانەکە، کە نوسەرەکەی ناوی نابوو (قەرە بن نەمسی) باسی ئەو سەرکێشیانە دەگێڕێتەوە کە لە گەڵیاندا ژیاوەو ئەو ڕوداوانە دەگێڕێتەوە کە لە گەشتی نێوان شاری (موسڵ) وشاری هەرە دێرینی کورد، شاری (ئامێدی) دا بەسەری هاتوون. ئەم ڕۆمانە پڕ لەسەرکێشی و کەش وهەوا ڕۆمانسی یە عینوانێکی سەرنج ڕاکێشی هەبوو (گەشتێک بە کوردستانی کێوی)دا، پاشان لە شێوەی کتێب دا هاتە چاپ و بڵاوکردنەوەو لە ماوەی چەند نەوەیەک دا ملیۆنان خوێنەر، بەسەریدا دابارین. ئەم ڕۆمانە لە نوسینی (کارل مای)ە کە لە ڕاستیدا بەچاکترین نوسەری میللی ئەڵمانی دێتە ژمارتن.

"...لەسەردانی پێشەوای کوردی بادینان گەڕاینەوە"، کارل مای بەو ڕستەیە دەستی بە چیرۆکەکەی کردوەو لەسەری دەڕوات: "لە ڕێگەی گەڕانەوەماندا، کە گەیینە لوتکەی چیاو، لە ژێرمانەوە دۆڵی شەیتان پەرستانمان لێ بەدیارکەوت، لەنزیکی ماڵی عەلی بای کۆمەڵێک لێ وپۆیی درەختانمان بینی، چەند ئیزیدی یەک خەریکی ئەوەبوون لێ وپۆیی زیاتری باوێنەسەر". بەم ڕستانە، نووسەر جەماوەری خوێنەرانی دەگوازێتەوە بۆ دنیای پاشایانی تەماحکاری چاوچنۆک و ئەو بەدووە عەرەبانەی کە متمانەیان پێ ناکرێ، هەروەها ئەو کوردانەی هێشتا لەوپەڕی ساکاری دا دەژین و هەروەها ژنانی بێ عەباو پەچەی یەکجار جوان.

ئەوەی ئەم کتێبەی کارل مای لە گەشتنامەکانی تری جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە زۆر سەرکەوتوانەو بە شێوەیەکی سوارو ڕەوان و زۆر نزیک لەواقیعەوە وەسفی تەواوەتی شاران و ڕووداو و کەسایەتی و گوندەکانی کردووە . هەروەها کە هاتۆتە سەر وەسفی سروشت و وولات بە جۆرێ وەسفی کروون، مروڤ سەد سوێند و قورحانان دەخوات کە

ئەم نوسەرە بە خۆی لە ناوجەرگە و کرۆکی هەموو ئەم روداوو سەرکێشانەدا ژیاوە و بە خۆی یەکە بەیەکەیانی جەرباندووە. زۆر گەریدە و تۆیژەرەوەی زانستی ئەوروپایی بە ستایشەوە ئاماژەیان بۆ ئەم وردی یە سەیرو واقیعی یەی ناو کتێبەکەی کارل مای کردووە.

مێژوونوس و مامۆستای زانستگەی ئەلمانی (نێگون فون ئایگشتید) لە ساڵی ۱۹۶۱ دا لەم بارەیەوە نوسیویەتی: "لەراستیدا رای گشتی ئەوروپی چ شتێک لە مەر کورد نازانێ تەنیا ئەوەندە نەبێ کە گوایە کۆمەڵێک چەتەو رێگران و سەر چاوەی نێگەرانی و ئاژاوە وکیشەن بۆ حکومەتەکانی تورکیا و ئێران. بێگومان رۆمانە بە نێوبانگەکانی (کارل مای) دەورێکی زۆر گەورەی دیتوە لەوەی ئەم وێنەیەی کورد لە لای خەڵکی ئاسایی ئەوروپا دروست بکات. بەڵام ئێمە ناچارین، لە لایەکی ترەوە، دان بەو حەقیقەتەدا بنەین کە: ئەوەی خەڵکانی دی لەمەر کوردیان نوسیوە، لەوەی کارل مای باشتر نی یە. ئەوەی شایانی باسە، ئەو (کارل مای)ەی کە سەردانی کوردستانی نەکردووە، لە رۆمانە خەیاڵی یەکەیدا کۆمەڵێک زانیاری و وەسفی زۆر وردی لە مەر کورد و کوردستانی نیشتمانی کوردان پێشکەش کردوە، یەکجار باشترە لە نوسینی زۆر لەوانەی کە سەردانی کوردستانیان کردوەو لە نزیکەوە کوردیان دیتوە و ئاشنای بوون".

## ئایا نوسەری فرمیەرهەم راستی گوتوە؟

بۆ دووپات کردنەوەی ئەم تێبینی یە، لێرەدا ئەم وەسفە دەنوسینەوە کە کارل مای لە وەسفی شاری (ئامێدی) دا وەکو چۆن لە ساڵی ۱۸۸۵دا هەبووە، نوسیویەتی: "ئەم دۆڵە لە هەردوو لاوە شاخی گڵێن دەوری داوە. ئەم شاخانە پرن لە شەق و جۆگەلە و هەموو دەرژێنە ناو (زێ)وە. ئەم رەوەز و قەدپاڵانە یەکپارچە دار بەرون. بەروبومی ئەم دارستانانە دەرامەتێکی چاک بۆ خەڵکی ناوچەکە پێک دێنێ، چ لە رێگەی فرۆشتنەوە یان گۆرینەوەی بەکەل و پەل وکاڵای دی. لەو دەشتەی پەنای دۆڵەکەدا چەندگوندێکی خالیدی یەکانم بینی کە روخابوون یان بە جێ هێڵرابوون یان نیمچە چۆڵ بوون بە هۆی راکردنی خەڵکەکانیانەوەو رووکردنە چیایان لە ترسی گوشاری هێرشی ئیسلامی یان لە ترسی پەلامارو راورووتی کوردەکان".

ئەگەر ئەو دوا سەرنجانەی لەمەر کوردە مەسیحی یەکان ببوێرین، کە پەیمانیان لەگەڵ کوردە موسوڵمانەکاندا بەست و لە باری سیاسییەوە لەگەڵیاندا یەکیان گرت بە هۆی ئەو چەوساندنەوەیەوە کە لە سەردەستی رژێمی بەعسی بەغدا چەشتبویان، ئەوا ئەم وەسفە وردەی ناوچەکە رێک پر بە پێستی واقیع و سروشتی جوگرافی ناوچەکەیە. من بە خۆم، لە سەفەرەکەم دا بۆ ئەو ناوچەیە،پاش نەوەد ساڵ دوای ئەو نوسینەی (کارل مای)، دروستی و وردی ئەو وەسفەم بە چاوی خۆم بینی.

(کارل مای) لەم کتێبەیدا پەلی بۆ مەسەلەیەکی دی کوتاوە کە لە نێو کوردا باو بووە، ئەویش ئەوە بووە کە هاوینان گوندوماڵیان بە جێ هێشتوە و رویان کردۆتە ئەو هاوینە هەوارانەی کە لە بەرزایی چیاکاندا دروستیان کردووە. لەم روەوە دەڵێ: "کە وەناو شار کەوتین، هەستم کرد نیمچە چۆڵە، زۆرگەڕاین تا لە ئەنجامدا قاوەخانەیەکمان لە ناوەندی بازێری کش ومات و بێ جم و جوڵدا دەست کەوت و شتێکمان وەچنگ کەوت و تینوێتی خۆمان پێ ی شکاند. هەر چەندە شار کەوتۆتە سەر هەڵەموتێکی بەرزی ناوەندی دەشتێکی نێوان دوو زنجیرە چیاوە، بەڵام کەش و هەوای شار لە باری تەندروستی یەوە ناخۆش بوو، هاتنی وەرزی هاوین، خۆی لە خۆیدا بانگەوازی بڵاوبونەوەی لەرزوتا بوو لە نێو خەڵکیدا. بۆیە زۆربەیان روودەکەنە چڕەدارستانەکانی چیاکانی دەوروبەری شارو لەوێندەر کەپر دروست دەکەن.

جا بۆ ئەوەی رادەی دروستی ئەم دوا تێبینی یەی (کارل مای) و بایەخە زانستی یەکەیان بۆ بەدیار بکەوێ، لێرەدا ئەنجامی ئەو لێکۆلینەوە زانستی یە دەخەینە روو کە زانای جوگرافیناس (ڤۆلف دیتر هیتروث)ی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٥٩دا دەربارەی کوردی (یال یال) ئەنجامی داوە. ئەم زانایە حەقیقەتێکی کەشف کردووە کە بریتی یە لەوەی کە ئابوری ئەو ناوچەیەی لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر ئەنجام داوە، لە ئابوری ناوچەی (ئالم) دەچێت، هەروەها ماڵاتداریان لە جۆری ماڵاتداری وڵاتانی ئەورویای ناڤین و ناوچەکانی چیای (ئەلپ) دەچێت.

هەروەها زانای نێو براو تێبینی ئەوەشی کردوە کە (یال یال)ەکان لە پاڵ ژیانی کۆچەریدا، ژیانێکی کشتوکاڵی سەقامگیریشیان هەیە. ئەمەش جۆرێکە لە جۆرەکانی ئابوری تێکەڵ کە جوتیارەکان لە وەرزەکانی بەهارو و هاوین و پایزدا گوندەکانیان بە جێ دێڵن و روو دەکەنە مێرگ و لەوەڕگەکانی زۆزان و لەوێندەر یان خێوەت هەڵدەدەن یان کەپروساپات چێدەکەن و لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا سەرقاڵی ماڵات لەوەڕاندن وکۆکردنەوەی بەروبومی حەیوانات دەبن. هەروەها لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە چوار لە سەر پێنجی جوتیار و وەرزێرانی کوردی ئەو ناوچەیەی لێکۆلینەوەکەی تێدا ئەنجام دراوە، هاوینان گوندەکانی خۆیان بە جێ دەهێڵن و رودەکەنە زۆزان و لەوێندەر لە ژێر کەپرو ساباتاندا دەژین یان خێوەت هەڵدەدەن و بە درێژایی وەرزی هاوێن لەوێندەر دەمێننەوە.

لە کۆتایی قسەکانمان، دەربارەی کارل مای، واچاکە نمونەیەکی دی لە کتێبەکەی بخەینە بەر چاو: "بۆنی خوێن وگوندی سوتاو لە دۆڵەکانی کوردستانەوە بەرز دەبێتەوە و دەگاتە ئاسمان. ژیانی مرۆڤی ئەم وڵاتە و ئازادی و سەر و سامانی هەمیشەو بەردەوام لە ژێر هەڕەشەدایە، کە ئەمە بە دەگمەن لە شوێنێکی تری سەر زەمین دا هەیە و دەبینرێ".

نا بەم جۆرە دەبینین کە (کارل مای) جلەو بۆ قارەمانی رۆمانەکەی (قەرەبن نەمسی) شل دەکات، تا بەریەرچی قسەو تێبینی یەکانی ئەو گەریدە ئینگلیزە بداتەوە کە گوتویەتی کوردستان سەرزەمین و خاکێکی ئاوەدان و گەشە کردووە. رەنگە تێبینی ئەو گەریدە ئینگلیزە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست راست بووبێ.

بەلام شۆرشە بەردەوامەکانی کورد لە سەدەی بیستەمدا و ئەو هەموو هێرش و پەلامارانەی کە سوپای تورکیا و عێراق و ئێران بە بەردەوامی کردویانەتە سەر کوردستان و تا رۆژگاری ئەمرۆکەش هەر بەردەوامە، هەموو ئەو تێبینییانەی دوایی (کارل مای) وەبیر دێنێتەوەو دەنگدانەوەیەکی تاڵ و بەسودی پێ بەخشیوە،بەلام لە لایەکی دی یەوە دەنگدانەوەیەکی واقیعی و هاوچەرخە.

نێو بانگی (کارل مای) هەر لە سنوری ئەڵمانیا نەوەستاو بەڵکو بەرادەیەک بلاو بووەوە کە گەیبیە دوورترین شوێنی خودی کوردستانیش. (طارق ئاکرەیی)ی رۆژنامەنوس، لە حەفتاکاندا بۆی باسکردم: "ئەوەی بەلامانەوە سەیرە، ئەوەیە کە ئەڵمانەکان بەشداری یەکی چالاکانەیان لە ناساندنی کورد و لێکۆڵینەوە لە سەر کورد کردووە، کەچی ئینگلیز سەرەرای ئەوەی ئەزمونێکی زۆریان لەمەر رۆژهەلات هەیە، ئەمەیان نەکردووە" ئەوجا لێی پرسیم: "ئەرێ راستە نووسەرێکی ئەڵمانی ناودار، بەر لە سەد ساڵێک کتێبێکی دەربارەی کورد نووسیوە؟".

## ئەو گەلەی، تەنانەت لە نوسینەوەی مێژوەکەشیدا فەرامۆش کراوە

ئەو زانیاری یەی ئێستا لە مەر کوردستان و کورد و ریشەو مێژووی کورد هەمانە لە کەموکوری بەدەرنی یە. تا ئێستاش کۆمەڵێک پرسیار هەن کە باس و لێکۆڵینەوە زانستی یەکان وەلامیان بۆ نەدۆزیوەتەوە. زانای ئەڵمانی (ئایکشتید) کە پسپۆری لێکولینەوە لە گەلانە، لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئەو حەقیقەتە زانستی و گرینگانەی لەمەر کورد سەلماون و ساغ بوونەتەوە، تا رۆژگاری ئەمرۆ لە نێو چەند کەسێکی کەمی پسپۆردا قەتیس ماوە و زوربەی ئەم حەقیقەت و زانیاریانە نەگەیوونەتە خوێنەری ئاسایی و خوێنەرانی ئاسایی ئاگایان لێ نی یە".

سوڵتانی رەوشت بەرزو نەجیب، وەکو دوژمنە (سەلیبی) یەکانی وەسفیان دەکرد، (سەلاحەدینی ئەیوبی) کە سوڵتانی (شام) بوو، (سەلاحەدین کوری یوسف کوری ئەیوب) لە ساڵی ۱۱۹۳ دا مردوەو دامەزرێنەری میرنشینی (ئەیوبی یە) بووە لە ناوچەی (میسر)و (سوریا)ی ئێستادا، بۆ وێنە کورد بوو".

هەروەها زانای جوگرافیاناسی عەرەبی (الادریسی، ۱۱۰۰-۱۱٦٦) کە لە بارەگای (روجەرز) شای پاشای (سەقلی یە)دا خزمەتی کردووە، کورد بووە. هەروەها میرنشینێکی کوردی لە نێوان ساڵانی ۱۸۳۷و ۱۸٤۹دا لە دەوروبەری (بەدلیس)ی

باشوری دەریاچەی (وان) دا هەبووە. ئەمە جگە لە چەندین میرنشینی دی کەلە سەدەکانی ناوەراست دا لە باشوری (عەنەدۆل) دا دامەزران.

هەروەها گەلێک وەزیر و سولتان و تەنانەت ژمارەیەک لە ئەندامانی کۆمەلەی (تورکیای لاو) هەر کورد بوونە. بەلام کە ناوەندێکی بەرین، زانیاریان، یان زانیاری پێویستیان لەمەڕ کورد نی یە، رێگەی ئەوەمان لێناگرێ ئەو راستی یە بلێین کە گەلی کورد یەکێکە لە کۆنترین گەلانی نیشتەجێ ی ناوچەی رۆژ هەلاتی ناڤین. بە زمانی تایبەتی خۆ دەدوێن. گەلێکە لە قوناغە سەرەتاکانی مێژوودا دەوری زۆر گرینگی دیتوە، ئەگەرچی ئەم دەورە زۆر جاران بە ناوی ترەوە بووە.

لە نێو کوردانیدا، سولتانانی مەزنیش هەلکەوتوون، وەکو سولتان (کەریم خانی زەندی) سەر بە عەشیرەتی (ئەردەلانی) کوردی کە لە سالانی ۱۷٦۰-۱۷٦۹دا حوکمرانی ئێرانی گرتە دەست. کەچی مێژوونوسان، کە ئەو قۆناغەی مێژوی ئێرانیان گێراوەتەوە، ژبیریان کردوە کە ئاماژە بۆ ئەوە بکەن کە کورد بووە.

هەروەها زانای روسی ی پاریس نشین، (باسیل نیکیتین)ی پسپۆر و شارەزا لە کاروباری کوردا گەیبوەتە هەمان ئەنجامگیری و لە سالی ۱۹۲۰دا نوسیویەتی کە: "مێژوو، کوردی ژ بیر کردووە. بەراستی کورد گەلێکن تەنانەت لە کاتی نوسینەوەی مێژووەکەشیاندا، فرامۆش کراون".

سەرچاوەی زانیاری ئەورویی لە مەڕ کورد بۆ ماوەی چەند سەدەیەک بریتی بووە لەو ئاماژە کورتەی کە لە سالی ۱۷۵۱ و لە (ئەنسکلوپیدیای فەرنسی)دا لە مەڕ کورد هاتووە و تۆمار کراوە و دەلێ کە کورد: "گەلێکی رەوەندی کۆچەرین، زەوی و زاریان لە نزیکی ئاشوری و خالدی یەکانەوە هەیە. گوێ رایەل و مل کەچی هیچ دەسەلاتێک نین و زۆر جار نشینگەی خۆیان دەگۆڕن".

هەروەها ئەنسکلوپیدیای (دایەلوگ)ی ئەلمانیش کە لە سالی۱۸۳۸دا و لە بلاوەخانەی (بروکهاوس)ەوە بلاو کراوەتەوە، لە مەڕ کورد لەوە زیاتری نەنوسیوە کە "کوردستان ناوچەیەکی شاخاوی یە لە ئاسیا. بەشێکی لە ژێر دەسەلاتی تورکیایەو بەشەکەی تری لە ژێر دەسەلاتی ئێران دایە، کوردستان ئەو ناوچەیەی نێوان دەریاچەی (وان) لە باشوری رۆژهەلاتەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە وولاتی کوردستانی ئێران. ناوچەیەکی شاخاوی بە دێژایی سال بەفرگرتوو بە پانی و درێژی ناوچەکەی گرتۆتەوە و گەلێک دۆل و نیهالی بە پیت و بەرەکەت کەوتونەتە بنارو نێوان چیاکانەوە. کورد، لە سەردەمانی زۆر کۆنەوە لەم ناوچەیەدا دەژین، ئەمانە گەلێکی رەوەندی مالات بە خێوکەرن، خەلکێکی موسولمانن و زۆر سیفەتی چاکیان هەیە. هەر چەندە کورد قەومێکی پاشکەوتون، بەلام جەنگاوەری سەر سەخت و ئازادیخوازن".

شەڕەکانی تورک و دژمنایەتی عوسمانیان لەگەڵ ئەوروپادا تا سەدەی نۆزدە کردی یە کارێک کە لێکۆڵەرەوە وگەڕیدە وگەشتیارانی ئەوروپا نەتوانن زانیاری خۆیان لەمەڕ کوردو کوردستان دەوڵەمەند بکەن.

بۆ وێنە، پزیشکی هوڵاندی (ئەلڤێرت دابر) کە لە ساڵی ١٦٨٢ داو لە (نورمبرگ) دا کتێبێکی بە ناوی (دەوڵەتی مەزنی مەغول، ئێران، جورجیا، و مینگریلیا) بڵاو کردۆتەوە، لەم کتێبەدا بەکورتی ئاماژەی بۆ کورد کردوەو زانیاری یەکانیشی کۆنن و هەموو ئاماژەکەشی لە چەند دێڕێک تێنەپەڕیوە بەم ئاوایەی نوسیوە: "کوردستان، خاکێکە کەوتۆتە نێوان چیاکانی (میدیا) و (سوسیانا)وە. خەڵکی کورد زۆر سەر سەخت و پڕ ئاژاوەن". هەر چەندە (دابر) سەری کوردستانی نەداوە، کەچی شتێکی سەیری نوسیوەو مایەی سەرنجە، ئەویش ئەوەیە کە: "کورد نەک هەر نەبونەتە مایەی هەڕەشە لە حکومەتی تورکیا، بەڵکو لە ئایندەشا نابنە مایەی هەڕەشە".

## کارستێن نیبور، لەبنی کولەکەی دەدات

دەشێت ئەو هەوڵەی کە (کارستێن نیبور) ی ڕازیات زان و جوگرافیاناس، دوای سەدەیەک لەو مێژوەوە داویەتی، بە یەکەمین هەوڵی سەرکەوتوو بژمێردرێ لە بواری ناسینی ڕەگ و ریشەو ئەسڵ و بنەچەی کوردا. ئەم زانا ئەڵمانییە لە ساڵی ١٧٣٣دا لە شاری (هانۆڤەر) لە دایک بووە. لە (گوێتنگن) دا خوێندویەتی. پاشان بە پلەی مولازم ئەندازیار چووەتە سوپای دانیمارکی یەوە. لە سەر داوای حکومەتی دانیمارکی و بە مەبەستی هەندێ کەشفکاری، گەشتێکی دورگەی عەرەب و ئێران و وڵاتە دراوسێکانی کردوە کە لە ساڵی ١٧٦١ تا ١٧٦٧ی خایاندوە. هەر چەند لەم سەفەرەی دا بەتەنێ نەبووە، بەڵام لە نێو ئەندامانی شاندەکەدا هەر ئەو گەیشتەوە ئەوروپا، چونکە هەموو یاوەرەکانی لە بیابانەکانی دورگەی عەرەب و شاخە سەختەکانی ئێراندا مردن.

ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە نێوان ساڵانی ١٧٧٤ و ١٧٧٨دا لە (کوپنهاگن) و بە ناونیشانی (باری سەرنجی گەشتێک بۆ دورگەی عەرەب و وڵاتانی تری دراوسێ) بڵاوی کردنەوە، تا ئەمڕۆی بایەخی زانستی خۆیان پاراستوە بە سەرچاوە و ژێدەری کلاسیکی بە نرخ دێنە ژمارتن لە مەیدانی زانستی ڕۆژهەڵاتناسیدا.

هەندێ باری سەرنجی دەربڕیوە،کە نیشانەی زیرەکین، بە تایبەتی مەسەلەی پێشبینی کردنی ڕوخانی حەتمی و مسۆگەری ئیمپراتۆریەتی پیرو پەککەوتەی عوسمانی و ئاماژە کردنی بۆ دەردو ئازاری کورد بە دەست ئەوانەوە.

تا ئەمڕۆ بە چاوی ڕێزەوە دەڕوانرێتە ئەو باری سەرنج و ئەنجامگیری یە دروستانەی لەمەڕ بە ناوحوکمی عوسمانی لاواز لە دۆڵی دوو ڕوباردا. نوسیویەتی و دەڵێ:

"(یەنکشاری)ەکان لە ناو دیوار و شوراکانی (موسڵ) و (دهۆک) دا خاوەن دەسەڵاتن، بەڵام لە دەرێ ی شاردا حوکم بە دەستی کورد و عەرەبە".

هەروەها بارودۆخی تایبەتی کوردستان و دژواری کۆنترۆڵ کردنی کوردستانی بە تەواوی دیاری کردووە دەڵێ: "عەشایەری ئەم ناوچە شاخاوی یە ئیعتراف بە هیچ حاکمێکی تورک ناکەن و تەنیا مل کەچ و گوێ رایەڵی سەرانی خۆیانن و بە حوکمڕانی راستەقینەیان دەزانن". هەروەها ئاماژەی بۆ خێرایی گۆڕانی دەسەڵات لە کوردستاندا کردوە: "حوکم و دەسەڵات بۆماوەیەکی زۆر لە دەستی یەک خێزاندا نامێنێتەوە. مەرگی یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکە، دەبێتە سەرەتای کێشەیەکی دوو قۆڵی لە سەر دەسەڵات و ئێدی ئەنجامی کێشەکە دەری دەخات کە کێ لە ئایندەدا دەبێتە سەرۆکی عەشیرەت". هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە خوێنداری و تۆڵە سەندنەوە سەرەتایەکی زۆر باوە لە سەرانسەری ناوچەکەدا.

## نۆینەرانی (کۆمپانیای ئەوتی هندی رۆژ هەڵات)

ئەو کتێبانەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا بە زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی دەر چوون، یەکەمین کتێبن کە دەشێت بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی کورد، پشتیان پێ ببەسترێ، چونکە حەقیقەت و زانیاری زۆریان لە مەڕ وڵاتی کورد تێدایە کە تا ئەو کاتە بریتی بوون لە کۆمەڵێک زانیاری ئەفسانە ئامێز.

نۆینەرانی کومپانیای (ئەوتی هندی رۆژهەڵات)، یەکەم کەس بوون کە ئەم ئەرکەیان دەستێ گرتووە. چونکە ئەرکییان تەنیا ئەوە نەبووە کە کەشفی جوگرافی رێگەی زەمینی بۆ هندو باشوری رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بکەن. بەڵکو راسپێردرابوون کە لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل لە مەڕ گەلانی نیشتە جێ ی هەردوو رەخی ئەم رێگە زەمینی یە ئەنجام بدەن. لە میسرو تورکیاوە بیگرە تا دەگاتە ئەفغانستان. دیارە ئەم گەلانە لە جارێک پتر سەرنج و خولیا و کەڵکەڵەی بەریتانیاکانیان بە لای خۆدا راکێشاوە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا یەکێک بوو لە کۆڵەکەکانی سیاسەتی بەریتانیا لەم ناوچەیەدا.

یەکێک لەو نوێنەرانە، هەموو خوویەکی دایە کوردستان، کە لەوسەروبەندەدا نەناسراو بوو، ئەویش (جیمس کلاودیوس ریچ) بوو کە لە دایک بووی فەرەنساو پەروەردەی ئینگلترا بوو. ئەم (ریچ)ە کە لە بیست زمان حاڵی دەبوو، و بە زۆربەیان دەدوا، لەوانە: فارسی و عەرەبی و تورکی، ئەم (ریچ)ە توانی شوێنەوارێکی دیار لە هزرو بیری رۆژهەڵاتیان دا دوورست بکات، بە تایبەتی کاتێ کە چەند کارێکی ئەنجام دا، نیشانەی ئازایەتی و بوێرییان پێوە دیار بوو، یەکێک لەو کارانەی دزە کردن بوو بۆ سوریا و فەلەستین و دورگەی عەرەب بە جلی موسوڵمانانەوە کە گوایە دەیەوێ بچێتە

حەجی بۆ مەکە و ئەوجا زیارەتی مزگەوتی دیمەشق بکات، ئەو مزگەوتەی کە (سولتان صلاح الدین) رۆی نابوو. هەموو ئەم کارانەی کردیانە کارێک کە سۆز و خۆشەویستی پتر بۆ خۆی وەدەست بێنی.

(ریچ) سەرپەرشتیاری نوێنەرانی کومپانیا بوو لە کونسولخانەی بەریتانی لە بەغدا. وازی لەم کارە هێنا. تا بتوانێ لە سالی ۱۸۲۰ دا گەشتێک بۆ کوردستان بکات. لەم گەشتەیدا سەردانی هەموو ئەو ناوچانەی کرد کە ئەمڕۆکە لە ژێر دەستی عێراق و تورکیا و ئێران دان.

ئەمە ئەو گەشتە بوو کە چەند گەشتێکی تری بەدوودا هات. ماوەیەکی زۆر لە کوردستاندا و لە نێو کوردان مایەوە و دەڵێ: "کورد باشترین خەڵکانێکن کە لە رۆژهەلاتدا دیومن". بە هەر حاڵ بەرەنجامی گەشتەکەی لە کتێبێک دا تۆمار کردوە کە ژنەکەی پاش مەرگی ئەو لە سالی ۱۸۳٦دا بە نێوی (کاتێ لە کوردستان بووم، چیم بینی) بلاوی کردەوە.

(ریچ) بەم کارە بەشداریەکی گەورەی کرد لە ناساندنی کوردستان بەرای گشتی ی ئەوروپی، کە تا ئەو دەمە بە لایانەوە ناشنا نەبوو. (ریچ) توانی لە رێگەی دۆستایەتی بتەوی لەگەڵ (محمد پاشا) و (ئوسمان بەگ) دا لە شاری سلێمانی، بچێتە بنج و بناوانی زۆر بابەتی مێژوو، ژیانی ئابوری و راو بۆ چونی سیاسی یەوە کە زۆری مەبەست بوون. هەروەها ئاماژەی بۆ کێشەو ناکۆکی بەردەوامی نێوان کورد و دەسەلاتی عوسمانلی کردوەو قەناعەتی وا بووە کە "نەبوونی ئەمن و ئاسایش لە راستیدا نیشانەو هۆی وێرانی وولاتە". هەروەها ئاماژەی بۆ دووبەرەکی و ناکۆکی بەردەوامی نێو خۆی کوردەکانیش کردوە.

(ریچ) لە سەرنجێکی دا لە مەڕ قسەیەکی عوسمان بەگ دەربارەی تورکەکان کە بوغز لەزگ و زۆردارن، مرۆڤ تا بەتوندی بەگژ یاندا نەچێتەوە ولەگەڵیاندا بە زەبر نەبێ لە شەڕیان ناخەلەسێت، ریچ لەم بارەیەوە دەڵێ: "هەست دەکەم هەندێ حەقیقەت لەم باری سەرنج و بۆ چونەدا هەیە".

وەکو زۆر گەڕیدەی دی کە پاش (ریچ) سەردانی کوردستانیان کردووە کتێبەکەی بەسوپاس و ئەوازش و رێزی زۆر بۆ هەردوو خانە خۆییەکەی دوایی هێنا: "لەو ماوەیەدا کە لە کوردستان مامەوە. توانیم چەندین دۆست پەیدا بکەم و دۆستایەتیەکی زۆر بەریا بکەم، ناستێکی زۆر بەرزی پاکی و راستگۆیی و ئەمەکداری و میوان پەروەریم بینی کە دەترسم لە هیچ شوێنێکی دی دا لە زەیارەتی دووردرێژی حەجم دا ئەی بینم. بیرەوەری یە جوانەکانم لە مەڕ ئەو وولاتە تا من بێنم لە بیر ناکەم".

## دۆزەرەوەی نەینەوا، دۆستی کورد بوو

چەند سالێک پاش بلاو بوونەوەی کتێبەکەی (ریچ) کتێبێکی تازە لە مەڕ کورد. لە لایەن (ئوستن هنری لایارد) لە دایک بووی فەرەنساو پەروەردەی بەریتانیاوە بلاو بووەوە. ئەم پیاوە خوێندنی بالای لە ئیتالیا و ئینگلترا تەواوکردووە. بەمەش (لایارد) ئەو ئەزمون و تەجرەبانەی تۆمارکرد کە لە سەردانە زۆرو زەبەندەکانیا بۆ کوردستان، چ وەکو خۆی وچ وەکو نوێنەری کومپانیای نەوتی رۆژهەلات، وەدەستی هێنا بوون. بەمەش گەورەترین کەشفی ئارکولوژی ئەو سەردەمەی بۆ خۆی مسۆگەر کرد. پێ ی وا بوو شوێنی پایتەختی کۆنی ئاشوری یەکان، شاری (نەینەوا)ی ناوچە شاخاوی یەکانی نزیکی موسلە. یەکەمجار بە کۆمەکی پارەی کنسۆلی بەریتانیا و پاشان بە کۆمەکی پارەی موزەخانەی بەریتانیا لە لەندەن، لە سالی ۱۸٤۰دا کەوتە تەنقیب وگەڕان، لە راستیدا شوێنەواری (نەینەوا)ی دۆزی یەوە. بەمەش لە شەوو رۆژێکدا بوو بە ناودارترین زانای ئارکۆلۆژی سەردەمی خۆی.

(لایارد) لە پال پرۆسەکانی پشکنینەوە، بەمەبەستی گەشتوو گوزار و تەبدیل هەواو خۆدزینەوە لە گەرمای هاوین، گەشتێکی شناسایی بۆ ناوچە شاخاوییەکانی (زاب) دەست پێکرد، بۆ وەی لێکۆلینەوە لەمەڕ ئەو تیرە کوردانە ئەنجام بدات کە لەو دەڤەرە نیشتە جێ بوون. ئەوە بوو باری سەرنج و تێبینی یەکانی خۆی دەربارەی ئەو پشکنینە نەسەری وگەشتو گەڕانەکانی خۆی و ئەو روداوانەی لەم سەفەرەدا هاتبونەرێ ی، لە دوو توێ ی کتێبێک دا تۆمار کردو لە سالی ۱۸٤۹ دا بەناوی (نەینەواو شۆینەوارەکانی) بلاوی کردەوە.

لە سالی ۱۸٥٤دا تەرجەمەی هەمان کتێب لە (لایبزگ) و بە ناونیشانی (گەڕان لە نەینەوا) بلاو کرایەوە. ئەم کتێبە تا ئەمڕۆش بایەخی خۆی لە دەست نەداوە و بە بەردەوامی چاپ دەکرێتەوە. نووسەر لە پال باسی گەڕان و پشکنینە گرینگەکانی خۆیدا، لایەنێکی گەورەی ئەم کتێبەی بۆ باسی کورد و کوردستان تەرخان کردووە.

بەراورد کردنی سەرنجەکانی ئەوسای لایارد دەربارەی کورد وشێوازی ژیانیان، لەگەل بارودۆخی ئەمرۆی کوردا ئەوە دەردەخات کە گۆڕانێکی زۆرکەم بە سەر ناوچەکە و شێوازی ژیانی کوردا هاتووە. بۆ وێنە لە وەسفی چیای (تجاری) دا دەلێ: "دۆلەکان چرە دارستانن، تاوری هەمە جۆر، بە بەرزی یەوە گیرساونەتەوە لە تۆ وایە بە گەردنی بەرزی ناوەڕۆی روباری (کۆمر)ەوە هەلواسراون. روباری نێوبراو بەم دۆلە تەنگەدا دەڕژێ. ئەم کۆمەلە شاخە سەختە لە ناوەندی هەلدێرەکەدا رێیان بە رێبوار دەگرت، ئەو رێگەیەی بەقەدپالەکەدا دەرژیی و دەیروانی یە روبارەکە". هەروەها گەڕیدەی بەریتانیش. سەرنجی ئەو نەریتەی داوە کە کورد تا رۆژگاری ئەمڕۆ لە سەری دەرۆن، ئەویش ئەوەیە کوردان لە هاویندا دەچنە زۆزان و گوندەکانیان بە جێ دێلن.

لەم رووەوە نوسیویەتی کە بە چاوی خۆی دیتویەتی "چەندین گوندی بناری چیاکان چۆڵ بوون و خەڵکەکەی چونەتە چیاو لە زۆزاندا کەپری هاوینەیان بۆ خۆ دروست کردوە. تا وەرزی هاوین لە وێندەر بە سەر بەرن". لە ساڵی ١٨٤٥ دا دوای سەفەرێکی نارەحەت بە سواری قاتر دەگاتە گوندی (خالونی) کە چۆڵ دەبێت و بەمجورە وەسفی دەکات: "خانوە لە بەرد دروستکراوەکان چۆڵ بوون. شاخی حەیوانە کێوی بە سەر دەرگاکانیانەوە بوو، باخی رەزو مێو دەوری گوندەکەی دابوو. خەڵکی گوند، کەپریان لە رەخی ئەو روبارە دروست کرد بوو کە بە نزیکی گوندەکەدا رەت دەبوو".

(لایارد)، هێندە بەوردی وەسفی ناوچەکە و سروشتی جوگرافی و جۆری ژیانی ئەو دەڤەرەی کردوە کە سەرنجی چەندین خوێنەری ئەوروپای راکێشاوە. تەنانەت (هانزهاوزر) ی نوسەری ئەڵمانی پێ ی وایە (کارل مای) زانیارییەکانی خۆی لە مەڕ ئەم ناوچەیە و خەڵکی ئەم دەڤەرە لەو کتێبەوە وەرگرتوە. هەر ئەم رازو نهێنی یەشە وای کردوە هەر کەسێک کتێبەکەی (کارل مای) (گەشتێک بۆ کوردستانی کێوی) خوێندبێتەوە، وا دەزانێ (کارل مای) بەراستی سەردانی ناوچەی شاخی (تجاری) کردوەو بە خۆی دیتویەتی.

لە کاتێکدا (کارل مای)، قارەمانێکی خەیاڵی (قەرەبن نەمسی) خولقاندوەو زۆر سەرکێشی مەترسیداری لە حوزوری پاشا کورد و ئێزیدی یەکان دا، داوەتە پاڵ، و مەیدانی روداوەکانی ناو چیرۆکەکەی کردوە بە چەند شارێکی پڕ رازو نهێنی، پڕ شیوو دۆڵ و هەڵدێری هەزار بە هەزاری ترسناک. رەنگە خوێندنەوەی ئەم پەرەگرافەی خوارێ کە وەسفی رێبەرێکی تیرەیەکی ئێزیدی دەکات، بە ئاشکرا چوون یەکی نێوان رۆمانەکەی (کارل مای) و باری سەرنجەکانی (لایارد) مان بۆ بە دیار بخات.

(لایارد) دەڵێ: "رێبەری تیرەکە، یەکێک بوو لەو لاوە هەرەقۆزانەی کە لە ژیانمدا دیتبوومن. سیمای رێک و پێک بوو. چاوەکانی گەش وپرشنگدار بوون. چەند چەپکە قژێکی رەش رەش لە ژێر دەرسۆکە رەنگینەکەیەوە وەدەرکەوتبو". (کارل مای)ش هەمان کەس بە شێوازی تایبەتی خۆی و بەم شێوەیە وەسف دەکات: "... دەرگا ڤەبوو. کوڕێکی زۆر قۆز، بەژن و باڵا رێک وە ژوورکەوت. سیمای رێک و پێک بوو. چاوەکانی پرشنگێکی دڵگیریان لێ دەبووەو، چەند چەپکە قژێکی رەشی ناسک لە ژێر دەرسۆکەکەیەوە وەدەرکەوتبوون".

ئێمە لە حەقیقەت دورناکەوینەوە، ئەگەر بڵێین ئەم دوو نوسەرە لە هەر کەسێکی دی پتر بەشدارییان لە چەسپاندنی دیمەنی واقیعی کورد لەزەین و هزری ئەوروپی یەکاندا کردووە و بۆ چونە خەیاڵی یەکانیان لە مەڕ کورد رەواندوەتەوە، (کارل مای) وەکو نوسەرێکی فرە خوێنەرو (نوستێن لایارد)ش وەکو زانایەکی سەرنج تیژ.

(لایارد) یەکەم کەس بووە بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ جیاوازی نێوان کوردی هیندو ئەورووپی و عەرەبی دراوسێیان کردووە، ئەویش لە لێکۆڵینەوەیەکی دا دەربارەی ژیان و جۆری گوزەرانە کە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی گەلان و نەتەوەکاندا بە فاکتەرێکی زانستی و گەورەتر لە فاکتەری جیاوازی رواڵەت و دیمەنی دەرەوە و پێکهاتەی بەدەنی، دەژمێردرێ. هەروەها سەرنجی ئەوەی داوە کە ئافرەت لە کوردەواری دا رۆڵی هاوتای رۆڵی پیاو دەبینی. کورد هەڵوێستی تایبەتییان لە مەڕ ئافرەت هەیە کە لە کوردەواریدا ئازادییەکی دیاری هەیە، ئەم شتە لای عەرەب و تورکە عوسمانی یەکان نابینرێ، ئەمە لە کاتێکدا وایە کەکوردیش وەکو عەرەب و تورک لە باری باوەڕی ئاینی یەوە موسوڵمانن. تەنانەت هەر ڕێبوارێکی ئەورووپایی رێ ی بکەوێتە ئەم ناوچەیە زوو بۆی بەدیار دەکەوێت کە دەشێت قسە لەگەڵ هەر ئافرەتێکی کوردا بکرێ، بێ ئەوەی پیاوی لە گەڵدا بێ. لە کاتێکدا زۆر زەحمەتە ئەمە لەگەڵ ئافرەتێکی عەرەبدا بکرێ، مەگەر لە حاڵەتی زۆر ناچاری و تایبەتیدا.

(لایارد) لەم بارەیەوە نوسیویەتی و دەڵێ: "سەرۆک هۆز لەماڵ نەبوو. ژنەکەی میوانداری کردین. دەستوری دا مافور راخرێ، لەو مافورانەی کە ژنانی کورد بە خۆیان و لە سێبەری دارتووان دەی چنن. ئەوجا ماست و کەرە لە قاپی تایبەتی دا هات. پاشان چێشتی برنج لە قاپی دارین و میوەی تازە و هەنگوینیان لە سەبەتەدا بۆ دانایین". لە شوێنێکی دیدا دەڵێ:

"ئافرەتانی بێ پەچەو عەبا، کایان بۆ وڵاخەکانمان هێنا، قژیان لە شێوەی پرچی درێژدا هۆنی بوومەوە. سەر پەرچەمی دارو موورو بە سەر هەنیەیاندا شۆر بوو بوەوە. هەر یەکێکیان نموونەیەک بوو لەو جوانی یەی کە ئافرەتانی (مزوری) پێ ی بە نێو بانگن".

## سەرهەنگێکی سوپای پروسیا، بە کورد موعجەب دەبێت

هەر لەو کاتانەدا کە (لایارد) سەرقاڵی کۆکردنەوەی زانیاری بوو دەربارەی کورد، کەسێکی تریش خەریکی هەمان کار بوو، ئەگەرچی بەمەبەستێکی جیاوازتر بوو. ئەوکەسەش میر (هیلموت کارل بیرنهارد فون مولتکە) یەکە لە دایک بووی (میکلن بورگ)ی ئەڵمانیا بوو، کە پاشان بوو بە فەرماندەی بالای سوپای پروسی و بەیەکێک لە ناودارترین فەرماندە ستراتیژی یەکان لە مێژووی ئەڵمانیادا دەژمێردرێ. (فون مولتکە) لە ساڵی ١٨٣٥دا، کە ئەو دەمە لە تەمەنی ٣٥ ساڵی دا بوو، و لە سوپای پروسی دا سەرهەنگ بوو، مادونی یەکی سێ مانگی وەرگرت، دەیویست لە ماوەی ئەو مادونی یەدا ئەو خەونەی ژیانی بێنێتە دی کە چەندین ساڵ بوو، خولیای بوو، زۆری دڵ پێوە بوو کە گەشتێک بۆ تورکیا و وڵاتی (هومیر) بکات و لە نزیکەوە بیدینێ و لێکۆڵینەوەی لە مەڕ بکات.

لە ئەستەمۆڵ برایە لای وەزیری جەنگی عوسمانی (خوسرین پاشا) کە لە هەمان کاتدا پیاوی دووەمی دەسەڵات بوو لە ناو ئیمپراتوریەتی عوسمانیدا. لە سەر داوا و حەزی وەزیری جەنگ، (فون مولتکە) بۆ ماوەی چەندین ساڵ کرا بە راوێژیکاری سوپایی لە بارەگای (باب العالی)دا، تا لەو ماوەیەدا ئارەزووەکانی سوڵتان (محمود) کە بریتی بوو لە ئەنجامدانی ریفۆرمێکی ریشەیی لە ناو سوپای عوسمانی، بهێنێتە دی.

(فون مولتکە)، لە ساڵی ١٨٣٩دا بە یاوەری ئەو لەشکرکێشی یە رۆیی کە بۆ میسر نێردرا تا یاخی بوونەکەی (محمد علی پاشا) سەرکوت بکات.

ئەرکی (فون مولتکە) لەم لەشکرکێشی یەدا ئەوە بوو کە پێشنیار و ئامۆژگاری بە فەرماندەی هێرشەکە، کە پیاوێکی تورک بوو، بدات. بەڵام فەرماندە تورکەکە هەموو تێبینی و پێشنیارەکانی ئەوی فەراموش کردو ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هێرشەکە لە شەڕی (نیسیب)دا بشکێ. بەڵام ئەم روداوە، بۆ (فون مولتکە) وێڕای ئەو شکستەش، دەرفەتێکی بە نرخ و لە بار بوو، چونکە هەلی بۆ رەخساند بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا، ئاشنای کورد و کوردستانی وڵاتی کوردان بێ.

(فون مولتکە) چەندین کتێب و گوتاری رۆژنامەوانی دەربارەی تێبینی یەکانی خۆی لە سەر ئەو روداوو مەسەلانەی کە بە چاوی خۆی دیتونی و تیایاندا ژیاوە، بڵاو کردۆتەوە. رەنگە بە ناوبانگترینیان ئەمە بێ (چەند نامەیەک لە مەڕ بارودۆخ و روداوەکانی ناو تورکیا) کە لە ساڵی ١٨٤١دا لە بەرلین بڵاوبوەتەوە. (فون مولتکە) ژمارەیەک لەم نامانەی بۆ باسی کوردستان تەرخان کردوەو ئەو پەڕی دڵبەندی خۆی بەم وڵاتە شاخاوی یە دەربڕیوە، ئەم وڵاتە بە رەسەنایەتی و دڵگیری و جوانی سروشتەکەی خۆی، (فون مولتکە)ی ئەفسون کردوە، وەکو چۆن پێش ئەویش چەندین گەڕیدەی تری ئەفسون کردووە.

(فون مولتکە) لە ١٨٣٨/٥/١٨دا نوسیویەتی: "کاتێ مرۆڤ لە روباری (دیجلە) رەت دەبێت، لە پڕ دەشت و نشێوەکان دەگۆڕێن و دەبن بە دەڤەرێکی شاخاوی، لە لوتکەی بەفرگرتوی ئەو شاخانەوە، روبارو جۆگەلە بە قەد پاڵی زۆر رک و رژدی چڕە دارستانەوە، دێنە خوارێ بۆ ناو دۆڵی پڕ دارو دەرختی وەکو زەیتون وگوێز و هەنجیرو هەنار و ترێ. ئەم جۆگەلە و روبارانە بە دەم رێگەی خۆیانەوە بێستان ومێرگ و مەزرایان ئاو دەدا. هەروەها ئەو شێوازەی کە (فون مولتکە) باسی سامانی گیانلەبەرو روەکی کوردستانی پێ کردووە، مایەی سەرنجە.

ئەم ئەفسەرە تینوەی زانیاری لەو روەوە نوسیویەتی: "لەوێ، لەوشوێنەدا کە دەستی تیرەی بەشەر نەیتوانیوە سروشت بگۆڕێ، ئەو سروشتەی لە جوانترین وێنەی خۆیدا مرۆڤ گاز دەکات، لەو وڵاتەدا ئێستاش باران گیاو گوڵ ئاو دەدات. لە باوەشی ئەم

سروشتەدا ڕۆژانە ملیۆنان گوڵ و گولیلکی هەمە ڕەنگ لە شێوەی مافوری ڕەنگین دا دەپشکوێن و ئەو سروشتە دەڕازێننەوە".

## بەهاری (گەلی ی عەلی بەگ)

ئەندازیاری بەریتانی (ئارشیبالد مایلن هاملتون)، لە کتێبێکی دا کە لە ساڵی ۱۹۳۷ دا بڵاوی کردۆتەوە، هەمان دڵبەندی بە بەهاری کوردستانەوە دەربڕیوە. پاش تەواو کردنی ئەو ڕێگەیەی دۆڵی (گەلی ی عەلی بەگ) نوسیویەتی: "کاتێ کە بەهار دێت، لە چاو تروکانێکدا سروشتی ووشکی کوردستان و شاخە زۆر قوچ و ڕکەکانی دەبن بە پارچەیەک جوانی لە ئەندازە بەدەر. گوڵ و گولیلکی ڕەنگاو ڕەنگ، لە نێو گیاوە سەر بەرز دەکەنەوە. ڕەنگی ئەم گوڵانە ڕۆژانە دەگۆڕێن و ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکات هەر بە بەراوردی ڕەنگەکاندا جیاوازی ڕۆژی تازە و ڕۆژی بوری بکات. ڕۆژێکیان لە سەر تاوێرێکی زۆر دورە دەستی لایەکی هەڵدێرەکەوە، بریقەی گوڵە سوسنێکی سور لە نیگام هەڵەنگوت. گیای هەردو ڕەخی ڕیگەکە بە دەم شنەباوە وەلادەکەوتن و گوڵە نێرپسی شین خۆی دەنواند، گوڵە مێلاقەش لە پەنا تاوێرانەوە و بە تەنیشت قۆیەنە وەنەوشەی سروشتی یەوە سەرەتاتکێیان دەکرد.پانتاییەکی بەرفراوان لە گردە نزیکەکانی (کانی وەمان) بە نێرگز داپۆشرا بوو، لە دوورەوە وەها دەهاتە بەرچاو کە پارچە بەفرێکی زۆر سپی وگەورەیە".

(هاملتون) ،دەڵێ کورد زۆر شانازی بەم جوانی یە سروشتی یەوە دەکەن کە خوا بە خاکەکەی بەخشیون و دەڵێ: "روم لە هەر شوێنێ دەکرد خەڵکی چەپکە گوڵی کێوی و گوڵی ماڵییان پێشکەش دەکردم. وێرای ئەوەی ئەم کارە بۆ خەڵکی ئەشارەزا هەندێ سەیر و غەریب دێتە بەر چاو، بەڵام ئەو خەڵکە خێڵەکی یە یەکجار ئاشقە گوڵ و گوڵ بەخێو کردن بوون. زۆریان حەز لە باسی گوڵ و گوڵزار و جۆرەکانی گوڵ دەکرد و لێ ی وەڕز نەدەبوون".

(هاملتون) لە مەوە دەگاتە ئەو ئەنجامگیری یەی کە کورد بەو کارەیان گوزراشت لە خۆشەویستی و شانازی بە وڵاتی خۆوە دەکەن، هەروەها دەڵێ: "مرۆڤ لەم ڕەفتارەوە هۆی هەڵگیرسانی هەموو شەڕەکانی ئێرەی بۆ بەدیاردەکەوێت و قەناعەت دێنێ کە هۆی شەڕی ناوخویی و شەڕی سەپاوی دەرەوەش تەنیا بەو مەبەستە بووە پتر دەست بە سەر ئەم ناوچەیەدا بگیردرێ و پاشان بۆپەرچدانەوەی ئەو هەوڵە داگیرکاریانە بووە....".

نوسینەکانی (هاملتون)، ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە زۆربەی شتەکانی کوردستان، هەر وەکو ئەوساکە ماونەتەوە کە (فون مولتکە) دیتونی و باسی کردوون. بۆ وێنە هاملتون باسی جۆری ڕۆنانی خانووی لە کوردستاندا کردووە کە چۆن لە قەد پاڵەکاندا و بە

شێوەی پلیکانە دروست دەکرێن و سەربانی هەر ماڵێک دەبێ بە بانیژە بۆ ماڵەکەی سەروی خۆی. هەروەها باسی کەرستەکانی بینای کردوە کە پێکهاتوون لە خشت و بەرد و لێ و پۆپی سپیدار. هەروەها دەڵێ: "سپیدار زۆر بەکەڵکە بۆ ئەو ناوچانەی کە خانوو لە شێوەی پلیکانەدا رۆ دەنێن. هەر چەندە دیواری خانوەکان لە تاوێر وخشتی گڵ دروست دەکرێن، بەڵام کورد کاریتەو دار بۆ دارەڕای سەرەکەی بە کار دێنن و بەزۆری کاریتەی سپیدار بۆ ئەم مەبەستە بە کار دێنن. پاش دارەڕای سەری خانووەکە، ئەوجا کاژێکی تەنکی هەژگ و چەوێڵی ووشکی بە سەردا دەدەن. ئەوجا قوڕە پەستێکی ئەستوری بەسەردا دەدەن. ئەم جۆرە سەربانە بۆ وەرزی گەرما تا رادەیەک گونجاو و لە بارەو شەوانی هاوین کە شەو لە رۆژ فێنک تر دەبێت، لە سەری دەنوون". ئەم جۆرە بینایە کە (دام)ی پێ دەڵێن تەنیا لە باشوری ناوچەی (ئەنتی توروس) دا بەرچاو دەکەوێ.

ئەوەی نوسینەکانی (فون مولتکە)، لە نوسینەکانی (هاملتون) جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە (فون مولتکە) تەنیا دڵبەندی خاک و سروشتی کوردستان نی یە، بەڵکو زیاتر دڵبەندی کوردە جەنگاوەرەکانە؛ زیاتر لە سێ ساڵان لە کوردستاندا مایەوە. ئەم مانەوەیە رێ ی بۆ خۆش کرد کە لەگەڵ دراوسێ عەرەب و تورکەکانیاندا بەراوردیان بکات.

لە رۆژێکی مانگی مایسی ساڵی ١٨٣٨دا ئەوەی تۆمار کردووە کە کورد: "لە زۆربەی هەرە زۆری بوارەکاندا جیاوازە لە عەرەبی دراوسێ ی. کە چی یەک خەسڵەتی هاوبەشیان هەیە، ئەویش ئارەزووی تاڵانی یە. هەر چەند لەم بوارەش دا عارەب زیاتر خەسڵەتی دز دەگرێ و کورد زیاتر جەنگاوەرە تا دز بێ. کورد بە ئارەزوو ئەڵهایەکی جدی یەوە مومارەسەی ژیانی کشتوکاڵی ناکات مەگەر ناچاربێ، چونکە زیاتر حەز لە جەنگ و شەڕ دەکات. رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ کە کورد ماڵ و قوللە و قەڵاتان لە بەرزایی چیاکاندا رۆ دەنێن و دەشتەکان و ناوچە راستانی یەکان دەکەن بە مەزراو کێڵگەو خانووی هاکەزایی لێ دروست دەکەن. کورد حەز لە شەڕی پیادە دەکەن، خۆ دەدەنە پەنا شاخ و دیواری ماڵان، تفەنگ چەکی دڵخوازی کوردە. کورد دەست راست و ئەنگێوە ونیشان شکێن و سەگڤانی باشن. تفەنگ شوێنی تایبەتی خۆی هەیە لە نێو خانەوادەدا و بە میرات لە بابەوە بۆ کوڕ دەمێنێ، تفەنگ لای کورد نازیزە و بە ماشوقەی هەمیشەی گەنجێتی خۆی دەزانێ".

## کاسە سەروکۆیچکەی براو

سوپای (توروس)ی عوسمانی، کە (فون مولتکە) یان بۆی دانا، بە پەلە بەرەو سوریا رەوانە کرا تا والی میسر سەرکوت بکات کە لە باب العالی یاخی بوو بوو. ئەو سوپایە

لەبناغەوە لە تورک پێک هاتبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا چەندین کوردی تێ کەوتبوو کە بە ئیجباری گیرا بوون. چونکە ئەم سوپایە لە شارەکانی (کاربوت) و (دیاربەکر) دا سەربازخانەی هەبوو، بۆیە دەبوایە ئەم ناوچە کوردنشینە بەر لە هەر ناوچەیەکی دی، باجی سیاسەتی تەجنیدی ئیجباری عوسمانی بدەن. فەرماندەی عوسمانی (حافظ پاشا) هەر بەوەوە نەدەوەستا کەل و پەل و ئازوقە و ولاخ و دار بۆ سوپا چل و پێنج هەزاری یەکەی لە خەڵکی بسەنێ، بەڵکو کوردەکەی ئەو ناوچانەشی لە ماڵی خۆیان دەردەکرد و سەربازەکانی دەخستە ناو ماڵەکانیان. ئەمەجگە لە گرتنی سەربازی ئیجباری لەو جوتیارە کوردانە.

(فون مولتکە) لە نامەیەکیدا بۆ ئەڵمانیا دەڵێ: "پرۆسەی سەرباز گرتن پتر لە پەلاماری راوو شکارو راوەدونانی کۆیلە دەچوو، بریر و کۆمەڵ کۆمەڵ سەربازی ئیجباری دەبینران، وەکو دوژمنی بەزێنراو، دوو دوو بە کەلەپچە دەستیان پێکەوە بەستراو بوو، بۆ سەربازخانە دەهێنران. نیگای تورە و پرکینەو رقیان دەبری بە ئێمە و بەمەش راستگۆترین گوزارشتیان لەرای خۆیان دەرهەق بە ئێمە دەکرد و بە ئاشکرا هەڵوێستی خەڵکی دەربارەی حکومەت وەکو دەسەلاتێکی غەوارە، دەردەبری. ژمارەیەکی زۆر لە لاوان لە دەست مەفرەزەکانی سەوقی ئیجباریدا بەرەو چیاکان هەڵدەهاتن. بەڵام تورکەکان دوایان دەکەوتن و سەگی راوییان پێوە دەنان وپاش ئەوەی دەگیران، پەتیان دەکردن و بە سەر عاردی دا رایان دەکێشان، یان رادەکێشرانە ناو سەربازخانەکە. ئەم سەربازانەی، کە ژمارەیەکی زۆر منداڵ ونوقسانیان تێدا بوو، تاقە یەک ووشە لە زمانی ئەفسەرەکانیان حاڵی نەدەبوون. وەکو زیندانی و یەخسیری جەنگ مامەڵەیان لە تەکدا دەکرا. نۆبەدارانی بەزەبر ئێشکی سەربازخانەکەیان دەگرت تا کوردەکان هەڵنەیەن. کە چی نۆبەدارو پاسەوانەکان کە هەلیان بۆ هەڵدەکەوت، خۆیان لە پێش خەڵکی دی یەوە هەڵدەهاتن".

نوسینەکانی مولتکە لە مەڕ هێرشی تەمبێ کاری و سەرکوت کاری پاشایانی تورک، بۆ سەر میرو سەرانی کورد، ئەوانەی کە باجیان نەدەداو سەربازیان نەدەدا، رەنگدانەوەیەکی راست و دروستی ئەو چەوساندنەوەیەیە کە تورکەکان تاڕۆژگاری ئەمڕۆش درندانە و دڵڕەقانە و بە بەردەوامی دژی کورد ئەنجامی دەدەن.

(فۆن مولتکە) جارێک دەیەوێ چاودێری ی پزیشکی بۆ سەربازێکی کوردی بریندار دابین بکات و پزیشکی بێنێتە سەر، ئەو حەقیقەتەی بۆ دەردەکەوێ کە کورد لە تورکیادا، لە باشترین حاڵەتدا وەکو مرۆڤی پلە دوو تەماشا دەکرێت.

هەروەها نوسیویەتی کە: "کوردێکی لە بن دەروازەیەکدا دیتوەو برا زامدارەکەی، .فیشەکێک بە لاقی یەوە دەبێ، بەکوڵەوە بووە.ئەو کوردە بۆی گێرامەوە کە ئەوە حەوت رۆژە برا برینندارەکەی دەگێڕێت. ناردم بە شوێن پزیشک دا، کاتێ کە هات و

زامدارەکەی بینی، بە قیز و بێزەوەگوتی چ نی یە کوردە!!. زیاد لە جارێک ئەم قسەیەی گوتەوە. لە تۆ وایە دەیەوێ پێم بڵێ: "ئاخر تۆ قەڵ پیاوی کە داوام لێدەکەی ئەم بوونەوەرە تیمار بکەم؟".

لەنامەیەکی تریدا کە بۆ هاورێ یەکی خۆی لە ئەڵمانیا، ناردویەتی، باسی ئەوەی کردوە کە چۆن مامەڵە لەگەڵ کوردە مەدەنی یەکاندا دەکرێت: "هەق نی یە بەغیلیمان پێ بەری بۆ ئەم شەڕانەی دەیکەین، پڕن لە شتی بێ مانا و هیچ و پوچ. ئەمڕۆ جگە لە هەزاران سەر وڵاخ و حەیوان، پتر لە شەش سەد زیندانیش گەیشتنە سەربازخانەکەمان. نیوەیان ژن و منداڵ بوون. ژمارەیەکی زۆر لەو ژنانە بریندارن، ئەمە لێرە شتێکی ئاساییە و لەگەڵی راهاتووین، بەڵام منداڵیان تێدایە کە بە قەمە وسونگی بریندارکراون، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەشێکە لەو رەفتارەی کە لەگەڵ کوردا دەکرێ. منداڵی ساوای شیرەخۆرە دەهێنرێنە بارەگای ئەفسەرەوە دەبێ کەس و کاریان پەنجا لیرە بدەن تا منداڵەکانیان وەر بگرنەوە. هەروەها ئەمڕۆکە یەک تورەکە کەللە سەرو گوێچکەی براوی بەشەریان هێنا".

(مولتکە) ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە: "ئەم رەفتارەی بۆ چەوساندنەوەی کورد پەنای وەبەردەبرێ، دەتوانێت بۆ ماوەیەکی کورت دەسەڵاتی تورکیان بە سەردا بسەپێنێ، وەکو چۆن پێشتریش وا بووە. بەڵام حکومەت بەم رەفتارە گوێ رایەڵی هەمیشەیی کوردان بە دەست ناهێنێ، مەگەر ئیدارەیەکی باشتر لەم ئیدارەیەی ئێستا ، ئازادی و سەربەخۆیی کوردان بدات".

هەروەها ئەم نوسەرە سەرنج تیژە پەردەی لە رووی خاڵی سەرەکی لاوازی یەکانی کوردیش هەڵماڵیوە دەڵێ: "سەران و میرانی کورد لە نێو خۆیاندا بەگژیەکدی دا دەچن، لە پێناوی دەسەڵاتی پترو قۆرخ کردنی زەوی و زاری زۆرتردا، دیارە بەمەش زیانێکی زۆر گەورە لە خۆ دەدەن، گەورەتر لەو زیانانەی کە لە کاتی بەرگری چەکدارانەدا دژی لەشکرکێشی و پەلاماری عوسمانی یەکان، لێیان دەکەوێ". لە کۆتاییدا وەکو ئەوەی دەرمانی ئەم دەردەی کوردان بکات، نوسیویەتی: "گەر کورد یەک بن، مەحالە کەس بەسەریاندا سەر بکەوێ".

## ١٥٩٦:دەرچونی کتێبی مێژووی کورد

ئەو وێنەیەی جیهان لە مەڕ کوردی دروست کرد بوو، بەرەبەرەو پاش گەشتەکانی (ریچ) و (لایارد) لە کوردستانداو دوای نامەکانی (مولتکە) و تێبینی و باری سەرنجی ژمارەیەک لەو گەرپدانەی دی کە دوای ئەوان سەردانی کوردستانیان کرد، بەرە بەرە رەوی یەوەو ئاشکراتر بوو. بەڵام بایەخدانی زیاتر بەم گەل و وڵاتە، پاش بڵاوبونەوەی بەرهەمەکانی ریچ پەرەی سەندو رووی لە زیادی کرد.

بەلام بەشداری هەرە گرینگی ئەم بوارە، ئەوە بوو کە رۆژ هەلاتناسی ئەمساوی (هـ.ا.یارب) لە سالانی ١٨٤٦و ١٨٤٧دا گەشتێکی زانستی شناسایی بۆ ناوچەکە کردو دەستکەوتێکی ئەدەبی نایابی یەکجار بەنرخی لەگەل خۆیدا هێنایەوە، کە دەشێت بە ژێدەرو سەرچاوەی پلە یەک دابنرێ بۆ لێکۆلینەوە لە مێژووی کورد وکوردستان.

مەبەست لەم دەستکەوتە کتێبی (مێژووی کورد)ە کە سالی ١٥٩٦ ،فەرماندەی گشتی سوپای میرنشینی (بەتلیس)ی کوردی، (میر شەرەفخان) نوسیویەتی. (میر شەرەفخان) بە تۆمەتی بەشداری و سازدانی پیلانێک دژی باوکی، تڕۆ کراو مافی میراتگری لێ سەندرایەوە، بەلام هەول و تەقەلای هەندێ میری کورد سەری گرت و ئیعتباری پێ درایەوەو مافی ئاسایی خۆی لە بەرێوەبردنی میرنشینەکەدا پێ درایەوە وتا سالی ١٦٠٠ کە مرد، دەسەلاتی م ـشینەکەی گرتە دەست و بەرێوەی برد.

مەبەستی (شەرەفخان) لە نوسینی ئەم کتێبە ئەوە بوو بەپێ ی توانا تیشکێ بخاتە سەر مێژووی کورد و رابردووی گەلەکەی بە رۆلەکانی کورد بناسێنێ و ویژدانی رۆلەکانی کورد بە مەبەستی خولقاندن و دروست کردنی هەستێکی نەتەوەیی کوردی گشتی جۆش بدات. بۆ ئەمەش سودی لەو شەرو کێشە بەردەوامانەی ئەو سای نێوان کورد و عوسمانی یەکان وەرگرت. بۆ نوسینی ئەم بەرهەمە مێژووییە بەنرخە لە لایەکەوە پشتی بە سەرچاوە فارسی یە مێژووییەکان بەستبوو، و لە لایەکەوە پشتی بەو ریوایەت و روداوانە بەستبوو کە ئەوە و ئەتیرەی کورد لە زمانی پیرەمێرانی راستگۆ و باوەڕ پێکراوەوە دەیانگێرایەوە.

ئەم لێکولەرەوە کوردە پێشرەوە ئەیتوانیوە گرینگترین مەبەستی خۆی، کە دەست نیشان کردنی رەگ ورەچەلەکی کوردە، بە شێوەیەکی بنج بڕ ساغ بکاتەوە. هەر چەندە توانیویەتی سەرکەوتوانە مێژووی کورد لە کۆنەوە، بنوسێت. بەلام لە دیاریکردنی بنج و بناوانی کوردا سەرکەوتنی بە دەست نەهێناوە و ئامازەی بۆ زۆر بیر و بۆچونی ناکۆک لەو بارەیەوە، کردووە و تیشکی خستۆتە سەر سییان لەو بۆ چون و ریوایەتانە.

یەکێک لەو بۆچونانەی ئامازەی بۆ کردوە، هەر هەمان ئەفسانەیەکە لە مێژووی ئێرانش دا باسی کراوە. دەربارەی (زوحاک)ی خوێن رێژو زۆردارە کە کوردەکان تا ئەمرۆش بە داستانی خۆیانی دەزانن. بە پێ ی ئەفسانەکە، ئەم زۆردارە توشی ئەخوشی یەکی سەیر دەبێت، دوو مار لە سەر هەر دوو شانی پەیدا دەبن و بە هیچ شتێک ناهێورێن ، تەنیا بەوە ئەبێ هەموو بەیانی یەک دوو لاو سەر ببڕدرێن و مێشکەکانیان دەرخواردیان بدرێ. بەلام خەلکی سایەی حوکمی ئەو زۆردارە فێلێکیان دۆزێ بووەوە کە لە بری مێشکی دوو لاو، مێشکی لاوێک و مێشکی مەڕێک یان بزنێک دەرخواردی مارەکان بدەن و کوڕە رزگاربووەکان رەوانەی چیا بکەن، ئیدی ئەمانە بوون بە بنەچەو هەوێنی گەلی کورد.

بەڵام ئەم فێڵە هەموو جارێک لە پاشای زۆردار و دەستوپێوەندەکەی نەدەکرا. وەختێ پیاوانی پاشای زۆردار ویستیان دوا کوڕی (کاوەی ئاسنگەر)، کە پێشتر هەشت کوڕی بەو جۆرە لە دەست دابوو، بەرن و دەرخواردی مارەکانی بدەن، (کاوە) چیتر خۆی پێ نەگیراو پێشتەماڵە چەرمەکەی داکەندو کردی بە سەری دارێکەوە تاببێ بە ئاڵای کاتی کوردان و جوتیارەکانی هاندا کە دژی زوڵم و زۆر شۆڕش بکەن. لە هێرش و پەلامارێکدا کە دەشێت بە شۆڕشی جوتیارانی کوردی مێژووی کۆن بێتە ژمارتن، پەلاماری کۆشک و بارەگای دکتاتۆر دراو (کاوەی ئاسنگەر) توانی بەو چەکەی دەستی سەری دکتاتۆر پان بکاتەوە و دەستو پێوەندەکەی لە نێو بەرێ. هەڵبەتە بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی هەبێ کە دروستی ئەم ئەفسانەیە بسەلمێنێ، هەر هەموو کتێبەکوردیەکان لە کۆنەوە لە سەر ئەو رایەن کە ئەم رووداوە گرینگەی مێژووی کورد لە ڕۆژی ۱۲۳٤/۳/۲۱ی پێش هیجرەت (واتە لە دەوروبەری ساڵی ۲۰۰۰ پێش .ز) دا رووی داوە.

هەروەها ئەم ڕۆژە هێماو مانایەکی مێژوویی تریشی هەیە، چونکە ئەو ڕۆژەیە کە ئەینەوا بە دەستی میدی یەکان روخا و بەمەش ئاشورییەکان بە یەکجاری لە نێو بران و ئیمپراتوریەتی میدیا لە شۆێنی دامەزرا، کە زۆربەی کورد خۆیان بە نەوە و نەتیرەی ئەو میدیانە دەزانن.

هەموو کورد، تەنانەت ئەوانەیش کە بەناچاری بۆ ئەوروپا و ئەمریکا کۆچیان کردوە، لەم ڕۆژەدا کە (نەورۆز)ی پێ دەڵێن، واتە ڕۆژی نوێ، بەو حیسابەی سەرەتای ساڵی کوردی یە، ئاهەنگ دەگێرن. لەو ڕۆژەدا جوانترین جل و بەرگ لەبەر دەکەن، بەتایبەتی ئافرەتان بە جل و بەرگی ڕەنگینی هاودامانی فش و فۆڵەوە کە زۆر لە جل و بەرگی شەوانەی ئەورویی سەردەمی رینیسانس دەچێت. هەروەها ژنی کورد خشڵی جوان لە خۆ دەدەن. هەروەها کورد لەو ڕۆژەدا خۆشترین و بەلەزەت ترین خواردن دروست دەکەن، هەموویان، ئافرەت و پیاو دەرەقسن و ستران دبێژن. شایی و هەڵپەڕکێ ی کوردان دستە جەمی یە و ژمارەیەکی زۆر بەشداری تێدا دەکەن و لە سەر یەک ریتم و ئاهەنگی تایبەتی ئەنجام دەدرێ. کورد بۆ هەر بۆنەیەک شایی و ئاوازی تایبەتی خۆیان هەیە.

کورد، لە ئێوارەی ڕۆژی پێش نەورۆزدا، لە سەر زۆر لوتکە چیای بڵندی کوردستاندا ئاگر دەکەنەوە. ئەسکەندەنافی و ئەڵەمان و بەشێک لە گەلانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاش بە بۆنەی هاتنی وەرزی بەهار یان جەژنی پاک، ئەم کارە دەکەن. بەڵام ئاگر کردنەوەی کورد، کردەوەیەکی سیاسی رووتە: ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو ئارەزوەی کە کورد دەیانەوێ پیشانی بدەن گەلێکی سەربەخۆن و دەیانەوێ تەنانەت لە داب و نەرتیەکانیشیاندا لە دراوسێ عەرەب و تورک و فارسەکانیان جیاواز بن. هەر لە بەر ئەو هێما سیاسی یەیە

که لەو وولاتانەدا ئاگر کردنەوە قەدەغە دەکرێ وپۆلیس و ئەمن ئەو کەسانە راو دەنەن و دەگرن کە ئاگردەکەنەوە.

هەروەها تەفسیرو لێکدانەوەیەکی تریش هەیە بۆ ئەو هاوپەیوەندی یەی لە نێوان داستانی کاوەی ئاسنگەر وسرووتەکانی جەژنی ئەوروزدا هەیە. ئەمە رەنگدانەوەی کاریگەری داب و نەریتی گەلانی هندو ئەورویی یە لە سەر شارستانیەتی و مێژووی کورد. چونکە گەلانی گەرمانی و کولونی یە و سلاڤیش لە رۆژی ۳/۲۱ دا کە شەو و رۆژ تیایدا بەرانبەر دەبن، ئاهەنگ دەگێرن بەو حیسابەی سەرەتای بەهارە، ئەمە پەیوەندی یەکی بتەوی بە ئاهەنگەکانی جەژنی (پاک)ی لای ئەم گەلانەشەوە هەیە. وەکو چۆن لە لای گەلانی سلاڤی جەژنی گۆڕانی وەرزەکانە، لە لای کوردیش جەژنی گۆڕانی سالە و سەرەتای سالی نوێ یە.

بەلام دوو بۆچون و تیۆری یەکەی دی لە مەڕنەسلی کورد کە (شەرەفخان) ئاماژەی بۆ کردبوون، یەکەمیان دەلێ کورد زوربەتی جنۆکانن، دووەمیان دەلێ کورد گەلێکی دوو رەگەو لە ئەنجامی جووت بوونی دێو لەگەل خەلقەندەیەکی زەمینی دا دروست بوون. رۆژهەلاتناسە ئەمساوی یەکە کە ئەم کتێبەی وەرگێڕاوە، ئەم دوو تیۆری یەی بە نوکتەو دەستکرد و بیدعەت داناوە. (شەرەفخان) بە خۆیشی نەیشاردۆتەوە کە نەسلی کوردی بۆ دیاری نەکراوەو دەلێ: "جگە لە خوا چ کەسێک بەتەواوەتی نازانێ کە بنج و بناوان و رەگ و رەچەلەکی کورد لە کوێوە هاتووە".

(یارب)ش کە نەیتوانیوە بگاتە ئەنجامێکی بنجبر، پێ ی وایە ئەم نادیاری یەی نەسلی کورد "پێویستە ببێ بە هاندەرێک بۆ زۆر لە پیاوانی ئەم سەردەمەمان کە لێکۆلینەوەی جدی لەم رووەوە ئەنجام بدەن تا ئەو تەم و مژەی لە نەسلی کورد ئالاوە، برەوێتەوە". هەروەها پێ ی وایە بایەخی زانینی بنج و بناوان و نەسلی کورد لەوەدایە کە پەیوستە بە "گەلێکی رەسەنی ئەوتۆ، کە توانیویەتی سەرباری زۆر هەوراز ونشێوی سیاسی، پارێزگاری جۆرە ئازادی و سەر بە خۆییەکی خۆی بکات لە سایەی میرو سەرانی خۆیدا لە سەر خاکی ئاشورو میدیای خاوەن شارستانیەتی کۆن ودێرین".

ئەم گەلە لە رێگەی سیستەمی خێلایەتی و پێکهاتەی کۆمەلایەتی یەوە توانیوبەتی بنج و بناوانی کۆنی خۆی بپارێزێ و بەمەش شایستەیی خۆی سەلماندوە کە ناو و مێژووی پارێزراو بێ، چونکە رەگو ریشەی بۆ سەردەمانی پێش مێژووی ئاشوری و میدی دەگەڕێتەوە.

## سالی ۲۳۵۰ پێش .ز. کورد و خەتی بزماری

مەسەلەی دیاریکردنی بنج و بناوانی کورد تا رۆژگاری ئەمڕۆ بێ ئەنجام ماوەتەوە. زۆر کەمو کوڕی لەم بوارەدا هەیە و زانای سۆڤیەتی (مینورسکی)ی پسپۆڕو شارەزا لە

کورد، دەی گەڕێنێتەوە بۆ: "کەمی و پچڕ پچڕی ئەو زانیاریانەی لەم بارەیەوە هەمانە، لەگەڵ جیاوازی ئەو شێوازەی کە لێکۆڵەرەوەکان لەم بارەوە گرتویانەتە بەر". بەو حاڵەشەوە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە (مینورسکی) و زۆر زانای تری سۆڤیەت و ئەڵەمان و ئینگلیز ئەنجامیان داوە، پڕن لە زانیاری دەوڵەمەندی ئەوتۆ کە پشتیان پێ دەبەسترێ و وێنەیەکی ئاشکراو روونی مێژووی ئەم گەلە رەسەنەمان دەخەنە بەردەست. زانای ئارکولۆژی ئەڵەمانی (ئایکشتید) یەکەم کەسە کە لەم دەرکەیەوە وەژوورکەوت و پشتی بەو گریمانەیە بەست کە دەڵێ: (شانۆ، هەر وەکو خۆی دەمێنێ ئەگەر ئەکتەرەکانیشی بێنە گۆڕین).

بەم پێ یە دوو بۆ چونی سەرەکی روون و ئاشکرا هەن، ئەگەر جیاوازیش بن، ئەوا دەچنەوە سەر یەک ئامانجی هاوبەش، ئەویش نیشتمانی ئێستای کوردانە. (سۆمەری) و (بابلی) و تەنانەت (ئاشوری)یەکانیش لە هەزارەی سێ یەمی پێش زاینەوە هەندێ ئاسەواریان لە پاش بە جێ ماوە، کە لەگەڵ یەکتریان بەراورد بکەن، هەندێ لایەنی لێکچونیان لە نێواندایە، هەموو ئەو ئاسەوارانە ئاماژە بۆگەلانێک دەکەن لە ناوچەی زاگرۆسی شاخاوی ناوەندو باکوردا ژیاون و ناوی وەکو (گوتی) و (کورتی)یان هەبووە. بە نیشتمانەکەیان گوتراوە (گوتیوم) یان (کارداکا) و ناوی تری لەو بابەتە ناوە.

بۆچونێکی دی هەیە کە لەباکوری ناوچەی (زاگروس) و (توروس)ەوە سەری هەڵداوە و خۆی لەو ئاماژەیەدا دەنوێنێ کە (سۆمەری)یەکان لە هەزاری یەکەمی پێش زاینی دا بۆ وولاتی (بات-کاردو) و خەڵکەکەی (کالدیری)یەکان و (کارودوخی)یەکان کردویانە، ئەو کاردوخیانەی کە (زەینەفون)ش لە کتێبەکەیدا (گەڕانەوەی دە هەزارپیاو) دا ئاماژەی بۆ خۆیان و بۆ وولاتەکەیان کردووە، هەڵبەتە ئەمە ئاماژەیە بۆ کورد.

(ئایکشتید) دەڵێ لەو ئاماژەیەدا بۆ کوتی یەکان، وا وەسف ئەکراون کە: "گەلێکی دەشتەکی نیمچە هۆڤین، بەڵکو ئەو ئامازانە ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کە ئەمانە رۆڵەی گەلێکی زۆر رێک و پێک بوونە و توانیویانە لە وولاتی کۆنی دۆڵی دوو روباردا ، لە سەرشانۆی رووداوەکان دەر بکەون". زۆر جار ناوی (کوتی)یەکان لە نوسراوە سۆمەری یەکاندا هاتوە و باس کراون کە چۆن لە ناوچەیەکی فراوان دا بڵاو بونەتەوە و باسی ناوچە دورەکان و شارە دەوڵەمەندەکانیان کراوە، هەروەها باسی پاشا بەزەبرو زەنگەکانیان کراوە.

زانایانی ئارکۆلۆژی و خەمخۆرانی لێکۆڵینەوە لەگەلانی کۆن، هەموو لە سەر ئەو رایەن کە نیشتمانی ئێستای کورد لە کۆندا لە ئێستە دەوڵەمەندتر و دانیشتوانی لە ئێستە زۆرتر بوون. مەلیک (سەرگۆنی) یەکەم کە لە (ئەکەد)دا دەوڵەتێکی سامی گەورەی دامەزران، شانازی بەوەوە دەکرد کە توانیویەتی وولاتی (کوتی)یەکان بگرێ.

هەروەها (نارام سین) کە پاشایەکی تری (ئەکەد)ەو لە دوای سەرگۆن هاتووە، لە بەردەنوسێکی بزماری سالی ٢٣٥٠ پ .ز، کە لە سالی ١٨٨٤ دا دۆزراوەتەوە، هەوالی سەرکەوتنی خۆی بە سەر گەلانی چیایی دا تۆمار کردووە. هەر چەندە کوردەکان پاشتر و لە نزیکی دەربەندی دیالەدا سەرکەوتنێکی بەرچاویان بە سەردا هێناو توانیان دوای چەندین سال هێزێکی سوپایی دەستوشێن دروست بکەن کە بۆ ماوەیەک دەستی بە سەر باکوری ولاتی دۆلی دوو رووباردا گرت. بەلام رۆلەکانی ئەم گەلە چیاییانە، لە سەدەکانی دوای ئەو سالانە دا، سەرچاوەی هەرە سەرەکی ئەو هێزە سوپاییانەیان پێک دێنا کە بابلی یەکان لە لەشکرکێشی و پەلاماری تەمبێ کارانەیاندا دەیانکردە سەر ئەو هەرێم و ناوچانەی سەر پێچیان دەکرد.

دوای نزیکەی هەزارسالێک لەم ئاماژەیەی سەرگون بەم لاوە، مەلیکی ئاشوری (تکلات- بیساری یەکەم) لە دەوروبەری سالی ١١٠٠پ. ز، سەرکەوتنە سوپاییەکانی خۆی بە سەر گەلی (کوتی ی بەربلاو) دا تۆمار کردووە. لەو گەران و پشکنینانەی کە لە (خرسباد)ی باکوری نەینەوا دا ئەنجام دراون، لە کۆشکی (سەرگونی دووەم)دا (دەورو بەری سالی ٧٢٢پ .ز) کە بە لەقەبی مەلیکی ئەکەدی نێودار، ناوی رۆیی بوو، لە کۆشکەکەی ئەودا یەکەمین بەردەنوس دۆزرایەوە کە ئاماژە بۆ جۆری جل و بەرگ و داب و نەریتی کوتی یەکان دەکات.

(ئایگشتید)، لە ئەنجامی بەراورد کردن و لێکۆلینەوەی هەموو ئەم بەلگانەوە دەگاتە ئەنجامگیری یەکی تەواو کە کوردەکانی ئێستا، بێگومان درێژە و نەوەی ئەو کوتی و کاردوخی یانەن. (مینورسکی)ش پشتیوانی دەکات و دەلێ: "زۆر نزیکە وابێ و چ بەلگەیەکی بۆ نادروستی ئەم گریمانەیە نی یە".

## ئاخۆ ئیمپراتوریەتی میدیا، دەولەتێکی کوردی بووە؟

ئەم گریمانانە، هەر لە خۆوە و لەئەنجامی لێکچونی ناوەکان یان گوشەگیری نیمچە تەواوی زنجیرە چیاکانی تورس و زاگروس-ەوە نەهاتوون. بەلکو رووداوە مێژووییەکان بە بەلگەیەک زیاتر سەلماندویانن. بابلی یەکان، نەیان توانی ناوچە کوردنشینەکان داگیر بکەن و تیایدا بمێننەوە. هەروەها ئیمپراتۆریەتی ئاشوری-ش نەیتوانی ناوچەی دەسەلاتی خۆیان بەرین بکات و لە هەموو ناوچەی کوردستاندا، پیادەی بکات؛ هەر چەندە توانی تا قولایی کوردستانی ئەمرۆی عێراق بروات.

هەر چەندە زمانی هندو-ئەورووپی لە ناوچەی چیای (زاگروس)دا لە سالی دوو هەزار پ. ز، و لە رێگەی (میتانی) و (کاستی)یەکانەوە دەرکەوت و بلاو بوەوە، بەلام (میدی)یەکان توانیان لە ناوچە کوردی یەکاندا بیچەسپێنن، ئەویش لە دەوروبەری سالی ١٠٠٠ هەزار پ.ز.

(مینورسکی) لەو روانگەیەوە کە زمانی کوردی ئەمڕۆکە زۆر لە زمانی (میدی) دەچێت، دەگاتە ئەو گریانەی کە کوردی ئەمڕۆ لە ئەنجامی توانەوەو پەرت بوون و لە ناوچونی ئەو تیرە میدییانەوە دروستبوون کە لە رۆژاوای ئێرانی ئەمڕۆدا دادەنیشتن. گەلێک لە مێژوو نوس و سیاسەتوانانی سەربە رێبازە هەمە جۆرەکانی بزاڤی رزگاریخوازی ئەمڕۆی کورد، رایان لەگەڵ ئەم گریانەیەدایە. باشترین بەڵگەش بۆ ئەم گوتەیە کتێبەکەی (محمد امین زکی)یە کە لەساڵی ١٩٦١ لە بەغدا چاپ بووەو لە رەچەڵەک و مێژووی کورد دەکۆڵێتەوە. چاپەمەنی و بڵاوکراوەکانی ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ش لایەنگری لەم حەقیقەتە دەکەن. لە گۆڤاری ساڵانەی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)، ساڵی ١٩٧٤، ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە: "ئیمپراتوریەتی میدیا، گەورەترین دەوڵەت بووە لە مێژووی کوردا".

هەندێ مێژونوس پێیان وایە کە (سکیتی)یەکان و (کیمیری)یەکان (ئەمانە تیرەو تایفەی هندو-ئەوروپایین) لە سەدەکانی٧ و٦ پ.ز، دەوڵەتێکی بە هێزیان لە بەستێنی دەریای ڕەش دا دەمەزراندووە.، ئەمانە، لە لای خۆیانەوە بەشدارییان لە دروست بوونی گەلی کورد کردووە.

زانای ئەڵمانیای دیموکراتی (ب.برینیتزر)ی پسپۆر لە کاروباری ئێرانی دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە: "ئاشوری یەکان بەرگەی ئەو گوشارەیان نەگرت کە کیمیری یەکان و پاشان سکیتی یەکان دەیانکردە سەزیان و بەمەش رێگەیان لە بەردەم داگیر کەراندا چۆڵ کرد کە خۆ بە ناوچە شاخاوی یەکاندا بکەن. بەشێک لە سکیتی یەکان لە دوا ئەنجامدا تێکەڵ بە خەڵکی ئەسلی وڵاتەکە بوون".

هەروەها (برینیتزر)، ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە کە: "یەکێک لەو خەتە لولەکی یە فارسی یە کۆنانەی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ٧و٦ پ.ز، جل و بەرگی سکیتی یەکانی لە سەر ئەخش کراوە، ئەمە بە ئاشکرا دیارە کە هەمان ئەو جل و بەرگەیە کە کوردی بادینان تا رۆژگاری ئەمڕۆ لە بەری دەکەن". لە سەری دەڕوات و دەڵێ: "راستە وڵات کەوتە ژێر رکێفی دسەلاتی سکیتی یەکان، بەڵام ئەمە تەنیا چینی حوکمرانی گرتەوە، دەنا جەماوەری خەڵک هەموو سەر بەتیرەوهۆزە کوردەکان بوون".

زانای ئارکولۆژی ئەڵمانی (فیلیکس فون لوشان) لەو لێکۆڵینەوانەیدا کە لەمەڕ بایولۆژی نەژاد لە کوردستان و لە ساڵی١٩٢٠دا ئەنجامی داون، گەیبوەتە ئەو ئەنجامگیری یەی کە بوونی رێژەیەکی زۆر لە کوردی دەموچاو درێژکۆڵەو گەنم رەنگ دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری (سکیتی) و (کامیری)یەکان. لە گۆڕستانێکی مەلەکی گەورەی (کاماکیری)دا، لە ناوچەی دەوروبەری (قەرەقوش)دا بۆی دەرکەوتوە کە رێژەی چاوانی شین گەیبوەتە ٦٢٪ بەڵام لە (ئەمرود داغ)دا، کە دوو هەزار مەتر لە روی دەریاوە بەرزە، رێژەکە لە ٥٨٪ زیاتر نەبووە. هەمان رێژە لە (سنجری) ئێران دا لە

٣٩٪ تینا پەڕێ .ئەم حەقیقەتانە گەیاندیانە ئەودوا ئەنجامگیری یە زۆر باوو بلاوەی کە کوردەکان بە خۆشیان پێ ی قایلن، دەڵێ: "کورد لە هەوەڵەوە زەری وەشی چاوشینی دەموچاو درێژکۆلە بوون. لە ئەنجامی گۆڕانی بارودۆخی ژینگە و تێکەڵ بوونی خوێنیان لەگەڵ خوێنی تورک و ئەرمەن و فارس دا، پێستیان رەش هەڵگەڕاو دەموچاویان درێژتر بوو".

بەڵام ئەو لێکۆڵینەوە باسانەی (ئیگون فون ئایکشتید) ئەنجامی داون، گەیاندویانەتە ئەنجامگیری یەکی دی کە پێ ی وایە کورد هەر لە هەوەڵەوە تێکەڵەیەک بوون لە چەندین نەژادی هەمەجۆری وەکو ئەوروپی و ئەسکەندەنافی وئێرانی و مەغول. واتە زادەو بەرەنجامێکی خۆرسکی ناهەم ئاهەنگ. رواڵەتی دەرەوەی کورد و ئەو تایبەتمەندی یە مێژوویەی بە درێژایی مێژوو هاتووە، ئەم بۆ چون و گریمانەیە دەسەلمێنن.

سەرسەختی کوردی ئەمڕوکە ،کە توانیویانە سیفەتە زاتی یەکانی خۆیان بپارێزن و هەموو ئەو هەوڵانە پوچەڵ بکەنەوە کە لە لایەن رەگەزو کۆمەڵە نەژادی دی یەوە دراوە، بۆ تواندنەوەیان لە نێو میللەتانی دی دا، مایەی سەر سامی مێژوونوسانە و زۆریان پێ سەیرە کە ئەم گەلە تاکو ئەمڕۆکە وەکو کۆمەڵێکی تایبەتی، خاوەن خوو خدەی دیارن و شانازی بە وابەستەیی تیرەیی خۆیانەوە دەکەن.

لە لایەکی دی یەوە زۆر فاکتەرو هۆکاری تری وەکو ئەو بارو دۆخەی کوردی تێدا دەسورێتەوە وچارەنوسی هاوبەشیان و دژمنایەتی کردنیان لە لایەن گەلانی دراوسێ و داگیرکەرەوە. هەر هەموو ئەم هۆکارانە بوونەتە مایەی لێک نزیک بوونەوەی رۆڵەکانی گەلی کورد، دیارە ئەم هۆکارانە لە ئایندەش دا هەمان دەور بە زیاترەوە دەبینن و شوێنەواری ئەمەش بە ئاشکرا لە قۆناغەکانی ئایندەی مێژوویاندا رەنگ دەداتەوە.

## زەینەفون و گریکەکان، روو بەرووی کوردوخی یەکان دەبنەوە

لە ساڵی ٤٠١ پ.ز دا (میدری)یەکان، کە گەلێکی میدی-کوردی یە، روو بەرووی مێژونوسی گریکی (زەینەفون) بوونەوە و لەمەوە کورد دەرفەتی بۆ رەخسا بە شێوەیەکی لەبەر چاو، بێتە سەر شانۆی روداوەکان. زەینەفون، دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکانی (بیلوپونیزیە) پەیوەندی بە (سیروس)ی گچکەوە کردو پەیوەندی بە سوپاکەیەوە کرد لە ساردیس، لە ئاسیای ناوەراست دا کە سێروس لەشکری دەنارده سەر هێزەکانی براکەی (ئەرتاکسیرکیس منیمون). پاش ئەوەی سوپای سیروس لە نزیکی (کوتاخا)ی نزیکی شوێنی ئێستای بەغدادا شکاو هەڵات، زەینەفون ڕێبەرایتی پاشماوەی هێزە سوپاییەکەی کرد کە دە هەزار جەنگاوەر بوون. دەیویست رێگەی چوار هەزار کیلومەتر بەم لەشکرەوە ببڕێ و بیگەیەنێتە کەنارەکانی دەریای رەش و

لەوێندەرەوە بۆ یونان. ئەم لەشکرە بەددم پاشەکشەوە کە لە وولاتی دۆڵی دوو رووبارەوە دەستی پێکرد بوو ، بەرزاییەکانی ئەرمینیا و کوردستانی بڕی.

زەینەفون، لە کتێبەکەی خۆیدا (ئاناباسیس) کە بەوردی چۆنیەتی ئەم پاشەکشە زەحمەتەی گێراوەتەوە، بە شێوەیەکی زۆر جوان و کاریگەر چۆنیەتی روو بەروو بوونەوەی لەشکرەکەی خۆی لەگەڵ کوردوخی یەکاندا گێراوەتەوە.

یونانی یەکان لەو دیلانەوە کە بەر دەستیان کەوتبون، بیستبویان کە ئەو رێگەیەی بۆ باکور دەچێت، سوپای گریکی پاشەکشە کردوو بەرەو وولاتی کوردوخی یان دەبات، هەندێکیان گوتبویان کە ئەو کوردوخیانە لە لوتکەی چیاکاندا دەژین و جەنگاوەرو شەڕکەرن وگوێ رایەڵی پاشای گەورە ناکەن. جارێکیان سوپایەکی سەدو بیست هەزار کەسی دەچێتە قولایی خاکی کوردوخی یەکانەوە و تاقە یەک جەنگاوەری ئەو سوپایە دەرناچێت.

کە سوپای گریکی لە دەوروبەری شاری زاخۆ سەری دەرهێناوە، ئەمە شتێکی سەیرو کوت و پڕ بووە. بۆیە کوردوخی یەکان خۆ دەدزنەوە و رێگەیان بۆ چۆڵ دەکەن. زەینەفون نوسیویەتی کە: "ماڵەکانیان بەجێ هێشت. لەگەڵ ژن و منداڵەکانیاندا بۆ نێو دۆڵە عاسی یەکان هەڵاتن، خواردەمەنی یەکی زۆریان بەجێهێشتبوو کە دەمانتوانی لەگەڵ قاپ و ئامانە مسەکانیاندا بیبەین. بەڵام گریکەکان بۆ ئەوەی توشی چەرمەسەری نەبن دەستیان بۆ ئەوشتانە نەبرد و هیچ تالانی یەکیان نەکرد. هەروەها خەڵکەکەیان ڕاونەنا ، بەمەش نیاز پاکی خۆیان بەرانبەر بە کوردوخی یەکان دەربڕی تا بە سەلامەتی و بێ وەی لەو دەڤەرەوە رەت بن. وەکو چۆن بە خاکی هاوپەیمان و بە نێو گەلی دۆست دا بپەڕنەوە".

هەروەها زەینەفون گلەیی ئەوەی کردووە کە کوردەکان: "هیچ نیازێکی پاکیان دەرنەبڕیوە وبە دڵی یونانی یەکان نەبوون، چونکە لە کتێبەکەی زەینەفوندا ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ کە: "کاتێ پاشینەی سوپای گریکی لە بەرزایی چیاوە بەرەو گوندەکان نشێو دەبوەوە ، تاریکی باڵی بەسەر هەموو دەڤەرەکەدا کێشاو شەویان بە سەردا هات، چونکە هەڵگەڕان وداگەڕان بە قەدپاڵی چیاکەی بەرامبەر دا زۆر سەخت و عاسی بوو. ئەو دەمە ژمارەیەک لە کوردوخی یەکان خڕبونەوەو پەلاماری پاشینەی لەشکرەکەیان داو توانیان چەند کەسێکیان لێ بکوژن و چەند کەسێکی تریان لێ زامدار بکەن، بەوەی کە لە سەر شاخەکانەوە بەردیان بە سەردا غل کردبوونەوە و لەو بەرزی یەوە بەرتیریان دابوون.خۆ ئەگەر ژمارەیان هەندێ زۆرتر بوایە ، دەیانتوانی بەشی زۆری لەشکرەکە لەنێو بەرن. ئەم هێرش و پەلامارە کوتوپڕە، گریکەکانی ناچار کرد لە گوندی (بێخاک) خڕ ببنەوە. کوردوخی یەکان، لە شاخەکان دا مانەوە ولە رێگەی ئەو ئاگرانەوە پەیوەندی خۆیان دابین دەکرد کە لە لوتکەکاندا دەیانکردەوە.

پێگەی ستراتیژی کوردستان، کەکەوتبوە سەر ڕێگەی هاتو چۆی سەرەکی زەمینی یەوە و مەیدانی تێپەڕبوونی لەشکری هێزەزلەکان بوو، کردی یە کارێک کە کورد لە سەدەکانی پاش گەڕانەوەی لەشکری زەینەفون، ببێ بەفاکتەرێکی گرینگ، بێگانە وغەوارە لەنەخشە وپلانی خۆیاندا، حیسابی بۆ بکەن.

وولاتی کوردان، پاش ئەوەی ئەسکەندەری گەورە توانی ئاسیای بچوک غەزو بکات و لەشکری سەرداری فارس (داریوش) لە ناوچەکەوە دەربنێ، کەوتە ژێر رکێفی یونانی یەکان بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ تاکو ئەوکاتەی مەلیکی ئەرمینیا (تیکرانیس) لە ساڵی ۸۰ پ.ز دا توانی (کوردونیا) بگرێ و بەوەش سەردەمی کولونیالی کردنی کوردستان لە لایەن ئەرمەنی یەکانەوە دەستی پێکرد.

ناکۆکی نێوان رومە رۆژهەلاتی یەکان و ئەو هێزە تازەیەی کە لە رۆژهەلاتدا دروست بوو، واتا هێزی دەوڵەتی (پارتی)یە، تاسەدەی حەوتەمی زایینی بەردەوام بوو. بەلام چارەنوس وقەدەری کورد لەو سەدەیەوە ئیدی بەسترا بە هێزی عەرەبی یەوە. چونکە ئەو عەرەبانەی بوون بە ئیسلام لە سایەی ئالای محمدی پەیامبەردا ڕێبەری گۆڕانکاری یەکی وەهایان کرد کە تا ئیستاکە ئەو ناوچەیە بە خۆوەی نەدیتوە. پاش وەفاتی پەیامبەر،خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب، نەخشەی بۆ لەشکرکێشی یەکی گەورە بۆ سەر فورس دانا، عەرەب توانیان لەم لەشکر کێشی یەدا بە ناو وولاتی ئەرمەنی مەسیحی و ئەو کوردانە بکەوێ کە هەندێکیان بوو بوون بە مەسیحی و هەندێکیان لە سەر دینی خۆیان (زەردەشتی) مابونەوە.

عەرەب، غەزوی شارانیان کرد. کلێسایان سوتاند، ئاتەشکەدەو بنکە رۆشنبیری یەکانی دیانەتی زەردەشتیان روخاند.کورد، بەزەبری هێز کران بە ئیسلام. بەلام کوردەکان هەرکە هێزی عەرەب دوور دەکەوتەوە، بە کۆمەڵ پاشگەز دەبوونەوەو لە ئاینی ئیسلام هەڵدەگەڕانەوە. هێزی عەرەب، ئەو هێزە بوو کە هیچ سازشێکی نەدەکرد و لێبڕابوو بە توێژی هەموو تیرە و تایفە کوردەکان ملکەچی دەسەلاتی ناوەندی ئیسلامی-عەرەبی بکەن، لە سەدەکانی دواتردا گەلێک ڕاپەڕین و شۆڕشی بەردەوام بەرپا بوون، عەرەب هەمیشە بە شێوەیەکی خوێناوی و توند سەرکوتیان دەکرد.

کورد، لە ئەنجامدا چارێکیان نەما، تەنیا ئەوە نەبێ کە لەگەڵ دەسەلاتی عەرەبی دا خۆیان بسازێنن. لە سەرەتای سەدەی دەیەمی زایینی دا، ئەم خۆسازاندنە گەیە ڕادەیەک کە ئیمارەتی کوردە (شەدادی)یەکان، لە باکوری (ئازربایجان)ی ئێستادا دامەزرا. هەروەها لە باشوری رۆژاوای قوقازدا ئیمارەتی (هەسنەوی یە) دامەزرا، هەر هەموو ئەمە لە سایەی ئاژاوەی سیستەمی باج و خەراج و سەرانەدا رووی دا. میری کورد (هەسەن وای)ی سەر بەتیرەی (بارزیکانی)، کە پاشتر بووە بە (بارزانی)، ئەم ئیمارەتەی دامەزراندوە.

هەروەها قەلەمرەوێکی کوردی بە ناوی وولایەتی (مەروانی)یەوە توانی پتر لە سەدەیەک خۆی بگرێ و لە ساڵی ٩٩٠ وە تا ساڵی ١٠٩٦ دەوامی کرد، مەڵبەندی ئەم وولاتە لە شاری (دیاربەکر) بوو. دەسەلاتی بە سەر هەموو ناوچەکانی نێوان (ئورفە) و باکوری دەریاچەی (وان) دا کێشا. (مەروانی)یەکان توانیان هەموو ئەو ناوچەیە یەک بخەن و دەسەلاتی دەوڵەتەکەی خۆیانی بە سەردا بسەپێنن کە بە رواڵەت وابەستەی دەوڵەتی مەرکەزی عەرەبی بوو. هەروەها هێزی کورد، هەمیشە بەهێزترین بەشی سوپای عەرەبی لە ماوەی شەڕی سنوریان لەگەڵ (بێزەنتی)یەکاندا، پێک دێنا. تەنانەت (مەروانی)یەکان، سوریایان لە تزاری بێزەنتی (باسیلیوس ی دووەم) سەندەوە.

## سەلاحەدینی ئەیوبی ـ سوڵتانی خانەدان و نەجیب

لە کاتێکدا، لە سەردەمی غەزوی تورکی دا بۆ ناوچەکە، چەندین تیرەو تایفەی کورد لە بنەوە قەتڵ و عام کران و نەهێڵران، جەنگاوەرانی کورد لە سەرەتاکانی سەدەی یازدەی زایینی و لە سوریادا بەگژ داگیرکەرانی سەڵیبی دا دەچوون. کورد، بریاریان داەوو لایەنی عەرەب بگرن و بەگژ داگیرکەرانی ئەوروپا دا بچن؛ واتا رێک بە پێچەوانەی دراوسێ ئەرمەنی یەکانیانەوە کە لایەنی ئەوروپایان گرت. هۆی حونەری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ میرێکی ئیمارەتی (ئەیوبی)کوردی،کە فەلەستینی عەرەبی لە دەستی سەڵیبی یەکان رزگار کرد، ئەو میرە (میر سەلاحەدین) بوو کە توانی لە ساڵی ١١٨٧ دا بە سەر سوپای سەلیبی یەکاندا، کە نزیکەی شەست هەزار جەنگاوەر دەبووە، سەر بکەوێ، ئەمەش لە شەرێکدا کە لە نزیکی شاری (قودس)دا روی دا و بووە هۆی رزگار کردنی ئەم شارە پیرۆزە بەلای موسوڵمانەکانەوە و سەندنەوەی لە سەڵیبی یەکان. "ترس و لەرز کەوتە دڵی مەسیحی یەکانەوە و ژمارەیەکی زۆریان بە پەلە کەوتنە داواکردنی لێبوردن لەسەلاحەدین و ئەویش ژیانی پاراستن و ئازادی کردن". ئەمە لە سەرچاوەیەکی مێژوویی عەرەبیدا باسی کراوە. کورد، تا رۆژگاری ئەمرۆکە، (سەلاحەدین) بە گەورەترین کەسایەتی کوردی هەڵکەوتوی سەرانسەری مێژووی کۆن و دێرینی خۆیان دەزانن.

لە سەدەی سیازدەی زایینی دا، کاتێ کە مەغولەکان توانیان بە سەرکردایەتی هۆلاکۆخان، دەوڵەتی سەلجوقی یەکان هەڵ لوشن، لە کاتێکا خۆیان لە رۆژهەلاتەوە لە ترسی پێشرەوی تورکەکان هەلا تبوون، زەمینەیەکی لەبار بۆ سەرهەڵدان و دامەزراندنی میرنشینان و حکومەتانی کوردی رەخسا. بەلام مەغولەکان لەم پەلامارەیاندا هێرشیان کردە سەر زۆر ناوچەی کوردستان، هەرکە لە ساڵی ١٢٥٧ دا دەستیان بە سەر بەغدا دا گرت، هۆلاکۆ، خێرا لەشکرو قۆشەنێکی گەورەی بۆ سەر شاری (هەولێر)ی کوردان نارد تا بیخاتە ژێر رکێف و دەسەلاتی خۆیەوە. فەرماندەی سوپایی شار کە نەیتوانی

بەرگری بکات ورێ ی هەلاتنی دایە چاو، خۆی دایە دەست مەغۆلەکانەوە، بەلام سەربازە کوردەکانی ناو حامیەی شار، چاویان لە فەرماندەکەیان نەکرد، بەرەنگاری مەغۆل بوونەوە، مەغولەکانیش پاش شەڕێکی هەفتەیی دەستیان بە سەر شاردا گرت و هەر هەموو جەنگاوەرە زیندوەکانی ناو حامی یەکەیان سەربڕی. ئەوجا مەغۆلەکان توانیان بچنە ناو شاری هەولێر و ئیدی شمشێریان لە خەڵکی شار خستەکارو هەموویان کوشتن.

مەغۆلەکان، هەمان قەسابخانەیان لە شارەکوردنشینەکانی تری وەکو (دیاربەکر) بەرپا کردو مەغۆلان، هەموو رقێکی خۆیان بە سەر شاردا رژاندو خەڵکەکەیان قەتڵ و عام کرد. چەندین تیرەی کورد ناچار بوون لە ناوچەکانی خۆیان کۆچ بکەن و خۆیان لە مەرگی مسۆگەر رزگار بکەن. رەنگە بوونی کوردی سەر بە تیرەی (لاوان) و (باسیین) لە وولاتی (جەزایر)دا باشترین بەڵگەی ئەمە بێ.

پاش مەغولەکان، دەوری رەقیبە تورکەکانیان هات، کە لە دەورو بەری ساڵی ١٤٠٠دا کەوتنە سەپاندنی دەسەلاتی خۆیان بە سەر کوردستاندا، قەسابخانە وقەتڵ و عامی وەهایان دژی کورد بەرپا کرد، کە مایەی شەرمەزاری هەموو تیرەی بەشەرە. بۆ وێنە تیرەی (موکریان) لە ناوچەی باشورو باشوری رۆژهەلاتی دەریاچەی (ورمێ)ی ئێراندا، کە کەوتبوە سەر ڕێیان و هێزێکی پەیدا کرد بوو، چونکە ئیمارەتی (ئاق قوینلو-بەرخی سپی) تورکی بە چاوی رەزامەندیی یەوە نەیدەروانی یە ئەو میرنشین و تیرە کوردانەی، پەیمانیان لەگەڵ هەڤرکەکەی ئەودا، واتا لەگەڵ (قەرەقوینلو-بەرخی رەش)دا هەبوو، هەرچی توانایەکی هەبوو خستی یەگەڕ بۆ زەرەردان لەم تیرە کوردە و بەبەردەوامی کاری بۆ لە نێو بردن و قەتڵ وعامی ئەو میرنشینە کوردانە دەکرد.

ئەوە بوو لە سالانی دواتردا، کورد خۆیان لە بەینی شەرگەکانی نێوان ئێرانی یەکان و تورکەکاندا بینی یەوە. ئەو شەڕ وناکۆکیانە بنەو بناغە سەرەتاییەکانی دابەش کردنی کوردستانیان بە سەر پتر لە دەوڵەتێکدا، پێک هێنا. تیرەی (ئاغوز)ی تورکی بە سەرکردایەتی (عوسمان)، توانی لە سەدەی١٣ دا دەسەلات بە سەر تیرە تورکەکانی دی دا پەیدا بکات و ئیمپراتوریەتی عوسمانی دابمەزرێنی. لە لایەکی دییەوە، (سەفەوی یەکان)ش توانیان پاش نەمانی دەسەلاتی مەغول لەوێندەر، دەوڵەتی خۆیان لە وولاتی فارس دابمەزرێن و بەمەش بناغەی پەیدا بوونی دەوڵەتی ئێرانی ئەمڕۆیان دامەزراند. ئەم بارودۆخەو ئەو گۆڕانکاری یەی کە ناوچەکە بە خۆیەوە بینی، کورد دیسان کەوتنەوە بەینی بەرداشی دوو دەوڵەتی تەماحکاری وەها کە هەریەکەیان دەیویست لە سەر حیسابی ئەوەی دی وولاتی خۆی بەرین و فراوان بکات. بۆ نەگبەتی کورد، تاقە رێگەی ئەم فراوانخوازی یە بە کوردستاندا رەت دەبوو، کە کەوتبووە سەر سنوری هاوبەشی هەر دووک دەوڵەتی نێو براوەوە. ئیدی لەو سەروبەندەوە تاکو ئەمڕۆ

سیاسەتی فێڵ و تەڵەکە و فیتبازی وەگەڕ خراوە و ویستویانە کورد وەکو بەردی دامە لەگەمەی هێزە گەورەکاندا بەکار بهێنن. بۆ وەدی هێنانی بەرژەوەندی و نەخشە ویلانەکانیان لە ناوچەکەدا. ئەوە بوو کوردستان تا ئاخر و ئوخری سەدەی نۆزدە، بوو بووە شەرگەو مەیدانی کوشتو کوشتاری نێوان ئیرانی و عوسمانی یەکان.

زۆربەی کوردی سوننی مەزەب لەم شەڕانەدا لایەنگری ی عوسمانی یەکانیان کرد و لە تۆڵەی ئەمەدا جۆرە ئیدارەیەکی ناوچەیی سنورداریان وەدەست هێنا. کەچی بەشێکی تر لە کوردە شیعی مەزەبەکان دایانە پاڵ سەفەوی یەکان. هۆی سەرکەوتنی یەکجارەکی ئەستانە بە سەر سەفەوی یەکاندا لە ساڵی ١٥١٤دا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پشتیوانی یە گەورەیەی کە کوردەکان لە تورکیان کردو، هەروەها بۆ ئەو دەورە گرینگەی کە کوردەکان لە شەڕدا دیتیان .

کوردستان، لەم سەروبەندەدا گەشە سەندنێکی رۆشنبیری لە بەرچاوی بەخۆوە بینی، گەلێک میرنشین ودەوڵەتی بچوکی کوردی هاتنە ناراوە، وەکو (دیاربەکر) و (بەتلیس) کە کتێبی (شەرەفنامە)ی لێ هاتە بەرهەم و دەرچوون. ئەم کتێبە دەربارەی مێژووی کوردە، ئەم شارە "شارێکی ئاوەدانی پر لە کۆشک و تەلارو قوتابخانە ومزگەوت و پردو قوللە و قەلاتان بوو. مەڵبەندێکی گرینگی بازرگانی وخوێنەواری و خوێندن بوو، ئەدیب و شاعیرانی تێدا دەژیان"ئەمەمطلە هەوالی شاران دا، لەو سەرو بەندەدا هاتووە.

دیارە کورد، بۆ عوسمانی یەکان، فاکتەرێکی گەورە بوون،چونکە لەگەڵ ئێرانی یەکاندا شەریان بوو، کورد لای عوسمانی یەکان بایەخێکی گەورەیان هەبووە و بە کار هێنراون، وەکو چۆن ئەمرۆکە لە لایەن هێزەکانی ترەوە بە کار دەهێنرین، بۆیەش بایەخیان لای عوسمانی یەکان هەبووە، چونکە ئاتاجی هێزو توانای کوردان بوون. واتا کوردیان تەنیا بۆ کاری شەڕ ویستوە، هەر بۆیەش کاتێ عوسمانی یەکان لە ساڵی ١٦٣٩ دا لەگەڵ سەفەوی یەکاندا لە سەر دیاریکردنی سنوری هاوبەشی نێوان خۆیان رێک کەوتن، پشتیان کردە کوردەکان و هەموو ئەو خزمەتە زۆرەیان لە بیر کرد کە کوردەکان پێشکەشیان کرد بوون. ئەوە بوو هێڵی سنوری نێوان هەر دوو دەوڵەتەکە بە ناوجەرگەی کوردستاندا راکێشرا، ئەو هێڵەی پتر لە سێ سەد ساڵە کوردستانی دابەش کردووە.

# فەسڵی چوارەم

*لویەکی شێرپەنجەی پیسەو دەبێ ببڕدرێ*

## ٨ ملیون کورد لە تورکیادا، بەرەسمی بە (تورکی چیایی) دادەنرێن

مرۆڤ کە لاپەڕەکانی کتێبی ڕێبەری گەشتیاری هەڵدەداتەوە، دڵی خۆی بەوە خۆش دەکات و خۆی ئەمادار دەکات کە زۆر شت لە شاری دیاربەکری باشوری ڕۆژهەلاتی تورکیادا ببینێ. مرۆڤ لەو کتێبەدا ئەوەی بۆ بە دیار دەکەوێت ئەو شارە، کە شاری (گولان)شی پێ دەگوترێت، ناوچەیەکی گەشتوگوزاری نمرە یەکە. بەلام هەر گەشتیارێک تاقە یەک جار ئەو شارەی ناوجەرگەی عەنەدۆڵ بدینێ، ئەو پرسیارەی لە نک دروست دەبێت کە ئاخۆ دانەری ئەو گەشتنامەیە، باسی شارێکی دی دەکات، یان پروسەی گەشەسەندنی تورکیا، ئەوپروسەیەی کە کەمال ئەتاتورک داینا، بێرەدا تێ پەڕیوە و چ شوێنەوارو ئەسەرێکی بە جێ نەهێشتوە. یان زەمەن و کات وەستاوەو بواری هیچ پێشکەوتن و پەرەسەندنێک لێرەدا نی یە؟

لە کاتێکدا کە جوتیارانی دەوروبەری ئەم شارە، هێشتا هەر هەوجاری دارو گاجووت بۆ کێلانی زەوی وزار بەکار دێن و عەرەبانەی پێچکەدارین بە کار دێن، شاریش هەر لە سەر شێوە ڕۆژهەلاتی یە کۆنەکەی خۆی ماوەتەوە. شەقام، شورەو دیوارەکانی تانهوژی مینا خۆی ماوەتەوە. بینای تازەی ئەو زانستگەیەی کە کیلۆ مەترێک لە شارەوە دورە، نیشانەی ئەو نیازونیەتە شاراوەیەیە کە دەیەوێ دیار بەکر چ ئایندەو پاشەڕۆژێکی نەبێ.

ئەفسەرێکی جەندرمەی تورکی، زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی سیاحەتچیان وێنەی بگرن، هەڵبەتە ئەمە کارێکە کە ئاغاکانی لێ ی رازی نێن، چونکە زۆریەی خەڵکی دیار بەکر کوردن، بۆیە هێزی ئاسایشی تورکیا، هێزێکی گەورەی جەندرمەیان بۆ شار نارد، تا نەیەڵن بە هۆی ناکۆکی نەتەوەییەوە هیچ گیروگرفت و کێشەیەک روو بدات، کە دەوڵەت حیسابی زۆری بۆ دەکات.. ئەم هێزە بەردەوام لە حاڵەتی ئامادە باش دا بوو. سەیاحی ئاسایی هەستی بەم بارو دۆخە گرژو نائاساییە دەکرد کە بە هۆی سیاسەتی رەگەز پەرستانەی دەوڵەتەوە دروست بووە.. وەختێ بە نێو بازاڕی شاردا پیاسەیەکمان کرد هەستمان بەوە کردو کاتێ خاوەن موغازەیەک بەدڵ وکوڵ کەوتە باس وستایشی ئەڵمانیای فیدرالی، وەختێ لێمان پرسی کە ئاخۆ کوردە یان نا، رەنگی گۆڕاو ئەو گەشی و خۆشی یەی تۆزێک لەوە بەر لە سیمای تۆرا. چونکە وەکو نوسەری ئەڵمانی (هایکوف فلوت ئاو) دەڵێت لە تورکیادا مرۆڤ دان بە کورد بوونی خۆیدا بنێ تانەمرۆش بڤەیەو سەریەشەو خەتەری گەورە بۆ خاوەنەکەی دروست دەکات. لەگەڵ

ئەوەشدا زۆر کوردی تورکیا توانیویانە بگەنە پلە و پایەی بەرزو پۆستی گرینگ وەکو چۆن ئەمە لە نێو کوردی عێراق و ئێرانیش دا هەیە.. هەڵبەتە گەیشتن بەو پلەو پایەو پۆستە بەرزانە، بەرانبەر بەوەیە کە ئەوانە دەستبەرداری وابە ستەگی نەتەوەیی خۆیان بن، رەگ و رەچەڵەکی کوردی خۆ فەرامۆش بکەن.. بە تەواوەتی ئاوێتەی گەلی تورک بن و بە زمانی تورکی قسە بکەن کە یەکجار دورە لە زمانی کوردییەوە. وێرای ئەم قاییل بوونە نارەزومەندانەیە بە سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی، ئەوا ئەو کوردە هەلپەرستانە لە سەریانە هەمیشە ئاگایان لە خۆ بێت کە پێ خوار دانەنێن دەنا بە بچوکترین بیانوو هەنجەت دێنە ترۆ کرن.

(دافید هوثام) ی رۆژنامەنوسی ئەمریکی دەربارەی ئەو "سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی و سەرکوتکردن و کۆچاندن"ە نوسیوە کە ئەنقەرە دژ بە کوردی تورکیای ئەنجام دەدات. جارێک (هایکو فلوت ئاو)ی رۆژنامە نوسی ئەڵمانی دەیەوێ ئیزن لە حکومەتی تورک وەربگرێ و وەکو پەیامنێری رۆژنامەی (سوید دویچەتسایتونگ) ی ب ناف و دەنگ، سەردانی ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا بکات. وەڵامی رەسمی تورکیا ئەوە بوو، چونکە رۆژنامەکەی لە پاشکۆیەکی تایبەتی دا سەبارەت بە تورکیا، ووشەی (کورد) ی بە کار هێناوەو لە کاتێکدا چ کوردێک لە تورکیادا نی یە، بۆیە رێ ی ناردێ کە سەردانی رۆژهەلاتی عەنەدۆڵ بکات. رۆژنامە نوسی نێوبراو دەڵێ تورکەکان "واسەیری رۆژهەلاتی تورکیا دەکەن کە کولۆنی یەک بێ نەک بەشێک بێ لە ولاتی خۆیان و هەمان مافی بەشەکانی تری تورکیای هەبێ".

لە سالانی بوری دا چەند دەرفەتێک رەخسا تارای گشتی جیهانی لە نمونەی قێزەوەری ئەم سیاسەت و مامەڵە کردنە ئاگاداربکرێنەوە، بە تایبەتی لە رێگەی ئەوانەوە کە توانیان بە بۆنەی کارەساتەکانی ئەو بوومەلەرزانەوە کە لە ناوەراستی هەفتاکاندا ناوچەکەی گرتەوە، سەردانی ئەو ناوچانە بکەن.

### جینوساید تەنیا بە بۆمبا ئەنجام نادرێ

"ئەنگۆ چاک دەزانن کە لێرەدا بە هیچ جۆرێ کورد نی یە، ئەگەر هەشبن ئێمە هەرگیز بیر لەوە ناکەینەوە یارمەتییان بدەین. بۆیە یارمەتی و کۆمەکی ئێوەشمان ناوێ.. سەریان بە گۆری بابیان". بەم شێوەیە دەرەجەدارێکی تورک بە نێوی (مهدی جالدی) بە توڕەیی نزیکەی بیست جوتیارێکی گوندی (یلزدر)ی دەدواند کە لە بەردەمیا وەستا بوون.. ئەمە لە راپۆرتێکی رۆژنامەوانیدا تۆمار کراوە کە (دیر شپێگل)ی ئەڵمانی بلاوی کردۆتەوە. ئەمە لە کاتێکدا بووە کە بوومەلەرزەکەی مانگی ت۱۹۷٦/۲ لە گوندی نێوبراوی دابوو، و بە تەواوەتی وێرانی کرد بوو، پتر لە دوو سەد گوندی چرە دانیشتوانی رۆژهەلاتی تورکیای وێران کرد بوو. ئەو بیست جوتیارە، ئەوانە بوون کە لە کۆی پتر لە دوو سەد کەسی خەڵکی گوندی نێو براو مابوونەوەو نەمردبوون.

پێنج ڕۆژ بە سەر ئەو کارەساتەیاندا بوری بەر لەوەی چ کۆمەکێکیان بگاتێ. پاش ئەوەی سەربازانی تورک گەیینە گوندە وێرانەکە، ئەو بیست کەسە تۆزێک هیوایان پەیدا کردەوە، چونکە بە هۆی برسێتی و سەرماو تۆفی لە ڕادە بە دەرەوە کەوتبوونە نێوان بەرداشی مەرگ و ژیانەوە. دڵیان بەوە خۆش دەکرد کە خێوەت و خواردن و جل و بەرگ لەو بەسەربازانە وەردەگرن کە گوایە بۆ یارمەتی دانیان هاتبوون. بەڵام سەربازەکان بە ئیشی دی هاتبوون؛ ڕانەسپێرابوون کە یارمەتی کوردەکان بدەن، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوون کە ئەندامانی شاندی کۆمەک وەدەربنەن، ئەو شاندەی کە جفاتی مامۆستایانی تورک «توب- دار» دوای ڕۆژێک لە ڕوودانی کارەساتەکە ناردبوویان بۆ ئەو ناوچەیە تا بە پشتی هێسترو وڵاخ کۆمەکی پێویست بگەیەننە لێقەوماوەکان. سەربازەکان وا تێ گەیەنرابوون کە ئەو مامۆستایانە جێ گومانن و گومانی ئەوەیان لێدەکرێ کە "بانگەشەی کۆمونیزمی و جوداخوازی لە نێو خەڵکی ناوچەکەدا بڵاو دەکەنەوە".

هەرچەندە ناکام و ئەنجامی بوومەلەرزەکە بۆ ناوچەکەو خەڵکی ناوچەکە کارەساتێکی گەورە بوو، کەچی حکومەتی تورکیا دەمودەست لەشکرێکی سەربازی بۆ ئەوێندەر نارد. لێ ئەوەی دەردی خەڵکەکەی گرانتر کرد، ئەوە بوو کۆمەکە پێویستەکان نەگەیینە هیچ شوێنێکی ناوچە لێقەوماوەکان، زۆربەی قوربانیانی کارەساتەکە، کە ژمارەیان لە دەهەزار کەس پتر بوو، پاش بوومەلەرزەکەو لە سەرمانا و لە برساندا مردن. هەروەها ئەو چاودێرە نێو دەوڵەتیانەی کە لە هەموو گۆشەو کەنارێکی دنیاوە هاتبوون، نەیانتوانی سەردانی کوردستان بکەن، یان چۆنیەتی دابەش کردنی، ئەو هەموو کۆمەکەی کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان، بە سەر خەڵکی لێقەوماوی کارەساتەکەدا بدیتن.

هەرچەندە (سلێمان دیمیریل)ی سەروک وەزیرانی تورک بەتوڕەییەوە ڕای گەیاند کە: "ئەوپەڕی گەوجێتی یە کە گومان لە پێشکەش کردنی ئەو کۆمەک و یارمەتیانە بکرێ کە زۆر بەرێک و پێکی ئەنجام دراو.. و بیست فڕۆکەی بارهەڵگر ڕۆژانە بەرەو ناوچەی بوومەلەرزەکە دەچوون و.... و.. سوپای تورک بە گیانێکی بەرزی پڕفیداکاری یەوە یارمەتی بێ وێنەی پێشکەش کردووە".

بەڵام واقیعی حاڵی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات، پێچەوانەی ئەو قسانەی دەسەلماند، ئەم واقیعە تفت وتاڵە، گەلێک لە چاودێران و ڕۆژنامەنووسانی تورک و بێگانەی، بە جیاوازی هەڵوێستیانەوە دەرهەق بە ڕژێمی تورک، والێکرد بەڕاشکاوی ئاماژە بۆ حەقیقەتی رەوش و بارودۆخەکە بکەن. بۆ وێنە ڕۆژنامەی (جمهوریەت)ی تورکی کە ڕۆژنامەیەکی مەیلەو لیبراڵە نوسی: "سوپای تورک ئەو خەستەخانە مەیدانیانەیان بۆ خۆ زەوت کرد، کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نارد بوونی". پەیامنێری (دەیلی ئێکس پریس)ی لەندەنی، وێرای ئەوەی هێزی سوپاو پولیس کۆسپ و تەگەرەی زۆریان

خستبوه رێ ی ،توانی بووی خۆی بگەیەنێتە ناوچە لیقەوماکەو نوسیویەتی کە بە چاوی خۆی "چەندین کۆمەڵ دەرمان و کەرەستەی پزیشکی دیتوە کە لەو مەیدانە فڕێ دراون بەو هەنجەتەی کە شوێن نی یە بۆ هەڵگرتنیان، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە سەربازانی پرچەکی تورک لە دوری چەند مەترێکی ئەوشوێنەوە ئێشکی پەنجا خێوەتیان دەگرت کە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نارد بووی.. سەربازە تورکەکان چاوە نۆڕی هەلێک بوون دەست بە سەر ئەو خێوەتانەدا بگرن و بۆ خۆیانی بەرن".

هەروەها پەیامنێری (گاردیان) ڕایگەیاند کە خەڵکی برسی ی ناوچەی (یانگێن تەپە) چەند ڕۆژێک بوو لەبەر بارەگای شاندی کۆمەک خڕبوو بوونەوەو داوای خواردن و پۆشاک و نوێنیان دەکرد. لەو کاتانەدا کە سەربازەکان خەریک بوون خەڵکەکەیان لە بەر بارەگای شاندی کۆمەک دەردەکرد، ئەفسەرەکان لێکدا لێکدا ڕایان دەگەیاند کە گوایە یارمەتی و کۆمەک و باربوەکان ڕاستەوخۆ بۆ گوندە لێقەوماوەکان ڕەوانە کراوە. بەلام پەیامنێری نێوبراو بەچاوی خۆی دەیبینی کە: "هەندێ پیاو بە جل و بەرگی مەدەنی شیکەوە، پێدەچوو فەرمانبەری تورک بن، بە نێو کۆمەڵە کەل و پەلە جۆراو جۆرەکان و بە نێو ئەوگالیسکانەدا دەسوڕانەوە کە جل و بەرگ و پوشاک و خۆراکی هەمە جۆریان بە سەرەوە بوو، هەر شتێکیان بەرچاو بکەوتایە وبەدڵیان بوایە بەبەرچاوی سەربازەکانەوە دەیانبرد".

(یورگن روث)ی نووسەری (ئەڵەمانی)ش نوسیویەتی کە بەشێک لەو کۆمەک و پیتاکانەی بۆ قوربانیانی بوومە لەرزەی ناوچە کوردی یەکان نێردرا بوو، لە هاوینی پاشتردا بینرا بووکە لە هاوینە هەوارەکانی ئیجەدا دەفرۆشرا، کە ژمارەیەک لە فەرمانبەرانی مانگی سوری تورکی مۆڵەتی سالانەی خۆیان لەوێندەر دەقەتاندو لە نێو ئەو خێوەتە گەورانەدا دەنوستن کە کاتی خۆی ئەمریکا نارد بوونی تا بکرێن بە خەستەخانەی مەیدانی لە ناوچەی لیقەوماوەکاندا.

هەندێک لە بەشدارانی شاندی کۆمەکی ئەڵەمانی، ئەوەیان تۆمار کردوە کە ئەگەر کۆمەکەکان دابەشیش بکرایە، بە شێوەیەکی کەیفی (انتقائی) دەکرا. کۆمەکەکان، دەگەیەنرایە لایەنگرانی حکومەت و نەیارانی کورد، ئیدی ئەو لایەنگرانە خەڵک یان ڕێکخراو یان حیزبی نەتەوەیی بوایەن. کوێخای شارۆچکەی (مرادیە) لە شاندی کۆمەک دەرکرا، هەر لەبەر ئەوەی بەئاشکرا ڕای گەیاند کە تەنیا ١/٢ ئەو کۆمەکەی بۆ زەرەرمەندان نێردراوە، بە سەر زەرەرمەندانی ڕاستەقینەی بوومەلەرزەکەدا دابەش کراوە.

عەقیدێکی سوپای ئەڵمانی کە یاوەری ئەو فڕۆکە سوپاییانەی ئەڵمانیای دەکرد کە کۆمەکیان بۆ ناوچە کوردی یەکان هێنابوو، گلەیی کرد کە پیاوەکانی نەیانتوانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کۆمەکەکان پێشکەش بکەن و هەندێ لیژنەی تورکی بڕیاریان

دەدا کە کۆمەکەکان بدرێ یان نا، بڕیاری ئەوەی دەدا کە کێ موستەحەقەو کێ موستەحەق نی یە، هەر ئەوانیش سەلاحیەتی پیاوانی لیژنە ئەلمانی یەکەیان دیاری دەکرد. ئەم پیاوە بە رۆژنامەی (بیلد ئەم سونتاگ)ی راگەیاند کە کۆمەکە ئەلمانی یەکە وەکو پێویست بۆ ئەو مەبەستە بەکار نەهێنراوە کە لە پێناویدا نێردرابوو، بەلکو بۆ مەبەستی تریش بە کار هاتووە.

سەرۆکی ئەو شاندە سوپاییە - پزیشکی یەش کە ئەلمانیا لەگەل خەستەخانەیەکی مەیدانی دا بۆ (وان)ی نارد بوو، رایگەیاند کە هەندێ لایەنی رەسمی تورکیا پێیان گوتووە کە: "لێرەدا نە مردوومان هەن و نە چ زەرەمەندێک هەیە کە مابێ، جا لەبەر ئەوەی نەمردوان و نە زیندوان پێویستیان بە کۆمەکی ئەنگۆ نی یە، بۆیە پێویستیمان بەو کۆمەکانە نی یە کە دەتانەوێ پێشـ تی بکەن". باشترین وەسف بۆ وەزع و حالی جوتیارانی کوردی ناوچەکانی (وان) کە بوومەلەرزەکە زیانی لێدا بوو، ئەوەیە کە (دیر شپیگل)ی ئەلمانی نوسیویەتی: "قەتل وعام و کۆمەل کوژی تەنیا بە بۆمباو چەکی کوشندە ئەنجام نادرێ".

هەر هەموو ئەو نمونانە، کە نیشانەی هەلوێستی دوژمنکارانەو خەمساردانەی دام و دەزگا رەسمی یەکانی تورکە دەرهەق بە ناوچەکانی رۆژهەلاتی تورکیا کە زۆربەی خەلکەکەی کوردن، نە تازەن ونە سەیرن. ئەم رەفتارەی دام ودەزگاکانی حکومەتی تورک هەمان رەفتار بوو، کاتێ کە سالێک لەوە بەرو لە ١٩٧٥/٩/٦ دا بوومەلەرزە لە شاری (لیس)ی کوردنشینی داو بووە مایەی مردنی چوار هەزار کەس لە خەلکی ئەو شارەی کە سەد کیلو مەترێک سەروی دیاربەکر کەوتووە. هەموو هەولێکی ئەو سەربازانەی دەوری ناوچەکەیان دابوو، بریتی بوو لە گەڕان بە دوای چەک و ئەدەبیاتی بە کوردی نوسراو کە قەدەغە بوو، بێ ئەوەی گوێ بە هاوارو نالەی بریندار ان و لێقەوماوان بدەن و لەژێر دارو پەردووی مالە وێران بووەکان دەریان بێنن.

بۆیە نووسەری ئەلمانی (یورگن روث) کە بەوە ناسراوە گوایە دژی سیاسەتی تورکە دەرهەق بە کورد، بە ئینسافەوە رای خۆی تۆمار کردووە دەلێ: "بوومەلەرزەو قەدەغە کردنی گەیاندنی کۆمەک، نمونەن کە چۆن کارەساتە سروشتی یەکان دەکرێن بە چەک دژی کوردی سەرسەخت و کۆلنەدەر، بەتایبەتی کە ژیانی کورد بەلای حکومەتەوە مەسەلەیەک نی یە شایستەی بایەخ پێدان بێ".

## کەمال ئەتاتورک: لە تورکیادا تەنیا تورک هەن

ئەو سیاسەتی چەوساندنەوەو قەتل و عام و جینۆسایدەی کە دژی ئەو هەشت ملێون کوردەی کە شەش یەکی تێکرای خەلکی تورکیا پێک دەهێنن، سیاسەتێکی لە مێژینەی کۆنەو پێشینەو نەریتی خۆی هەیە. بە پێچەوانەی ئەو کوردانەی کە لە

یەکێتی ی سۆڤیەت و عێراق و سوریا و ئێران دا دەژین، کوردی تورکیا لە رووی رەسمی و قانونی یەوە (تورکی چیایی)ن نەک کورد. ئەمە ئەو ناوە رەسمی یەیە کە لە سەرەتای سیاسەتی تورکاندنەوە، کە (کەمال ئەتاتورک) دای هێناو کەوتە جێ بەجێ کردنی، بە بالایاندا براوە.. دامەزرێنەری تورکیای هاوچەرخ و تازە، پاش ئەوەی جێ پێ ی خۆی قایم کردو بەردی بناغەو کۆلەکەکانی دەولەتە نەتەوەییە هاوچەرخەکەی دانا، هەنگینێ رایگەیاند کە بەلای ئەوەوە لە تورکیادا جگە لە تورک، چ کەسێکی دی نی یە.

دیارە ئەم هەلوێستەی ئەتاتورک، کە خۆی لە خۆیدا ئەک حەرامی و سپلەییە، لە پاش روخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە سالی ١٩١٨دا، بەو پەری ساردی و بێ هیواییەوە لەلایەن کوردەکانەوە وەرگیرا، کە زۆربەی خەلکی باشوری رۆژهەلاتی وولات پێک دەهێنن.

سوپای هاوپەیمانان، وەکو لە پەیمانی ئاشتی دا لە سەری رێک کەوتبوون، لە عێراق و سوریاوە بەرەو پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کەوتە پێشرەوی لە پێگە ستراتیژی یەکاندا هەلیان داو لە هەمان کاتدا یونان لە سالی ١٩١٩دا هێزێکی سوپایی لە (سمیرنا)دا دابەزاندو ناوچەی رەخی دەریای (ئیجە)ی گرت.

کورد، ئەم رەوشە تازەیەیان ،بەدەرفەت زانی، تا دەست بە خەباتی خۆ بکەن لە پێناوی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەولەتی کوردی دا، ئەویش لە رێگەی گفتوگۆ لەگەل هاوپەیمانانی سەرکەوتوو لەلایەک و پاراستن و هێشتنەوەی کەنالەکانی پەیوەندی لەگەل ئەو بزاڤە سیاسی یە تازەیەدا کە مستەفا کەمال رێبەری دەکرد. کورد هەولیان دەدا بە پێ ی توانا هەم ئاهەنگی لەگەلدا بکەن، تا دلسۆزی و وەفاداری خۆیان بۆ یەکپارچەیی تورکیا بسەلمێنن .میری کوردی بە سالاچوو (کامەران بەدرخان) کە لە فەرەنسا دەژی، ئاماژەی بو ئەم دووفاقی یەی ئامانج و کارە سیاسییەکانی کورد کردوەو لە سالی ١٩٧٧دا، لە نوسینێک دا وەسفی بارودۆخی ئەوسا، واتا سەردەمی پاش کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانی کردوەو دەلێ: "لەسەر داوای لیژنەیەکی بەریتانی، من و برایەکەم لە سالی ١٩١٩دا سەردانێکی کوردستانمان کرد، تا وەزع و حالی کوردستان هەلبسەنگێنین، هاوپەیمانان بەلێنیان دابوینێ کە ئیعتراف بە کوردستان وەکو دەولەتێکی سەر بەخۆ بکەن. کەچی کوردەکان پێیان ئەنگ بوو لەم زروفەدا پشت بکەنە تورک و لە پشت را خەنجەریان لێ بدەن. لەلایەکی ترەوە مستەفا کەمال لە چەندین بۆنەدا ئەوەی دوپات کردوە کە کورد لە سایەی دەولەتی تورکیادا دەگەن بە هەمان ئەو مافانەی کە هاوپەیمانان بەلێنیان داونەتێ.. تەنانەت کارگەییە ئەوەی زۆر جوتیاری کورد، تورکیان بە برای خۆ دەزانی"..

مستەفا کەمال، بەر لەوەی بکەوێتە دژایەتی هێزی هاوپەیمانان، نامەی شەخسی بۆ زۆر کەسایەتی کورد، لە میرو ئاغا، هەناردو داوای لێدەکردن کەپەیوەندی بە بزوتنەوەی نیشتمانی یەوە بکەن.

لە راستیدا ئەمە ڕوویدا، چەندین هۆزی کورد بەدەم ئەو نامانەوە چوون و زۆر دڵسۆزانە شەڕی هێزەکانی بەریتانیایان کرد، تەنانەت جوتیارانی کورد زۆربەی هەرە زۆری ئەو هێزە تورکی یە بوون کە بەریتانی یەکانی لە (ئورفە) وەدەرنا.. ئەتاتورک لە نامەیەکیدا بۆ یەکێک لە میرە کوردەکان، ئاماژەی بۆ ئەوە کردوەو زۆر بەشان و باڵیدا هەڵی داوەو دەڵێ: "ئەو یارمەتی یەی کە جەنابتان لە جەنگی جیهانیدا، پێشکەش بە سوپای عوسمانی و سوڵتان و خەلیفەتان کردووە، لە ئێمە شاراوە نی یەو مایەی ڕێزو پێ زانینمانە، هەر ئەمە وام لێدەکات ڕێزو قەدری جەنابتم لە لا هەبێ. وەکو دەزانن خەلیفەو، خوا پایەداری بکات، و سوڵتانی عوسمانی و نیشتمانی پیرۆزمان سوکایەتیان پێکراو بێگانە زۆربەی ناوچەی ڕۆژهەلاتی نیشتمانیان بە دیاری داوە بە ئەرمەنەکان".

بەلام هەمو ئەم قسە لوس و هەڵبژاردانەو هاروژاندنی ناکۆکی کۆنی نێوان کوردو ئەرمەن، بە تەنیا نەیدەتوانی هوشیاری نەتەوەیی کورد دابمرکێنێتەوە کە لە نێو کوردا بە خێرایی بلاودەبوەوە. وەکو چۆن بزوتنەوەی نەتەوەی تورک داوای سەربەخۆیی و بوژانەوەی نەتەوەیی دەکرد، کوردیش خۆیان لەوان بەکەمتر نەدەزانی و خۆیان بە شایستەی وەدەست هێنانی هەمان مافی ئەوان دەزانی. وەکو چۆن کوردی عێراقی سایەی داگیرکەری بەریتانیاش هەمان حاڵیان هەبوو. ئیدی کوردی باکورو ڕۆژاوای کوردستان لە دەوروبەری (وان)، (دیاربەکر)، (مەلاتییە) و (کالان) کەوتنە بیرکردنەوە لەوەی کە لە نیری کۆیلایەتی تورکی- عوسمانی کە چەند سەدەیەک دەوامی کرد، رزگار بێن، ئیدی ناسیونالستانی تورکی هەواداری (تورکیای لاو) قایل بێن یان نا.

## ١٩٢٠: هاوپەیمانان، بە ئومێدی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردین

گەلێک لەو ڕێکخراوە کوردییانەی کە دامەزران، دڵیان بە دەوڵەتانی هاوپەیمانی سەرکەوتوو خۆش بوو، بەتایبەتی بەو بەرنامەیەی کە چواردە خاڵەکەی سەرۆکی ئەمریکی (ودرو ویلسون)ی لە خۆگرتبوو، و بەڵێنی دابوو کە بنەماکانی ئاشتی، دوای تەواو بوونی جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر بناغەی مافی پیرۆزی هەر نەتەوەیەک لە دیاری کردنی چارەنوسی خۆیدا ڕۆبنرێ.

جەنەڕال (شەریف پاشا)ی کورد، کە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا ئەفسەری سوپای عوسمانی بوو، وەکو نوێنەری هەموو بزاڤی رزگاریخوازی کورد، بۆ پاریس وەڕێ

کەوت. جەنەڕاڵ شەریف کە پەیوەندی لەگەڵ نوێنەری ئەرمەندا (بوغوس نوبار پاشا)دا خۆش بوو، توانی داخوازییەکانی کورد لە ئازاری ١٩١٩و لە نیسانی ١٩٢٠دا بگەیەنێتە دەستەی ڕاوێژکاری باڵای هاوپەیمانان.

دیارە مەبەستی ڕاوێژی نوێنەرانی دەوڵەتانی هاوپەیمان لەو دانیشتنانەدا کە لە (پاریس)، (سان ریمو) و (سیڤەر)دا کران، ئەوە نەبووکە بنەمای عەمەلی بۆ جێ بەجێ کردنی سەرەتای مافی دیاری کردنی چارەنوسی میللەتان دابنەن، بەڵکو ئەم دانیشتن و کۆبوونەوانە لە بنەڕەتدا بۆ پارچە پارچە کردنی دەوڵەتی عوسمانی و دابەش کردنی بوو بەسەر دەوڵەتانی بچووک بچووکدا، دیارە لەو دابەش کردنەشدا بەرژەوەندییە جیاوازەکانی خۆیان لە باکوری ئەفریقاو ئاسیای بچوک و ڕۆژهەڵاتی ناڤین دا، ڕەچاو دەکرد. داوا لە تورک کرا کە دەستبەرداری هەموو ناوچەو وڵاتە ناتورکی یەکان بێن. هەروەها (باب العالی) ئەلبانیاو ئەو ناوچانەی کە دەوڵەتی یوگسلافیای لەسەر هاتە دامەزراندن و باکوری یونان و مەگدونیای لە دەست دا. لە باکوری ئەفریقادا، تەرابلوسی ڕۆژاوا بەر ئیتالیا کەوت .

ناوچەی بەستێنی دورگەی عەرەبی لە حیجازەوە تا یەمەن بەر بەریتانیا کەوت؛ ئەو بەریتانیایەی کە دەسەڵاتی میسریشی لە عوسمانی یەکان وەرگرت. بەڵام سوریا بەر فەرەنسا کەوت. هەروەها لەسەر ئەوەش ڕێکەوتن کە بەشێک لە عەنەدۆڵیش لە تورکیا بسەنرێ و دەوڵەتێکی کوردی- ئەرمەنی تێدا بێتە دامەزراندن.

دیارە وەختێ کە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری ی دەوڵەتانی هاوپەیمان ڕەشنوسی پەیمانی سیڤەری لە ڕۆژی ١١/٣/١٩٢٠دا تەسلیم بە شاندی عوسمانی کرد، کوردی تورکیا لە ڕادەبەدەر پێ ی کەیف خۆش بوون. هەرچەندە عوسمانی یەکان ئەم لاو ئەولایان کردو هەنجەتیان هێنایەوە بێ فایدە بوو، و ناچار بوون لە ڕۆژی ١٠/٨/١٩٢٠دا پەیمانەکە مۆر بکەن.

مادەی (٦٢)ی پەیمانەکە ئەوەی گرتەخۆ کە زەمینە خۆش بکرێ بۆ دامەزراندنی حوکمێکی زاتی لەو ناوچە کوردنشینەی کە کەوتۆتە ڕۆژ هەڵاتی فورات و باشوری ئەرمینیاو، کە لەگینە دابەزرێ، باکوری سنوری تازەی هەردوو عێراق و سوریا، وکورد لە سایەیدا لە ڕووی ڕۆشنبیری و سیاسی یەوە حوکمی زاتیان هەبێ، بەمەرجێ لیژنەیەکی نێودەوڵەتی هاوبەش لە نوێنەری فەرەنساو بەریتانیاو ئیتالیاو ئێران وکورد، سەرپەرشتی ئەو کیشانە بکات کە لەمەڕ دیاری کردنی سنوورو زامن کردنی مافی کەمینەی ئاسوری- کلدانی لە ئارادان و هەن.

مادەی (٦٣) ئەوەی لەخۆگرتوە کە تورک بەڵێنی ئەوە بدەن کە ئیعتراف بە بڕیارەکانی ئەم لیژنەیە بکات و جێ بەجێ ی بکات. بەڵام مادەی (٦٤) لەوەش زیاتر هاتۆتە

پێشێ و هیوای زۆرتری خستۆته بەر کوردان، کە دەرگای لە بەردەم ئەگەری یەکێتی یەک لە نێوان ئەم ناوچە سەر بە خۆیەداو کوردستانی عێراقدا خستەسەرپشت ودامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد، پاش تاقیکردنەوەیەکی یەک ساڵی و بەراوێژ کردن لەگەڵ کۆمەڵەی نەتەوەکاندا، لەم ماوەیەدا ئەوە هاتووە کە "دەوڵەتانی هاوپەیمان رێ لە هیچ هەوڵێکی یەکێتی ی ئارەزوومەندانەی کوردەکانی بەشی باشوری کوردستان، کە بەشێک بوو لە ویلایەتی موسڵ، ناگرن". لێ گەش بینی و کەیف خۆشی کوردان زۆری نەخایاند؛ چونکە هاوپەیمانان رازو نیازی خۆیان کرد بوو بێ ئەوەی ج حیسابێک بۆ تورک بکەن. ئەتا تورک، لەو سەروبەندەدا ناکۆکی و کێشەی ناوخۆیی بە پشتیوانی عەشایەری کوردو کۆمەکی سوپای دەوڵەتی سۆڤیەتی تازە کورە، برانەوەو بنج بری کرد.. ئیدی ئەتا تورک دەستی بەتاڵ بوو، و سەرکردایەتی یاخی بوونێکی نەتەوەیی کرد دژ بە سوڵتانی عوسمانی لە ئەستەموڵ.

لە ١٩٢١/٤/٢٣دا ئەنجومەنی نیشتمانی تورک لە ئەنقەرە کۆبووەو دامەزراندنی حکومەتی ئۆپۆزیسیونی راگەیاند. هەروەها ئەتا تورک کە دەسەڵاتێکی دکتاتۆریانەی زۆری درابێ، توانی رێبەری و سەرکردایەتی چەند هێرشێک بکات و دوا سەنگەری سەربە سوڵتان لەنێو بەرێ و ئەوە بوو لە ت٢/١٩٢٢دا لابردنی سوڵتانی لەسەر حوکم راگەیاند، بەمجۆرە ئیمزای سوڵتان محمودی چوارەم لە سەر پەیمانی سیڤەر، بە نیسبەت رژێمی تازەی تورکی یەوە شەرعیەتی نەما. ئیدی ئەتاتورک هێرشێکی چڕی دژی پەیمانی سیڤەر دەست پێکرد و، کەوتە کار کردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی و گۆڕینی بە پەیمانێکی دی کە گونجاوتر بێ لەگەڵ بارودۆخی تازەدا. ئەم هەوڵ وکۆششانەی لە ١٩٢٣/٧/٢٤دا سەری گرت و پەیمانی (لوزان) لە ئەنجامی هەڵوێستی توندی تورک و سیاسەتی دووفاقی رباکارانەیاندا، جێ ی پەیمانی سیڤەری گرتەوە.

پەیمانی تازە، هەرچەندە هەندێ مافی کەمی بۆ کەمینەکانی وەک (ئەرمەن و جولەکەو یونان) گرتەخۆ، بەڵام کەم و زۆر باسی دەولەت یان ناوچەیەکی کوردی سەربەخۆ لە ئارادا نەماو تەنانەت پەیمانەکە بە هیچ جۆرێ (وشەی کورد)ی نەگرتەخۆ. دەستکەوتی کورد تەنیا ئەوە بوو کەبەپێ ی مادەی (٣٨ و ٣٩) حکومەتی تورکیا بەڵێنی دا کە "پارێزگاری هەموو خەڵکی تورکیا بکات. ژیان و ئازادییان بپارێزرێ بێ گوێدان بە زێدو وابەستەگی نەتەوەیی و زمان و نەژادو ئاینیان".

### نموونەیەکی ئاشکرای سیاسەتی واقیعی

لەوەوە کورد بۆیان بەدیارکەوت کە دامەزرێنەری تورکیای تازە هەڵی خەڵەتاندون. سیاستوان ومێژونوسی کورد (عبدالرحمن قاسملو) لە کتێبێکی دا کە پاش دووەم جەنگی جیهان بلاو بوەتەوە، رەخنە لە خودی کورد دەگرێ و دەڵێ: "ئەوهەڵە

سەرەکییانەی کە کورد لە سەرو بەندەدا کردویانە، لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوویاندا دوبارە بوەتەوە، ئەوە کە پشتیان بە بەڵێنی زارەکی و ئەو راگەیاندنە گشتیانە بەستوە کە کەمالیستەکان پێیان داون، لەکاتێکدا دەبوایە سوربن لە سەرنیلتزامات و زەمانەتی نوسراو. پێدەچێت سەرانی کورد، تەنیا پشتیان بە متمانەی نێوان هەردوولا بەستبێ و نەیان ویستبێ تورک لە خۆیان بوروژێنن، لە کاتێکدا تورکیا بە قەیران و ئاستەنگێکی نەتەوەی گشتی دا دەڕۆیی. ئەمە جگە لەوەی کە پشتیان بە داب و نەریت و یاساکانی شەرەفی باوی ناوخۆیان بەستوەو لەو بەڵێنانە پاشگەز نەبونەتەوە کە داویانە".

هەرکە پەیمانی لوزان مۆرکراو مستەفا کەمال جێ پێ ی خۆی قایم کرد، ئەوسا کوردەکان هەستیان کرد چ کارەساتێک لەسەر دەستی رژێمی تازە چاوەروانیانە بە ناوی (سیاسەتی واقیعی)یەوە کە شۆڤێنی یە تورکەکان کەوتنە جێ بەجێ کردنی.

هەر لەو ساڵەدا کە پەیمانی لوزان مۆرکرا، دامەزرێنەری دەولەتی تورکیای تازە، زمانی کوردی، تەنانەت لەو ناوچانەشدا قەدەغە کرد کە زۆربەی هەر زۆریان کورد بوون. هەروەها ناوی زۆربەی گوندو شارۆچکەکان گۆڕان و کران بە ناوی تورکی.. سوکایەتی کردنی تورک بە کورد گەییە رادەیەک کە ناوە تازەکانی گوندو شارەکانی خۆیان پێ نەدەگوتن.

ئاشکرایە، مەبەستی ئەم سیاسەتە ئەوەبوو کە کورد لە رووی نەتەوەییەوە بە یەکجارەکی بتوێننەوە. چونکە حکومەت نەیدەویست جگە لە تورک چ کەسێکی دی لە تورکیا دا هەبێ. تەنانەت نوسین یان بەکار هێنانی ووشەی (کوردی) وەکو باسمان کرد، قەدەغە کراو سزای یاسایی بۆ دانرا. بەم پێ یە مادامێکی کورد، تورک بن، هەر چەندە (تورکی چیایی)ش بن، کەواتە زمانەکەشیان تورکی یە. مێژونوسی کورد (عصمت وانلی) دەڵێ: "داهێنانی زاراوەی تورکی چیایی کردیە کارێک کە سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی سەرنەگرێ، چونکە بەپێ ی ماددەی (٣٨)ی پەیمانی لۆزان، دەبێ مافی کەمینە نەتەوەییەکان بێتە پاراستن، خۆ چونکە تورکی چیایی تورکن و ناکرێت تورک بە کەمە نەتەوەیی دابنرێ لە سایەی دەولەتی تورکیای ناسیونالستی دا".

لە ساڵی ١٩٢٤دا پەرلەمانی تورکی گواستی یەوە بۆ ئەنقەرەی پایتەختی تازە. پەرلەمان بڕیاری دا کە سوڵتان لە سەر حوکم لابدرێ و رژێمی خەلیفایەتیش نەهێڵرا و داوا لە سوڵتان عبدالحمید و خانەوادەکەی کرا کە لەماوەی ٤٨ سەعاتدا وولات بە جێ بهێڵن.

بەمەش دوا هەودای پەیوەندی کوردی موسوڵمان لەگەڵ مستەفا کەمالدا پچڕا کە لەلای کوردەکان دەیگوت گوایە ئەو رزگارکەری خەلیفەیەو لەو هەڕەشەو مەترسیانەی دەپارێزێ کە لە دەرێ را دەکرێنە سەری. هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی ئاینی، کە خۆی لە

خۆیدا داوای له خەڵکی دەکرد دەستبەرداری هەموو خەسڵەت و تایبەتمەندی یەکی خودی بن، بۆشاییەکی فیکری گەورەی دروست کرد، تورکەکان بەرنامەیەکیان داناو هەوڵیاندا لە ڕێگەی بانگەشەی بیری ڕەگەز پەرستانەی توندو تیژەوە ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە.

کورد کە ئەمەیان بینی سەرەڕای نائومێدی نەتەوەیی، دوچاری نائومێدی ئاینیش بوون. کاتێک کە ڕەوشی ئابوریش لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتدا کەوتە داتەپین و نرخی شتومەک بەشێوەیەکی خەیاڵی بەرز بوەوەو کەرستەی پێویست لە بازاڕدا چووە قاتی، ئیدی کورد تاقە ڕێگەی ڕزگاری خۆیان لە شۆڕشی نەتەوەیی دا بینی یەوە کە لە ساڵی ١٩٢٥دا بەرپایان کرد. سەرکردەی ئەم شۆڕشە شێخ سەعید بوو کە بە بنەماڵە ڕێبەرایەتی تەریقەتی نەقشبەندییان دەکرد.

لە ماڵی شێخ سەعیدا و لە گوندی (پالو)دا و لەو تەکیەیەدا کە لەوێندەر بەرێوەی دەبرد کۆبونەوەیەک کرا. سەرانی کورد لەزۆربەی ناوچە کوردی یەکانەوە، بە تایبەتی سەرانی دەرسیم و نێودارانی بەتلیس و دیاربەکر، لەو کۆبونەوەیەدا ئامادە بوون. هەروەها ژمارەیەک لەو تورکە دینداڕانەی کە لە حکومەتی تازە ناڕازی بوون و هەواداریان لە خەلیفەو سوڵتان دەکرد، ئامادەی کۆبونەوەکە بوون. ئامادە بووان لە بەینی خۆیاندا ڕێک کەوتن کە ڕاپەڕین بەرپا بکەن و هەموو سوێندیان بۆ یەکتر خوارد کە ئەم ئەرکە ئەنجام بدەن.

## شۆڕشگێڕانی چیا

ئەم شۆڕشە، کە زۆر بە خێرایی بڵاوبوەوەو زۆربەی ناوچەکانی نێوان سەرچاوەکانی دیجلەو فورات و دەریاچەی وان-ی گرتەوە، بە لای تورکەکانەوە شتێکی کوت و پڕو چاوەنۆڕ نەکراو بوو، بەتایبەتی کە شۆڕش لە ناوچەیەکدا هەڵایسا کە درێژی یەکەی ٢٠٠ کیلومەترو پانی یەکەی ٣٠٠ کیلو مەتر بوو. سوپای تورک ناچار بوو بەرەو ڕۆژاواو باشور پاشەکشە بکات و مەخفەرەکانی جەندرمەی بێزراوش لەبەرچاو وون بوون. ژمارەی شۆڕشگێڕان لێکدا لێکدا زیادی دەکرد، گەلێک تیرەو تایفە پەیوەندییان پێوە کرد؛ تا وای لێهات ژمارەی پێشمەرگەو جەنگاوەرانی شۆڕش گەیە پتر لە (٣٠) هەزار چەکدار.

تورک لە ئەنقەرە، کە یەکەمین هەواڵی سەرکەوتنی شۆڕشگێڕانی کوردیان پێ گەیی توشی سەدمەیەکی توند بوون. هەواڵیان پێ گەیی کە کوردەکان ئیپی حەوتیان تەرتەو وەرتە کردوە. لیوای سوارەی یەکیان تەفرو تونا کردووە، ژمارەیەک سەربازی کەوتونەتە دەستی شۆڕشگێڕانی کورد.

تورکەکان تاکۆتایی مانگی ئازار، نەیانتوانی هێزەکانی خۆیان ساز بدەنەوە. ئەوکات توانیان هێزێکی دەست وەشێنی (٣٥) هەزار کەسی ساز بدەن و فەرەنساش کە ئەوکات حوکمی سوریای دەکرد، هێڵی ئاسنی (حەڵەب)ی خستە خزمەتی هێزی تورکەوە. هەروەها هێزێکی تری تورکی توانی ناوچەی رۆژهەڵاتی دەریاچەی وان دابڕن و بەمەش توانی شۆڕشگێران لە سنوری هاوبەشی عێراق- تورکیا دابڕێت. هێرشی گشتی تورک لە مانگی مایس دا دەستی پێکرد، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا شۆڕش لە نێو براو شێخ سەعیدو ژمارەیەک لە سەرانی کورد دەستگیر کران.

هەر چەندە ئەم قەسابخانەیە هێزی تورک دەرهەق بە کوردی شکست خواردیان ئەنجامدا، لەو تاوان و قەتڵ و عامانە کەمتر نەبوو کە عوسمانی یەکان لە پێش و لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەرهەق بە ئەرمەن ئەنجامیان دا، کەچی ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کاتێ مێژوونوسە ئەمریکی یەکان دێنە سەر گێرانەوەی ئەو روداوانە، بەشێوەیەکی نا واقیعی باسی دەکەن.

(ریچارد د.روبنسن)ی مێژوونوسی ئەمریکی کە دێتە سەرباسی مێژووی کۆماری تورکیای یەکەم دەڵێ: "پرۆسەی بەرقرار کردنی هێمنی و چەسپاندنی ئارامی، لە بواری پراتیک دا هەندێ توندو تیژی بەگەل کەوت. بەلام بە هیچ شێوەیەک گەرماوی خۆین نەبووە".

ئاشکرایە ئەمریکاییەکان بە ئانقەست دەیانەوێ شەقڵ و روخساری ئاشتیخوازانەی زیاد لە پێویست بە تورکیای هاوچەرخ بدەن؛ چونکە هاوپەیمانەو دۆستی سیاسی و سوپایی رۆژاوایە. بەلام حەقیقەتەکان لەوە بە سوێ ترو حەیابەرە ترن کە ئەم هەڵوێستە نارەوایانەی تەرفداری لە تورک دەکەن بتوانن بیشارنەوەو لە بەر چاوی وون بکەن. کاری زەبرو زەنگ و تیرۆر دژی کوردان تا چەندین مانگ پاش دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەش بەردەوام بوو. پتر لە دوو سەد گوند لەگەڵ زەویدا تەخت کران. زیاتر لە نۆ هەزار ماڵ سوتێنران، پتر لە ١٥ هەزار مەدەنی کورد کوژران. مێژوونوسێکی تورک ژمارەی قوربانی یەکانی بە پتر لە سەد هەزار کەس قەبلاندووە.

رۆژنامەنوسێکی ئەڵەمانی، لە ساڵی ١٩٧٧دا بۆی هەڵکەوتبوو یەکێک لەو کوردانە ببینێ کە بە چاوی خۆی قەسابخانەکانی ئەو دەمانەی دیتبوو. ئەو پیرەمێرە ئەو رۆژگارەی وە بیر هێنا بوەوەو بۆ رۆژنامە نوسەکەی گێرابوەوەو گوتبوی کە سوپای تورک "پیاوانیان هەڵدەدایە ناو ئاگرەوە، بەلام کە سەیریان کرد بوو خێرا گڕ ناگرن، ئەفسەرە تورکەکە دەستوری دابوو کە ژنانیش فڕێ بدەنە ناو ئاگرەکەوە، تا ئاگرەکە باش گڕبسەنێ، چونکە ژنان لەشیان چەورەو بە گوتەی ئەو ئەفسەرە بلێسە بە ئاگرەکە دەدەن".

هەروەها زانایەکی کۆمەڵناسی تورک، کە لەشەستەکاندا بوو بە یەکێک لە پسپۆڕە دیارەکانی ئەشوغا لە هەردوو ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناڤین، بە چاوی خۆی ئەو تاوانانەی بینی بوو کە ڕۆڵەکانی میللەتەکەی دەرهەق بە کورد کردبویان. ئەو جوامێرە گوتارێکی لەو بارەیەوە بڵاوکردەوە کە ئەزوو بە لەشدا دێنێ. لەو گوتارەدا دەڵێ: "تورکە کەمالستەکان بۆری خوێن ڕێژترین سوڵتانیان دایەوە لە بە کار هێنانی زەبرو زەنگ و هۆڤیتی دا دژبە هاوولاتیانی مەدەنی. بە چاوی خۆم دیتم کە چۆن پەهاوانی دەرەکی تورک، کوردەکانیان لەزیندانان دێنایە دەرێ و گولله بارانیان دەکردن و ئەوجا پشتێنە حەریرەکانیان لە جەنازەکانیان دەکردەوەو دەیانفرۆشت".

تورکەکان، هەر هەموو ئەو ناوچانەی کە گوندەکانیان سوتێنراون، کردیان بە ناوچەی سوپایی و کەوتنە ڕاگوێزانی پاشماوەی دانیشتوەکانیان بۆ ناوچەکانی ڕۆژاوای تورکیا، بە مەبەستی تورکاندنیان، لە خۆیایی بوونی تورک و شانازی کردنیان بە تاوانەکانیانەوە گەییە ڕادەیەک کە یەکێک لە ڕۆژنامە ڕۆژانەکان بێ چ شەرم یان سزایەک بنوسێت: "کێشەی کورد لە هەر شوێنێک دا سونگی و قەمەی تورکی بگاتێ، نامێنێ".

تورکەکان هەموو رق و کینەیەکی خۆیان بە سەر سەرکردایەتی کوردا رشت. لە کۆتایی مایس داو لەیەک شوێنداو بە ئاشکراو بە بەرچاوی خەڵکەوە ئەوەدو یەک کەسیان ئیعدام کرد، لە ئەرزروم. لە ٦/٢٧دا دەستەیەکی چل وحەوت کەسی تریان لە سەرانی شۆرش ئیعدام کرد. بەڵام شێخ سەعید لەگەڵ دەستەی سێیەمدا کە ئەوەدو سی کەس بوون، ئیعدام کران؛ هەڵبەتە بە چەند ڕۆژێک دوای ئیعدام کردنی دەستەی دووەم، ئیعدام کران.

دادوەری گشتی، زۆری خۆماندوو کرد تا زۆرترین ژمارەی تاوان هەڵبەستێ و بیداتە پاڵ ئەو کوردانە: تۆمەتی هەندێکیان ئەوە بوو کەگوایە "جۆرە دەسەڵاتێکی جێ بەجێ کردنیان بەخۆ داوەو بەمەش سوکایەتیان بە هەیبەت و شکۆو دەسەڵاتی دەوڵەت کردووە". کۆمەڵێکی تریان بەوە تاوانبار کران کە گوایە: "بەرگرییان لە سوڵتانی لێخراو" کردوە. کۆمەڵی سێیەمیش تاوانەکەیان ئەوە بوو کە "باوەڕی ئاینی خۆیان کردوە بە بیانوو تا لە سایەی دا یاخی بوون بەرپا بکەن". بەڵام هەر هەموشیان لە تاوانێکی دیدا شەریک بوون. ئەویش ئەوە بوو: "هەموو ڕێک کەوتبوون لەسەر دامەزراندنی دەولەتی سەربەخۆی کوردستان".

## بەمجۆرە قەتڵ و عام و جینوسایدی کورد دەستی پێکرد

کورد هیچ ئومێدو دەروەیەکی بۆ نەمایەوە کە پشتیوانی دەرەکی وەدەست بێنێ. لە ئێران دا (ڕەزا خانی پەهلەوی) دەسەلاتی گرتە دەست و هێزەکانی حکومەت سەرقاڵی شەڕی

ئەو عەشایەرە کوردانە بوو کە دەسەلاتی ئێرانیان رەفز دەکرد. حکومەتی ئینتیدابی بەریتانی لە عێراقدا لە لایەکەوە سەرقالی سەرکوتکردنی ئەو بزوتنەوەیە بوو کە شێخ مەحمودی حەفید رێبەرایەتی دەکردو داوای سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد. لەلایەکی ترەوە ئینگلیز دەبوایە رێگەیەک بدۆزنەوە تا خۆیان لە ئەنجامدانی ئەو ریفراندۆمە بدزنەوە کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بریاری ئەنجامدانی دابوو، تا چارەنوسی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی عێراق) دیاری بکرێ.

حکومەتی سۆڤیەتی تازەش لە روسیادا، پێویستی یەکی زۆری بە گەورەترین و زۆرترین ئیعترافی نێودەولەتی هەبوو. بۆیە هیچ دڵی پێوە نەبوو لە پێناوی یارمەتی دانی کەمینە نەتەوەییەکی چەوساوەدا سەریەشە بوخۆی دروست بکات و ئەو پەیمانی بێ لایەنی و خۆش دراوسێ یەتی یە بشکێنێ کە لەگەڵ ئەنقەرەدا بەستبووی. بەمجۆرە کورد جارەکی دی بوون بە قوربانی بەرژەوەندی یە نێودەوڵەتی یەکان و پرۆسەی قەتڵ و عامی کورد لە تورکیادا دەستی پێکرد بێ ئەوەی کەس هەر ئاوڕی لێ بداتەوەو گوێ ی بداتێ، ئەو پرۆسەیەی کە تارۆژگاری ئەمڕۆکەش بەردەوامەو لەسەر پێ یە.

حەقیقەتێکی تر هەیە پێویستە ئامازەی بۆ بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە کورد لەو سەردەمەدا هیچ گروپێکی گوشاری سیاسی (لوبی) لە هیچ دەوڵەتێکی دنیادا نەبووە. بەلام ئەوە ئەمە ناگەیەنێ کە هەمیشە هێزو لایەن هەن بروانە ئەو رووداوانەی کە لە کوردستاندا روو دەدەن و چاودێری پەرەسەندنی رووداوەکان دەکەن. بەلام هەموو بایەخدانێکی ئەو هێزو لایەنانە لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ بریتی یە لە سود وەرگرتن لە رووداوەکانی ئەوێندەرو هەوڵدان بۆ ئاراستەکردنی بە شێوەیەک کە بەرژەوەندی یەکانی خۆیان بپارێزن. لەلایەکی ترەوە دەوڵەتانی ناوچەکەو دوڵەتە گەورەکانیش هەمیشە وا روانیویانەتە کورد کە بەردی دامەن لە گەمەی بەرژەوەندی یە هاوبەشەکاندا.

بۆیە ئەو بیانوەی کە تورکیاو دەوڵەتانی تری رۆژهەلاتی ناڤین بە دەمیانەوە گرتوە کە گوایە کورد کۆسپن لەرێگەی پەرەسەندن و گەشەکردنی ئەو وولاتانەدا، بیانویەکی بێ بنج و بناوانە، ئەویش لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، کە زۆربەی ئەم دەوڵەتانە بە خۆیان کارتۆنین و دەوڵەتە ئیستعماری یەکان قوتیان کردونەتەوە. تاقە هۆیەک کە ئەم حکومەتانە شەرعیەتی خۆیان پێ دەسەلێنن ودەسەپێنن، هێزو زەبرو زەنگە؛ چونکە لە بنەرەتدا ئەم شەرعیەتەیان لە رێگەی پشتیوانی میللی و گوێ رایەڵی خەڵکی یەوە وەرنەگرتووە. ئەم دەوڵەتانە هەر هەموویان پارچە دەوڵەتن و هاوپەیمانان کە لە یەکەم جەنگی جیهاندا سەرکەوتن، لە جەستەی زەبەلاحی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان کردەوەو بەپێ ی بەرژەوەندی و ئارەزوی خۆیان مشت و ماڵیان داون. وەکو چۆن ئیمپراتۆریەتی ئەمساوی-هەنگاری پارچە پارچە کراو، بە هەنجەتی ئەوەی کە ئەم هەموو گەلە جیاوازە ناتوانن لە سایەی یەک دەوڵەتدا بژین، بوو بەکۆمەڵێک دەوڵەت و دەوڵەتۆکەی تازە

که یەک لەوان چیکۆسلوفاکیا بوو، بە هەمان شێوەش ١٥ملیون کورد پارچە پارچە کراو فڕێ درایە زیندانەکانی ئەو دەوڵەتانەوە لە عێراقی سەر بە دەسەڵاتی ئینگلیزو سوریای سەر بە فەرەنسا، یان دەوڵەتی تورکیای تازە کە کەمال ئەتاتورک دای مەزراند..

بۆیە سەیر نەبوو دەوڵەتە ئیستعمارییەکان بە هەموو قورسایی و توانایەکی خۆیانەوە بەشداری لە پرۆسەی چەوساندنەوەی کورد بکەن. چونکە کورد لەو سەرو بەندەدا کۆسپ بوون لە رێگەی جێ بەجێ کردنی نەخشەو پلانەکانی دەوڵەتە ئیستعماری یەکان، کە زۆریان مەبەست بوو پارێزگاری ئەو دابەش کردنە بکەن کە لە ناوچەکەدا کردبوویان: عێراق، چەند جارێک هانای وەبەر فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی پاشایەتی بەریتانیا برد بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی کورد. هەروەها تورکیا داوای یارمەتی لە فەرەنسا کرد، کە رێ بە هێزەکانی تورک بدات، کە هێڵی ئاسنی سوریا - فەرەنسا (هێڵی حەلەب) بەکار بێنن بەو مەبەستەی پشت لە هێزی کورد بگرنەوەو لە پشتەوە لێ ی بدەن. لە راستیشدا زۆر سەخاوەتمەندانە ئەم یارمەتی یە درا.

## ئەهرۆ رەخنە لە هەڵوێستی تورک، دەرهەق بە کورد، دەگرێ

جەواهیرلال ئەهرۆ کە ئەو دەمە هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، و پاش چەند ساڵێک لەوە بەدواوە بوو بە سەرەک وەزیرانی هیند، تاقە کەسێک بوو کە رەخنەی لەم هەڵوێستەی تورک دەرهەق بە کورد، گرت. ئەهرۆ رەفزی کرد کە شۆڕشی کوردی ساڵی ١٩٢٥ بە بزوتنەوەیەکی کۆنە پەرستانەی ئاینی دابنرێ، بەڵکو بە سەرەتای بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی تازەی گەلێکی لەقەڵەم دا کە لە پێناوی ئازادی خۆیدا دەخەبتێ و ئەوچەوساندنەوەیە رەفز دەکات کە دەوڵەتی مەرکەزی دژی دەیکات. ئەهرۆ، رەخنەی لەو هەڵوێستە ریاکارانەیە گرت کە تورکەکان دژی کورد وەریان گرت؛ ئەو کوردانەی داوای هەمان مافیان دەکرد کە بزاڤی ناسیونالستی تورکی لە پێناویدا دەخەبتی. ئەهرۆ ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە تورکەکان هەستی نەتەوەیی و ئەخشەدانان بۆ ئاینده تەنیا بە خۆیان رەوا دەبینن، ئەوەی بۆ خۆیان بەرەوای دەزانن بۆ کورد بە رەوای نازانن، ئەمەش هەمان هەڵوێستی هەڵەی حکومەتە کورد کوژەکانی عێراق و ئێرانە.

ئەهرۆ، ئەم هەڵوێستەی لە کتێبەکەی خۆیدا (چاوخشانێک بە مێژووی جیهاندا) کە لە ساڵی ١٩٢٥دا بڵاوبوەتەوە، تۆمار کردوەو نوسیویەتی کە تورکەکان: "ئەوانەی کە تازە ئازادی خۆیان وەدەست هێنا بوو، کەوتنە قەتڵ و عامی ئەو کوردانەی کە بۆ ئازادی خۆیان دەگەڕان. عەجایەب نی یە کە بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بەرگریکارانە بگۆرێت بۆ بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی دوژمنکارانە؟ عەجایەب نی یە خەباتێکی سەربەخۆخوازی بگۆرێ بۆ کێشەیەک بیەوێ خەڵکانی دی بچەوسێنێتەوە؟ کورد لە ساڵی ١٩٢٩دا ئاگری شۆڕشێکی تریان هەڵایساندەوە، کە ئەویش، ئەگەر بۆماوەیەکی

کورتیش بێ، دامرکێنرایەوە، بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێ باوەڕ بە بەردەوام بوونی چەوساندنەوەی گەلێک بکات کە سوور بێ لە سەر وەدەست هێنانی سەربەخۆیی و ئامادە بێ لەو پێناوەدا، هەر قوربانی یەک چەند گەورەش بێ، بیدات؟"

هەموو ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشە کوردیانەی لە دوایی شۆڕشی ١٩٢٥هاتن، بە هەمان توندو تیژی ودڕندییەوە سەرکوت کران. لە سالی ١٩٢٧داو وەک بلێ ی کورد، واقیعی شکستیان بەزاندبێ، توانیان لە کۆنگرەیەکی نهێنی دا، هەموو ڕێکخراوە کوردی یەکان لە سایەی دەستەیەکی باڵای سەر پەرشتکاردا یەک بخەن و ناویان نا ڕێکخراوی (خویبوون). لە پەیڕەوو پرۆگرامی (خویبون)ـەوە بەدیارکەوت کە بزاڤی رزگاریخوازی کورد، بۆ هەتا هەتایە شەقڵی ئاینی وەلاناو ئامانجێکی بۆ خۆی دانا کە بریتی بوو لە وەدەست هێنانی سەربەخۆیی کوردستان یان بەلای کەمەوە وەدەست هێنانی حوکمی زاتی راستەقینە. ئیدی لەوساوە مەسەلەکە لەوە دەرچوو کە بریتی بێ لە وەدەست هێنانی ئازادی ئەم تیرە یان ئەو هۆزە.

بەڵکو هەر بزاڤ و راپەڕینێکی کوردی لەوە بەدواوە دروشمێکی ناوەندی بۆ خۆی هەڵدەگرت کە بریتی بوو لە وەدیهێنانی سەربەخۆیی کوردستانی گەورە یان بەشێک لە بەشەکانی کوردستان، بەڵام شۆڕشگێرانی کورد هەمیشە ئەو حەقیقەتەیان لە هزرو بیرابوو کە ناتوانن روو بەرووی هەموو ئەو حکومەتانەی عێراق و تورکیاو ئێران وسوریا ببنەوە کە کوردیان وەکو کەمایەتی نەتەوەیی بەسەردا دابەش کرابوو. هەروەها چاوەڕوانی کۆمەک و یارمەتی و هاوکاری بەشەکانی تری کوردستان بوون و بە فاکتەرێکی گرینگیان زانیوەو لە هەموو بزوتنەوە رزگاریخوازەکانی کوردا دەوری دیتوە. حەقیقەتێکی تریش هەبووە کە هەمیشە پێویست بووە لە بەرچاو بگیرێ، ئەویش ئەوە بووە کە کارێکی وەها نەکرێت لەکاتی شکستی سوپایی بزوتنەوە چەکداری یەکاندا نەتوانرێ پەنا وەبەر دەوڵەتە دراوسێکان ببرێ.

کەواتە ئەرکی سەر شانی (خۆیبون) لە شۆڕشی تازەدا، ئەوە بوو ئەرکی سەرۆکایەتی سیاسی وهەم ئاهەنگی سوپایی لە ئەستۆ بگرێت. نەخشەکە وەهابوو کە یەکەمجار لە دورترین شوێنی رۆژهەڵاتەوە دەست بە شۆڕش بکرێ؛ چونکە دەکەوێتە سەر سنوری یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەش خۆی لە خۆیدا پشتیوانی یەکی گەورەیە بۆ شۆڕش. هەروەها عەشیرەتی (جەلالی) کە خێوەتەکانیان، نزیکەی ١٥هەزار خێوەتێک دەبوو، لە بنارو قەد پاڵەکانی چیای ئارارات دا هەڵدابوو، یەکەم تەقە دەست پێ بکەن. هەروەهاش کراو ئەوجا عەشیرەتی (حەیدەران) بەدوایدا هات و لەدوورترین ناوچەی رۆژاواوە شۆڕشی راگەیاند. هەر کە سالی ١٩٣٠هات ئیدی هەموو ناوچەی ئارارات تا سنوری تورکیاو ئێران و هەموو ناوچەکانی رۆژهەلاتی دەریاچەی وان بوو بە بەرمیلێکی باروت و هەر ئانێ بتەقایەتەوە دەتەقی یەوە.

## له بنارو قه‌دپاڵه‌كانی چیای ئارارات دا

شۆڕشگێرانی كورد ئه‌مجاره، له ڕووی چه‌كه‌وه زۆر باشتر بوون وه‌ك له ساڵی ١٩٢٥، تا ئێستاش سه‌رچاوه‌ی ئه‌م چه‌كه‌یان هه‌رنادیاره. ئه‌مجاره ئه‌فسه‌رێكی سوپایی كارامه‌و خاوه‌ن ئه‌زموون به ناوی (ئیحسان نوری) كه له (بەتلیس) له دایك بوو بوو، وكۆلیجی سوپایی ئه‌سته‌مولی ته‌واو كرد بوو، وله سوپای عوسمانی دا ئه‌فسه‌ر بوو، سه‌ركردایه‌تی سوپایی شۆڕشه‌كه‌ی له ئه‌ستۆ گرت. ئه‌م ئه‌فسه‌ره كورده له ژێر ئاڵای مسته‌فا كه‌مال دا به‌شداری شه‌ڕی سه‌ربه‌خۆیی توركیای كرد، دژی یونان شه‌ڕی كرد. ئه‌و ده‌مه پله‌ی ئه‌قیب بوو. ئه‌و ئه‌خشه‌یه‌ی كه (ئیحسان نوری) دایناب‌وو، ئه‌وه بوو كه شۆڕش له ڕۆژهه‌ڵاته‌وه هه‌ڵگیرسێنرێ تا وه‌كو ئاگری ئێو پوش به‌ره‌و كوردستانی ناوه‌ندی بته‌نێته‌وه‌و له ده‌رسیم و دیاربه‌كره‌وه بڕوات تا ده‌گاته ئه‌و ناوچانه‌ی كه به‌رده‌وام له پێنج ساڵ شۆڕشی ١٩٢٥ گرتبونی یه‌وه.

به‌ڵام ئیحسان نوری، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه له سه‌ره‌تاوه كۆمه‌ڵێك سه‌ركه‌وتنی دیاری به‌ده‌ست هێنا، ده‌یزانی كه له دوا ئه‌نجامدا سه‌ركه‌وتن بۆ شۆڕشگێڕانی كورد نابێت. چونكه هێزی تورك له ڕووی چه‌كه‌وه به‌تایبه‌تی هێزو چه‌كی ئاسمانی، زۆر له كورد باڵا ده‌ست تر بوو. ئه‌مه جگه له‌وه‌ی هێزی تورك مه‌شقێكی چاكی پێ كرابوو، وجه‌نه‌ڕاڵ ساڵح پاشای پسپۆڕو شاره‌زای شه‌ڕی پارتیزانی سه‌ركردایه‌تی ئه‌و هێزه‌ی ده‌كرد. هێرش و په‌لاماری تورك به هێزێكی تایبه‌تی دوانزه هه‌زار كه‌سی یه‌وه ده‌ستی پێكردو پاشان ئه‌م هێزه زیاد كراو گه‌یه‌نرایه چل هه‌زار كه‌س. ساڵح پاشا، له یه‌ك كاتدا دوو هێرشی له دوو قۆڵی ده‌ریاچه‌ی (وان)ـه‌وه ده‌ست پێكردو توانی به‌زه‌بری ئه‌و دوو هێرشه به‌ره‌ی كورده‌كان شه‌ق بكات و له یه‌كتریان دابڕێ و خه‌تی په‌یوه‌ندیی‌یان به كوردستانی ناوه‌ندی یه‌وه بپچڕێ و له‌لایه‌كی تره‌وه له سنوری توركیایان دابڕێ. كورد، له شه‌ڕه یه‌ك لاكه‌ره‌وه‌كه‌ی دوای ئه‌و هێرشه‌دا، پتر له هه‌زار كه‌سیان لێ كوژرا.

ئیحسان نوری پاشا، به‌رانبه‌ر به‌م وه‌زع و حاڵه چ ڕێگه‌یه‌كی له‌به‌رده‌م ئه‌ما ته‌نیا ئه‌وه نه‌بێ كه قوه‌ته سه‌ره‌كی یه‌كه‌ی بۆقوڵایی زنجیره چیاكانی (ئاراراتی بچوك) و (ئاراراتی گه‌وره) پاشه‌كشه پێ بكات، به‌و هیوایه‌ی كه ڕێگه‌وبان و دۆڵه پڕپێچ و په‌ناكان و لوتكه‌و زناران و ره‌وه‌زو زه‌نده‌ڵانی گركانی ده‌رفه‌تی ئه‌وه‌ی بۆ بڕه‌خسێنێ كه خۆ قایم بكه‌ن و پشوویه‌ك بده‌ن. هه‌روه‌ها به ئومێد بوو كه ئه‌و سروشته شاخاوی یه هه‌زار به هه‌زاره بۆی ببێ به په‌ناو ده‌رفه‌تی ئه‌وه‌ی بۆ بڕه‌خسێنێ كه بۆ ماوه‌یه‌كی درێژتر درێژه به شه‌ڕ بدات.

ئیحسان نوری له خوتبه‌یه‌كدا بۆ هاوڕێ جه‌نگاوه‌ره‌كانی، باسی بیره‌وه‌ری یه سوپاییه‌كانی خۆی له‌م ناوچه‌یه‌دا بۆ كردن و گوتی: "چاك ئه‌وه‌تان له بیر بێ كه له ساڵانی ١٩١٥ و١٩١٧دا سوپایه‌كی روسیا توانی بێته قوڵایی (١٥٠) كیلۆ مه‌تری

خاکی تورکیاوە، بەڵام نەیان توانی دەرەقەتمان بێت، هەر چەندە گەمارۆیەکی دوو ساڵییان خستینە سەر بەڵام کاتێ کە یەکەم جەنگی جیهانی تەواو بوو ئێمە هێشتا هەر مابوین و هیچمان لێ نەهاتبوو".

مەبەستی سیاسی ئەم پاشە کشەیە بریتی بوو لە خۆ قایم کردن لە سێ سنوری روسیا و ئێران و تورکیا و بەرگری کردن لەم قەڵا سەختەو راگەیاندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ناوچە رزگار کراوەکان و دامەزراندنی حکومەتێکی کاتی و هەوڵدان بۆ گەیاندنی دۆزی کورد بە کۆمەڵەی نەتەوەکان لەرێگەی هێزێکی دۆستی کوردەوە. بەڵام ئەم هێزە کێ بوو؟ ئەمە هێشتا مەعلووم نەبوو. هیچ شتێکیش لە گۆڕێ نەبوو کە ئاماژە بێ بۆ ئەوەی هێزێک هەبێ ئەم دەورە بدینێ لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکان، هەر بەتەما بوون ئەو هێزە فریایان بکەوێ و رزگاریان بکات. بەڵام جارێکی دی هیواو ئاواتەکانی کورد هەڵوەرین کاتێ (رەزای یەکەم)ی شای ئێران دەستوری دا کە رێگە گرینگ و سەرەکی یەکان لە کوردەکان دابخرێ و نەهێڵرێ لەو رێگایانەوە هیچ شتێکیان پێ بگات. هەروەها ئێران، لەسەر داوای تورک، هێزێکی سوپایی بە فەرماندەیی عەقید (ئەخشەوان)ی کۆنە ئەفسەری سوپای تزاری روسی نارد بۆ ناوچەکە تا تەیارو ئامادە بێت بۆ پەلاماردانی سەنگەرەکانی شۆڕشگێرانی کورد لەکات وشوێنی پێویست دا.

ئەو هێرشە چاوەڕوان کراوە لە چیای (موساداغ)ەوە دەستی پێکرد. ئەمە ئەو چیایەیە کە گەیە ئاستی نێودارترین چیای جیهان، پاش ئەوەی (فرانس ڤیرفیلس) لە ساڵی ١٩٣٣دا کتێبێکی نوسی دەربارەی قەسابخانەکانی تورک دژ بە ئەرمەن لەو چیایەدا. ئەخشەوان،توانی هێزەکانی کورد دەربەرێنێ و تابنارو قەد پاڵەکانی چیای ئاراراتی بچووک دوایان بکەوێ. هەرچەندە عەقید ئەخشەوان لەو شەڕەدا کوژرا، بەڵام شۆڕشگێرانی کوردیش لە دوای ئەو شەڕە لە سنوری ئێران و لە سنوری سۆڤیەت دابڕان. شۆڕشگێرانی کورد بەرگری یەکی زۆر دلێرانەیان کرد، زەرەرو زیانی گیانی و ماڵی گەورەیان لە هێزەکانی تورک دا.. بەڵام رووداوەکان بەئاشکرا دەریان خست کە زەمەن و سەردەم لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە زۆر گۆڕاوە، بەلای کەمەوە لە رووی سوپاییەوە زۆر گۆڕاوە. بەڵام ئەوزارو ئامێرەکانی سەرکوتکردن بە هەمان توندو تیژی خۆیانەوە مابوونەوە، بەڵام بە شێوەیەکی تازەترو هاوچەرخانەتر. هێزی زەمینی تورک هەرکاتێ نەیان توانیایە پەلاماری سەنگەرەکانی کورد بدەن و پێشڕەوی بکەن، هانایان وەبەر چەکی ئاسمانی دەبرد. حەسەنی ئەرفەعی، مێژونوسی ئێرانی، زۆر بەچاکی وەسفی ئەو رووداوانەی کردووەو نوسیویەتی: "فڕۆکەکانی تورک کاتێ کە نەیان دەتوانی چەکدارە کوردەکان، لە سەنگەرە قایم و پۆشراوەکانیان دەربەرێنن، دەکەوتنە پەلاماردانی ژن و منداڵ لە نێو ئۆردەگاکانی پشتەوەو خێوەت و شوێنەکانیان بە ئەزمی و بە چەکی سووک دادەبێژت. یان مەڕو ماڵاتەکانیان قردەکرد".

شۆڕشگێڕە گەمارۆ دراوەکان، لە نا ئومێدی یەوە بانگەوازی داوای کۆمەکیان لە (چیای ئاراراتی پیرۆزەوە) نارد. ئەم بانگەوازە بە نهێنی لە سەرانسەری تورکیادا بلاوکرایەوەو تەنانەت گەییە سوریاو عێراقیش. کوردی سوریا لە رێگەی تایبەتی خۆیانەوە ئەم بانگەوازەیان گەیاندە بەیروت و پاریس.

کۆمەڵەی نەتەوەکان لە جنیف ئوسخەیەکیان لەو بانگەوازە بەدەست کەوت. بەڵگەنامەی (sawisdats) ئەو سەردەمە بەم رستە کاریگەرە دەستی پێکرد بوو:

"برا کوردەکانمان.. دەستو برد بکەن و بیسەلمێنن کە شایستەی ئەوەن رۆڵەی نەتەوەیەکی گەورە بن. چۆن قایبیل دەبن رۆڵەکانی گەلی کوردی ئەجیب و خانەدان وەکو کۆیلەو بەندە لە ژێر ئیری تورکاندا بژین، ئەو تورکانەی بەڵێنیان داینێ کە ئێمەش دەوڵەتی سەربەخۆی خۆمان هەبێ لە نێوان ئێران و عێراقدا؟... وەرنە ریزی ئەو خەباتەوە کە لە پێناوی رزگارکردنی براکانمان لە چنگی داگیرکەری تورک، دەستمان داینێ . بەشداری بکەن لە ئازاد کردنی ئەم خاکەدا کە هەزاران ساڵە لە سەری دەژین... چەند دەستە جەنگاوەرێکی کوردستانی سوریا بە دەنگی ئەم بانگەوازەوە هاتن و چوونە خاکی تورکیاوە تا لە باشوریشەوە شۆڕش هەڵگیرسێنن.

لەکۆتایی تەموزی ساڵی ١٩٣٠دا شێخ ئەحمەد بارزانی لە باکوری عێراقەوە هێزێکی پێنج سەد کەسی بە فەرماندەیی برا بچوکەکەی (مستەفا بارزانی) نارد بۆ خاکی تورکیاو لە (ئورەمار)دا پەلاماری تورکەکانی داو غافڵگیری کردن، بەلام شتەکە لەوە زیاتر تەشەنەی نەکرد. هێزەکانی تورک کە لە رووی ژمارەو چەکەوە بالا دەست تر بوون، توانیان ئەو جەنگاوەرە کوردانە تێک بشکێنن کە لە وولاتە دراوسێکانەوە هاتبوون و پاشەکشەیان پێ بکەن. لەلایەکی ترەوە مەلایانی کورد بانگەوازێکیان بۆ سەفیرانی دەوڵەتە رۆژاواییەکان لە بەغداو کۆمەڵەی نەتەوەکان نارد، رۆژنامەی (الرابطە العربیە)ش کە لە کەرکوک دەردەچوو بلاوی کردەوە. کەچی ئەو بانگەوازەی کە دەیویست "سەرنجی رای گشتی جیهانی بۆ تاوانەکانی تورک دەرهەق بە کورد و قەتڵ وعام ولە نێو بردنی کوردان راکێشێت" دەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو.

لەم کاتەدا شۆڕشگێڕەکان پتر سەنگەرەکانیان قایم کردو مقاومەتی قارەمانانەیان زیاتر کرد، بەو ئومێدەی بتوانن خۆرابگرن تا وەرزی زستان بێت و پەرزە لەبەر هێزەکانی تورک ببڕێ و چیتر نەتوانن بێنە پێشێ. بەلام زۆری نەبرد سەیریان کرد ناچارن دەستبەرداری بەرگری و مقاومەت ببن، چونکە فیشەک و تەقەمەنی و هەموو شتێکیان لێ برا، ئیدی ئەوانە، مەرگیان پێ چاکتر بوو لە یەخسیری تا دوافیشەک بەرگریان کردو مردن و ئەوانی تریش ناچار بوون لە پایزدا خۆیان تەسلیم بە هێزەکانی تورک بکەن.

## حەوت سەد هێندەی تاوانەکەی لیدیس lidice

تۆڵەسەندنەوەی تورک لە شۆڕشگێڕانی کورد، یەکجار دڕندانە بوو. باشترین وەسفێک بۆ وەزع و حاڵی ئەوساکە ئەوەیە کە (جافید)ی پسپۆڕی کۆمەکی جیهانی کردویەتی و نوسیویەتی و دەڵێ: "ئەگەر هۆلاکۆ و تەیمور لەنگ بماban، زۆر بە قوتابی یە تورکەکانیان خۆشحاڵ دەبوون وحەسودییان بەکارە دڕندانەکانیان دەبرد". حەوت سەد گوندی کورد لەگەڵ عاردی دا تەخت کران و هەمور خەڵکەکانیان هاتنە سەربڕین جگە لە تاک و تەرایەکیان نەبێ کە بۆ ئەشکەوتەکانی ئارارات هەلاتن و ئەوەبو بە دوازدە ساڵ بەر لە تاوانەکەی (لیدس) لە کوردستانی تورکیادا حەوت سەد جاری یەک لە دوای یەک هەمان تاوان جێ بەجێ کرا بێ ئەوەی کەسێک یان لایەنێک ئاماژەیەکی بۆ بکات چ جای موناقەشە کردن و هەوڵدان بۆ ئەوەی کە سنورێکی بۆ دابنرێ. هەروەها هەمور ئەندامانی سەرکردایەتی شۆڕش کە (٥٣) کەس بوون، پاش دادگاییەکی سوپایی رواڵەتی، لە دیاربەکر هاتنە ئیعدام کردن و سەربڕین.

لە هەوڵێک دا بۆ ریشەکێش کردنی بزاڤی رزگاری کورد، پرۆسەیەکی پاکودان و لە نێو بردنی رۆشنیران و زانایانی کورد بە شێوەیەکی دڕندانەو هۆڤانەی وەها دەستی پێکرد کە مێژوو وێنەی نەدیتوە: هێزی جەندرمەی تورک سەد کەسیان لە رۆشنبیرانی کوردی خەڵکی ناوچەی (وان) لە مامۆستاو ئەدیب و قوتابی گرت بە تۆمەتی ئەندامێتی لە حیزبی (خۆیبون)یان هاوسۆزی لەگەڵ حیزبی کۆرین دا. هەر هەمور ئەمانە بە دەست و پێ ی بەستراوەوەو دوای ئەوەی بە بەلەم تا ناوەندی دەریاچەکە گوێزرانەوە، ئەوسا بەو حاڵەوە فڕێ درانە ناو ئاوی دەریاچەکەوە.

وەکو درێژەی سیاسەتی (هێمن کردنەوەی ناوچەکە) و (گەڕانەوەی ئەمن و ئاسایش و ئارامی بۆ ناوچەکە) حکومەتی ناوەندی دەستوری کۆچاندنی هەمور ئەو عەشیرەتانەی دا کە بەشداری شۆڕشیان کردبوو. بەمجۆرەو بەم هەنجەتە پتر لە پەنجا هەزار کەس راگوێزران بۆ ناوچەیەکی دووری سەدان کیلومەتر لە زێدی خۆیانەوە دور، تا لەوێ لە ناو چڕە دانیشتوانی تورک دا، لە رۆژاوای وڵات و کەناری باکوری دەریای سپی ناڤین دا بۆ خۆ لە دووری وڵاتی خۆیان وەکو قەترە لە دەریادا بژین. پرسە بۆ ئەو کوردە ئیعدام کراوانە لە هەمور مزگەوتە کوردەکانداو تەنانەت لە (دیمەشق)ش دانرا.

بەلام ئەنقەرە، هێندەی دی بەها مرۆڤایەتی یەکانی پێشێل کرد، بەتایبەتی کە دڵنیا بور نە کۆمەڵەی نەتەوەکان و نە هیچ دەوڵەت و لایەنێک لە دنیادا ئامادەیە لەسەر گەلێک وەجواو بێت کە مەسەلەکەی دەورێکی ئەوتۆ لە سیاسەتی بەرژەوەندی یە هاوبەشەکانی زل هێزەکاندا نابینێ. بۆیە زۆر بەرپرسی رەسمی تورک بێ شەرم و بێ پەردە هەڵوێستی خۆیان لە مەڕ کورد دەربڕی. عصمت اینونو-ی سەرەک وەزیران لە (سیفان)دا رایگەیاند: "تەنیا نەتەوەی تورک مافی ئەوەیان هەیە لەم وڵاتە دا بژین و

داوای مافی نەوەیی بکەن "محمد عزت-ی وەزیری داد-ش دوای لە نێوبردنی شۆڕشی کورد گوتی: "ئەم وڵاتە نیشتمانی تورکە، هەر کەسێک ئەسڵی تورک نەبێ، لەم وڵاتەدا تەنیا یەک مافی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە وەکو کۆیلە بژی".

کەمالیستەکان، سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەییان دژی کۆیلەو بەندە ناتورکەکان، زۆر بە خەست و خۆڵی لە ناوچەی دەرسیم دا خستە گەڕ. پێش هەموو شتێک ناوی دەرسیمیان گۆڕی بە (تونجەلی) کە ناوێکی تورکی یە. لە سی یەکاندا دەیان هەزار جوتیاری ئەم ناوچەیە راگوێزران. جێ بەجێ کردنی سیاسەتی کەم کردنەوەی چڕی دانیشتوانی ناوچە کوردیەکان تەنیا لە عۆدەی سوپاو جەندەرمەدا نەبوو، بەڵکو قانوندانەری ئەنقەرەش بەشی خۆی تێ خست، لەنایاری ساڵی ١٩٣٢دا یاسایەکی دەرکرد کە شەرعیەت بە راگوێزان و کو‌ ‌ ‌دنی کوردان دەدات و بە ئاشکرا حەڵاڵی دەکات:

هەر کەسێک زمانی زکماکی تورکی نەبێ، بۆی نی یە خانوو و ماڵ لەم ناوچانە دروست بکات. ئەوانە بۆیان نی یە سەندیکای کرێکاران و کۆمەڵەی پیشەیی دابمەزرێنن، وەزیری ناوخۆ دەسەلاتی ئەوەی دراوەتێ بە بڕیارێکی کارگێری، ئاسایی هەموو کۆمەڵە ناتورکی یەکان هەڵوەشێنێتەوە. کەچی یاسای ژمارە (٢٥١٠)ی ساڵی ١٩٣٤ زۆر وردترو دیارتر گوزارشتی لە ئامانجەکانی ئەنقەرە کردوە؛ بەپێ ی ئەم یاسایە تورکیا کراوە بە سێ ناوچە. ناوچەی یەکەم هەموو ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە "روشنبیری تورکی بە تەواوەتی تێدا چەسپیوە"و بەگوتەی پسپۆڕانی سیاسەتی تورکاندن پێویست ناکات هیچ دەسکارییەکی بکرێ. بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئەو ناوچە کوردیەی کە لە قانونی گۆڕین دا ئاماژەی بۆ کراوە، لەو ناوچانەیە کە "پێویستە لەبەر هۆی تەندروستی، ژینگە، رۆشنبیری، سوپایی و ئەمنی چۆڵ بکرێ و نابێ لە نێستە بەدواوە هیچ کەسێکی تێدا نیشتەجێ بکرێ".

چەند شوێنێک لە چوارچێوەی ئەم ناوچەیەدا تۆمارو دیاری کران، کە بریتی بوون لە: تونجەلی (دەرسیم، وان، قرس، بەشی باشوری دیاربەکر، بنگول، وموش). یاسای نێوبراو چارەنوسی ئەو خەڵکەی لەبەر چاوبوو کە لە ناوچەی دووەمەوە (ناوچەی کوردان) دەگوێزرانەوە بۆ ناوچەی سێیەم. لە وێداو لە کۆمەڵگەو ئوردوگای زۆرەملێ ی بە حەسیر دروست کراو، نیشتە جێ کران. ناوچەکانی رۆژاوا، بە تایبەتی کەنارەکانی دەریای ئاڤێن دیاری کران و پێشنیاز کران بۆ نیشتەجێ کردنی ئەوکوردانەی کە بڕیاری راگوێزانیان درا، هەڵبەتە بەو مەبەستەی لە نیشتمان و زێدو زمان و رۆشنبیری و ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان دایان ببرن. یاساکان هەر بەوەندەوە نەوەستان، بەڵکو ئەوەشی حەڵاڵ کرد "ئەگەر زروفی ئەمنی دەوڵەت بخوازێ" عەشایەرە کۆچەرەکان لە تورکیا دەربکرێن.

لەوکاتانەدا کە دەست بەجێ بەجێ کردنی ئەم یاسایەکرا، ئیدی جەندرمەی تورک خەنی بوون، بە بیانوی گەڕان بەدوای چەکی شاراوەدا، کەوتنە گیانی جوتیاران. لێیان دان، سوکایەتیان پێ کردن، بەروبومی کشتوکاڵیان سوتاندن. کەچی هەر هەموو ئەم رەفتارانە تینویەتی تورکیان نەشکاند، ئەو تورکانەی بەردەوام بون لەسەر سیاسەتی دوژمنکاری دژ بەو کوردەی کە ئیعترافیان بە بوونی نەدەکرد. لەوکاتانەدا کە حکومەتی تورکیا، لە ئەنقەرەدا بە نوێنەرانی رۆژنامەوانی جیهانیان رادەگەیاند کە مافی کەمە نەتەوەییەکان پێ شێل ناکرێ و هەمیشە رێزی دەگیرێ، سەرۆک کۆمار داوای لە پەرلەمان کرد، هەڵبەتە پاش ئالۆز بوون و هەڵکشانی مەسەلەی کورد، کە "پێویستە دەسەڵاتی بێ سنوور بە حکومەت بدرێ، تا بتوانێ بە سەر ئەم شێر پەنجەیەدا زاڵ ببێ و لە ریشەوە دەری بێنێ".

## قەسابخانەیەکی بەشەری لە پشت پەردە تاریکەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی یەوە

تۆرەهاتە سەر جوتیارانی کوردی ناوچەی دەرسیم تا بە شێوازە تورکی یە باوەکە مامەڵەیان لە تەکدا بکرێ: شێوازی چەقۆی خەڵتانی خوێن و تینوی سەربڕین. کاتێ کە لە ساڵانی ١٩٣٦و١٩٣٧دا لە رووی سیاسەتی تورکاندن، سیاسەتی دزی و تاڵانی، راوەدونان هەڵگەڕاوەو راپەڕین و کەوتنە بەرگری لە خۆیان دژی ئەو زێدەگاڤیانەی لەلایەن سەربازو جەندرمەی تورکەوە دەکرایە سەر گوندەکانیان.

لەکاتێکدا مەفرەزەیەکی پولیس، وەکو خووی هەمیشەییان بە دوای چەک دا دەگەڕان، کۆمەڵێک جوتیاری یاخی تەقەیان لەو مەفرەزەیە کرد، لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا هەزاران جووتیار پەیوەندییان پێوە کردن.. سوپای تورک، بۆ ئەوەی رووداوەکە گەورە نەبێتەوەو هەر لە جێوە خەفەی بکەن، ئەمریان دەرکرد هەرچی پیاوی ٢٦-٢٨ ساڵان هەن بکرێن بە سەرباز. سوپای تورک، ئەو داوایەشیان رەفز کرد کە لەلایەن کوردەکانەوە کرابوو بۆ گفتوگۆ. تورکەکان داوایان لە جەنگاوەرانی کورد کرد، کە ژمارەیان لە هەشتا هەزار کەس پتر بوو، بێ ج قەیدو شەرتێک خۆ بە دەستەوە بدەن. لە هەوڵێک دا بۆ ناساندنی سەر هەڵدانی ئەم (شێرپەنجەیە) کوردەکان لە ١٩٣٧/١١/٢٠ یادداشتنامەیەکیان بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان نارد کە: "حکومەتی تورکیا قوتابخانەکانی ناوچەکانمان دادەخات و زمانی کوردیمان لێ قەدەغە دەکات و هەردوو ووشەی کوردو کوردستان، تەنانەت لە ژێدەرو سەرچاوە زانستی یەکانیشدا دەسڕێتەوە. شێوازی درندانەو هۆڤیانە بەکار دێنێ تا کوردەکان ناچار بکات، بەتایبەتی ژنان و کیژان کە لە پرۆژە سوپاییەکانی ناوچەی عەنەدۆڵ دا، کار بکەن. هەروەها کورد لە شێوەی گروپی دەکەسی دا رادەگوێزێ بۆ ناوچە تورکی یەکان، بە جۆرێک کە رێژەی کورد لەوێندەر لە ٥.٠ ٪ تێ نەپەڕێ".

کوردەکان، تا دوا ساتەکانیش دڵی خۆیان بەوە خۆش دەکرد کە پشتیوانی یەکی دەرەکی فریان بکەوێ و بتوانن بەرەڤانی لە بوونی هەرەشە لێکراوی خۆیان بکەن. بەڵام کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبە الامم) لە ساڵی ۱۹۳۷دا زۆر مژوڵ بوو: جەنگی چینی-ژاپۆنی تازە هەڵگیرسابوو، شەڕی ئەهلی ناوخۆی ئەسپانیا گەیی بووە لوتکە. کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەو حەقیقەتەی بۆ دەرکەوتبوو کە هیچ توانایەکی پراتیکی نی یە، بە تایبەت دوای ئەوەی نەیتوانی ئەو بڕیارانە بە سەر ئیتالیادا جێ بەجێ بکات کە ئیبسینیای داگیر کرد. بۆیە ئەوەی لەو گۆشە تاریکەی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، لە عەنەدۆڵ رووی دەدا، کەس خۆی لێنەکردە خاوەن و بایەخێکی ئەوتۆی نەدرایێ. بەمجۆرە عەمەلیاتی سوپایی لە ناوچەی دەرسیم دا زیادی کردو توندتر بوو. هێزی پەلاماردەری تورک بێ جیاوازی کەوتە سەر بڕینی خەڵکی بێ دیفاع، بە تایبەتی ئەوانەی کە خۆیان تەسلیم کرد بوو. ئەو روداوەی دەرسیم لەو راپۆرەدا تۆمار کراوە کە زانای روس، باسیل نیکیتن نوسیویەتی، هەروەها نوری دەرسیملی لەو بەڵگەنامەیەدا کە لە ساڵی ۱۹۵۲ لە شاری حەلەب بڵاوکرایەوە وردو درشتی شۆڕشی دەرسیمی تۆمار کردووە.

لەم دوو بەڵگەنامەیەوە، ئەوە بە دیار دەکەوێ کە کاتێ تورکەکان نەیان دەتوانی شۆڕشی کوردەکان تێک بشکێنن و بە سەریاندا زاڵ بێن، بە تایبەتی لەو ناوچە توش و سەختانەی کە بەرزی دەگەییە ۳ هەزار مەتر، هێندەی دی دڕندانە رەفتاریان دەکرد.. بۆ وێنەی هەندێ یەکەی سوپایی، قەدپاڵ وبنارەکانی چیای (تۆژک)یان گرت. کوردەکان، بەتایبەتی ژن و منداڵ، ناچار بوون لە تاو تۆپباران و بۆدومانی ئاسمانی هەڵێن و پەنا وەبەر ئەشکەفت و موغارە قوڵ و زۆرەکانی ئەو دەڤەرە بەرن.

کە سەربازە تورکەکان زانیان ئەو خەڵکە چوونەتە ئەشکەوتەکانەوە، بەردەمی ئەشکەوتەکانیان لێ گرتن و نەیان هێشت شتاقیان بێنە دەرێ و ئەوجا کەرستەی بیناسازییان هێنا و زارکی شکەفتەکانیان هەڵچنی و ئەوژن و منداڵانەیان زیندە بە چاڵ کرد.. لە هەندێ حاڵی تردا دەچوون ئەشکەوتەکانیان ڤانگ دەدا تاخەڵکەکە بێتە دەرێ، کە دەشهاتنە دەرێ بە سونگی تێیان بەردەبوون و هەموویان دەکوشتن. ژمارەیەکی زۆر لە ژن و کیژ خۆیان لە لوتکەی شاخەکانەوە هەڵدەدێرایە نێو دۆڵە هەزار بە هەزارەکان یان نێو روبارەکانەوە؛ ئەو مەرگە کارەساتاوی یەیان پێ باشتر بوو لەوەی بکەونە بەردەستی تورک و بە تۆبزی زەوتیان بکەن و سواریان بێن.

لە کۆتایی ساڵی ۱۹۳۷دا، وەختێ عصمت انینو، لە جێ ی کەمال ئەتاتورک بوو بە سەرۆک کۆمار، دەربارەی چارەسەری کێشەی دەرسیم رایگەیاند کە: "بە یەکجارەکی لەم کێشەیە رزگار بووین، هەموو کارە سەربازی یەکانی تورکە چیاییەکانمان پاکسازی کرد".

هەرچەندە کوردەکان چ ئومێدێکیان بە سەرکەوتن نەما، لەگەڵ ئەوەش دا بەرەڤانی یەکی قارەمانانەیان کرد، بەرادەیەک کە حکومەتی تورکی ناچار بوو سەد هەزار سەرباز بخاتە ژێر چەکەوەو، (جەلال بایار)ی سەرەک وەزیران دان بەوەدا بنێ کە ئەمن و نارامی بە تەواوەتی لە ناوچەکەدا بەرقەرار نەبووە "لەبەر ئەوەی سوپاکەمان، مانۆری سوپایی لە ناوچەی دەرسیم دا دەکات، خەڵکی ئەم ناوچەیە رادەگوێزین و بەوەش کێشەکە بە تەواوەتی بنج بڕ دەکەین". ئەوە تاقە چەک بوو کە بە هۆیەوە کۆتاییان بە مقاوەمەتی کورد هێنا هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کە پتر لە پەنجا هەزار کەس لە ماوەی دوو ساڵی شەڕدا هاتنە کوشتن و سەربڕین. دوو هێندی ئەم ژمارەیەش هاتنە راگوێزان، ئەنقەرەش جارێکی دی سێدارەی بۆ هەڵخستن بەو مەبەستەی کە بزاڤی رزگاری کورد ریشەکێش بکات.. ئەوەبوو دوانزە کەس لە سەرانی شۆڕشەکە ئیعدام کران کە هەر دوو پەرلەمانتاری ئەندامی پەرلەمانی تورکی "سید عبدالقادر" و "حسن خیری"یان تێدابوو چونکە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو. حکومەتی تورکی، لە سالانی دوەم جەنگی جیهانی دا مژولی کۆمەڵێک کێشەی دی بوو، بۆیە خۆی لە مەسەلەی کورد بێدەنگ کرد. بەلام هەر بەردەوام بوو لە چەوساندنەوەی رۆڵەکانی ئەو میللەتەی کە رقی لێیان بوو. تاکو رۆژگاری ئەمرۆش لە تورکیادا بەرەسمی دان بە بوونی کوردا نەنراوە.

# فەسڵی پێنجەم

*گەرماوی هەتاوی هاوچەرخ*

**وەزع وحاڵی کورد، لە تورکیادا پاش دووەم جەنگی جیهان یان چ شتێک "خەڵکانی کۆ نەپەرستی (هاندا) بانگەشەی کومونیزمی بڵاوبکەنەوە!".**

سەرەک کۆمار، خاکەنازێکی بە دەستەوە گرت و ئەوجا وەکو ئەکتەرێک خۆی بنوێنێ، دەمە خاکە نازێک چیمەنتۆی خستە نێو شیش بەندێکەوەو بەمە بەردی بناغەی پردی سەر لقێکی روباری فوراتی دانا. ئەوجا بەدەم زەردەخەنەیەکەوە؛ زەردە خەنەی پیاوانی دەوڵەت، روانی یە کامیرای تەلەفزیونەکان، دەستی بەسەر کوڕێکی لاودا هێناو لێ ی پرسی: "دەزانیت من کێم"؟. کوڕەکە وەک بلێ ی مامۆستایەکانی زۆری لەگەڵ ماندوو بووبن و پرۆڤەیان پێ کردبێ و تەواو تەلقینیان دابێ بەلەز هاتە وەلام: "سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایشی دەوڵەت وسەرکۆمار جەنەڕاڵ کەنعان ئیڤرین". ئەمە لە ئاخرو ئۆخری مانگی ت ۲/۱۹۸۱دا بوو. ئەوکاتە بوو کە سەرکۆماری تازەی تورکیا، یەکەم سەردانی شارانی ئورفە، دیاربەکر و مەلاتی یەی کرد کە گەورەترین حامی یەو سەربازخانەی سوپای تورکی تێدا بوو. لەم سەردانەدا فەرماندەی گشتی هێزی چەکدارو سەرەک وەزیران (ئولوسو) یاوەری بوون.

جەنەڕاڵ، مانۆڕێکی سوپایی سازدا کە تانک و فڕۆکەش بەشدارییان تێدا کرد، بەمەش بوونی چڕی سەربازی بەو حەشاماتە پیشاندا کە لە مەلاتییە خڕ بوو بوونەوە. پاش تەواو بوونی مانۆڕە سوپاییەکە، هەواڵێکی راگەیاند، کە بە خۆی ناوی لێنا هەواڵێکی گرینگ بۆ خەڵکی شار، کە زۆربەی هەرە زۆریان کورد و ئاشوری بوون، کەمینەیەکی زۆرکەمی تورکیشی تێدا بوو، روی دەمی تێکردن: "دەبوایە هەواڵەکەتان بزانیبایە، بەلام قەیدی نی یە من بۆتانی دووبارە دەکەمەوە: بارەگای لەشکری دوو، لە سەرەتای ساڵی ۱۹۸۳دا دەگوازرێتەوە بۆ مەلاتییە".

کاتێ جەماوەرکە چ کاردانەوەیەکی نیجابی ئەنواندو (ئیڤرین) لە بری ئەو هەواڵە گرینگە، چ چەپڵەوچەپلە رێزانێکی گوێ لێ نەبوو. یەکسەر هەستی بەوە کرد کە ئەزمونی رابردووی خەڵکی ئەم دەڤەرە لەگەڵ سوپای تورکی دا، دیوارێکی بەفرینی لە نێوان هەردوولادا دروست کردوەو، خەڵکەکە بە چاوی رەقزو گومانەوە دەڕواننە سەربازی تورک، بۆیە زمانی گۆڕی و راستەوخۆ دواندنی : "هەندێ خیانەتکار هەن دەڵێن گوایە گواستنەوەی بارەگای لەشکری دوو بۆ مەلاتییە، بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی ئەم دەڤەرەیە.. نازیزەکانم، چما ئەم خاکە هی کێ یە کە ئەوانە دەڵێن گوایە

ئێمە دەمانەوێ خەڵکەکەی بچەوسێنینەوە؟ چما هەموو هەر هاووڵاتی تورک نین؟ هەموومان لە باشور تا باکورە، لە ڕۆژهەلات تا ڕۆژاوا، قوربانیمان لە پێناوی ئەم خاکە نەداوە؟ ئایا بە درێژایی مێژووی ئەم وولاتە شەهیدانمان و ڕۆڵەی شەهیدەکانمان لە تەنیشت یەکەوەو لەم خاکەدا نەناشتوە؟ کە ئەمە وەزع و حاڵ و واقیعەکە بێ، ئیدی بۆچی دەبێ نیازی چەوساندنەوەی خەڵکی ئەم دەڤەرەمان هەبێ؟ ئاخر بۆ؟ ئەم قسەو قسەلۆکانە، خۆیان لە خۆیاندا خیانەتن".

بەڵام کوردی خەڵکی ئەم شارە، کە ژمارەی دانیشتوانی لە سەد هەزار کەس پترن، ئەمجارەش خۆیان شێلو نەکردو زەحمەتی چەپڵەلێدانیان وەبەر خۆنەدا. چونکە پێشتر بەشێک لە یەکەکانی لەشکری (دوو)یان ناسی بوو. ئەوەیان بیر مابوو کە کاتێ خەڵکی شاری (گازانتیب)ی نزیکی شاری مەلاتییە، لە ساڵی ١٩٦٨دا خۆپیشاندانیان کرد وداوای ئازادی بەکار هێنانی زمانی کوردی و هەندێ مافی خودی تریان کرد، چۆن ئەو یەکە سوپاییانە سەر کوتیان کردن.

(هلموت فون مولتکە) کاتێ لە سەدەی ڕابردوودا لە تورکیا دەبێ و سەردانی مەلاتییە دەکات، یەکەم کەس بوو کە سەرنجی ئەورپاییەکانی بۆ ئەم شارە ڕاکێشاو (مولتکە) لەو سەروبەندەدا بە مجۆرەی وەسف کردووە: "شارێکی گرینگە. نزیکەی ٥ هەزار ماڵی قوڕی تێدایە، سەربانی ماڵەکان تەختێ و هەر سەربانێک بووە بە بانیژە بۆ ماڵەکەی سەروی خۆی. گومەزی مزگەوتەکان و قوبەی گەرماوەکانیش بە قوڕوکا سەر سواغ کراون. هەر ماڵێکی شار حەسارێکی لە قوڕ دروست کراوی بەدەوردا کێشراوە. ئەمەش ڕەنگێکی بۆڕی بە هەموو شارەکە داوە. پێدە چێت تا ئێستا پەنجەرە لێرەدا نەبووبێ بە باو. بریا هێستر سوارێک بە ئێرەدا دەڕۆیی و کاغەزی (برشمان)ی پێ دەبوو تارەسمی پەنجەرەی لەسەر بکردایەو بە دیواری ماڵەکانی یەوە بنایە".

بەڵام ژیان لە مەلاتییەدا ئەوەندەش تاریک نەبوو وەکو لە دوورەوە دیمەنەکەی دەینواند. هەر چەند تەنێ لە وەرزی زستانی تەڕو توش دا ئاوەدان بوو، و خەڵکی تێدا بوو، لێ لە هاوین دا ڕێک لە شاری خێوانی چۆڵ و هۆڵ دەچوو. (مولتکە) هەستی بەمە کردوەو نوسیویەتی: "هەموو خەڵکی مەلاتییە، بۆ گوندی ئایسوسو بارگەیان لێک دەنا. ئەم گوندە نزیکەی ٥ هەزار ماڵی هاوینە دەبوو.. ماڵەکان لە نێو دارستانی قەیسی و سێوو قۆخ و گوێزو هەنجیر ڕۆنرا بوون، ئەم دارستانە هێندە گەورە بوو کە بە پێیان دوو سەعاتە ڕێ دەبوو. سپیداری لێ و پۆپ ڕێک وْ بالا بەرز، بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان و دەکەوتنە سەروی دارو دەرختانی دیەوە؛ دەتگوت منارەی مزگەوتی نێو ماڵانی شارێکن. جۆگەیەکی یەکجار جوان، لە شاخەکانەوە دەهاتە خوارێ و ئاوی زوڵاڵ و شیرین بە نێو ماڵەکاندا دەڕۆیی، هاڕەو هاژەیەکی هێندە دڵگیری هەبوو ئەقڵ و هۆشی تالاند دەکرد". مرۆڤ ئەمڕۆ کە ئەو وێنەو دیمەنانە نابینێ کە مولتکە لە مەڕ مەلاتییە

لە هزرو بیرمانی دروست کردوە. وەکو هەر شارێکی تری کوردستانی تورکیا؛ وەکو دیاربەکر، گازانتیب، نیلانیک، یان نورفە، چوار دەوری بەو گەڕەکە هەژارنشینانە تەنراوە کە جوتیارانی کۆچکردوو لە گوندەوە بۆ شار، ئاوەدانیان کردۆتەوە. هەروەها چوار دەوری بارەگای سەربازخانەکەش لەم ساڵانەی دواییدا بە گەڕەکی هەژارنشین تەنراوە.

## پێشڕەوی بۆ رۆژهەلاتی تورکیا

ئەگەر پانتایی خاکی کوردستان و رێژەی خەلکی کوردستان لە گەڵ پانتایی و درێژەی خاک و دانیشتوانی تورکیادا بەراورد بکەی، ئەوا بوونی هێزی سوپایی تورک لە ناوچەکانی کوردستاندا رێژەیەکی یەکجا زۆرەو رێبواری رەوتەنیش هەست بەم حاڵەتە نائاساییە دەکات. ژمارەی سوپای تورک خۆی لە نیو ملیون کەس دەدا، ئەم نیو ملیونە کراوە بە چوار لەشکر (فیلق) دوو لەشکری ئەم سوپا زەبەلاحە لە کوردستاندا جێگیرە، لەکاتێکدا ژمارەی خەڵکی کوردستان لە کۆی چل و حەوت ملیون کەسی خەڵکی تورکیا، لە هەشت ملیون پتر نابێ، خۆ ئەگەر ئەو هێزی پۆلیس و کوماندۆیانەی کە لە کوردستانن بخەینە سەر هێزی سوپای تورکیا، ئەوا ژمارەی هێزی چەکداری تورکی لە کوردستاندا دەگاتە زیاتر لە ٢/٣ ی هەموو هێزی سوپایی تورکیا، لەکاتێکدا کە پانتایی خاکی کوردستان لە١/٣ی پانتایی تێکڕای خاکی تورکیا پتر نابێت.

نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە کوردستانی تورکیا پتر لە (٥٠٠) سەد کیلۆ مەتر سنوری هاوبەشی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا هەیە. بێگومان ئەمە هۆکارێکە کە تورکیای ئەندامی پەیمانی ناتۆ ناچار دەکات زۆرترین ژمارەی هێزەکانی لەوێ دا مۆڵ بدات. واتا بە پێچەوانەی ناوچەکانی سنوری رۆژاوایەوە. لەم دواییانەدا زۆر بنکەی راداری ئەمریکی لە رۆژهەلاتی تورکیادا دامەزرا، ئەمە جگە لەو بنکانەی کە پێشتر هەبوونە، بە تایبەتی پاش داروخانی بنکە ئەمریکی یەکان لە ئێرانی پاش شۆڕشی ١٩٧٩.. هەروەها وێستگە جاسوسی یەکان و پەیوەندی دوری سەر لوتکەکانی ئارارات کە بوردیان دەگاتە قوڵایی یەکێتی سۆڤیەت لەلایەکەوە، دەگاتە ناوسوریاو عێراق لەلایەکی ترەوە. ئەم وێستگانە هەندێ عەمەلیاتی شناسایی (استطلاعی) سوپای زۆر گرینگ بۆ هاوپەیمانانی ناتۆ ئەنجام دەدەن.

بەلام پاراستنی ئەم هەموو دام و دەزگایانە، هێشتا ئەوە ناخوازێ کە ٢ لەسەر٣ی هێزی چەکداری تورکی بە بەردەوامی لە خاکی کوردستاندا جێگیر بێ، دیارە دەبێت هۆیەکی دی بۆ ئەم تەحەشودە سوپاییە هەبێ، بە تایبەتی هەموو دەزانین کە پەیمانی دۆستایەتی و تەعەدا نەکردنە سەر یەکتر، لە نێوان تورکیاو یەکێتی سۆڤیەتدا هەیەو لە ساڵی ١٩٥٤دا هاتۆتە مۆر کرن. هەڵبەتە ئەم بوونە سوپاییە ریشەی خۆی هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ دەیان ساڵ لەمەوبەر، ئەوە بوو پاش سەرکوت کردنی بزوتنەوەی دەرسیم

له سالانی ١٩٣٧/١٩٣٨دا، حوکمی عورفی راستەوخۆ بەسەر زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەلاتدا سەپێنراو کوردستان کرا بە مەلبەندی تۆڕێکی چڕی مەخفەری جەندرمەو سەربازخانەی سوپایی و ئەم بارودۆخە تاسالی ١٩٤٦ بەردەوام بوو. لەو سالەدا بۆ ماوەیەکی کەم حوکمی عورفی هەلگیراو پاشان سەپێنرایەوە.

کەمال ئەتاتورک، لە سالی ١٩٣٨دا مرد. رەوش و وەزع و حالی تورکیا باش نەبوو، خەلکی و تەنانەت تورکەکان بە خۆیانش لە رەوشەکان بێزارو نارازی بوون. هەر لە سەرەتای سالی ١٩٤٦وە بێزاری لە حیزبی کۆماری کەمالی گەییە لوتکە؛ چونکە پتر لە بیست سال بوو، تاک لایەنە حوکمڕانی دەکرد. ئەو رەوشە تازەیەی تورکیا، کارێکی وەهای کرد کە گرژی و دڕدۆنگی نێوان تورک و کورد، ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێ، سووک و کەم ببێتەوە. نوێنەرێکی (UN) بەمجۆرە باسی ئەو ماوەیەی کردووە: "هەندێ هێماو ئامـاژەی پەراگەنـدە لێرەو لـەوێ، لەم بـوارو لەو بواردا بەرچاو دەکەوتن کە نیشانەی ئەوە بوون کەش و هەوای سیاسی روو لە کرانەوە بوو".

کاتێ لە سالی ١٩٤٦دا حیزبی دیموکراتی، وەکو حیزبێکی ئۆپوزیسیون دامەزرا، هەموو لایەنە بێزارو بێ تاقەتەکان لەو رەوش و وەزع و حالەی کە هەبوو، لە دەوری خڕبوونەوە. بەو مینبەرەیان دەزانی کە دەتوانن لێوەی گوزارشت لە خواست و ئامانجەکانیان بکەن و بۆ خۆ هەناسەیەک بدەن. لە هەمان سالدا یەکەم قەرز لە ئەمریکا وەرگیرا. ئەم قەرزە ئومێدی بوژانەوەی خێرایی بارودۆخی ئابوری وولاتی زیندو کردەوە. سەرەک وەزیرانی تورک هەر لەو روانگەیەوە کەوتە ستایشی "هاوولاتیانمان لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی"، ئەوانەی کە جارێکی دی دلسۆزی و گوێ رایەلی خۆیان بۆ دەولەتی تورکیا سەلماندو بە شێوەیەکی گەلەک نموونەیی ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دا.. ئەو هەنگاوانەش کە بۆ عەلمەنە کردنی وولات دەنران و حکومەت سور بوو لەسەر جێ بەجێ کردنیان، هەندێ سووک کرانەوە، بەمەش کوردی، لە خەلکی پابەندتر بە ئاین، هەناسەیەکیان وەبەر هاتەوەو رێ ی خوێندنی ئاین لە قوتابخانەکانیش دا درا.

لە سالی ١٩٥٠دا، کاتێ کە حیزبی کۆماری ی ئۆپوزیسیون، بە رێبەری عەدنان مەندریس، لە هەلبژاردنی پەرلەمانیدا سەرکەوتنی تەواوی بە دەست هێنا، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە پرۆسەی: "بەشارستانی کردن" لە کوردستاندا هەندێ سوک بکرێ. پیاو ماقولانی ئاینی و تیرە رەوەندەکان، بەر لە هەموو کەسێک هەستیان بەم گۆڕانەی سیاسەتی تورکی کردو بەگۆڕانی باشیان لە قەلەم دا. ئیدی جارێکی دی ئەو دەرۆیشانەی کە حکومەت بەراستی سەرکوتی دەکردن و راوەدوی دەنان، پەیدا بوونەوەو بەشێوەی نیمچە ئاشکرا لە گوندەکاندا چالاکی خۆیان دەکردو بەشێک لەو پایەو دەسەلاتە کۆمەلایەتییەیان وە چنگ هێنایەوە کە لە دەستیان دا بوو.

## ئەو مەترسییەی هەڕەشە لە ئاسایشی دەوڵەتی تورکی دەکات

لەکاتێکدا ئەنقەرە، هەندێ نەرمی نواند و گوشاری لەسەر مومارەسەی سرووتە ئاینی یەکان کەم کردەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی توندو تیژ دەر هەق بە مەسەلەی نەتەوەیی لە کوردستانی تورکیادا. تورک بە ڕەسمی بەردەوام بوو لە سەر حاشا کردن لە بوونی گەلی کورد وەکو گەلێک کە ناسنامەی تایبەتی خۆی هەیە. پاش ئەوەی دوای دووەم جەنگی جیهانی ڕاستەوخۆ لە بەرکردنی شەل و شەپک قەدەغە کراو بە کوردی ئاخافتن لە حوزوری فەرمانبەرانی تورک دا بە تاوان دانراو هەر کەسێک قسەی بکردایە سزا دەدرا، ئەنقەرە لە ساڵی ١٩٤٦وە کەوتە حاشا کردن لە بوونی ماددی کوردیش.

بۆ یەکەمجار ئەم ئەخشەیە لە ساڵی ١٩٤٦دا باسی لێوە کرا، کاتێ کە ڕۆژنامەی (سن پوست) وتارێکی نووسی و دوپاتی کردەوە کە: "لە هیچ کات و زەمانێکدا کەمینەیەکی کوردی لە تورکیادا نەبووە، ئیدی ئەو کەمینەیە نیشتەجێ بووبێ یان تیرەی ڕەوەند، هەستی نەتەوەییان لەلا بووبێ یان نا".

دیارە (جەلال بایار)ی سەرۆکی تازە، پشتیوانی یەکی بە دڵ و کوڵی لەم هەڵوێستە دەکرد. ئەوەبوو کاتێ لە ساڵی ١٩٥٣دا، واتە ساڵێک پاش ئەوەی کە تورکیا لە پەیمانی ناتۆ وەرگیرا، سەردانێکی وولاتە یەکگرتووەکانی کردو ڕۆژنامەوانان هەندێ پرسیاری وەهایان لێکرد کە ڕووگیر بێ، هیچ خۆی شێلو نەکردو بێ لە ڕوودامان پێ ی ڕاگەیاندن کە هیچ کەمینەیەکی نەتەوەیی لە تورکیادا نی یە.

بەڵام مەسەلەی کورد، جارێکی دی و لە ئاخرو ئۆخری ساڵانی پەنجاکاندا سەری هەڵدایەوەو کەوتەوە سەر شانۆی سیاسی، ئەوەبوو زەعیم عبدالکریم قاسم، لە عێراقی دراوسێ ی تورکیاداو لە ساڵی ١٩٥٨دا ڕژێمی پاشایەتی عێراقی ڕوخاندو ڕێگەی دا کە سەرکردەی ئەفسانەیی کورد "مەلا مستەفا بارزانی" لە تاراوگەی یەکێتی ی سۆفیەتەوە بۆ عێراق بگەڕێتەوە. هەروەها پەیمانێکی نیشتمانی لەگەڵ کوردا بەست و بەڵێنی دانێ کە لە ئایندەدا (ئوتونۆمی)یان بداتێ و لە حوکم دا بەشداریان بکات.. ئەو بوژانەوەیەی لە ریزی کوردەکانی عێراقدا پەیدا بوو، پاش یەک ساڵ لە کوردستانی تورکیاش دا ڕەنگی دایەوە. ئەوە بوو هەستی نەتەوەیی لە وێندەر سەر لە نوێ بوژایەوەو لە شێوەی داوا کردنی مافی نەتەوەیی دا خۆی نواند.

بەڵام حکومەتەکەی (مندریس) یەکسەرو زۆر بە توندی بەر پەرچی ئەم پەرە سەندنە نوێ یەی دایەوە. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٩دا چل و نۆ ڕۆشنبیری کوردی بە تۆمەتی ئەنجامدانی چالاکی ڕۆشنبیری قەدەغە، دەستگیر کرد. هەر چەندە حکومەتی تورکیا تۆمەتیکی تریشی دایە پاڵ ئەو دەستگیر کراوانە، ئەویش ئەوە بوو کە گوایە پیلانیان

دژی ئەمن و ئاسایش و سەلامەتی دەوڵەتی تورکیا گیراوە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە گوایە پەیوەندییان دەگەڵ "جودا خوازانی بارزانی دا" هەبووە. کەچی کاتێ ماڵەکانیان تەحەری کرا، چ شتێکیان لە ماڵدا نەدۆزرایەوە تەنیا هەندێ گوتاری دەست نوس نەبێ دەربارەی ئەدەب و مێژوی کورد کە بۆ چاپ کردن ئامادە کرابوون. بەو جۆرە بۆ هەموان دەرکەوت کە ئەو هەڵوێستە توندو تیژەی حکومەتەکەی مندریس دەربارەی ئەم جم و جوڵە تازەیەی کوردستانی تورکیا، لە راستیدا بۆ شاردنەوەی ئەو رەوشە حەیابەرەیە بوو کە تورکیای تێ کەوتبوو.

هەرچەندە وولاتەیەکگرتوەکان یارمەتی یەکی (٢،٥) ملیاردۆلاری دا بە تورکیای شەریک وهاوپەیمانی ستراتیژی، بەلام ئەم یارمەتی یە بۆ ئەوە نەبوو کە ئاستی بژێوی و ژیانی رۆڵەکانی گەلی تورکی بەرز بکاتەوە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو یارمەتی تورکیا بدات بۆ دامەزراندن و قایم کردنی دەزگا سەربازی یەکانی. وەکو چۆن ئەمریکا هەمان سیاسەتی لەگەڵ هاوپەیمانی تری وەکو ئەڵمانیای فیدرالیش دا پەیرەو کردوە.

لە ساڵی ١٩٥٩ دا رێژەی گرانی لە تورکیادا گەییە پتر لە ٧٠٪ ئیدی ئەوە بوو مندریس حکومەتی عورفی لە وولاتدا سەپاند تا ئەو خۆپیشاندانانە سەرکوت بکات کە سەرانسەری وولاتی گرتبووەوە هەروەها جموجوڵی ئوپوزیسیونی روو لە زیادی سەرکوت بکات.

بەلام ئەم هەنگاوە حکومەتی رزگار نەکردو ئەوە بوو ئەفسەرانی کەمالیست لە ١٩٦٠/٥/٢٧دا کودەتایەکی سوپاییان کردو حکومەتیان روخاند. کودەتاچی یەکان پاش ئەوەی حوکمیان گرتە دەست بە ماوەیەکی کەم، دیسان بایان دایەوە سەربای بەرە بۆرو کەوتنە تەنگ هەڵچنین بە (تورکە چیاییەکان). (جمال گورسیل)ی سەرکردەی کودەتا تازەکە، بەساڵێک پاش ئەوەی جڵەوی کاروبارانی گرتە دەست، پەنجا کەسی لە دیارترین پیاوماقوڵ و سەرانی بە دەسەلات و پایەداری عەشایەر راگوێزا بۆ ناوچەیەکی نزیکی دەریای مەرمەرە لە هەردوو پارێزگای ئیزمیر و بورسا. رژێمی سوپایی هەفتانەیەکی (٣٥٠) لیرەیی بۆ هەر یەکێک لەو دوور خراوانە بڕی یەوە. ئەم بڕە پارەیە هەفتا [illegible]رامەتی هەفتانەی هەر وەرزێرێکی ناوچەی رۆژهەلات بوو، دیارە مەبەستی [illegible]ت لەم کارەی ئەوە بوو کە ئەو کەسایەتیانە لە بەر چاوی جوتیارانی نەخ[illegible]اری کورد بخات و رقیان لێ هەڵگرن و پەیوەندی خۆیان لەگەڵیاندا بپچرن.

کەچی نەفی کردن و دوور خستنەوەی ئەو پیاو ماقولانەی کورد بووە هۆی ئەوەی خەڵکی ئەو دەڤەرانەو کەس[illegible]لەو پیاو ماقولانە، پتر لە رژێم بێزار بن و رقیان لێ ی هەستێ. ئەوەبوو زۆرکەس، گوندی بە پولیسخانە گەمارۆ دراویان بە جێ هێشت و رویان لە چیا کردو کەوتنە رێگری و رووت کردنەوەی ئوتومبیلان. بە تایبەتی قافڵەی

سەیاحەتچیانی دەوڵەمەندی رۆژاوایی. حکومەت ج چارێکی نەما جگە لەوەی کە رێگەی سەیاحەتچیان نەدات بچنە ناوچەکانی (تورکانی چیایی هۆڤی). دیارە ئەنقەرە زۆری کەیف بەم حاڵەتە هات، چونکە بۆی بوو بە بیانوو تا ئەو هەموو سەربازە لە کوردستاندا بن.

لە بەهاری ۱۹٦۰دا هەشت کەس لەو کوردانەی کە بۆ ناوچەی دەریای مەڕ مەرە نەفی کرا بوون، درانە دادگایەکی سوپایی لە پایتەخت دا، تۆمەتەکەیان ئەوە بوو کە گوایە ئەمانە "خەڵکانێکی کۆنەپەرستن و بانگەشەی کومونیزمی بڵاو دەکەنەوەو داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دەکەن". بەڵام باشترین بەڵگەی داتەپینی بارودۆخی تورکیا چۆنیەتی روو بەروو بوونەوەی مەسەلەی کوردی، ئەو رەفتارە بوو کە لەگەڵ (٤٩) رۆشنبیری کوردا کرا کە هێشتا لە زیندان دا بوون. پاش ئەوەی پتر لە ساڵ و نیوێکیان کە تەوقیف دا بە سەر بردو، لە کانونی دووەم دا، دەست بە دادگایی کردنیان کرلو بە کەفالەتێکی دارایی قورس بەردران، کەچی زۆری نەبرد، حکومەت هەمدیس گرتنی یەوە و لە نایاردا دانی بە دادگایەکی سوپایی تایبەتی و (٢٦) کەسیان حوکمی ئیعدام دان.

**ئەوانەی پێیان دەڵێن کورد!!!**

لە ساڵانی سییەکانەوە کە سەرەتای شۆڕش و راپەڕینە گەورەکانی کورد بووە، تورکیا زۆر گۆڕانی سیاسی بە سەردا هاتووە، چەندین جۆرە حوکمی بە خۆیەوە دیتوە. کە چی هەڵوێستی رەسمی دەرهەق بە کورد هیچ گۆڕانێکی بە سەر نەهاتووە. ئەو هەڵوێستە بە درێژایی مێژووی تازی تورکیا ، وەکو خۆی ماوەتەوە.کاتێ جەنەراڵ (گورسیل) هاتە سەر حوکم، لە وەڵامی پرسیارێکی پەیامنێری تایمس-ی لەندەنی دا کە ئاخۆ بەتەمایە دان بەمافی کوردا بنێ؟! دەڵێ: "تۆ مێژووت نەخوێندۆتەوە؟ لە تورکیادا کەسانێک نین، پێیان بگوترێ کورد". جەنەراڵی نێوبراو لە ت ٢/ ١۹٦۰دا لە کۆبونەوەیەک دا لە دیاربەکر هەمان بۆچۆنی دوبارەوە کردەوە و گوتی: "بە هیچ جۆرێ گەلێک نی یە بە نێوی کورد". لە نیسانی ١۹٦۰دا حکومەت دەستوری دا ئەو کتێبە چاپ بکرێتەوە کە نوسەری تورک (شەریف فورات) لە سی یەکانداو لە سەر داوای خودی ئەتاتورک داینا بوو، تا گوایە بە بەڵگەی زانستی بیسەلمێنی کە "ئەوانەی بە خۆیان دەڵێن کورد، لە راستیدا ئەسڵیان تورکە".

گەلەک روداو هاتنە پێشێ کە بوونە هۆی زیاتر گرژ بوونی پەیوەندی نێوان کورد و تورک. لە ٨/٥/١۹٦١دا کە رۆژی سەر لە نوێ دادگایی کردنەوەی ئەو رۆشنبیرە کوردانەیە کە ئاماژەمان کردێ، دەیان هەزار خۆ پیشاندەری کورد، لەوانەی کە بە قسەی حکومەت بوونیان نی یە، رژانە ناو شەقام و بازێران. خۆپیشاندەران لە شارانی

دیاریەکرو بەتلیس و وان و زۆر شاری کوردی دیدا لە لافیتەکانیاندا داوای خود موختاری رۆشنبیری و سیاسییان دەکرد. گۆڤاری (الحقائق الکردیه) کە لە هەندەران دەردەچوو، لە رۆژنامە تورکی یەکانەوە نەقلی کردوە کە خۆ پیشاندەران ئەم دورشمانەیان هەلگرتبو: "ئیمە تورک نین... ئیمە کوردین" و "دەبێ حکومەت دان بە مافەکانمادا بنێ" و "بروخێ گورسیل، مندریس، اینونۆ و هەر دکتاتۆرێکی تری وەکو ئەوان". کە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ ئەو زولمە تورکی یەی کە دەیان سالە بەردەوامە.

ئیدی هێزی جەندرمەو ئەو هێزە سوپاییەی بۆ یارمەتی هێزی جەندرمە نێردرا بوو، بەزەبری چەک و گوللە بەناو خۆپیشاندەران کەوتن و بلاوەیان پێکردن. لە شاری ماردین دا (١٢١) کەس کوژران و ٣٥٤ کەسیش بریندار بوون. لە دیاربەکردا ١٩٤ کەس کوژران و ٤٠ کەس بریندار بوون. رۆژنامەی (جەمهوریت)ی تورکی کە بە زمانی حالی جەنەرال گورسیل دەژمێردری، دەربارەی ئەو روداوانە دەلێ: "هەر کەسێک گوتی من کوردم تفێک بکە چارەی" ئیدی سیاسەتی تورکاندن رۆژ بەرۆژ شەقلی توندتری گرتەخۆ.

لەکۆتایی سالدا، ئەو دوو رۆژنامەیەی کە لە سالی ١٩٦٣وەو بۆ ماوەیەکی کورت بە هەردوو زمانی تورکی و کوردی دەردەچون، داخران. لە هەمان ماوەدا (١٣) قوتابی دەستگیر کران کە دوانیان کوردی عێراق بوون، بەوتۆمەتەی کە گوایە "بەفیتی بێگانە خەریکی پیلان گێران بوون" ئەمەش ئەو حەقیقەتە دەردەخات کە ژمارەیەکی زۆر لە رۆلەکانی کەمینەی نەتەوەیی چەوساوە لە تورکیادا، رزگاری خۆیان لەوەدا دەبینی کە هاوکاری و هەم ئاهەنگی لەگەل مستەفا بارزانی دا بکەن کە لە خەباتی بەردەوامدا بوو دژ بە حکومەتی ناوەندی عێراقی.

لە ١٧/ک١/ی هەمان سالدا، حاکمی گشتی تورکی داوای ئیعدام کرنی ٢٣تاوانباری کوردی کرد بەو تۆمەتەی کە گوایە هەولیان داوە: "دەولەتێکی کوردی سەربەخۆ" پێک بێنن. حاکمی گشتی لێرەدا ئەوەی روون کردەوە کە پێشتر دام و دەزگا رەسمی یەکان لە زۆر بۆنەدا دوبارەیان کرد بووەوە، ئەویش ئەوە بوو کە بیرۆکەی دامەزراندنی دەولەتی کوردی لە خاکی تورکیادا، کاری کۆمونیزمی جیهانی یەو ئەوانەش "کە ئەوان پێیان دەلێن کورد، لە رووی نەژادو رەگ و رەچەلەکەوە تورکن".

## خەلکی ناوچەکانی رۆژهەلات، هاوولاتی پلە دوون

ئەوەی لە سالی ١٩٧٢دا روویدا، بەلگەیەکی تری ئەم سیاسەتە رەگەز پەرستانەیەیە، ئاژانسەکانی دەنگ وباسی جیهانی رایان گەیاند کە حکومەتی تورکی، لەو سالەدا سەدان هەزار هاوولاتی خۆی ناچار کرد، کە زۆربەیان خەلکی ناوچەکوردی یەکانن، کە

روو بکەنە وولاتە پیشەسازی یەکان و ، لەوێندەر دوی بژێوی خۆ بکەون، بەم کاری کۆچاندنە بەردەوامە توانی ناوچەیەکی سنوری فراوان لە "کورد خالی بکات". ئەم دەوڵەتە لەهەمان کاتدا دەیەوێ تورکیا بکات بە نیشتمانی هەموو تورکی دنیا لە هەر کوێ یەک بن. ئاژانسەکانی دەنگوباس ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کە ئەم سیاسەتە دووفاقی یە ئەو کاتە کەشف بوو کە تورکیا رایگەیاند کە ئامادەیە ( ٣٤٥٠ ) پەنابەری ئەفغانی کە لە پاکستانن، وەربگرێ و لە رۆژهەلاتی تورکیادا نیشتە جێیان بکات".

شایانی باسە ئەو ئەفغانیانەی باسمان کردن، کۆمەڵە قەرغیزێکی ئەفغانێن و بە زمانی تورکی قسان دەکەن و ئەسڵ و رەچەڵەکیان کازاخی و ئوزبەکی یە. پەیڤدارێک بە نێوی رێکخراوی فەرعی (UN)ی تایبەت بە کاروباری پەنابەرانەوە لە جنیف رایگەیاند کە فرۆکەی سوپایی تورکی ئەو پەنابەرانە راستەوخۆ بۆ تورکیا دەگوازێتەوە، هەروەها کاری پێویست بۆ گواستنەوەی مەڕو ماڵاتەکانیانش ئەنجام دراوە.

مرۆڤ کە لە سایکولوژیەتی تورک و بیرکردنەوەی رەگەز پەرستانەیان ورد دەبێتەوە و ئەو ئەزموون و تەجرەبانە دێنێتە بەرچاو کە لەم بوارەدا کردویانە، دەگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە ئەم پرۆسەیە بەراستی جێ بەجێ کراوەو ئەو هاوولاتی یە تورکە تازانە لە پایزی ساڵی ١٩٨٢دا لە کۆمەڵێک گوندی چیایی دەڤەری هەکاری نیشتەجێ کران؛ ئەو دەڤەرەی کە لەو خێزانە کوردانە چۆڵ کراون کە چەندین سەدەیە لەوێ نیشتە جێن.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر چاوێک بە رەوشی کوردستانی تورکیادا بگێڕین، دەبینێن دام و دەزگای راگەیاندن و کەناڵ و لایەنە رەسمی یە تورکی یەکان، هەمیشە مەسەلەی کوردیان کردوە بە بیانوو،و بە هۆکاری هەموو نشوست و گیروگرفتە ئابوری و سیاسی و داروخانەکانی بارودۆخی کۆمەلایەتی تورکیایان لە قەڵەم داوە. کاتێ حیزبی عەدالەت بەرێبەرایەتی (سلێمان دیمیریل) لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا بردیی یەوەو دیمیریل پۆستی سەرۆکایەتی وەزارەتی وەرگرت، بارودۆخ بۆ کوردو کوردستانی تورکیا وەکو خۆی مایەوەو هیچ گۆڕانێکی بە سەردا نەهات. جەمال ئەبەز، کە مامۆستایە لە زانستگەی ئازادی بەرلین، لەکتێبی کوردستان و شۆڕشەکەیدا کە لە ئەڵمانیای فیدرالی دەرچووە باسی ئەوەی کردوە کە تورکەکان بە شێوازی زۆر خراتر لەو شێوازانەی کە نازی یەکان لە کاتی دووەم جەنگی جیهاندا دژ بە رۆڵەکانی گەلانی سلاڤی بەکاریان دێنا، دەیانەوی کورد بکەن بە هاوولاتی پلە دوو.

کاتێ وەزیری ناوخۆ (خلدون منتس ئوغلو) سەردانی شاری (فارتو)ی کرد کە لە ساڵی ١٩٦٦دا بوومەلەرزە لێ ی دا، لە بری هەموو دڵدانەوەیەک بەسەر خەڵکی لیقەوماوەکەیدا نەڕاند: "ئەم هەموو هات و هاوارەی بۆ چی یە؟ نا لەم شارەدا تەنیا سێ هەزار کەس مردووە. تەمەشای ڤیتنام بکەن، لەوێندەر تا ئەهو پتر لە سی هەزار

کەس مردووە". کە کوردەکان نارەزایی خۆیان لە مەڕ ئەم رەفتارەی دەربڕی، وەزیری نێو براو ئەو حەقیقەتەی وەبیر هێنانەوە کە دەبێ هەمیشە لە بیریان بێت و ئەوسا بەرویاندا هەڵشاخی: "من دەنگی کۆمەڵێک حەیوانات دەبیستم کە لە زاری بەشەرەوە دەردێ. ئەوەی لەم وولاتە رازی نی یە دەرگا کراوەیەو با بڕوات لە وولاتێکدا بژی کە پێ ی خۆشە".

لە ١٤/٢/١٩٦٧دا فەرمانی کارگێری ژمارە (٧٦٣٥/٦) دەرچوو، و لە رۆژنامەی رەسمی تورکی دا بلاو کرایەوە. ئەم فرمانە قانونیەت بە سیاسەتی چەوساندنەوە دەبەخشێت، بەمەش سیاسەتی چەوساندنەوە گەیەنرایە چلەپۆپە، حکومەتی دیمیرێل، لە کۆتایی مانگی کانونی دووەمدا بڕیاری لە سەر ئەم فەرمانەدا و پەسندی کردو ناوی نا (یاسای رێکخستنی رۆشنبیری) بەپێ ی ئەم یاسایە زمانی کوردی بە تەواوەتی قەدەغە کرا، ئەم یاسایە هەموو کارێکی زانستی و کتێب و گوڤارو رۆژنامەو بەڵگەنامەیەکی بە کوردی نوسراو قەدەغە دەکات و تەنانەت گۆرانی کوردی سەر کاسێت و قەوان و هەر نامێرێکی دیکەی تۆمار کرن قەدەغە دەکات. وێڕای هەموو ئەم چەوساندنەوەو تەنگ پێ هەڵچنینەش، لە رووی زانستی یەوە ئەوە ساغ بوەتەوە کە زمانی کوردی زمانێکی هیندو جەرمانی یەو یەکجار دوورە لە زمانی تورکی یەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ٨٥٪ی خەڵکی رۆژهەلاتی تورکیا قسەی پێدەکەن، کارێکی یەکجار زۆری کردۆتە سەر زمانی تورکی هاوچەرخ. زانای ئەڵمانی (ئاندریاس تیسە)ی پسپۆڕ لە لێکۆڵینەوەی تورکی دا ئەمەی لە لێکۆڵینەوەیەکی دا کە ساڵی ١٩٦٤ لە ڤیێنا بلاوی کردۆتەوە، دەربارەی ووشەی کوردی و فارسی لە زمانی تورکی و ئازاربایجانی ساغ کردۆتەوەو سەلماندویەتی.

رژێمی ئەنقەرە، لەلایەن رۆژنامەو رێکخراوە تورکی یە شۆڤینی یەکانەوە هان دراوە کە بەردەوام بێ لە سەر سیاسەتی پاکسازی کورد لە رۆژ هەلاتی تورکیا. حکومەتی تورکی بە خۆی ئاگری دژمنایەتی کوردی خۆش کردوە، بە ئاشکرا تورکی هانداوە کە بە کۆمەڵ کورد بکوژن ، بێ ئەوەی دەسەلاتی قەزایی تووکی ورتەی لێوە بێت یان رای گشتی جیهانی ئاوڕێک لە دۆزی کورد بداتەوە.. هەر لە چوار چێوەودرێژەی ئەم پرۆسەی توانەوەو چەوسانەوەیەدا دەنگی وەها بەرز بوەتەوە کە هەزار و یەک کەسەرو داخ دەربڕن کە لە جەنگی جیهانی داو لە گەڵ قەتڵ و عامی ئەرمەنەکاندا، کوردیش قەتڵ و عام نەکراون و بەیەکجارەکی لە نێو نەبراون. بۆ وێنە رۆژنامەی (ئوتوکن)، هەڕەشەی لە هاو وولاتیانی ناوچەکانی رۆژهەلات کردوە کە واز لە داواکردنی زمانی تایبەتی و قوتابخانەو بەرنامەی رادیۆیی و کەناڵی بلاوکردنەوەو گۆشکردنی کوردبە حیکایەت و ئەفسانەی کوردی بهێنن. پێ ی راگەیاندون پێویستە ئەوە بزانن کە تاقە هۆیەک هێشتونیەتی یەوە و بەدەستی تورک قڕ نەکراون لەکاتی راوەدوڵانی ئەرمەنەکان، ئەوەبوە کە کوردەکان پەنایان وەبەر چیا سەختەکان بردوە. ئەگینا ئەمرۆکە لەو ناوچانەدا

که زۆرینەن، دەبوونە کەمینە . هەروەها لە سەری دەڕوات و دەڵێ: "ئەو خودموختاری یەی کورد لە هزرو خەیاڵی خۆیدا پەروەردەی دەکەن، تەنیا خەونەو پێویستە تازووە ئەو خەونە لە مێشکی خۆ دەربکەن و چاو پۆشی لێ بکەن بەر لەوەی خۆیان بە فەوتاندنی یەکجارەکی بدەن. نەژادی تورکی بە سەبرە، بەڵام کە تورە دەبێ ئیدی دەبێ بە شێری هەڵچوو کەس خۆی لە بەردەمی ناگرێ، هەرکەسێکیش ئەمەی نەدیوە دەتوانێ پرسیارێک لە ئەرمەنەکان بکات تا حەقیقەتی ئێمە بناسێت".

## بزاڤی کوردی کانگای هەموو بەڵاکانە

حکومەتەکەی دیمیرێل لە رووداوەکانی ئازاردا روخا.. بەڵام ئەوەی لە ۱۹۷۱/۳/۲۱دا روویدا، کودەتایەکی سوپایی بوو وەکو هەموو ئەو کودەتا سوپاییانەی کە مێژووی تازی تورکیا بە خۆوەی بینی. کودەتاچی یەکان ئەمجارەش هۆی کودەتاکەیان گێرایەوە بۆ "کورت چولوک-مەسەلەی کوردی" لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتدا. ئەمەش بەڵگەیەکی دی یە بۆ ئەو شێوازە نامەنتیقی یەی کە حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی تورکیا دەرهەق بە دۆزی کورد بە کاریان هێناوە. پێدەچێت سوپاییە تورکەکان، هەموو هەر بەم مەنتیقەکار بکەن: لە کاتێکدا کە سورن لەسەر حاشا کردن لە بوونی ماددی کورد، لە هەمان کاتدا ئەگەر بەرژەوەندی وئامانجەکانیان بخوازێ ئەوا خێرا با دەدەنەوەو (بزاڤی کوردی) بەرجەستە دەکەن و بایەخی تایبەتی دەدەنێ.

لە ئەنجامی ئەم مەنتیقەدا کە بزاڤی کوردی بەکانگای هەموو گیروگرفت و بەڵاو نەگبەتی یەک دادەنێ، سەر لەنوێ حوکمی عورفی بەسەر ناوچەکانی رۆژهەڵاتدا سەپێنراو کرا بە ناوچەی عەمەلیاتی سوپایی. هەروەها دایەرەکانی (تەجنید)ش ژمارەیەکی یەکجار زۆر سەر بازی ئیجبارییان بۆ ناوچەکە نارد بە بیانوی "بەگژا چونەوەی عەمەلیاتی تیروریستی" کە (جودا خوازەکانی کورد) ئەنجامی دەدەن. هێرشێکی گرتنی بەر فراوان لە هەموو لایەکی کوردستانەوە دەستی پێکرد، ئەوە بوو تەنیا لە شاری دیار بەکردا پێنج هەزار کەس دەستگیرکران.

سەرانی کودەتای ۱۹۷۱ جگە لەوەی لەسەر هەمان رێبازی حکومەتانی پێش خۆیان دەڕۆیشتن، نەخشەیەکی تازەشیان هێنایە گۆڕێ کە بریتی بوو لە دامەزراندنی کۆمەڵێک پرۆژەی کشتوکاڵی حکومەتی لە دەوروبەری سنوری هاوبەشی عێراق و سوریا، کە وەرزێری خەڵکی دەڤەری رۆژاوای بەزۆرینە تورک یان ئەو تورکە قوبرسییانەی بۆ تورکیا هەڵاتبوون، کاریان لەم پرۆژانەدا دەکرد.

مەبەستی ئەم پرۆژانە ئەوەبوو کە رۆڵەکانی کوردستانی تورکیا لە برا کوردەکانی عێراق یان دابڕن، بە تایبەتی کە بارزانی لەوێندەرو پاش خەباتێکی دە ساڵی توانی بووی ئیعترافی رەسمی حکومەتی عێراق بە مافی ئوتونومی کورد لە عێراقدا بە دەست

بێنن. هەروەها مەبەستێکی تری ئەو پرۆژەیە ئەوەبوو کە کوردستانی تورکیا لە کوردی ئێران و سوریا دابڕێ.

کاتێ کە کەناڵە رەسمی یەکانی تورک نکوڵی لە بوونی کورد دەکەن، ئەمە زۆر جار کێشەو گیروگرفتی لابەلا بۆ خۆیان دروست دەکات. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٦٨دا نوسەرو زانای کۆمەلایەتی (م.ی بوز ئەرسەلان) بەهۆی نوسین و چاپکردنی کتێبێکەوە دەربارەی بنەماکانی نوسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی، دەستگیر کراو درا بە دادگا. کە دادوەری گشتی ئەو کتێبەی بە دەستەوە گرت و لێ ی پرسی: "ئەمە چی یە؟" بوز ئەرسەلان وەلامی دایەوە: "نابێ جەنابت بەمە نیگەران بیت، چونکە ئەگەر راست بێ کوردو زمانی کوردی نەبن، ئەوا ئەم نامیلکەیەش بوونی نی یە. تکا لە جەنابتان دەکەم رێم بدەن بچمەوە بۆ ماڵی خۆم و لە نێو ماڵ و منداڵەکەمدا بژیم.. هیچ ماقول نی یە لەسەر شتێک دەستگیر بکریم کە بە هیچ جۆرێ بوونی نی یە".

لە ساڵی ١٩٧٣دا، حیزبی گەلی دیموکراتی سوسیالستی کۆماریخواز، لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەماندا سەرکەوت و بەمەش حوکمی سوپایی کۆتایی هات و جارێکی دی حکومەتی مەدەنی کەوتە سەرکار. حیزبی نێو براو هێندەی کورسی ی بە دەست هێنا کە بتوانێت حکومەتێکی ئیئتلافی دابمەزرێنێ، ئەم روداوە بە گۆرانکارییەکی سیاسی گرینگ لە مێژوی تازەی تورکیادا هاتە ژمارتن. بەلام دیاربوو کە ئەو ئیئتیلافە بە هۆی ناکۆکی نێو خۆ و دوو بەرەکی لایەنەکانی یەوە زۆر ناخایەنێت، ئەوەبوو روداوەکانیش دروستی ئەم بۆچونەیان سەلماند.

## هەڵوێستێکی دەگمەنی ئەجاوید لە دیمەنیەکدا لەگەڵ دێر (شپیگل)ی ئەڵمانیدا

کاتێ (بلند ئەجاوید)ی سەرۆک وەزیران بۆ یەکەمجار دانی بە بوونی کورد لە تورکیادانا و هەر بەناوو بێ پەردە ووشەی (کورد)ی بەکار هێنا، واتا رێک بە پێچەوانەی جارانەوە کە بەرپرسانی تورک لە بری ووشەی کورد (تورکی چیایی)یان بەکار دەهێنا، ئەمە تورسکە هیوایەکی خستە دڵی کوردەوە. بەلام ئەم شتە لە ناو تورکیادا رووی نەدا، بەڵکو لەسەر لاپەڕەکانی گوڤاری (دیر شپیگل)ی ئەڵمانیدا روویدا کاتێ کە دیمانەیەکی لەگەڵ ئەوجاویدا ساز دابوو.

کاتێ ئەجاوید بۆ تورکیا گەرایەوەو لایەنەکانی حکومەتەکەی لەو هەڵوێستەی نارازی بوون، ئەویش بای دایەوەو پەشیمان بوەوە. بەمەش ئەو تروسکە هیوایە کوژایەود کە کوردەکان پێیان وا بوو دەتوانێ رێگەی ئاشت بوونەوەی نەتەوەیی نێوان حکومەتی تورک و کوردەکان روناک بکاتەوە.

بلند ئەجاوید لە ساڵانی ٩٧٣-١٩٨٠ دووجاران سەرۆکایەتی حکومەتی ئیئتلافی گرتە دەست. بە درێژایی حوکمرانی ئەو چ گۆڕانێک بەسەر بارودۆخی کوردا نەهات.

که جەنەڕال (کەنعان ئیڤرین) لە ساڵی ۱۹۸۰دا بەزەبری کودەتایەکی سوپایی هاتە سەر حوکم ، باروودۆخی کورد، وەکو سەردەمانی ئەتاتورک وابوو. هەرچەندە شێوازی حوکم و سیاسەتی ڕەسمی حکومەتە جیاوازەکانی تورکیا، چوون یەک نەبوون، بەڵام هەموو لەو خاڵەدا یەکیان دەگرتەوە کە گوایە لە جەنگێکی ڕانەگەیەنراودان لەگەڵ کوردا. ئەم حاڵەتە دوژمنکارانەیە، لە سیاسەتی دابەش کردنی سوپاو پۆستە گرینگەکاندا بە سەر ئەفسەراندا، بە جوانی دەردەکەوێ. هەروەها چۆنیەتی سەربازگیری ئیجباری کە بیست مانگ لە خزمەتی ئاڵای وڵاتدا بەسەر دەبەن خۆی لە خۆیدا ڕەنگ دانەوەی لایەنێکی تری ئەم حاڵەتە دژمنکارانەیەیە. سەربازانی کوردی خەڵکی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات دەنێردرێن بۆ سەربازخانەکانی کەناری دەریای سپی ناڤین و یان دەریای ڕەش و لەوێندەر بە بەرنامە سیاسەتی تورکاندنیان لە گەڵدا بەکار دەهێنن.

لەم لاشەوە سەربازی ئیجباری (تورک)ی خەڵکی ناوچەکانی ڕۆژاوا ڕەوانەی ئەو ناوچانە دەکەن کە زۆربەیان کوردن. دیارە ئەوانە هیچیان زمانی کوردی نازانن و هەر ئەم زمان نەزانینە دەبێتە مایەی سەر هەڵدانی چەندین حاڵەتی بەد حاڵی بوون و زەحمەتی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە، بەتایبەتی کە پرۆسەی تەحەڕی و گەڕان بەدوای ئەدەبیاتی کوردی قەدەغەدا بەردەوامە، یان گەڕان بە دوای (خەڵکانی لە یاسا لادەر) و گەڕان بە دوای چەکدا کە جوتیارانی کوردو خەڵکی ناوچەکوردی یەکان بە هۆیەوە توشی لێدان و جنێو پێدان و ناموس بردنی دڕندانە دەبن. ئەم هەموو هێزە چەکدارە لە کوردستانی تورکیا دا، لەلایەکی ترەوە بۆ خۆ نواندن و ترساندنی کوردە، ئەمەش سیاسەتێکە لە سەردەمی ئەتاتورکەوە پەیڕەوی کراوەو دەکرێ. سەرکردایەتی سوپایی، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی تورکیا دا دەستوریان بۆ خەڵکی دەرکردووە کە بەردو تاوێران کۆ بکەنەوەو بۆیەی سپی بکەن و لە دووریانە سەرەکی یەکاندا دای بنەن، تا لە دورەوە وەکو نیشانەو دروشمی گەورە بێتە بەرچاو.

لە ساڵی ۱۹۸۱دا هەر کەسێک ڕێ ی بکەوتایەتە تورکیا لەم بابەتە دروشمانەی بەر چاو دەکەوت : (یەک وڵات) یان "ئەوەی خۆی بە تورک بزانێ بەختەوەرە". ئەمە جگە لەوەی کە لە بەردەم بچوکترین مەخفەری پولیس دا لە کوردستان، کۆتەڵێک یان بەلای کەمەوە وێنەیەکی گەورەی کەمال ئەتاتورک قوت کراوەتەوە، ئەو ئەتاتورکەی گوایە بە بابی شەرعی هەموو چەو ساوەکانی کوردی تورکیا دەژمێردرێ. هەروەها لە هەموو دایەرە حکومەتی یەکاندا وێنەی هەڵواسراوەو زۆر جار وێنەی سەرکردەی ئەم دوا کودەتایەش (کەنعان ئیڤرین)ی بە تەنیشتەوە هەڵواسراوە.

لە شاری ماردین دا، حاکمی عورفی گشتی ناوچەکە دەستورێکی دەرکرد کە قسە کردن بە زمانی کوردی و عەرەبی لە شوێنە گشتی یەکاندا قەدەغەیە. هەروەها تابلۆیەک هەڵواسراو لێ ی نوسرا: "لێرەدا جگە لە زمانی تورکی ناخافێ بەهەر زمانێکی دی

قەدەغەیە. هەرچەندە زۆربەی خەڵكی ماردین كوردن و كەمینەیەكی عەرەب و ئەرمەنیش لەو شارەدا دەژین، ئەوجاش لە قوتابخانەكاندا بە زمانی توركی دەخوێندرێ، دیارە ئەمە بەلای ئەو منداڵە كوردو عەرەب و ئەرمەنانەوە كە بەر لەچوونە قوتابخانە، لە كوچەو كۆلاندا فێری زمانی زكماكی خۆ دەبن شتێكی سەیرو عەنتیكەیە! حكومەتەكەی جەنەراڵ ئیڤرین، رێگەی بانگەشەو رێبازی ئیداری بۆ سەلماندنی شایستەیی خۆی نەگرتەبەر، بەڵكو هەمان رێبازی حكومەتەكانی پێش خۆی گرتەبەرو رێبازی سەركوتكارانەی درندانەی بۆ دامركاندنەوەی هەراو هەنگامەكانی ناوچەكانی رۆژهەلات گرتە بەر . .یەكەی سوپایی و جەندرمەو هێزی كۆماندۆ بە بیانوی گەڕان لە چەك و تەقەمەنی و ئەندام و لایەنگرانی رێكخراوە كوردی یەكان، هێرشێكی گەورەیان كردە سەر ناوچەكانی كوردستان و ئیدی ئاژاوە و نیگەرانی و ترس ناوچەكانی گرتەوە. هەروەها جوتیارە كوردەكان تووشی هێرشێكی، تری تالان و بڕۆو زێدەگاڤی ی لە بابەتی رووداوەكانی سالانی سییەكان بوون لەلایەن مەفرەزە سوپاییە تایبەتی یەكانەوە.

گۆڤاری (دیرشپیگل)ی ئەڵمانی و كەناڵەكانی راگەیاندنی رۆژاوا، رووداوێكیان بلاوكردەوە كە دەكرێت بە بەڵگەیەكی بێ چەندو چونی ئەو حاڵەتە دابنرێ: "هێزی جەندرمە، كێشەیەكی شەخسی نێوان یەكێك لە پارێزەرە دادپرسە گشتی یەكان و سەرۆكی عەشیرەتی (ژیركی) كوردییان كرد بە هەنجەت و پەلاماری "شارۆچەكەی بیت شباب" و زۆر گوندی دەورو بەریان دا لە ناوچەی هەكاریدا. دوو هەزار جەندەرمە رژانە ئەو دەڤەرەو بە ناهەق خوێنی پێنج سەد كوردیان رشت كە لە ترساندا پەنایان وەبەر چیا بردبوو؛ ئەمە وای كرد هەزاران كەسی دی لە ترسی گیانی خۆیان هەڵێن و برەڤن.

هەر چەندە هێزی جەندەرمە ناوچەكەیان تەنی و نەیان دەهێشت چ كەسێك بچێتە ناوچەكەو بە چاوی خۆی رووداوەكان بدینێ و پاشان لە سەریان ببێ بە شایەت، ئەوجاش رۆژنامەنوسی تورك (كورماس)ی پەیامنێری رۆژنامەی (حوریەت)ی توركی، كە لە ئەستەموڵ دەردەچێ، توانی خۆی بگەیەنێتە پەناگەی كوردەكان و قسەیان دگەڵ بكات و چەندین وێنەیان بگرێ.

رۆژنامە نوسی نێوبراوو لە رۆژی ١٨ت١دا شارۆچكەی (بیت شباب)ی بەجێ هێشت. بەلام پیاوانی هیت ئوتومبیلەكەیان راگرت . داوایان لێكرد رێكوردەرەكەی و ئەوكاسێتانەیان بداتێ كە دیمانەی كوردە هەلاتووەكانی لەسەر تۆمار كردون، بەلام (كورماس) نەیدانێ. ئەوەبوو دوای چەند رۆژێك خەڵكی گوندەكانی ئەو دەورووبەرە هەواڵیان بۆ مەخفەرێكی جەندرمە برد كە جەنازەیەك لە ئوتومبیلێك دا دۆزراوەتەوەو لە قەراخی جادەكە فڕێ دراوە.

**بەڵگەنامەیەکی بێ چەندو چون لەلایەن رێکخراوی ئەمنیستی ئەنتەرناشناڵەوە:**

رێکخراوی ئەمنیستی ئەنتەرناشناڵ لەم دواییانەدا بەڵگەنامەیەکی بڵاوکردەوە کە چەندین نمونەی رەفتاری هۆڤانەی دەرهەق بە کورد تێدا تۆمار کراوە. لە ساڵی ١٩٧٥دا جەندرمەی تورک هەموو خەڵکی گوندی (هەفریش)یان خڕ کردەوە، داوایان لێکردن زانیاریان دەربارەی قاچاخچیان بدەنێ، بەڵام کە کەس زانیاری نەدانێ، لە سزای ئەوەدا کە هاوکارییان لەگەڵ حکومەتدا نەکردووە، ناچاریان کردن کە چەندین کیلۆ خوێ بخۆن. هەروەها جەندرمە بە چەرخەکانیان ردێنی پیرەمێری گوندەکانیان دەسوتاند. بەڵگەنامەی نێوبراو ئاماژە بۆ زۆر جۆرە ئەهەقی دەکات کە تورک لە کوردی دەکەن، بەڵام باوترین جۆری ئەو ئەهەقیانە بریتی یە لە فەلاقە، لێدان، کاری بێ ناموسی، تەعەروزی ناموس، کارەبا پێوەنان.

«گەرماوی (هەتاو)ی هاوچەوخ» ئەمیش یەکێکە لە شێوازەکانی ئەشکەنجەدان. ئەم شێوازەش زۆر بەکار دێت. ئەمە شێوازێکە کە خەیاڵی ئەخۆشی ئەفسەرێکی جەندرمەی تورک دایهێناوە: ئەمە بریتی یە لەوەی کە کوردی گومان لێکراو دێنن، رووت و قووتی دەکەنەوە، هیچ جۆرە جلێکی لەبەر نایەڵن، ئەوجا ناچاری دەکەن لەسەر چەندین پلێتێکی گەرم گەرم و بەپشتدا رابکشێت و بە بەردەوامی بروانێتە هەتاو، خۆ ئەگەر یەکێک بەناچاری چاوێکی بنوقێنێ، ئەوا جەندەرمە بە دۆنکی تێ بەردەبێ و ناچاری دەکات زەق زەق بروانێتە هەتاو. شایەتێکی عەیان کە بەخۆی لە دوای کودەتا سوپاییەکەی ساڵی ١٩٨٠دا، کاتێ بە کوردستاندا رەت بووە، بەچاوی خۆی جەندرمەی دیتوە خەڵکی گوندی (میدیات)یان ناچار کردوە خۆ روت بکەنەوەو لەسەر سک بەنێو پەرژێنێکی تازەدا بڕۆن و وازی لێ نەهێناون تا هەموو سک و سینگیان بووە بە یەکپارچە برین وخوێنی لێ چۆڕاوە، ئەمەش بەو هەنجەتەی کە گوایە ئەفسەرێکی جەندرمە گوتویەتی (یاخی)یەکان کە پۆلیس تاقیبیان دەکەن، بەوێندەردا رەت بوون.

هەروەها ئیڤرین وەکو پێشترش ئاماژەمان بۆ کرد لە ووتەکەیدا لە مەلاتی یە دانی بەوەدا نا کە لەرۆژی ١٢/٩/دا کە دەکاتە رۆژی پاش کودەتاکە: "ژمارەیەکی زۆر لە خیانەتکارانی نیشتمان لە پروسەیەکی تەحەڕیدا دەستگیر کران، ئەوانەش کە دەستمان پێیان نەگەیشتوە هەر کاتێ بجوڵێنەوە، فرمان دەردەکەین کە تەحەڕی بکرێنەوە، ناچار بوین زۆر جاران ئەم پروسەیە دوبارە بکەینەوە". هەروەها لە ووتەکەیدا ئەوەش دوپات دەکاتەوە کە بەتەمان لە ئایندەدا چی دەرهەق بەو خیانەتکارانە بکەن و دەڵێ: "هێزی جەندرمەو سوپا، هەر کە ئەو خیانەتکارانە بجوڵێنەوە، دەستگیریان دەکات ئیدی لە هاوین بێ یان لە زستان دا، پاکیان دەکەینەوەو مل کەچی دەستورو فرمانەکانی خۆمانیان دەکەین".

قەوان و (کاسێت)ی گۆرانی و موسیقای فولکلۆری کوردی لە ریزی پێشەوەی شتە قەدەغەکاندا بوون؛ دیارە ئەمەش هۆیەکی بەجێ ی خۆی هەیە: لەوساوە کە رۆژنامەو چاپەمەنی بە زمانی کوردی قەدەغە کراوە، هەرچەندە کاتێ کە دەریش دەچون زۆر بەکەمی دەخوێنرانەوە، چونکە رادەی نەخوێنەواری لە نێو جوتیارو هاو وڵاتیانی کوردا زۆر زۆرە، ئیدی رۆڵی (دەنگ بێژان) زیادی کردو ئەمەش هەراسی لەبەر پرسان هەڵگرت، چونکە هونەرمەندان و دەنگبێژانی کورد هەوڵدەدەن ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە کە سیاسەتی چەوساندنەوەی رۆشنبیری تورکی، دەرهەق بە کورد، دروستی کرد.
زۆرجار رێک دەکەوێ کە هەزاران کورد لە شاران دا کۆ دەبنەوە تا گوێ لە دەنگبێژێکی کورد بگرن، دیارە پاش ئەوەی ژێراو ژێرو بەدزی یەوەو دەماو دەم و بە چپە بانگەشەی پێویستی بۆ دەکرێ. جەندرمە لە سەرەتادا ویستیان گوێ بەمجۆرە کۆڕو ئاهەنگ و کۆبونەوانە نەدەن، پێیان وابوو ئەمە شتێکە لە بابەتی ئاهەنگی زەماوەندو ئەو جۆرە بۆنانە، بەڵام کە لە ئەنجامدا پەیان بە دەلالەت و نێوەرۆکی سیاسیانەی ئەم کۆبونەوە جەماوەرییانە برد، ئیدی پەلاماریان دان و بڵاوەیان پێکردن و قەدەغەیان کرد.

## شاعیری بەرەڤانی (شڤان) مەترسی یە بۆ ئاسایشی دەوڵەت

سترانبێژ (شڤان)ی ناسراو بە (شاعیری بەرەڤانی) لە سەرەتای حەفتاکاندا یەکێک بوو لە هونەرمەندە بە نێو بانگەکانی ئەو مەیدانە. جەندرمە زوو هەستیان بە خەتەرو مەترسی ئەم هونەرمەندە کرد. بۆیە هەرهەمو کۆڕو کۆبونەوەو بونەیەک، کە شڤان ئامادەی بێ، قەدەغە کرا. هەروەها جەندرمە ئەو فەندو فێڵانەشی کەشف کرد کە بە ناوی بۆنەی کۆمەڵایەتی یەوە وەکو پەردەیەک بەکار دەهێنران تا شڤان لە سایەیدا ئاهەنگ بگێرێ. لەگەڵ ئەوەشدا گۆرانی یەکانی هەمو لەمپەرو سنورێکی بڕی و بە ئاسانی خۆی بە هەمو ماڵێکی کوردا دەکرد چ لە شاران و چ لە گوندان. هەرچەندە قەدەغەکرا کە لە بۆنە ئاشکراکاندا گۆرانی بڵێ و ژمارەیەکی زۆر لەو کاسێت و قەوانانەی کە گۆرانی شڤانیان لەسەر تۆمار کرابوو دەستیان بە سەردا گیرا، ئەوجاش هەمو خەڵکی گوێیان بۆ دەنگی شڤان رادەدێرا کە لە دورەوە لە کاسێت و بلندگۆکانەوە دەیپرسی: کوردستانم کا؟

شڤان، بەگۆرانی هەستی کوردی جۆش دەدا، داوای لێدەکردن لە پێناوی ئازادی و مافی خۆیاندا بخەبتێ و دەقی سترانی شۆڕشگێرانەی پێشکەش دەکردن وەک:

"کوردستانم کا... نیشتمانم کا؟
کا رەزو باخمان..کێڵگەو مەزرامان، کا نیشتمانم؟
کوردستان گولیلکا سورا من
من لە نیشتمانم، لە کوردستانم دەگەرێم و نایدۆزمەوە.
دژمنان، بست بە بـ ـتیان داگیر کردووە.

یان:
کوردستان ئێمەی هێنا... کردیی بە بەشەر
ئەو دەبێ هەر ڕۆژ ببێتەوە
هەتاو لە نوێ هەڵبێتەوە.
کوردستان ئەی نیشتمانم.. لە بیرت ناکەم ..تا نا لە بیرت ناکەم".

شڤان لەساڵی ١٩٧٦و لە ئەنجامی ڕاوەدونانی بەردەوامەوە ناچار پەنای وەبەر هەندەران برد. لە ئەوروپادا کەوتە گۆرانی گوتن بۆ ئەو کرێکارە کوردانەی کە لە کوردستانی تورکیاوە هاتبوون و دەرفەتیان بۆ ڕەخسا بوو کە هوشیاری ڕۆشنبیریی نەتەوەیی خۆ پەروەردە بکەن و بۆ یەکەمجار لە ژیانیاندا ئاشنایی کتێبی کوردی و مێژووی نەتەوەو گەلی خۆ بوو بوون. لە ساڵی ١٩٧٧دا دەرفەتم بۆ هەڵکەوت لە ئاهەنگێکی گۆرانی گوتندا ببینم، گۆرانی بۆ سەدان کەس لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی دەگوت. لە ئاهەنگێکی کۆمەڵەی دۆستایەتی کوردو ئەڵماندا لە شاری سانتی ئوگستین ی ناوچەی (ڕاین)ی ئەڵمانی ئەم ئاهەنگەی دەگێرا. (میرکامەران بەدرخان)ش کە تەمەنی ٨٠ ساڵ بوری بوو، لە پاریسەوە بۆ ئەو ئاهەنگە هاتبوو تاگوێ لە شڤان بگرێ کە گۆرانی (کوردستانم کا)ی دەگوت.

لەو موناقەشەو باسانەدا کە لەوێ دەکران و نوێنەرانی بزاڤی کوردی-ش ئامادەی بوون، ئەو بزاڤەی کە جەنراڵ بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێبەری دەکەن، ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەو کوردە پەنابەرانەی ئەوروپا، کەوتونەتە خۆ بۆ ئەوەی یەکێتی یەک لە نێو هەر هەموو ئەو ڕێبازە کوردی یە جیاوازانەدا دروست بکەن کە لە پێناوی ڕوخاندنی هەموو ئەو ڕژێمە چەوسێنەرانەدا تێ دەکۆشن کە لە هەموو پارچەکانی کوردستان دا کورد دەچەوسێننەوە. دیارە ئەمەکارێکی مەحاڵ نی یە و بگرە زۆریش لە گوێنە، ئەگەر ئەوە لەبەر چاوبگرین کە ڕۆڵەکانی گەلی کورد بۆ یەکەمجار دەتوانن یەکدی ببینن بە بێ ئەوەی ناچار بێن ئەو سنورانە ببڕن کە لە لایەن هێزی سوپاییەوە چاودێری دەکرێن.

ئیدی بەمجۆرە دەرفەت بۆ کوردی محافەزەکارو ناسیونال عەشایەرو شۆڕشگێڕانی سوسیالستی وەکو شڤان و میرانی کۆنە فیوداڵی وەکو (میر بەدرخان) و داواکارانی ریفورمی کشتوکاڵی، ڕۆشنبیرانی کوردی کوردستانی عێراق و کرێکارانی سادەی دواکەوتوترین ناوچەی کوردستانی تورکیا، ڕەخسا کە بە ئاسانی یەکدی ببینن و بەوپەڕی ئازادی و لە کۆشە نیگایەکی ئایندەگەری یەوە موناقەشەی ئەوە بکەن کە چ هەنگاوێک بنەن و چ نەخشەیەک دابنێن بۆ وەدی هاتنی ئاوات و خەونەکانیان، بۆ ڕزگاری و ئازادی وولاتەکەیان.

هەروەها هەزاران کوردی تورکیا، بۆ یەکەمجار لە ژیانیاندا دەرفەتیان بۆ هەڵکەوت، یەکەمین ئامیلکەی فێر بوونی خوێندنەوەو نوسینی کوردی، بە زمانی کوردی ببینن.

دیاره ئەمەیان لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی (بەتلیس)، (دیاربەکر)، یان (وان)دا نەبینی بەڵکو لە بارەگاکانی کۆمەڵە وسەندیکا کرێکاری یە کوردی یەکانی شارانی (دورتموند) یان (ئویرتال) یان (بەرلین)ی ئەڵمانیای فیدرالی دا بینیان. هەرچەندە کاری هاوبەش و هەم ناهەنگی خەبات لە نێوان کرێکاران و رۆشنبیرانی کوردا لە بنەرەتدا لە کوردستانی تورکیاوە دەستی پێکرد، بەڵام ئەم هاوکاری و هەم ئاهەنگی یە بە شێوەیەکی ئاشکراترو خەملیوتر لە ئەروپادا دەرکەوت، چونکە لە ئەوروپادا زۆر ئیمکانات هەیە کە لە وولاتی خۆیاندا نی یە.

## لە (کارل مای)یەوە بۆ (کارل مارکس)

گورانی یەکانی شڤان بەلای منەوە رەنگدانەوەی رویەکی تری روداوەکانی مەسەلەکەن: بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، لەم ساڵانەی دواییەدا رێرەوێکی گرتەبەر کە زۆر دورە لەو وێنەو دیمەنە رۆمانسیانەی کە باری سەرنج و تێبینی گەشتیارانی ئەوروپایی لە سەدەی نوزدەدا دەربارەی کوردستان و کورد لە هزرو بیرماندا دروستیان کرد بوو. بزوتنەوەکە، بە تایبەتی لە کوردستانی تورکیادا گۆڕا بۆ بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێری سوسیالستی دژ بە ئیمپریالزم، وەکو چۆن ئەمە حاڵی هەموو بزوتنەوە رزگاریخوازە نیشتمانی یەکانی جیهانی سێیەم بوو.

گۆرانی یەکانی شڤان لەهەمان کاتدا ئاراستەیە بۆ ناسیونالستەکان و (شۆڕشگێڕەکان)ش ئەمەش لە ناونیشان و ناوەرۆکی گۆرانی یەکاندا دیارە:- "...راپەن..لێدەن..سەرکەون بەسەرچەوسێنەراندا..سەیری دنیای دەرەوبەرتان بکەن..خەباتی شۆڕشگێرانی دنیا بخوێننەوە..ئەوە فەلەستین و ڤێتنام". زۆربەی گۆرانی یەکانیش بەم جۆرە کۆتاییانە دواییان دێت: "رۆژی شۆڕشی سەرکەوتوی کورد هاتوە، ئەو شۆڕشەی ئاڵای سوری بەرزی شەکاوە رێبەری دەکات". یان رستەو دەستەواژەی تری لەو بابەتە.

کوردی تورکیاو هەندێ لە کوردی ئێران، ئەوانەی کە تازە لە دنیای کارل مای هاتبوونەدەرێ، پەنایان وە بەر کارل مارکس بردو ئەویان بە پەناگەی خۆ زانی؛ دیارە ئەمە بە شیوەیەکی دیار لە نێو لاواندا رەنگی داوەتەوە، ئەو لاوانەی بە تاسەوە ئەو سەربهوردە ئەتەوەییانەی لە مەڕ سوڵتان محمود یان (سوارەی رەش) هەن دەخوێننەوە ئەمە جگە لەو نوسراوانەی کە ماوتسی تونگ و لینین لەمەڕ شەڕی پارتیزانی نوسیویانن. هەروها خەڵکێکی زۆر لەوانەی کە خەون بە (ئازادی بۆکوردستان)ـەوە دەبینن، هەوڵدەدەن شەڕێکی رزگاریخوازی لە بابەتی شەڕی رزگاری ڤێتنام و ئەنگۆلا بەرپا بکەن. (یورگن روث)ی نوسەری ئەڵەمانی کە لە تورکیادا زیندانی کراوە لەسەر ئەوەی کە لەسەر داوای رێکخراوی ئەمنیستی ئەنتەر ناشنال، راپۆرتێکی لەمەڕ

کوردستانی تورکیا ئامادە کرد بوو، دەڵێ: "کورد، لە تورکیا دەتوانن هەمان دەور بگێڕن کە باسک لە ئەسپانیا دا دەیگێڕن".

دیارە چەند هۆیەک هەیە بۆ رووکردنە ئەم رەوتی چەپگەراییە: لە کوردستانی تورکیادا ئەو بیرە چەسپی، کە بۆ یەکەم جارو لە ساڵی ١٩٧٠دا ئیعترافی رەسمی بە بوونی کورد کرا، ئەم ئیعترافەش لە لایەن حیزبێکی سوسیالستی تورکی یەوە بوو، ئەویش حیزبی کریکارانی تورکی بوو کە لە کۆنگرەی هەمان ساڵی خۆیدا دەپاتی کردەوە کە : "گەلی کورد لە رۆژهەلاتی تورکیا دا دەژی". هەر هەمان کۆنگرە ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد کە "حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی تورک، سیاسەتی تۆقاندن و تواندنەوەی نەتەوەییان دژ بە کورد بە کار هێناوەو ئەم چەوساندنەوەیەش لە شێوەی هێرشی سوپایی وعەمەلیاتی راوەدونان دا خۆی نواندووە".. کۆنگرەکە گەیی یە ئەو ئەنجامەی کە هۆی دواکەوتویی ناوچەکە دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی دژمنکارانە دژ بەکوردو هەروەها بۆ ئەو سیاسەتە ئابوری یە گشتی یەی کە ئەم حکومەتانە لە سەری دەڕۆن". دیارە ئەم هەڵوێستە بەرانبەر بە کورد، یەکێک بوو لەو هۆیە سەرەکیانەی کە حکومەتی هاندا ئەم حیزبە قەدەغە بکات.

کاتێ دادگای سوپایی سێیەم لە ئەنقەرەو لە رۆژی ١٩/٨/١٩٧١دا سەرانی ئەم حیزبەی دادگایی کرد، بەوە تاوانباری کردن کە (مومارەسەو پشتیوانی لە سیاسەتی جودا خوازی دەکەن). حکومەت بەم کارەی یەکەمین بەردی بناغەی هاوکاری و هەم ئاهەنگی لە نێوان بزاڤی رزگاری کوردو سوسیالستە تورکەکاندا دانا.

تەنانەت ئەوسەرکردەو رێبەرە کوردانەش کەپێیان وابوو رێکخستنی بزاڤی رزگاری کورد لەچوار چێوەی رێکخراوانی شەقڵ کۆمونیستی- سوسیالستی دا بۆ کورد مەترسی یە، ئەوانەش کەوتنە ئەوەی لە روانگەیەکی تازەوە مەسەلەکە تاوتوێ بکەن : ئەوانە پێیان وایەکە حکومەتە تورکی یە یەک لە دوای یەکەکان، لە لایەکەوە بوون بە شەریکی پەیمانی ناتۆو وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە لافی ئەوە لێدەدەن کە گوایە بەرگری لە ئازادی دەکەن؛ بوون بەو شەریکەی کە تازە ئەمریکا دەستیان لێ هەڵناگرێت.. لە لایەکی ترەوە ئازادی لە ولاتەکەی خۆیاندا؛ لە تورکیادا قەدەغە دەکەن و بە جۆرێکی هێندە توندو دڕندانە کورد دەچەوسێننەوە کە بە هیچ جۆرێ لەو چەوساندنەوانە کەمتر نی یە کە لە سەردەمی ستالین و لە سەردەمی فاشیزم دا بەکار هێنراون.

## ناوچەیەک، لە خوار ئاستی ئەشونماوە

فاکتەری هەرە گرینگی ئەم بۆچونە تا ئێستا، ئەو حالەتی پاشکەوتنە ئابوری و کۆمەلایەتی یەیە کە ناوچە کورد نشینەکانی تێدا دەژی، هەر وەها ئاستی بژێوی زۆر نزمی کورد لە تورکیا؛ ئەو تورکیایەی پەیوەستە بە جیهانی رۆژاواوەو جیهانی

رۆژاواش تەماحی تێدایان هەیە کە ببێ بە ولاتێکی گەشتیاری وەها کە سور بێ لە سەر پاراستن و قولکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەل هاوپەیمانانی جیهانی (ئازاد)ا، ئەویش لە رێگەی کودەتای سوپایی یەک لە دوای یەکەوە. تا ئێستا لە رۆژهەلاتی عەنەدۆل دا ئاغاواتی وەها هەن کە یەکێکیان حوکمی پتر لە هەشت سەد گوند دەکات. یەکێک لەو ئاغایانە دە گوندی (ئورفە)ی نزیکی سنوری سوریا بە مولکی خۆی دەزانێ.

پتر لە ۳/۱ی خێزانە جوتیارە کوردەکان بێ زەوی وزارن. هەر وەها کاری قورسی وەرزێری و بەد خۆراکی و کەمی بایەخدانی پزیشکی کارێکی وەهای کردوە کە تێکرای تەمەن لە نێو کوردی رۆژهەلاتی عەنەدۆلدا لە ٤٥ساڵ کەمتربێ. لە هەندێ ناوچەی کوردنشینی وەکو هەکاری، مرۆڤ بۆ ئەوەی دکتۆرێک بدینێ دەبێ بە پێیان یان بە سواری قاتر ماوەی (١٥٠) کیلۆمەتر ببڕێ. خۆ لە زستاناندا یان کاتێ ئەو چەند دکتۆرە کەمەی ناوچەکە، لەتاو سەرماوسۆڵە خۆدەگەیەننە رۆژاوای تارادەیەک گەرم، ئەوا سادەترین ئەخۆشی دەبێتە مایەی مەرگی ئەخۆشەکە.

بەپێ ی ئامارێک کە لە ساڵی ١٩٦٥دا ئەنجام دراوە، لە سەرانسەری تورکیادا هەر (٢٦٨٠) هاوولاتی یەک دکتۆریان بەردەکەوێ. بەلام لە ناوچە کوردنشینەکاندا کە بەهۆی ساردی و سەختی ناوچەکەوە پێویستیان بە دکتۆری زیاتر هەیە، ئەوا دەبێ هەر دکتۆرێک (٦٦٦٧) هاوولاتی مالیجە بکات. لە شاری تەبلیس دا هەر (٥٧٥٠٢) کەس یەک دکتۆریان بەر دەکەوێ. خۆ رێژەی دکتۆری ددان و دەرمانخانە زۆر خراترە لەوە. بۆ وێنە لە شاری (سیرت)ی کوردی دا هەر (٢٦٤٠٠٠) کەس یەک دکتۆری ددانیان بەردەکەوێت. لەکاتێکدا کە بەپێ ی ئامار لە تورکیادا بەرانبەر بە هەر (٢٠٠٠٠) کەس یەک دەرمانخانە هەبووە، ئەوا لە دەڤەرو هەرێمی هەکاریدا تاقەیەک دەرمانخانە نەبووە. هەروەها سەبارەت بە ناوچەی (دەرسیم)ش کە پتر لە جارێک لە روی تورکەکان راپەڕیوە. لە رۆژی ١٩٦٩/٥/١٠دا ئەنجومەنی شارەوانی (چوقورچە ئولودەرە) ئەم بروسکەیەیان بۆ لایەنە رەسمی یەکانی ئەنقەرە ناردووە: "سێ هاوولاتی کە لەبرساندا گژ و گیایان خواردبوو مردن. لەبەر ئەوەی لەم مەلبەندەدا چ دکتۆرو چ پەرستارێک نی یە، بۆیە هۆی مردنەکەیانمان بەم شێوەیە دیاری کرد: مردن بە هۆی خواردنی گژ و گیاوە."

لە ساڵی ١٩٧٦دا گۆڤاری جڤاتی پزیشکانی تورک نوسیویەتی کە رێژەی مردن لە نێو مندالاتی چوار سالان کەمتر لە تورکیادا دەگاتە ٩و٥٤٪ لە یەکێک لە ساڵەکاندا شەست هەزار قوربانی ناوچە کوردنشینەکان بەهۆی نەبوونی مامۆستاوە لە خوێندن مەحروم بوون. ئەمە لەوکاتەدا کە رێژەی نەخوێندەواری لە تورکیادا ٤٥٪، ئەوا ئەم رێژەیە لە ناوچە کوردنشینەکاندا دەگاتە ٧٥٪.

ئەم حەقیقەتانە وایان لە پسپۆڕی هندی (مجید رشید جعفر) (*) کرد، کە پسپۆڕە لە کاروباری فریاکەوتنی دەوڵەتانی نامی دا، ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا بکات بە بواری لێکۆڵینەوەیەکی خۆی کە لە ساڵی ۱۹۷٦دا لە ژێر ناونیشانی "لەخوار ئاستی نەشونماوە" لە هلسنکی دا بلاوی کردوەوە.

لە روانگەی ئەم دوا کەوتنە گشتی یەو ئەم هەژاری یە کۆمەڵایەتی و چەوساندنەوەیەوە، لە روانگەی گومان کردن لە نیازپاکی دنیای رۆژاوا، کە بەو چاوە سەیر دەکرێ کە هاوپەیمانی ئەنقەرەیەو لە دوا ئەنجامدا بەرپرسیارە لەو وەزع و حاڵەی کوردی تێدایە، ئا لەم زەمینە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە گەلێک قوتابی و رۆشنبیرو لاوی کورد لە سەرەتای هەفتاکاندا لە دەوری یەکدی خڕ بوونەوە بۆ موناقەشەکردنی رێگەیەکی تازە بۆ وەدی هێنانی ئازادی خۆیان. ئەو زمانە سیاسی یەی ئەوان پێ ی دەدوێن زۆر جیاوازە لەو زمانەی کە بابیان پێ ی دەدوان و بەوە قایل بوون کە خود موختاری رۆشنبیرییان بدرێتێ و سوکە گۆڕانێک بە سەر ژیانی کۆمەڵایەتیاندا بێت.

بزاڤی رزگاری نوێ ی کورد، کە گۆڕاوە بۆ بزاڤێکی سوسیالستی رزگاریخوازی نەتەوەیی، رێکخراوە چەپە تورکەکان، پشتیوانی لە ئامانجەکانی دەکەن، هەنگاوی بتەو لەرێ ی شەڕی پارتیزانی دەنێ، پشتیوانی یەکی ئایدولوژی و پراتیکی دەکرێ لە لایەن براکانیانەوە لە ئێرانەوە، بە تایبەتی دوای روخانی شا.

---

(*) دکتور مجید جعفر هندی نییە وەکو لە دەقە ئەڵمانی یەکەدا باس کراوە، بەڵکو کوردی کوردستانی عێراقە، لە کەسایەتی یە نیشتمانی و خوێندکارییە دیارەکانی کوردە لە ئەوروپا، سەیرە نووسەر وێڕای شارەزایی باشی لە زۆر لایەنی دۆزی کوردی و بزاڤی خوێندکاری وسیاسی کوردی لە ئەوروپا، ئەم هەڵەیەی بەسەردا تێ بپەڕێ. عبدالسلام بەرواری.

# فەسڵی شەشەم

*جەنەڕاڵ سالم ئاتاکیخوف...و سەفەری باکۆ.*

**کوردی ئێران، بەیەخدانەوەی نوێ ی سۆڤیەت بە دۆزی کوردی.**

فڕۆکە ڤانتۆمەکانی ئێران بەگرمەگرم بە سەر شاردا تێپەڕین. کاتێ فڕۆکەکان لە ئاسمانی شاردا دەنگیان بەردا، ناپورای خەڵکی مەیدانی چوار چرا زۆر ترسان. هەرچەندە فڕۆکەکان شاری مهابادیان بۆردومان نەکرد، بەڵام خەڵکەکە چ ئومێدێکیان بەو ئاشتی یە نەما کە لە گۆڕێدا بوو. خەڵکی شارو ئەو جوتیارانەی کە هاتبونە نێو شار، کەوتنە دروستکردنی پەناگەو هەڵکەندنی سەنگەرو چاڵە تەیارە: چونکە سوپای ئێران روەو شار دەهات و لە دووری چل کیلۆ مەتری شاردا بوو. بەڵام کاتێ ترومبێلی عەسکەری پڕ لە پێشمەرگەی چەکداری کورد گەیینە ناو شار، هەر هەمو ئەو هەستە نیگەرانی ئامێزانە رەوینەوە. دیارە پێشمەرگەکان ئەو چەکانەیان لەو جبەخانە سوپاییانەی ئێران دا گرتبوو، کە لەو چەند رۆژەی دوای روخانی شادا، تەواو لە حاڵەتی هەرەس دا بوو. وەختێ ئوتومبیلەکان گەیینە مەیدانی چوار چراو روەو باکور ملیان نا، ئیدی دەنگی هورا و سرودی پێشمەرگەو لە پێش هەموویانەوە سرودی (ئەی رەقیب) بەرز بوەوە. ئەم سرودە لە مهابادا و لە ساڵی ١٩٤٦دا لە لایەن شاعیری کورد (یونس رفعت دڵدار)ـەوە دانراوە: "ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان، نای شکێنی دانەری تۆپی زەمان. کەس نەڵێ کورد مردووە، کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زندووە. زندووە قەت نانەوێ ئاڵاکەمان. جەنگاوەرە کوردەکان ئەم کۆپلەیەی دواییان بە شێوەیەکی تایبەت و بە دەنگی بەرزی پڕ لە شانازی یەوە دەگوتەوە: "سەیری کە خوێناوی یە رابردوومان. لاوی کورد هەر حازرو ئامادەیە گیان فیدایە گیان فیدایە هەر گیان فیدا"

یەکەم تەق و توق و (پێکدادان)ی تازەی سوپایی لە مەهاباد و شاری سنەی باشوری مهابادەوە دەستی پێکرد، کاتێ رژێمی شا وەکو شێرە بەفرینە تواپەوەو کەوت، کورد دەستیان بە هێرشێکی کوتوپڕکرد بۆ سەر سەربازخانەی سوپای ئێرانی لە مهاباد، پاش ئەوەی سەربازەکانی لیوای پیادەی (٢٨) هەڵاتن و سەربازخانەکەیان بە جێ هێشت، کە ئەفسەرێکی ئێرانی بە پلەی لیوا لەم عەمەلیاتەدا بریندار بوو،کوردەکان دەستیان بە سەر سەربازخانەدا گرت. تەق و توق لە زۆربەی ناوچە کوردنشینەکاندا، بۆماوەی چەند رۆژێک درێژەی کێشا.. هێزی پاسدارانی سەر بە حوکمرانی تازەی ئێران (خومەینی) پشتیوانیان لە هێزی ئێران دەکرد. بەپێ ی راپۆرە رەسمی یەکان لەم شەڕانەدا (٩١) کەس کوژران، بەڵام سەرچاوەکانی تری هەواڵ، وا رادەگەیەنن کە کوشتاری ئەم شەڕانە لە پێنج سەد کەس پتر بووە و جگە لە سەدان زامدار.

کوردەکان، لە سەرەتاوە زۆر بەگەرمی پشتیوانیان لە شۆڕشی ئێران کرد. ئەتەمابوون ...ای خۆد موختارییان بداتێ و نەرم و نیانی یەکی زیاتریان لە گەڵدا بەکار بێنێ بۆ وەدی هاتنی داخوازی یەکانیان.

شاندێکی کوردی لە پیاوانی ئاینی و سەرەک عەشایەری کورد لە شارەکانی سنەو کرماشان و مەهابادەوە بەرەو تاران چوو تا گوێ رایەڵی و پشتیوانی خۆی بە خومەینی رابگەیەنێ. بەڵام ئیمام هێشتا هەر مەستی سەرکەوتنەکانی خۆی بوو، بۆیە بە ئاشکرا رەفزی کرد کە حوکمی خود موختاری بە کورد بدرێ. هەروەها بە شاندەکە راگەیەنرا کە رێ بە کورد نادرێ نوێنەری لە ئەنجومەنی شورادا هەبێ؛ چونکە کورد سوننی مەزهەبن و ئەندامەتی لە (پەرلەمانی ئیمان داران)دا تەنێ بۆ خەڵکی شیعەیە. کورد، کە ئەم هەڵوێستەیان بینی، هیچیان بۆ نەمایەوە تەنیا ئەوە نەبێ کە شۆڕش رابگەیەنن و لە رژێمی تازە یاخی بێ.

سەرکردایەتی تازەی ئێران کە لە هەردوو مەیدانی تیۆری و پراتیکی دا بێ ئەزموون بوو، بە ئاشکرا رایگەیاند کە (بە زەبری هێزو بە توندی) یاخی بوونی کوردەکان سەرکوت دەکات و لە نێوی دەبات. بەڵام پاش ئەوەی هێزەکانیان لە مەهابادو سنەدا دوچاری شکستی سوپایی بوون، رژێم ناچار بوو بابداتەوەو رێگەی گفتوگۆ بگرێتە بەر. ئەوە بوو وەزیری ناوخۆ (حاج سید جوادی) و (ئایەتوڵلا تاڵەقانی) کە لە روحانی یە هەرە دیارەکانی ئێران بوو، بۆ ئەم مەبەستە بۆ مهاباد نێردران.

حوکمڕانانی تاران، پێویستیان بە ئاگر بەست و راگرتنی شەر هەبوو، چونکە ئەو کاتەی کە بۆ ئەنجامدانی ریفراندۆم و هەڵبژاردنی گشتی دانرابوو، تەواو نزیک بوو بووەوە. تاران گفتی بە کورد دا کە (جۆرە سەربە خۆییەکی) لە بابەتی سەربەخۆیی وولاتەکانی وولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکایان بداتێ، بەمەش ئەو هودنەو ئاگر بەستەی کە پێویستی بوو، دابینی کرد. هەڵبەتە ئاگربەستەکە لە سەر بناغەی هەندێ گفت و بەڵێنی فشەڵ رۆنرابوو، بۆیە نەیدەتوانی بەردەوام بێت.. چونکە کوردو بەتایبەتی خەڵکی مەهاباد بە حوکمی ئەزمونی تفت و تاڵی رابردویان دەیانزانی کە بەڵێن و بەڵێنکاری، چاوەروانی ئەوەی لێناکرێ خود موختاریان بۆ دابین بکات.

## سەربەخۆییەک کە مێژوویەکی تایبەتی هەیە

مهاباد، بەلای کوردانەوە شارێکی پیرۆزە. چونکە بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردا، لەو شارەدا بەرزترین خۆزیاو هێڤیان هاتە دی: دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی؛ ئەوە بوو لە رۆژی ۱۹٤٦/۱/۲۳داو لە سەر سەکۆیەکی بچوکەوە کە لە مەیدانی چوار چرادا بۆ ئەو مەبەستە رۆنرا بوو، دامەزراندنی کۆماری مەهاباد راگەیەنرا. هەر چەندە ئەم کۆمارە لە ساڵێک کەمتر دەوامی کرد، بەڵام مێژووی کۆمارەکەو چۆنیەتی دامەزراندنی و ئەو

رووداوانەی پێش ئەو ڕووداوە مێژووییە کەوتن و ئەو ڕووداوانەش کە بە گەڵی کەوتن، بەشێوەیەکی ئاشکراو زیاتر لە هەر ڕووداوێکی دی، ئەو واقیعەکارەسات ئامێزە پیشان دەدات کە ناوێتەی خەباتی کورد لە پێناوی سەر بە خۆییاندا بووە. هەروەها پێگەی بزووتنەوەی ڕزگارییخوازی کورد لە نێو سیاسەتەکانی زل هێزەکاندا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە لایەکەوەو پەیوەست بوونی لە لایەکی ترەوە بە زرووف و هەلومەرجە ناوچەیی و نیشتمانی و نێودەوڵەتی یەکانەوە دەنوێنێ؛ ئەوە بە دیاردەخات کە چۆن سنوور بۆ جوڵانەوەیان دادەنێ و بوارە زۆرەکانی هەڵبژاردنیان لێ کەم و سنووردار دەکات. خەباتی کوردی ئێران لە پێناوی سەربەخۆیی دا کۆنەو مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە. دەسەڵاتە ڕەسمی یەکانی ئێران، وەکو تورکیا لە هیچ کاتێکدا دانیان بەوەدا نەناوە کە کورد ڕۆڵەی نەتەوەیەکی سەر بەخۆیە. لە باشترین حاڵەتدا وەها سەیری کورد کراوە کە هەندێ تیرە و تایفەی ئێرانین و شێوەزمان و دیالێکتی تایبەتیان هەیە. زۆر سەر چاوەی ڕۆژاوایی بێ چ لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەیەک ئەم بۆچوونە ڕەسمی یە ئێرانی یەیان وەرگرتوە و پشتیان پێ بەستوە. تەنانەت ئەو کۆششە زانستی یە تازەیەش کە پێ ی دەگوترێ (تاریخ کمبرج لایران) ئەم گوتەیەی پەسند کردوە کە کوردی ئێران بەوە دەزانێ گوایە: "گروپێکن لە گروپەکانی گەلی ئێران و خەسڵەتی نەتەوەیی تایبەت بە خۆیان نی یە. ئەمانە (کورد) بەزۆری کۆچەرو مەڕدارن و بە پلەی سەرەکی خەریکی ماڵات و ئەسپ بە خێو کردنن. دیارە بە هۆی ئەم بۆ چوونە هەڵانەوە حاڵەتی کورد لە ئێراندا هێندەی دی ئاڵۆز دەبێت، چونکە لە حاڵی حازردا چ شوێنێکی جوگرافی تایبەت بە خۆیان نی یە، بەڵکو لە نێوان چیاکانی ئەلبورز و خۆراساندا دابەش کراون و جگە لەوەی کە لە هەردوو پارێزگای ئازربایجان و کوردستاندا هەن. کورد، لە سەدەی حەڤدەمدا لە خوراسانی نزیکی سنووری ئێران-سۆڤیەت نیشتە جێ کراون. لە سەدەمی هەژدەش دا وەکو ڕێبەری بزاڤی ڕزگاری کورد هاتوونەتە سەر شانۆی ڕووداوەکان، بەڵام دەوریان لە بزاڤی ڕزگاریخوازی هاوچەرخی کوردی دا زۆر کەمە".

بەڵام هەوڵی بێ ووچان لە پێناوی سەر بە خۆییدا. هەمیشە خولیای ئەو کوردانەی ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژاوای دەریاچەی ورمێ و دەشتە بە پیت و بەرەکەتەکانی موکریان و زۆربەی ناوچەکانی پارێزگای کوردستانی ئێران و بەشێک لە پارێزگای کرمانشا بووە. ئەو بزووتنەوەی ڕزگارییەی کە لە پاش یەکەم جەنگی جیهان لە عێراق و تورکیا دا سەری هەڵدا خێرا کاری کردە سەر کوردەکانی ئێرانیش و بە ئاسانی بیری ڕزگارییان قبوڵ کرد و وەکو هەر هەموو ئەو گەلانەی کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا پێشوازییان لە بزاڤ و بیری ڕزگاریخوازی کرد، ئەوانیش پێشوازییان لێکرد. کاتێ کە عەقید ڕەزاخانی پەهلەوی لە ساڵی ۱۹۲۵دا کودەتایەکی سوپایی ئەنجام داو قاجارییەکانی لە سەر تەخت لادا و خۆی کرد بە شاهنشای ئێران، ئەمە خۆی لە خۆیدا ئاژیرو زەنگی خەتەر بوو بۆ چەوساندنەوەی کورد لە ئێراندا؛ ئەوە بوو زمانی کوردی

قەدەغە کرا، جل و بەرگی نەتەوەیی کوردی قەدەغەکراو تاران پەنای وەبەر چەکە لە مێژینەکەی خۆی بردەوە کە زۆر جاران دژی کورد بەکاری هێناوە: چەکی راگوێزان و کۆچاندن.

## ٥ هەزار دۆلار، لە بری دابین کردنی سەفەری موبەشرێکی ئەمریکی

سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەیی لای کورد و چەوساندنەوەیان لە لایەن دەسەڵاتی ئێرانی یەوە لە لایەک و کەش و هەوای گشتی نائارامی ناوچەکە کردییە کارێک کە دەسەڵاتی ئێرانی لە ناوچە کوردنشینەکاندا لەق ببێ و لە ئەنجامی ئەوەوە کە روس و تورک و ئێران بە نۆرە دەسەڵاتیان بە سەر ناوچەکەدا دەگرت، ئەمە بووە هۆی ئەوەی میرانی کورد هێزی خۆیان خڕ بکەنەوە وئەو دەرفەتانە بقۆزنەوە بۆ وەدەست هێنانی چەک و رێکخستنەوەی هێزەکانیان.

لەلایەکی دیەوە، هەموونەم فاکتەرانەی کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە ناوچە کورد نشینەکاندا باو بوو لە ئێران، کردییە کارێک کە شۆڕشێکی کوردی بە سەرکردایەتی (روبن هود)ی کوردی؛ سەرکردەی خێڵەکی (اسماعیل- سمکۆ) بەرپا ببێ کە لە پایزی هەمان ساڵدا بە هێزێکی سێ هەزار کەسی یەوە لە دۆڵەکانی عەشیرەتی شکاک، پەلاماری ئەو هێزە دەرەکەی ئێرانی دا کە لە شاری مهاباد جێگیر بوو.

کونسولی ئەمریکی ئەو دەمە لە تەورێزدا ئاماژەی بۆ دیدارێکی خۆی لەگەڵ سمکۆدا کردووە کە (٥) هەزار دۆلاری داوەتێ تا سەفەری موبەشرێکی ئەمریکی دابین بکات،کونسولی نێو براو دەڵێ: سمکۆ "گەنجێکی قۆزو رەشید بوو، لە کەش و هەوایەکی ناوێتە بە بیرەوەری کوشتنی برا گەورەکەی، کە دەساڵ لەو گەورەتر بوو، سمکۆ لەو کەش و هەوایەدا گەورە بوو بوو، فورسەکان، براکەیان بۆ دەعوەتێکی رەسمی شیو خواردن دەعوەت کرد بوو تالەوێ بیکەن بە دادوەری گشتی ناوچەی رۆژاوای دەریاچەی ورمێ و لە سەر خوانی نان خواردن بە غەدر کوشتبویان".

ئەو دەرەکانەی کە لە مەهاباد بوون و سمکۆ پەلاماری دابوون، شەس سەد کەس بوون، تاقە یەکێکیان دەر نەچوون. رەزاشای پەهلەوی سوێند دەخوات کە تۆڵەیان بسەنێتەوە. ئەوە بوو لیوایەکی لە سوپا و هێزی ناوخۆی ئازربایجان نارده سەر کوردەکان. کوردەکان، خۆیان لە بەر هێزی ئێران نەگرت و پەنایان وەبەر چیاکان برد. تا بەو جۆرە شەڕێکی پارتیزانی هەڵایساو پتر لە نۆ ساڵی خایاند و تا لە ساڵی ١٩٣٠ دا و لە شنۆ بۆسەیەک بۆ سمکو نرایەوە و کۆتایی بە شۆڕشەکەی هات.

پێشڕەوی هێزی سۆڤیەت و بەریتانیا لە مانگی ١٩٤١/٨ دا بۆ سەرئێران، کردییە کارێک کە زروفێکی تازە بێتە ئاراوەو کوردەکان بە هەلیان زانی بۆ وەدەست هێنانی

خواستە نەتەوەییەکانیان. هاوپەیمانان لەو ساڵەدا ڕێک کەوتن لە سەر دابین کردنی کۆمەک و نیمدادات بۆ سوپای سۆڤیەتی لەو ڕێگە زەمینی یەوە کە کەنداوی فارسی بە دەریای قەزوینەوە دەبەست، جا بۆ جێ بەجێ کردنی ئەمە ئەوە بو لەشکرکێشی کرایە سەر ئێران و بۆ ماوەیەکی کورت ئێران داگیر کرا و ڕەزا شای یەکەم ناچار کرا واز لە کورسی حوکم بهێنێ و کوڕە نە باڵقەکەی (محمد ڕەزا) لە جێ ی دانرا. هەروەها ڕێ درا کە دەوڵەتێکی ئێرانی دابمەزرێ کە لە بواری بڕیارداندا نازادییەکی سنورداری هەبێ. ئەم دەوڵەتە لە لای خۆیەوە کەوتە هەوڵدان بۆ ئەوەی دەسەلاتی خۆی بە سەر ناوچەکانی تری ئێراندا بکێشێت و کاروبارە ئیداری یەکانی بەڕێوە بیات.

## کورد، دڵ بە هێزی داگیرکەری سوڤیەتی خۆش دەکەن

کاتێ کە روسیا دای بەسەر ئێران دا و دەسەلاتی ناوەندی ئێرانی لە باکوری رۆژاوای ئێراندا داروخاو نەما، هەڵبەتە ئەمە بووە مایەی دڵخۆشی کوردەکانی ئەوناوچانە و کوردەکانی پارێزگای ئازربایجان و دەوروبەری ورمێ. هەرچەندە پارێزگای کوردستان کە کەوتبوە باشورەوەو لە دەست رەسی سۆڤیەت دورر بوو، بەلام سۆڤیەتەکان هەوڵیان دا کوردەکانی ئەو ناوچانەی کە داگیریان کرد بوو، هان بدەن و بە جۆرێ ئاراستەیان بکەن کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیانیان پێ بکەن. هەرچەندە هێزی داگیرکەری سۆڤیەت روی کردە باشورو بەرەو سنە رۆیی، کە چی پاشان پاشەکشەی کرد و لە هێڵی شنۆ- میاندواوی باکوری مهاباد گیرسایەوە. بەلام لە باری پراتیکی یەوە دەسەلاتیان دەگەیە باشوری ئەم هێڵە و ناوچەکانی (سەقز) و (بانە) و (سەردەشت)یشی دەگرتەوە.

بەلام دەسەلاتی بەریتانی لە باشوردا مایەوە، لە کرماشاندا کە لەوێندەرەوە هێڵی هاتوچۆی نێوان عێراق و ئێران کۆنترول کرد بوو. هەڵبەتە خەتی تەماسی سۆڤیەتی- بەریتانیش بە ناوچەی سەقز- سەردەشت دا دەڕۆیی. هەر چەندە سۆڤیەتی یەکان، بە ئاشکرا و بەر لە ساڵێک و کاتێ لەگەڵ ئەڵمانەکاندا هاوپەیمان بوون ڕایانگەیاند کە بەتەمان بەرەو باشور پێشڕەوی بکەن و بگەنە ئاوەکانی کەنداوی فارس. کەچی پاشان قەناعەتیان بەو هەندە زەوی یە کرد کە کەوتبوە ژێر دەسەلاتیان؛ چونکە لە بەرەو هاوپەیمانی یەکی تری دژ بە ئەڵمانیا دا بوون و ئەمەش گەلێک فاکتەری تازەی لێکەوتەوە.

سەرقاڵی دابین کردنی بەرەکانی پشتەوەی قوقازو ئازربایجان بوون کە سوپای سوری هەلاتوو لە بەردەم پێشڕەوی ئەڵمان، پەنایان بۆ برد بوو، لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوان زەروری بوو ئەو ڕێگە و بانانە دابین بکەن، کە کۆمەک و یارمەتی ئەمریکیان لێوە بۆ دەنێررا کە بریتی بوو لە ئوتومبیلی گواستنەوەو تانک و میکانیکی سوپایی کە بەلای ئەوانەوە زۆر گرینگ بوو.

هەموو ئەم فاکتەرو هۆکارە ستراتیژییانە کردیانە کارێک کە روسەکان هێمنی و نارامی لە باکوری رۆژاوای ئێران دا بپارێزن.

هەر لەو روانگەیەشەوە. سۆڤیەت کەسایەتی یە کوردەکان و سەرەک خێڵ و گروپەکانی تری ناوچەکەیان هاندا کە پەناو دالدەی بەکرێگیراوان و پیاوانی دەوڵەتانی میحوەر نەدەن؛ دیارە ئەم کارە لە سەرەتادا زۆر قورس دەهاتە بەرچاو،چونکە کورد خۆ بەخۆ جۆرە هاوسۆزی یەکیان لەگەڵ ئەڵەمانەکاندا هەبوو.. تێکرای ئەم فاکتەرو هۆکارانە وایان لە سۆڤیەت کرد سەرلە نوێ بایەخ بەدۆزی کوردی بدەنەوەو پێگەیەکی تایبەتیان لە حیسابات و جم و جوڵی خۆیاندا بۆ دانا.

بارودۆخی گشتی کورد لەو سەردەمەدا زۆر باشتر بوو لە سەردەمانی پێش هەلایسانی دووەم جەنگی جیهانی. کورد چەک و تەقەمەنی یەکی زۆریان وەدەست کەوت، بەتایبەتی کاتێ کە سوپای ئێرانی لە بەردەم پێشرەوی سۆڤیەت و بەریتانیادا هەلات، کورد چەکێکی زۆریان گرت. لە پایزی ۱۹٤۱دا زۆر لەو سەرەک خێڵ و هۆزو سەرکردە سیاسیانەی کە شا بەر لە دووەم جەنگی جیهانی لەسەر راپەرین و شۆڕش نەفی کردبوون، گەڕانەوە بۆ ناوچەکە. ئەم سەرکردە و سەرۆکانە زۆر بە گەرمی پێشوازیان کران. جەماوەر لە دەوریان خڕ بوونەوە و متمانەی تەواویان دانێ، جا بەخێراییەکی وەهاکە ئەو سەرۆکانە بە خۆیشیان پێیان سەیر بوو؛ تومەز سالانی نەفی و دوور خستنەوە ناوبانگ و کەسایەتی یەکی شکۆداری وەهای بۆ پەیدا کرد بوون، کە خەڵکی عەشایەرو هاوولاتیانی شاریش متمانەیان پێ بکەن.

ئینگلیز و پاشماوەی دەسەلاتی ئێرانی لەو ناوچە داگیرکراوەی ئیران دا بەر لە هەر کەسێک رووبەرووی ئەم شەپۆلە گەورەیەی هەستی نەتەوەیی کوردی ئێران بوونەوە.پێشرەوی بەریتانی و سۆڤیەتی بۆ سەر ئێران بووە هۆی خولقاندنی جۆرە ئاژاوەیەک. بۆ وێنە وەزیری بەرگری ئێران (ئەحمەد نەخشەوان) فرمانێکی کارگێری نامەفهوم و ئالوزی ئەوتۆی دەرکرد کە بووە هۆی ئەوەی یەکە ئێرانی یەکان هەموو سەربازەکانیان تەسریح بکەن.. ئەمە تەنیا شارەکانی نەگرتەوە، بەڵکو لەو یەکانەی سەر سنورەکانیش رووی داو بەمەش دوا شێوەی دەسەلاتی ئێران لە سەر سنوری عێراق- ئێران نەماو ئیدی سنوری ئێران لە بەردەم جەنگاوەرانی کوردی عێراق ئاوالا بووەوو بێ کۆسپ و تەگەرە دەیانتوانی هاتوچۆ بکەن.

هەروەها هێزەکانی سۆڤیەت کە لە سەرەتاوە بەرەو باشور کشا. ئەوانیش لای خۆیانەوە بەشدارییەکیان لە خولقاندنی ئاژاوەی ناو ئێران و نادیاری باری ئێران دا کرد: "سۆڤیەت دەستیان بە سەر سەربازخانەی بانەدا گرت، هەموو سەربازەکانیان رەها کردو ناردیانەوە بۆ مالی خۆیان، بەلام ئەفسەرەکان و ژمارەیەک دەرەجەداریان وەکو

یەخسیری جەنگ لە لای خۆ هێشتەوە و کەبەرەو باکور پاشەکشەیان کرد لەگەڵ خویاندا بردیانن.

هێزەکانی سۆڤیەت لە سەرەتادا گەورەترین شاری کوردی ئێران (سنە)شیان گرت، کەچی پاشان بۆ یەکەیەکی میکانیکی لەشکری هندی سەر بە هێزەکانی بەریتانیان بەجێ هێشت. ئالەم کاتانەدا پاشماوەکانی هەندێ یەکەی ئێرانی کەوتنە خۆ رێکخستنەوە، بەترس و دوو دڵی یەوە لە شارەکانی بانە و سنەی داگیرکراودا ئەمەیان دەکرد، ئەوە بوو هەندێ ئەفسەرو دەرەجەداری هەڵاتوو لە ئەسارەتی سۆڤیەت پەیوەندییان پێوە کردن.

ئەوەی کە لە پێشی پێشەوە سوودی لەم ئاژاوەیە وەرگرت سەرکردەی خێڵەکی کورد حەمە رەشید بوو کە بە خۆی چوار سەد چەکدارەوە سنوری عێراقی بڕی و توانی دوای دوو رۆژ تەق وتۆق و پێکادان لەگەڵ پاشماوەی سوپای ئێرانی لە ناوچەکەدا، شاری بانە بگرێ. ئەوجا بەرەو شاری (سنە) کەوتە پێشڕەوی و زۆری نەما بوو ئەویش بگرێ، لەشکری هیندی بەریتانی نەی هێشت. رێک لەم کاتانەدا تاران پاش ئەوەی راوێژ و تەگبیری لەگەڵ بەریتانی یەکاندا کردو رەزامەندی ئەوانی وەرگرت، لیوا محمود امین -ی کرد بە حاکمی سوپای سنە.. بەڵام ئەم (امین)ـە لە باری پراتیکی یەوە چ دەسەڵاتێکی سوپایی نەبوو. هەموو هیوایەکی ئەوە بوو کە (لەشکری رۆژاوا)ی ئێرانی کە بە درێژایی سنوری رۆژاوادامەزرا بوو، سێ سریەی بەشەش تانکەوە بەرەو سەقز و بانە رەوان کرد بوو، فریای بکەوێ و رزگاری بکات.

حەمە رەشید لەم سەروبەندەدا توانی گەلێک لە سەرەک خێلەکان لە سایەی خۆیدا خر بکاتەوە و ژمارەی هێزەکەی لە دوو هەزار جەنگاوەر تێ پەڕی. ئەوجا هێزی کورد و هێزی پێشەوەی ئێران لێیان بوو بەشەڕ و زەرەرو زیانێکی گەورە لە هێزی ئێران کەوت و تەنانەت (٥) تانک لەو شەش تانکەی کە بۆ ناوچەکە نێردرا بوون تێک شکێنران و کوردەکان ئەو پردە دارینەشیان سوتاند کە لەم ناوچە شاخاوی یە سەختەدا تاقە رێگەی پاشەکشە بوو. ئەوجا جەنگاوەرانی کوردی دلێر کەوتنە پەلامار دانیان.

بەڵام ناکۆکی و دوو بەرەکی نێو خۆی کوردەکان، کە ئەمە نەخۆشی یەکی باوی نێو کوردانە. بوە هۆی ئەوەی کە هیچ سەرکەوتنێکی گەورە بە دەست نەهێنن. ئەوە بوو نۆکەرانی ئێران توانیان عەشیرەتی (تیلەکۆ) بەلای خودا راکێشن و بیانکەن بە جاش و بە کرێگرتە و پەلاماری هێزەکانی (حمە رشید)یان داو تێک وپێکیان شکاند. هەر لەم سەرو بەندەدا هەندێ عەشایەری شۆڕشگێڕی دی شاری سنەیان گەمارۆ داو حمە رشید خان بە لەز بەخۆ و پاشماوەی هێزەکانی یەوە پەیوەندی پێوە کردن. کاتێ محمود امین بە خۆی گەیبە شار، و چونکە ئاگای لە وەزع و حاڵی ناوچەکە نەبوو، داوای گفتوگۆی لە کوردەکان کرد. ئەوە بوو کوردەکان، دەست بە سەریان کردو لە بارەگاکەی

خۆیدا هێشتیانەوە و پاشان فەرماندەی بەریتانی لەشکری هیندی بۆی تێکەوت و هەنگینێ ڕەهایان کرد.

بەڵام (محمود امین)یان تێگەیاند کە بوونی ئەو لە خاکی رزگارکراوی کوردستاندا، هیچ ڕەوا نی یە. کورد، بەردەوام بوون لە سەر ئەم هەڵوێستە ڕەسمی یەیان و داوایان لە هێزی داگیرکەری بەریتانیش کرد کە دان بە سەربەخۆیی کوردستاندا بنێ.. بەڵام حاکمی بەریتانی کە لەم ڕووەوە چ دەسەڵاتێکی نەبوو، و لە ئاستی بارو دۆخە تازە و ئاڵۆزەکەدا نەبوو، ویستی بەر لەوەی چ هەڵوێستێکی ڕەسمی دەربڕێ، دەستی بە کوردەکان بکات و کاتیان لەگەڵدا بە سەر بەرێ. پێویستی بە دە ڕۆژ بوو بەر لەوەی لە ڕۆژی ٣١/ ١٠/ ١٩٤١دا حمە رشید ئاگادار بکاتەوە کە لەم کاتەی ئێستا دا ئەم دەسەڵاتەی نی یە هەڵوێستی ڕەسمی لە مەڕ سەر بەخۆیی کورد وەر بگرێ.

دیار بوو کە بەرپرسەکانیشی لە بەغدا دا پێویستیان بە ماوەیەک هەبوو تا ئەم زروفە تازەیە هەڵسەنگێنن و لێ ی بکۆڵنەوە بەر لەوەی دوا هەڵوێستی خۆیانی لە مەڕ دەربڕن. بەڵام حاکمی بەریتانی وێڕای لاوازی ئەم هەڵوێستەش توانی کارێکی وەها بکات کە هێزەکانی کورد نەچنە ناو شاری سنەوە. ئا بەمجورە هێزی کوردەکان جارێکی دی ناچار بوون، پاش چەند ڕۆژێک کە هیچ شتێک ڕووی نەدا، بەرەو شاخەکانی (دیواندەرە) و (زاغە) پاشەکشە بکەن. مێژو نوسی سوپایی حسن ارفع، کە پاشان بوو بە سوپاسالاری سوپای ئێران، بەتەوسەوە باسی ئەم ڕوداوانەی کردەوەو دەڵێ: "جەنگاوەرانی عەشایەر ئەو سەبرو حەوسەڵەو پێداویستی یە لوجیستی یەیان نی یە کە ئەم هێرشە چڕو پڕانە بە ئەنجام بگەیەنن".

لەمانگی ت٢ دا لیوا محمود امین، جارێکی دی زاتی وەبەر خۆی نایەوەو هێرشێکی بردە سەر هێزەکانی کورد لە هەمان ناوچەوە کە پاشەکشەیان لێوە کرد بوو. بەڵام بەم کارەی بەرەو ئەو چارە نووسە ملی دەنا کە بوو بە بەش و نسیبی زۆربەی ئەو هێرشە سوپاییانەی پێش و پاش ئەو مێژوە کرانە سەر کورد: ئەوە بو لە شاری سەقز و دەوروبەریدا، هێزەکەی شڕو وڕکرا، زۆر لە پیاوەکانی دەستگیر کران و ئەوانی تریان چنگ لە سەرشان هەڵاتن و لیوا (ئەمین)ش لە مەیدانی شەڕەکەدا کوژرا. جاشەکانی عەشیرەتی (تیلەکو)ش پتر لە سێ سەد کەسیان لێکوژرا. حمە رشید خان بەدەستی خۆی (عەلی خان حەبیبی) سەروک جاشەکانی کوشت. لە کاتێکدا تەق و تۆق و پێکادانی پەراگەندە بەردەوام بوو، داخوازی کوردەکان بۆ کوردستانی سەر بەخۆ هێور بووەوە و لە هەمان کاتدا بەفر دەستی بە بارین کردو زوربەی شەڕگە نائارامەکانی داپۆشی: شەڕگەی نێوان ڕوس و فورس و بەریتانی یەکان لە لایەکەوەو لە نێوان خودی کوردەکاندا لە لایەکی ترەوە.

## بەرپەرچدانەوەی هێرشێکی تەمبێکارانەی گەورە

حکومەتی ئێران لە مانگی مایس ۱۹٤۲دا کەوتنە خۆ سازدان بۆ هێرشێکی تەمبێکارانەی گەورە بۆ سەر کوردەکان، بە مەبەستی تاقیکردنەوەی هێزی پاشماوەی دەسەڵاتی ئێرانی و سەروەری نیشتمانی لە ناوچەکەدا. سەرهەنگ حسن ارفع سەرکردایەتی ئەم هێرشە دوو هەزار کەسییەی دەکرد، ئەم هێزە چوارده تانکی لەگەڵدا بوو، جگە لە چەکدارانی تیرەی تیلەکۆ کە یەکپارچە کەرب و کین بوون. ئەم هێرشە بە سەرکردایەتی حسن ارفع کەوتە پێشرەوی بەرەو بارەگاکانی (حمه رشید). ئەو ئەفسەرە ئێرانی یە بەتەوسەوە باسی تێک بەر بوونی هێزە کوردی یە دژمنەکان دەکات و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "یەکسەر پیاوەکانی حمه رشید دەستگیر کراون. ئەوجا پیاوانی تیلەکۆیی یەکسەر کەوتونەتە سوتاندنی خانوو بەرەی دوژمنەکانیان و تالانکردنی ناومالەکانیان، هەر لە قوزی و کتلی یەوە تا دەگاتە بوخچەی بوکێنی و هەر شتێکی دی کە دەستیان پێ ی گەییوە". حسن ارفع لە سەرەتاوە هەولی داوە بکەوێتە نێوانەوەو ئەو تالان و بڕۆیە قەدەغە بکات، بەڵام لە ئەنجام دا بۆی بە دیار کەوتووە کە: "وەکو دەردەکەوێ ئەم کارانە بە شێوەیەکی گشتی بەشێک بوون لە داب و نەریتی شەڕی خێلایەتی".

لەوکاتانەدا کە ئێرانی یەکان وایاندەزانی لەم هێرشە تەمبێکارانەیەیاندا زۆر سەرکەوتوو بوون، رەوتی رووداوەکان پێچەوانە بوەوە: ناچار بوون لە ژێر گوشاری بەریتانی و روسی یەکاندا لە ناوچەی نێوان سەقزو بانەدا پێشرەوی یەکەیان رابگرن و لەگەڵ حمه رشید بکەونە گفتوگۆ بۆ دۆزینەوەی چارە سەرێک لەگەڵیدا، چونکە هاوپەیمانەکان حەزیان نەدەکرد هیچ بونێکی سوپایی ئێران لە هێڵی نێوان هەردوو ناوچەی داگیر کراوی بەریتانی و سۆڤیەتی دا هەبێ. ئەوە بوو فەرماندەی بەریتانی میجور (فلیچر) بە خۆی لە کرماشانەوە بەرەو باکور رۆیی تا لە نزیکەوە ئاگاداری چۆنیەتی بەڕێوەچونی ئەو گفتوگۆیە بێ کە گەیی بووە ئەنجامێکی نامەنتیقی و رەنگە ئەمە بۆ خۆی رەنگدانەوەی تێکرای سیاسەتی کوردی بێ لە کاتی دووەم جەنگی جیهاندا: ئەوە بوو تاران. (حمه رشید)ی دژمنی سەر سەختی دوێنێ ی خۆی کرد بە حاکمی بانەو رێگەی بە پیاوەکانی دا کە چەک هەڵگرن و سنورێکیش بۆ جم و جوڵ و بوونی هێزی پۆلیس و سوپایی ئێرانی لەو ناوچە کوردییەدا دانرا.

ئێرانی یەکان، ئاقیبەت بەکۆمەک و پشتیوانی بەریتانی لە کۆتایی ساڵی ۱۹٤۱ دا ئارامی و هێمنیان بۆ وڵاتی کوردستان گێرایەوە. ئەم بادانەوەیەی بەریتانیا هی ئەوە بوو کە دەیانزانی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی خەتەرە و بە ئاسانی کۆنترۆڵ ناکرێ، بە تایبەتی کە لە عێراقی دراسێ ی ئێران دا بە دەست هەمان کێشەوە گیرودە بوون. لە ئەنجامی ئەم بادانەوەیەی بەریتانیا، دەسەڵاتی ئێرانی تا ساڵی ۱۹٤٥ و داوتریش لە وێندەر بەرقەرار بوو.

ڕەوشی پارێزگای (ئازربایجان) کە کەوتبوە باکورەوە و زۆربەی خەڵکەکەی تورک زمان و کەمینەیەکی گەورەی کوردیشی تێدا بوو، زۆر جیاواز بوو لەو ڕەوشەی باشوری کوردستان: سۆڤیەتەکان هەر لە سەرەتای کۆنترۆڵکردنی ناوچەکەوە (١٩٤١) هەڵوێستێکی زۆر چالاکیان لە مەڕ دۆزی کورد هەبوو. وێڕای ئەوەی کە حەزیان دەکرد کیانی ئێرانی بهێڵن، بەڵام لە لایەکی تریشەوە حەزیان دەکرد دۆزی کوردی هەر بەگەرمی و بەپێ ی پێویست بیهێڵنەوە. بۆیە هیچ سەیر نەبوو کە کوردەکان بە پێشڕەوی سۆڤیەت کەیف خۆش بێن و بەرێزو سوپاسگوزاری یەوە لێ ی بڕوانن، چونکە بوونی سۆڤیەتی لە ناوچەکەدا هۆیەکی سەرەکی جوڵاندنی دۆزی کورد بوو، و زەمینەی بۆ ئەو ڕاپەڕینە کوردییە خۆش کرد کە پاش ئەو پێشڕەوییە بەرپا بوو. دیارە لە بەرانبەر ئەو هەموو هیوا و خۆزیانەدا کە کورد لە سەر پێشڕەوی سۆڤیەتی ڕۆینا بوو، چاوپۆشی لەو ڕابردووە سەلبیەی سۆڤیەتی دژ بە ئاینی ئیسلامی کرا، هەموو ئەو بیرەوەری یە تفت و تاڵانەی بەگەڵ پێشڕەوی هێزی ڕوسیا بۆ کرماشان لە کاتی یەکەم جەنگی جیهانی دا کەوت؛ لە کوشت و بڕو سەرکوتکاری پشتگوێ خران و، ئەوە بوو دۆستایەتی و هاوپەیمانی یەکی کوردی سۆڤیەتی دەستیپێکرد کە دەیانساڵ درێژەی کێشا.

## جەنەڕاڵێکی سۆڤیەتی مەشق بە کوردان دەکات

لە ڕۆژێکی سارد و تۆفی ڕۆژانی ت٢/١٩٤١دا، شاندێک لە فارگۆنێکی تایبەتی ئەو یەکی ئەو قیتارەدا گیرسایەوە کە هەفتەی سێ جاران لە نێوان شاری تەورێزی مەنشور بە مافوری چاک و شاری باکۆی دەوڵەمەند بە نەوت دا هاتو چۆی دەکرد. شاندەکە، هەمەرەنگ بوو، خەڵکی جیاوازی لە خۆگرتبوو. مرۆڤ دەیتوانی ئەو پیاوە بناسێت کە بە ناوی شاندەکەوە قسەی دەکرد. پیاوێک بوو لە سەروی پەنجا ساڵەوە، بەڵام لە تەمەنی خۆی گەنجتر دەینواند، پیاوێکی تۆکمە بوو. قاتێکی مەدەنی لەبەردا بوو. مەحاڵ بوو کەس پەی بەوە بەرێ کە ئەم پیاوە جەنەڕاڵێکی سوپای سورە. ناوی (سالم ئاتاکیخوف) بوو لە باکۆری ئازربایجاندا لە دایک بوو بوو. سەفەری ئەم پیاوە سەفرێکی سیاسی بوو نەک سوپایی. ئەم ئەفسەرە زیرەک و زمانلوسە زۆر پابەندی جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆی بوو.

چەند ڕۆژێک گەڕا، چەندین دیداری لەگەڵ چەندین سەرەک خێڵی کوردی ناکۆک و ناتەبادا کە ئامادە نەبوون ج سازشێک لەگەڵ یەکدی بکەن، سازدا. لەو دیدارانەدا هەوڵی دەدا زەمینەیەک بۆ کاری هاوبەش وهەم ئاهەنگی کوردی- سۆڤیەتی لەو ناوچەنەدا خۆش بکات کە سۆڤیەت لە باکوری ئێراندا داگیریان کرد بوو. لەم ئەرکەیدا دووکەس یارمەتییان دەدا، یەکێکیان سەرهەنگ (ئەسلانوف) کە ئەفسەرێکی سۆڤیەتی کورد نەژاد بوو، ئەویتریان هاوڕێ (مصطفایوف) بوو کە لە شوێنی خۆیدا

خرایه سەر میلاکی کونسولگەری بازرگانی سۆڤیەت تا دەوری دەرهێنەر ببینێ و پرۆسەکە لە پشت پەردەوە بێنێتە دەرێ.

هەڵبەتە ئەو سێ ئەفسەرە هەقی خۆیان بوو شانازی بە کارەکەو ئەنجامی کارەکەیانەوە بکەن. توانیان نزیکەی سی کەس لە دیارترین و گرینگ ترین سەرانی تیرە کوردەکان و سەرکردە سیاسییەکانی کورد لەم فارگۆنە تایبەتی یەی فارگۆنەکانی هێڵی ئاسنی سۆڤیەتیدا خڕ بکەنەوە. سەرکردە کوردەکانیش لە لای خۆیانەوە بە شادییەوە ئەو دەعوەتەیان قەبوڵ کرد کە بە ناوی سەردانەوە ئەنجام دەدرا، چونکە ئەوانیش لای خۆیانەوە بە تاسەوە بوون بۆ قەبوڵ کردنی کۆمەکی سۆڤیەتی، تا ببێ بە پشتیوانیان لە خەباتی رزگاریخوازیاندا.

جل وبەرگی شاندەکوردی یەکە، خۆی لە خۆیدا تابلۆیەکی هونەری جوانی پێک دەهێنا، جگە لە جل و بەرگی نەتەوەیی کوردی، هەندێ لەو سەرکردەکوردانە قاتی مەدەنی ئەورووپیانەی مۆد بە سەر چویان لەبەر کرد بوو. سەرکردەکان، بەخۆیشیان، تێکەڵ بوون لە بیرو باوەڕی جیاواز و وابەستەیی چینایەتی و کۆمەڵایەتی جیاواز: بۆ وێنە حاجی بابا شێخی بۆکانی کە نێو بانگێکی ئەفسانەیی لە نێو سەرەک خێڵە کوردەکاندا هەبوو، پیاوی وەک (رشید بەگ)، (زێرو بەگ) و (طە)یان لەگەڵدا بوو کە ئەمانە نوێنەری سێ باڵە دوژمنەکەی عەشیرەتی هەرکی بوون کە عەشیرەتێکی زۆر بە هێزو بە توانا بوو. (سالم ئاتاکیخوف) بەزیرەکی و دبلۆماسییەتی خۆی توانی هەموو دوژمنەکانیش کۆبکاتەوە، توانی سەرانی دوو لایەنە دوژمنەکەی عەشیرەتی (مامەش)ی نیشتە جێ ی رۆژانەی مهاباد (حاجی قەرەنی ئاغا) و (کاکە حەمزە نەڵۆسی) لەسەر یەک خوان لە فارگۆنی نێو براودا کۆ بکاتەوە، کە بە دوو قۆڵی کوپە چای گەرم یان شەرابی پاپیروزی روسیان لە گارسۆنەکە وەردەگرت.

## ئەو پیاوەی مێزەری سپی مەلایانی لەسەر دەکرد

بەلام سۆڤیەتەکان، بەچاوێکی تایبەتی دەیان ڕوانی یە پیاوێکی نێو شاندەکە، بۆ خۆیان و بۆ جێ بەجێ کردنی نەخشەکانی خۆیان لە هەر هەموو ئەو سەرەک خێلانە بەگرینگتریان دەزانی، ئەو پیاوە سەرکردەی کوردی مهاباد و پیاوی ئاینی (قازی محمد) بوو، کە بەقاتە ئەورووپاییە دەستدرووەکەی تارانی یەوەو بە مێزەرە سپی یەکەوە، سیمای چینی دەوڵەمەندی شاران و بورژوای کوردی دەنواند. (قازی عەلی)ی بابی قازی محمد لە کوردستاندا بوو بوو بە ئەفسانەیەکی زیندوو. زۆربەی خزمانی و ئەندامانی بنەماڵەکەیان پۆستی قازییەتیان هەبووە. قازی محمد لە خانەی ئەو پیاوانەدا بوو کە لە جیهانی ئیسلامی دا هەردوو کەسایەتی ئاینی و قەزایی لە خۆ دەگرن.

قازی محمد، بەمنداڵی چوو بووە حوجرە (بەرانبەر بە قوتابخانەی سەرەتاییە) کە مەلا بەرێوەی دەبەن. بەلام خوێندن و فێر بوونی راستەقینەی لە لای بابی و لە نێو ئەوکتێبخانە گەورەیەدا تەواو کرد بوو کە پڕ بوو لە کتێبی هەمە جۆرو بە زمانی هەمەجۆر. یەکەم جار پۆستی دایەرەی ئەوقافی مهابادی گرتە ئەستۆ. کاتێ کە بوو بە قازی ئیتر دەسەلات و نێو بانگێکی وەهای پەیدا کرد کە قسەی لە هەموو مەسەلە قانونی یەکاندا دەیخواردو رەت بوونەوەی نەبوو. ئەمە جگە لەوەی کە لە هەر بۆنەیەکی کۆمەلایەتی و ئاینی و سیاسیدا ئامادە بوایە، ئەو بۆنەیە شکۆ و هەیبەتی تایبەتی وەردەگرت. رواڵەتی چالاک و بە هەیبەت بوو، لە قسە کردندا زۆر بلیمەت بوو، بە سێ- چوار زمانان دەئاخفی، بە جۆرێکی هێندە دڵگیر دەئاخفی کە سەرنجی بەرانبەرەکەی رادەکێشا. کە قسەی دەکرد توزێک دەوەستا و ئەوجا لە سەری دەڕۆیی. هەر هەموو ئەم شتە رواڵەتیانە کەسایەتی یەکی بە هێزو کاریگەریان دەنواند. لە هەموو ئەمانەوە مرۆڤ دەتوانێ بگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە قازی محمد ئەو خەسڵەتانەی تێدا بوو کە مرۆڤ بتوانێ متمانەی پێ بکات و بە یەکێک لەوانەی بزانی کە بتوانێت جوڵەیەکی گشتی بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بدات.

بەلام بوونی قازی محمد لە نێو ئەم هەموو سەرەک خێڵە کوردەدا لە راستیدا کارێکی نا ئاسایی و نەشاز بوو، و لەگەڵ کەش و هەوا گشتییەکەی نێو فارگۆنەکەدا نەدەگونجا: جیاوازییەکی زۆر هەبوو لە نێوان دیمەن و رواڵەتی سەر خێڵەکان و؛ کە هەر چەندە لە سیمایاندا نیشانەی دەسەلات دەبینرا، بەلام رێک لە سیمای جوتیارانی دێهاتی دەچوو، لەگەڵ رواڵەتی قازی محمددا کە نیشانەی پێگەیشتنی زانستی و مەدەنی بەرزی پێوە دیار بوو. لە لایەکی ترەوە روانگە ئاینی یە گشتی یەکەی بۆ دنیا یەکجار دوور بوو لە روانین و، رێبازی خانەخوێیە کۆمۆنیستەکانی. بەلام سۆڤیەتەکان زۆر زیرەکانە توانی بوویان هەر هەموو ئەم دژانە لە یەک شوێن دا کۆ بکەنەوە و متمانەی سەرانی کورد بە دەست بێنن و وەهایان لێبکەن ئومید بەو یارمەتی یە پەیدا بکەن کە بەتەما بوون سۆڤیەت پێشکەشیان بکات؛ هەر چەندە چ ئامارەیەک بۆ جۆرو چۆنیەتی ئەم یارمەتی یە لە گۆڕێ نەبوو.

سەرانی کورد، لە باکۆدا سەیریان کرد بەرنامەیەکی تێرو تەسەل و ووردیان بۆ ئامادە کراوە: کۆمەڵێک سەردانیان بۆ کارخانە و مەزرا و کێڵگەی جیاواز و ئاهەنگی خێر هێنان و سەردانی شانۆ و سینەمایان بۆ ساز درا بوو کە چەندین رۆژی خایاند، مەبەست لەم شتانە ئەوە بوو کە ئەو میوانانەی لە دێهاتەکانی ئێرانەوە هاتبوون بێ تاقەت نەبن. بەشدارانی سەفەرەکە هەستیان بەوە کرد کە سۆڤیەتەکان مامەڵەیەکی تایبەتی وپڕ لە رێز و حورمەت لەگەڵ قازی محمد دەکەن. ئەم بایەخدانە تایبەتی یە بە قازی محمد، عەلی کوریشی گرتەوە کە لەو سەفەرەدا لەگەڵ بابی هاتبوو، و تەمەنی

هەر هەشت ساڵێک دەبوو. تەنانەت ئەم میوانە چکۆلەیە دەمانچەیەکشی لە خانە خوێیەکانی یەوە پێدرا. نوسەرو دیپلۆماتی ئەمریکی ولیم ئیگلتون ئەم رووداوەی وا لێکداوەتەوە کە رەنگە "ئاماژەیەک بوو بێ بۆ ئەوەی کە لە ئاییندە دا چ روو دەدات".

(عەلی قازی) لە ساڵی ١٩٧٩دا بەدەم وەبیر هێنانەوەی بیرەوەریانی وان رۆژان، پاش ئەوەی ئەویش بوو بە قازی و لە دوای روخانی شا دەورێکی ناوچەیی لە شۆڕشی نوێ ی کوردیدا بینی، گوتی: "هەرشتێک لە باکۆدا رووی دەدا بەلای منەوە مایەی سەرنج بوو. لە ژیانمدا و بۆ یەکەمجار موغازەیەکی پڕ لە کالام بینی، بالارزێەکی کارەبایم بینی، بە درێژایی یەک رۆژی تەواو و من پێ ی سەرکەوتوم و دابەزیوم هەر چەندە من تاقە منداڵ بووم لەگەڵ شاندەکەدا، کە چی سۆڤیەتەکان بردیانێن بۆ سێرک، زۆر بە نەجیبی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرین، من بۆ خۆم چەندین دیاریم لێ وەرگرتن، یەکێک لەوانە نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزو قاتێک و دەمانچەیەکی بچکۆلەی یانزە خۆر بوو. هەروەها سەرەک وەزیرانی کۆماری ئازربایجانی سوسیالستی ی سۆڤیەتی زۆر لەگەڵماندا بەلوتف بوو".

چونکە بابم ئەوکاتانە پێ ی دەگوتم (کوڕی رەش) جعفر باقروف پێشنیاری کرد کە لەوە بەدوا بە (کوڕی سوور) گازم بکات؛ لەبەر ئەوەی گوایە رەنگی رەش، رەنگی فاشیزمە. بابم بە شۆخی یەوە وەلامی دایەوە: "هەر چەند من پێ ی دەڵێم کوڕی رەش، بەلام من پێم وایە لە هەموو سوپای سور ئازاترە". هەر یەکێک لە سەرەک خێڵە کوردەکانیش سەرو زینی چەرمی دەستکردو شەش مەتر قوماشی ژنانەیان بۆ ژنەکانیان بە دیاری درایێ. زۆریشیان تاپڕو تفەنگی راوی بەرهەمی کارخانە چەک سازییەکانی سۆڤیەتیان کڕی.

لوتکەی ئەم سەفەرە، ئێوارە ئاهەنگێکی خێر هێنان بوو کە باقروف بۆ رێزلێنانی شاندەکە سازی دا. هەر هەموو لەو گوتانەدا کە لە ئاهەنگەدا خوێنرانەوە یان لە سەر خوانی نانخواردن گۆڕدرانەوە بە وریایی و جۆرە گومانێکەوە ئاماژەیان بۆ دۆستایەتی سۆڤیەت لەگەڵ گەلان و نەتەوە چەوساوەکاندا، بە تایبەتی لەگەڵ کوردا کرد. باقرۆف ستایشی خۆشدراوسێ یەتی نێوان کورد و ئازەری کرد. بەلام ئاماژەی بۆ ئەو هێرشی تالانیانەش کرد کە خێڵە کوردەکان بۆ سەر دەرو دراوسێیانی خۆیانی دەکەن و داوای لە کورد کرد کە لە ئێستا بەدواوە هەوڵ بدەن "بە ئاشتی و برایانە" لەگەڵ ئازربایجانییەکاندا بژین. بێگومان هەوڵدان بۆ بەستنەوەی سەرانی کورد بە بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەتەوە، تەنیا بە مەبەستی راگەیاندنی هاوسۆزی و دەربڕینی شادی و رەزامەندی نەبوو، بەڵکو زۆر ئامانجی نهێنی و جدی تری لە پشتەوە هەبووە. هەڵبەتە سۆڤیەتەکان بە تەمای تەنازولات وسازشی سیاسی و خزمەتگوزاری دوو لایەنە بوون و ئەم سەفەرە سەرەتا بوو بۆ ئەوە. بەلام یەکێتی راو بۆ چوون لە نێو

بەشدارانی ئەم سەفەرەدا نەبوو سەبارەت بەوەی کە ئاخۆ ئەم هەنگاوەی سۆڤیەت دوگاتە کوێ.

لەو کاتانەدا کە قازی محمد ئەم هەنگاوەی بە ئامازەیەک دەزانی بۆ ئامادەیی سۆڤیەت تا رادەی ئەوەی ئیعتراف بە دەولەتی کوردی بکات، هەلسەنگاندنەوەی سەرەک خێلەکان لێکدانەوەی بچووک بوو، بەئەندازەی هیڤی و خۆزیاکانی خۆیان بوو، ئەوەندەیان بەلاوە بەس بوو کە سۆڤیەت نارزای نەبوو کە لە پێش و لە کاتی دووەم جەنگی جیهانی دا لە ناوچەکانی دەسەلاتی سۆڤیەتی و بەریتانی دا ئەو هەموو چەکەیان لە سوپای ئێرانی گرتبوو، بەلای ئەوانەوە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیعترافێ بوو بەوان وەکو هێزێکی چەکدار.. وێڕای جیاوازی بیرو بۆچونیان دەربارەی هەنگاوەکانی سۆڤیەت، هەموویان لە یەک خالدا یەک بوون کە سۆڤیەت پشتیوانی لە کورد دەکات و لە رووی پراتیکی یەوە تایان دەگرێ.

## کۆمارێکی کوردی بە موبارەکبایی سۆڤیەت

سوڤیەتەکانیش لە لای خۆیانەوە حوکمی خۆیان لە سەر ئەم سەفەرە دابوو، بەلام حوکمەکەیان زۆر بە پارێز بوو: هەلوێستی سۆڤیەت لە مەڕ ئیمپراتوریەتی ئێرانی و لە چوار چێوەی سیاسەتی گشتی دا لە رۆژ هەلاتی ناڤین هێشتا بە تەواوەتی روون نەبوو بووەوە. هەروەها هێشتا وەلامێکی رون و ئاشکراو بنجبڕ لە مەڕ چارەنوسی کەمینەی ئازربایجانی ئەم دیوو و ئەودیوی سنوری ئێران نەبوو. ئاخۆ هەردوو دیوەکە یەک بخرێ وەکو جەعفەر باقروف دەیەوێ؟ یان پێویستە دەولەتی ئێرانی وەکو خۆی بهێلرێتەوە و بەوەندە واز بهێنرێ کە ئێران ناچار بکرێ سیاسەتێکی سەر بە سۆڤیەت پەیرەو بکات؟

(حسن ارفع)ی مێژوونوس دەربارەی ئەم بابەتە دەلێ: "ئاشکرایە کە هەلوێستی سۆڤیەتی لەمەڕ مەسەلەی کورد، تا ئەوساتە دوا قالبی خۆی وەرنەگرتبوو، ئەویش لەبەر ئەوەی چەند چەمک و بۆچونێکی ناکۆک هەبو کە لە یەک کاتدا کاریان دەکردە سەربابەتەکە. لەکاتێکدا کە خەتی گشتی بیروباوەڕ وای لە سۆڤیەت دەخواست هەلوێستێکی ئیجابی لە مەڕ دامەزراندنی دەولەتێکی کوردی هەبێ کە کوردی ئێران و عێراق و تورکیا بگرێتە خۆ و لە سەریانە کار بۆ دامەزراندنی بکەن، چونکە ئەو دەمە وەکو پێزانین بە چاکەی سۆڤیەت، دەبێت بە دەولەتێکی دۆست و لایەنگری سۆڤیەت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەکاتە لاواز کردنی رژێمی حوکم لە عێراق و تورکیا و ئێران، کە لە روانگەی سۆڤیەتەوە دەولەتانی سەر بەرۆژاوا بوون. هەر هەموو ئەمەش دەکاتە کارێک کە دەرگاکان لە بەردەم سۆڤیەت دا بکەونە سەرگازی پشت بۆ ئەوەی لە ئایندەدا خۆ بەرۆژهەلاتی ناڤین دا بکات.

لەلایەکی ترەوە، دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئاوها، لە سەر زەمینێکی بەریندا کە راستەو خۆ لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی ی سۆڤیەت دا نەبێ، دەبێتە هۆی بەرپا بوونی بزاڤێکی رزگاری و سەر بەخۆ خوازی ئەوتۆ کە لەگینە لەگەڵ سیاسەتی گشتی سۆڤیەتی دا نەگونجێت. لە دوا جاردا ترسی ئەوش هەبوو کە ئەم دەوڵەتە کوردی یە تازەیە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی رۆژاوا، بەتایبەتی کە دەسەڵاتی راستی لە کوردستاندا بە دەستی گەورە فیودال و سەرەک خێڵ و رێبەرانی ئاینی یەوە بوو. واتا ئەگەری ئەوە دەبێت کە خەڵکانی موحافەزە کارو تەنانەت کۆنەپەرستیش دەستی بەسەردا بگرن و لە مەرامەکانی سۆڤیەت نەگەن و دژی دۆزی کۆمونیزم بوەستنەوە".

لە ئەنجامی زاڵبونی ئەم لێکدانەوە کلاسیکی یەی دوایی دا، کە تا ئیستاش زاڵە بە سەر روانینی سۆڤیەتی دا بۆ دۆزی کورد، هەڵوێستی سۆڤیەتی لە ماوەی پاش گفتوگۆ کەدا بە هێمنی و حەزەری مایەوە. بەڵام هاوپەیوەندیتی سەرانی کورد و یەکێتی ی سۆڤیەت دووپات کرایەوە و کاری تەواو بۆ ئەوە کرا.کە چاوەروانی دوا هەڵوێستی سۆڤیەتی بکەن، ئەویش لە رێگەی بەڵێن و نیمچە بەڵێن دان و موجامەلاتی شەخسی یەوە. بەڵام بزاڤی رزگاریخوازی کوردی بۆ خۆی هەنگاوێکی ئیجابی ناو، ئەوەی ئەم هەنگاوەی بە قووەت دەکرد بلاو بوونەوەی ئەو بۆ چونە گشتی یە بوو کە یەکێتی سۆڤیەت ئامادەیە بەرگری و پشتیوانی لە کورد بکات.

# فەسڵی حەوتەم

*سوێندە پیرۆزەکەی سەر لوتکەی (دەڵان پەر)*

## کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان و فەسڵێکی نوێ لە فەسڵەکانی سیاسەتی سۆڤیەتی لە رۆژهەڵاتی ناڤین دا.

چ شتێک نەبوو کە شارۆچکەی مهاباد لە شارە کوردییەکانی دی جیا بکاتەوە. هەروەها شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو کە ئیحاو هێمای ئەوە بێ کە رۆژێ لە رۆژان ناوی دەچێتە مێژووەوە. مهاباد بەر لەوەی لە ماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا، بە حوکمی شوێنەکەی کە کەوتبوە ناوچە داگیر کراوەکانی سۆڤیەتی و بەریتانیانی یەوە، ببێ بەو شوێنەی هەموو هەوڵ و خەباتێکی سەربەخۆ خوازی کورد لەوێندەر خڕ ببێتەوە، تا ئەو دەمە تەنیا لای گەڕیدەو بازرگان و مژدە بەرانی ئاینی ناسرا بوو. لە لای مێژوو نوسەکان تەواو گومناو بوو، خۆ لەروی سیاسییەوە هەر بوونی نەبوو. شار، بە خانووە گڵەکانی یەوە کەوتۆتە رەخی باشوری روباری (سوی بولاغ) ئەمە وشەیەکی تورکی یەو بەمانای (بەهاری سارد) دێت. رەنگە هەر ئەم وشەیە سەر چاوەی ئەو ناوە بێ کە کورد و تورک لە شارەکەیان نابوو (سابلاغ) ئەمە ناوی شارەکە بوو تا لە سەردەمی رەزا پەهلەویدا و لە چوارچێوەی پەیرەو کردنی سیاسەتی فارساندنی ناوی شارەکاندا گۆڕییان بۆ (مهاباد) ئەو گەڕیدە کەمانەی کە ناوی ئەم شارەیان هێناوە، زیاتر دلبەندی ئەو گۆڕە کۆنانە بوون کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی میدی یەکان و کەوتونەتە ناوچە شاخاوییەکانی پانزە کیلو مەتری مهابادەوە. (بیلی فریزر)ی گەڕیدەی ئینگلیزی لە ساڵی ١٨٣٤دا چ شتێکی لە مەڕ مهاباد نەنوسیوە تەنیا ئەوە نەبێ کە (شارێکی جوانە، دەکەوێتە قەراخ روبارێکی ساف و زوڵاڵەوە). بەڵام (ئیزابیلا بیردبیشوپ) لە ئاخر و ئۆخری سەدەی رابردودا، دەربارەی مهاباد نوسیویەتی کە شار: "بەمەزەندە پێنج هەزار کەسی تێدا نیشتە جێن، ئەمە جگە لەو هەزار سەربازەی کە بۆ ناوبژی ئەو کورد و ئازەربایجانیانە دانراون، کە لە شەڕی بەردەوام دابوون".

گەڕیدەی ناو براو باری سەرنجێکی ناشرینی دەربارەی شار لەلا دروست بوو: ئەم گەڕیدەیە بەرێ یەکی هەڵەدا بۆ ناو شار هاتبوو، کاتێکی بە خۆ زانی بوو کەوتۆتە نێو قەبرستانێکی بێ سەروبنەوە، قەبر لە پاڵ قەبر، لەم روەوە نوسیویەتی کە جەنازەکان کە لە قوڵاییەکی کەمدا نێژراون و خۆڵێکی کەمیان بە سەردا کراوە، بۆنێکی زۆر ناخۆشیان لێهەڵدەستاو هەواکەی دەلەوتاند.

لەگەڵ ئەمەشدا، مهاباد لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانداو لەو سەرو بەندەدا کە سۆڤیەت و بەریتانیا بەناو ئێران کەوتن و داگیریان کرد، تا لەو سەرو بەندە دا مهاباد

گۆڕاو بوو بە مەڵبەندێکی گرینگی ناوچە دەشتاییەکەی داوێنی ناوچە شاخاوی یە کوردی یەکان. ژمارەی دانیشتوانی گەیبە شانزە هەزارکەس، بوو بە مەڵبەندی ئاینی زۆر بەی خێڵە کوردەکان، کەش و هەوای گشتی مهاباد زۆر لەو کەش و هەوایە دەچێت کە خوێنەرانی کارل مای حەزدەکەن بۆ شارەکوردەکانی تەسەوو بکەن: ئەوەی مرۆڤ لە باشورەوە، واتە لە مەیدانی چوار چراوە بۆ بازاڕی ناوجەرگەی شارو تا دەگاتە ئەو دوو جادەیەی کە مهاباد دەگەیەنن بەرمزاییەو میاندوا و دەیبینی، بریتی بوو لە تێکەڵەیەکی رەنگاو رەنگی تێکچرژاوی، نێوەڕۆکی تابلۆیەکی هونەری رەنگاو رەنگ، جوتیاران لە چیاکانەوە بەرەو شار دادەگەڕان، پەزو رانەکانیان وەپێش دەدا، کەچی هێندێکی دی لە شار وەدەردەکەوتن و بەکەروباری ئازوقەوە بە پەلە بۆ گوندەکانیان دەگەڕانەوە. کوچەو کۆڵانانی شار پڕ بوون لە کۆمەڵە مندالی جل و بەرگ شڕۆڵە و خەریکی غار غارێن بوون.

نوسەرو دیپلوماتی ئەمریکی ولیم ئیگلتون، کە کتێبێکی دەربارەی مهاباد نوسیوە، دەڵێ مرۆڤ لە نێو رەگەزەکانی ئەم وێنەو دیمەنەوە "دەموچاوی جوانی ژنەکوردی بێ پەچەوعەبای دەبینی کە سەرگەرمی کاری خۆ بوون، یان پێداویستی یەکانی ماڵیان دابین دەکرد. چ ئافرەتێکم نەدەبینی بەشداری ئەو قسەو باس و موناقەشانە بکات کە لە سوچی شەقامەکاندا رویان دەدا. ئەم موناقەشانە تایبەت بوون بە پیاوان".

پیاوان چاکەتو پانتۆڵی ئەوروپاییان لەبەر دەکرد: چونکە جل وبەرگی نەتەوەیی کوردی بەفرمانی رەزا شای پەهلەوی قەدەغە بوو، بەلام زۆربەیان دەرسۆکێکیان لە سەر کلاوێکی لبادەوە،بە شێوەیەکی هونەری، دەبەست و لە سەریان دەکرد.

چەکدارانی تیرەکان، بەنێو شەقامەکانی شاردا و بە جلی کوردی دەڵب و دەرسۆک و مێزەری توند بەستراوەوە، بەسەر بەرزی رەت دەبوون و هەقیان بەوەوە نەبوو کە لەشاردا چ روودەدات. پاش ئەوەی دەچوونە نک بەریەر، کە ئەگەر دنیا خۆش بوایە لە هەوای ئازادا کاری خۆی ئەنجام دەدا، و لە کڕینی پێداویستی یەکانیان دەبوونەوە، لە چایخانەیەک دا لایان دەدا تا پیاڵە چایەک بخۆنەوە یان چەند شیشێک گۆشتی بژراو بخۆن، کە ئەو ساکەش بە هەمان شێوەی ئێستای دەفرۆشرا، بریتی بوو لە بابۆڵەیەکی نان کە جگە لەوەی گۆشتەکەیان تێدە کرد، برنج و سەوزەی تازە وسەلکێک پیازیانش تێدەکرد.

بەنزیکە هەر هەموو لایەنەکانی ژیانی بازرگانی بە دەست کوردەکانەوە بوو، تەنیا چەند بازرگانێکی ئەرمەنی و شەش بازرگانی جولەکە هەبوون کە خەریکی ئاڵتونچێتی و مەی فرۆشی بوون: کە لە نێو موسوڵمانەکاندا حەرام بوو. تاقە یەک (روسی)ش هەبوو کە خەریکی سات و سەودای ئەسپ کڕین و فرۆشتن بوو، ئەم پیاوە لە هەمان کات دا قۆنتەراتچی ئازوقەی هێزی داگیرکەری سۆڤیەتیش بوو کە لە دەرێ ی شاردا

سەرباز خانەیەکیان هەبوو، بە ئوتومبیل سەعاتە رێ یەک دەبوو. لە نێو شاری مهاباد هیچ شوێنەوارێکی دەسەلاتی ئێران نەدەبینرا. مێژونوسە ئێرانی یەکان باروودۆخی ئەوێندەریان، لەو رۆژانە دا کە شاندی کورد لە سەردانی باکۆ بوون، بەمجورە وەسف کردووە: "دەسەلاتی شار بەرە بەرە کەوتە دەست کۆمەڵێک لە هاو وولاتیانی کورد".

## خوانی چا خواردنەوە و سەرهەڵدانی بیرۆکەی کوردستانی گەورە

هەستی نەتەوەیی کوردی ئێران، دوای ساڵێک لە گفتوگۆی کورد و سۆڤیەت لە باکۆ، شەقڵێکی تەواو سیاسی وەرگرت. ئەم کارە لە سەرەتادا وەها دەهاتە بەر چاو کە هەوڵێکی رۆمانسیانەیەو چ بایەخێکی سیاسی نابێت: رۆژی ١٩٤٢/٩/١٦، پانزە پیاو لە سەر خوانێکی چاخواردنەوە وشیرینی خواردن دا، لە سێبەری دارو درەختی باخێکی رەخی روباری (سابلاغ)ی باکوری شاردا خڕ بوونەوە.

بچوکترین کەسی ناو ئەم مەجلیسە گەنجێک بوو کە هێشتا نۆزدە ساڵی تەواو نەکرد بوو، و تازە خوێندنی ئامادەیی لە رەزاییە تەواو کرد بوو، گەورەترین کەسی نێو مەجلیسەکەش تەمەنی پەنجا ساڵێک دەبوو، و بەرێوەبەری دایەرەی توتنی حکومەتی بوو لە شاردا. چ شتێک دیمەن و رواڵەتی ئەم پازدە کەسەی لە خەڵکانی دی جیا نەدەکردەوە. بەلام بۆ مەبەستێک کۆ بووبوونەوە کە ئامادە نەبوون دەستبەرداری بێن: ئەویش پەلە کردن بوو لە دامەزراندنی حیزبێکی کوردی ئەوتۆ کە بتوانێت سەرکردایەتی و رێبەرایەتی ئەو باس و موناقەشانە بکات کە ساڵێک بوو دەربارەی سەر بەخۆیی کوردستان دەکران. هەروەها دەبوایە ئەم حیزبە بکرێ بە دەزگایەک کە لە پێناوی وەدی هێنانی ویستەکانی گەل و کەڵکەڵەی سەر بەخۆییان بخەبتێ.

(میرحاج)ش کە کوردی عێراقی بوو ئامادەی ئەم کۆبونەوەیە بوو بوو. ئەم پیاوە لە سوپای عێراقی دا ئەفسەر بوو. ئامادەبوان لە سەر ئەوە رێک کەوتبوون کە وەکو راوێژکارێک دەعوەتی بکەن. ئەمیش سلاو ورێزی (کۆمەڵەی هیوا)ی پێ گەیاندن، ئەم کۆمەڵەیە، کۆمەڵەیەکی نهێنی کوردی بوو، و لە عێراقاو لە سەردەمی انتدابی بەریتانیادا دامەزرابوو. چالاکی ئەم کۆمەڵەیە لە نێو رۆشنبیرانی شارو نوسەران و رۆژنامەوانان و ئەفسەرانی سوپادا بوو. میرحاج بە خۆی تەجرەبە و ئەزمونی دەیان ساڵ چەوساندنەوەی کوردی عێراقی لە لایەن ئینگلیزو عێراقی یەکانەوە هەبوو، ئەمە جگە لە تەجرەبەی عەمەلی کە ئامادە بوو لە شێوەی ئامۆژگاری و زانیاریدا، بە خۆشحاڵی یەوە پێشکەش بە برا کوردە ئێرانی یەکانی بکات.

میرحاج، ئامۆژگاری کردن کە دەبێ زۆر وریا بن وبەو پەڕی نهێنی یەوە حیزبەکەیان رێک بخەن. هەر چەندە دەکرێت دامەزراندنی حیزبەکە رابگەیەندرێ، بەلام دەبێ بزوتنەوەکە لە چوار چێوەی زنجیرەیەک شانەی پێکەوە بەستراودا رێک بخرێ

بەمەرجێک ئەندامانی هەر شانەیەک جگە لە ئەندامانی شانەکەی خۆیان ئەندامانی چ شانەیەکی دی نەناسن، و نابێ هیچ پەیوەندییەک لە نێوان شانەیەک و شانەیەکی تردا هەبێ، پێدەچێ لەو نیوەڕۆ دانیشتنەدا چ کەسێک بەوەی نەزانی بێ کە ئەوەی بڕیاریان لە سەر دا شێوازی شیوعیانەی ڕێکخستنی حیزبە. هەروەها هیچ کەسێک لە ئامادە بووان موناقەشەی پێشنیارەکەی (میرحاج)ی نەکرد کە حیزبەکەیان نێو بنەن (کۆمەڵە)؛ ئەوە بوو ڕێک کەوتن لە سەر ئەوەی ناوی بنەن (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد)و بەو جۆرە کۆبونەوەکە تەواو بوو، و بڵاوەیان لێکرد.

وەکو لە زۆر بۆنەی مێژوویی تریش دا باوە، ئەم روداوە کە لە سەرەتادا کەم بایەخ دەهاتە بەرچاو، بوو بە هەوێن و سەرەتای کۆمەڵێک روداوی مێژوویی هەرەگرینگ. کۆمەڵەی نێو براو پاش شەش مانگ لە دامەزراندنی، توانی نزیکەی سەد هاوولاتی شاری مهاباد لە ریزەکانی خۆیدا ڕێک بخات. وەرگرتنی ئەندام لە کۆمەڵەدا بە شێوەی فەردی دەبوو. هەر کەسێک پێویستایە ببێتە ئەندامی کۆمەڵە، دەچوو بە ئامادەبوون و شایەتی سێ کەس سۆێندی بە قورعان دەخواردو دەبوو بە ئەندام. لە نیسانی ۱۹٤۳دا و بە شێوەی نهێنی، کۆمیتەیەکی ناوەندی لە ئەندامانی ڕێکخستن هاتە هەڵبژاردن. ئەم بزوتنەوەیە زۆر زوو پەلوپۆی بۆ نێو خێڵە کوردەکانی دەوروبەری مهابادش هاویشت. لە سەرەتادا و لە بەر هەندێ هۆی ئاشکرا، تەرکیز لە سەر ناوچەکانی باکوری سەقز کرا، واتە روو کرایە ئەو ناوچەیەی کە نە دەسەلاتی بەریتانی تێدا بوو نە هێزی ئێرانی تێدا بوو تا ببنە کۆسپ و تەگەرە لە ڕێگەی پەرە سەندن و گەشەکردنی کۆمەڵەدا.

سەرانی عەشایەرش پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە کرد لەوانە سەرۆکی عەشیرەتی هەرکی بە هێزو امین خان شەریفی ی سەرۆکی هوزی شکاکی بە نێو بانگ. لە لایەکی دیەوە سەرانی کوردی عێراق و تورکیاش دڵیان بە کۆمەڵە خۆش کردو چەند سەردانێک لە نێوانیاندا روویدا بۆ ئەوەی موناقەشەی ئەوە بکرێ کە چ ڕێگەیەک بۆ کۆمەک و یارمەتی یەکدی بگرنە بەرو موناقەشەی نەخشەکانی کار کردنی ئاییندە بکەن. تا بەمجۆرە ئەم رووداوە ناوچەییە کە لە سەرەتا دا بێ بایەخ و گچکە دەهاتە بەر چاو، بوو بە هەوێنی سەر هەڵدانی بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتوی ئەوتۆ کە هەموو کوردی ئێران و عێراق و تورکیا بگرێتە خۆ، واتا بوو بە هەوێنی سەر هەڵدانی بیرۆکەی کوردستانی گەورە. لە ئابی ساڵی ۱۹٤٤دا ئەو رووداوە بە نێو بانگە رویدا کە دەکرێت لەگەڵ (سوێندی روتیلی)ی بەنێو بانگ دا بەراورد بکرێ: ئەو شوێنەی کە سویسری یە کۆنەکان (سوێندی روتیلی) ی بە نێو بانگیان تێدا خوارد، وەکو ریوایەتەکە دەیگێرێتەوە، کەوتبووە رەخی دەریاچەی (اوریز)، ئەم شوێنە بە دیواری تاوێری بەردان و گژو گیا تەنرا بوو، لە رۆژی چوارشەمەی بەر لە رۆژی جەژنی

(القديس مارتين) له سالی ۱۲۹۱، ئاماده بووان لەوێدا سوێندیان خوارد کە (فوکت)ـەکان وەدەرنێن و سێ ناوچەکەی خۆیان (شفیتز)، (نوری) و (ئونترڤالدن) یەکبخەنەوە و لە دەسەڵاتی بنەماڵەی (هابسبورگ) رزگاری بکەن.

بەڵام بەشدارانی سوێندە کوردییە مێژوویییەکە، دەبوایە سەفەرێکی زۆر قورستر لە هینەکەی باپیرانی سویسری یەکان بکەن، تا بگەنە ئەو شوێنەی کە لێبڕابوون سوێندی تێدا بخۆن. کوردەکان خاڵی یەکانگیری سنوری عێراق، تورکیا، ئێرانیان بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژارد کە وەکو سێکوچکەی سنور دەکەوێتە سەر چیای (دەلان پەر)ـەوە کە (۳٦۰۰) مەتر لە رووی دەریاوە بەرزە. پیاوەکان چەندین سەعات بە چیایەکەدا هەڵگەڕان و لە وێندەر (پەیمانی سێ سنور)یان مۆر کرد کە لە نێو کوردان دا پایەیەکی ئەفسانەیی زیندوی هەیە.

لە پەیمانەکەدا، بەڵێن دراوە کە هەموو لایەک یارمەتی یەکتر بدەن و ئەو ئیمکاناتە مادی و بەشەرییانە بەکار بهێنن کە خزمەتی ئامانجی یەکخستنی کوردستانی گەورە دەکات.

نوێنەری کوردی ئێران لەم پەیمانەدا )قاسم قادری) ی ئەندامی کومیتەی ناوەندی کۆمەڵە بوو. (شێخ عبیداللە) نوێنەری کوردی عێراق بوو. (قازی مەلا وەهاب) ش نوێنەری کوردی تورکیا بوو.

## تەماشاکردنێکی خاکی دەوڵەتی ئومێدان

مرۆڤ دەیتوانی لە سەر ترۆپکی (دەلان پەر)ـەوە خاکی سێ دەوڵەتان بدینێ، کە چی ئەو کوردانەی لەو رۆژانەی مانگی ئابی ۱۹٤٤دا وەختێ روانیانە دەوروبەری خۆیان تەنیا یەک خاکیان دەبینی: خاکی دەوڵەتی کوردستانی یەکگرتوی ئاینده.

نوێنەرانی (کۆمەڵە) نەخشەیەکیان بۆ ئەو دەوڵەتەی دڵخوازی خۆیان ئامادە کردبوو، دیارە لەم نەخشەیەدا پشتیان بە هەوڵەکانی پێشوتری سەرکردایەتی کۆمەڵەی خۆیبون بەستبوو. خۆیبوون، کۆمەڵەیەکی کوردی بوو، سەرکردەکانی کۆمەڵە میرو رۆشنبیرێکی کورد بوون بە سەرۆکایەتی میر بەدرخان. دیارە لە تاراوگەو دەربەدەریدا، بە تایبەتی لە بەیروت و قاهیرە و پاریس دا، چالاکی خۆیان ئەنجام دەدا. هەڵبەتە ئەوانەی کە نەخشەی سنورەکانی دەوڵەتی چاوەڕوانکراویان کێشا بوو، زۆر بە سەخاوەتەوە دەستیان شل کرد بوو لە بەرین کردنەوەی پانتایی ئەم دەوڵەتەو زۆر شوێنیان خستبوە سەر پانتایی ئەسڵی کوردستان لە نێوان چیاکانی ئارارات لە باکورەوە و بۆ دەشتەکانی دیجلە و فورات لە باشورەوە. شاری کەرکوکی پرنەوتیش بە شێوەیەک خرابوە سەر ئەم نەخشەیە کە بەلای ئەوانەوە شتێک بوو بڕابوەوە و چەند و چونی هەڵنە دەگرت: هەر چەندە کورد لەوێندەردا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکەیان پێک نەدەهێنا. بەڵام لە چاو

ئەو تورکمان و عەرەبانەدا کە لەوێندەر دەژیان، گەورەترین کەمینەی نەتەوەییان پێک دەهێنا هەروەها پتر لە نیوەی دانیشتوانی شاری کەرکوک کورد بوون.

پێدەچێت ئارەزوی داڕێژەرانی نەخشەی کوردستانی یەکگرتوو کە حەزیان دەکرد دەوڵەتەکەیان دەرویەکی لە سەر دەریای سپی ناڤین و کەنداوی فارسی هەبێ، کارێکی زۆری لێکردبێ و لە کاتی دیاریکردنی سنورەکانی کوردستاندا، هەندێ لە واقیع و واقیعبینی دوری خستبێتەوە. چونکە مرۆڤ ئەو هەقەی هەیە کە بپرسێت ئاخۆ بوونی چەند گوندێکی کورد لە باکوری شاری حەلەب دا، دەکاتە ئەوەی کە دەبێت ڕارەوێکی زەمینی لە ناوجەرگی کوردستانەوە بۆ دەریای سپی ناڤین بکشێت و ئەو ڕاڕەوە بە بەشێک لە خاکی کوردستان بێتە ژماردن؟ کە چی ڕارەوی دووەم کە دەگاتە سەر کەنداوی فارسی زۆر زیاتر جێ ی چەندو چونە: چونکە عەشایەری لوڕو بەختیاری هەڵوێستیان بەرانبەر بە کورد وەکو هەڵوێستی فلامی یەکانە بەرانبەر بە ئەڵمان یان وەکو هەڵوێستی نوکرانی یەکانە بەرانبەر بە روسەکان. داڕێژەرانی نەخشەکە هاتوون ئەوانەیان بە تیرەی کوردی ئەسڵ داناوە. هەروەها بەشدارانی پەیمانی سێ سنور لە سەر ئاڵای دەوڵەتی یەکگرتوی کوردی ش ڕێک کەوتن. ڕەنگی ئاڵاکە سورو سپی و کەسک بوو، هەمان ڕەنگەکانی ئاڵای ئێرانی بوو، بەڵام بەریز بەندییەکی پێچەوانەوە. وێنەی ئارمی ڕەسمی کوردی لە ناوەندی بەشە سپییەکەدا کێشرا: هەتاوێکی پرشنگداری بە گوڵەگەنم دەوردراو، لە پشت هەتاوەکەوە چیایەکی بەفرگرتوو و قەڵەمێک دیارە.

کۆمەڵە گەنجێکی ئەندامی (کۆمەڵە)ش لە ژێرکارێگەریی بوژانەوەی نەتەوەییدا کەوتنە خۆ بۆ ئامادە کردنی داستانێکی نەتەوەیی. ئەم شانۆنامە شیعرییە بۆ یەکەمجار لە مهابادا نمایش کرا، مەبەستی هەرە سەرەکی ئەم شانۆنامەیە بریتی بوو لە بەرزکردنەوەی ورەی گەلی کورد. ئەم شانۆ نامەیە (دایکی نیشتمان) لەو شانۆنامە نۆیراییانە دەچوو کە لە پەکێن داو لە سەردەمی بەناو (چوار شەقاوە)دا نمایش دەکران و زیاتر پشتیان بە فاکتەری جۆشدان و هاندانی جەماوەری ڕاستەوخۆ دەبەست. نێوەرۆکی ئەم شانونامەیە یەکجار ڕاستەوخۆ و سادە بوو: نیشتمان، شوبهێنرابوو بە ئافرەتێک، ئەم ئافرەتە خەتەری لە سەر بوو، دژمن توانی کۆت و زنجیری بکات، بەڵام ڕۆڵە شۆڕشگێرەکانی لە ئەنجامدا ڕزگاری دەکەن. نمایشی ئەم شانۆنامەیە کارێکی یەکجار زۆری کردە سەر ئەو جەماوەرەی کە بۆ یەکەم جار روو بەرووی کارەساتی نەتەوەی کوردکرانەوە، ئەم کاریگەرییە گەلێک پتر بوو لە کارێگەری هەر خوتبەیەک یان گوتەیەکی سیاسی دی. شایەت حاڵێک بەم شێوەیەوە وەسفی دەکات: "نمایشەکانی شانۆ نامەکە شەقڵێکی ئاینی خواپەرستانەی لە خۆ دەگرت". پاش ئەوەی زۆر سەرکەوتوانەو بۆ چەند مانگێکی یەک لەدوای یەک لە مهاباد نمایش کرا، تیپەکە کەوتە گەڕان بە کوردستاندا و شانۆ نامەکەی لە شارۆچکە جۆراوجۆرەکاندا نمایش کرد. سەرکەوتنی باشی بە دەست هێنا و ئەو ئامانجانەشی پێکا کە بۆی دانراو

بوو، و بریتی بوو له جۆشدانی سۆزی نەتەوەیی و گیانی شۆڕشگێڕی.. وەختێ ئەم شانۆنامەیە لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی سۆڤیەتدا نمایش کرا، کۆمیسەرێکی سیاسی نەشارەزا لە کەلکەلە و خولیاکانی کورد، نارەزایی لەوە دەربڕی کە ئەوانەی دایکەکەیان کوت و وزنجیر دەکرد بە ئەسپ بشوبهێنرێن. پێشنیازی کرد با ئەوانە ئەلمانە نازیەکان بن، بەلام سودی نەبوو. بەلام هەندێ بەرپرسی سۆڤیەتی لەو شارەزاتر لە دۆزی کورد، توانیان خواستەکانی خۆیان بەوە بێننە دی کە سوکە دەستکارییەکی کۆتایی شانۆنامەکە بکرێ و با یەکێک لەوانەی کە دایکەکە رزگار دەکەن، سەربازی سوپای سوور بێ.

بەو جۆرە دەبینین کە (کۆمەلە) بیری لە هەموو وردو درشتێکی چۆنیەتی دابینکردنی پێداویستی یەکانی وەدیهاتنی سەربەخۆیی چاوەنۆڕکراو کرد بووەوە. بەلام بیهودە و سەر سام لە کەسایەتی یەکی سەر کردەیی وەها دەگەڕان کە بتوانێت سەرکردایەتی ئەو دەولەتە کوردیە لە ئەستۆ بگرێ و بەرێوەی بەرێ. ئەوەی سەیر بوو سۆڤیەت کە بۆ خۆی پارێزەرو سەر پەرشتیاری بزوتنەوەی (کۆمەلە) بوو، لە مامەلە کردنیاندا لەگەل کۆمەلە، وازیان لەو شێوازە تەقلیدی یە هێنا کە دەبوایە هەر بزاڤێکی رزگاریخوازی بگۆڕن بۆ بزاڤێکی چەپگەری رووت و لە مەداری سۆڤیەتی دا بخولێتەوە. کاتێ کە ئەندامانی کۆمەلە دەکەوتنە موناقەشەی ئەوە کە کێ بۆ سەرۆکایەتی دەولەتی چاوەنۆڕ کراو هەلبژێرن، ناوی پیاوێکی زۆر نێوداری مهاباد، پتر لە هەر ناوێکی دی دەهاتە سەر زارورو بەر هزرو بیران، کەچی کۆمیتەی ناوەندی هەمیشە دوو دل بوو لە قبولکردنی ئەو پێشنیارە، چونکە چاک دەیانزانی کە ناوو پایەو دەسەلاتی قازی محمد و تەقدیری لە لای سۆڤیەتەکان، کۆمیتەی ناوەندی دەخاتە خانەی دووەمی سەرکردایەتی سیاسیەوە. بەلام لە لایەکی تریشەوە لە پێناوی ئامانجە نەتەوەییە گشتی یەکاندا، ئامادە بوون بێ دوو دلی و راوەستان قازی محمد بە ئەندامی (کومەلە) قبول بکەن. ئا بەمجۆرە قازی محمد وەکو میوان لە یەکێک لە مالەکانی مهابادا و بەئامادەبوونی پتر لە بیست ئەندامی (کومەلە) پێشوازی کرا.

ئەوە بوو لە بەر هۆی ئەمنی تەنیا دوو ئەندامی کۆمەلە، لە پشت پەردەیەکی قوماشەوە لەگەل قازی محمدا روو بەروو بوونەوە و لە ئامانج و نەخشەکانی کۆمەلەیان ئاگادار کردەوە کە کاری بۆ راگەیاندنی دەولەتی کوردستان دەکرد. هەروەها داوایان لێکرد کە ببێ بە ئەندامی کۆمەلە و پێیان راگەیاند کە ئەگەر رەفزی کرد، ئەوا چ شتێکی لە سەر نی یە تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەو مالە بە جێ بهێلێ، خۆ ئەگەر قایل بوو، ئەوا حەزدەکەن لە بەردەم هەموو ئامادە بووان دا سوێند بخوات.

پێدەچێ ئەم هەموو پێچە بە دەوروبە لە زیادە بووبێ. چونکە قازی محمد یەکسەرو هەر لەوێ دا داواکەیانی قبول کردو بوو بە ئەندامی کۆمەلە. یەکێک لە مێژو نوسەکان

دەڵێ قازی محمد "لەو ساتەوە نیدی بوو بە دەنگ و سەر کردەی حیزب، ئەگەرچی قەتاو قەت بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (حیزب) ش هەڵنەبژێردرا".

## کورد سەربازی شەترنجن

(سۆڤیەتەکان)ش، لە هەمان کاتدا کە سەرقاڵی دارشتنی نەخشەو هەڵوێستی خۆیان بوون لە مەڕ کورد، دوو دەستپێکیان ئامادە کرد بوو، تا بە هۆیەوە بچنە ناو ئەو پێشبڕکێ ی شەترەنجی سیاسییەوە کە لە پێناوی وەدەستهێنانی پێگەی دەسەڵات لە رۆژهەڵاتی ناڤین دا دەیانکرد. بەڵام هێشتا دڵنیا نەبوون لەوەی کە کام دەستپێکەیان دەیانگەیەنێتە ئامانجە دیاریکراوەکانیان. لە لایەکەوە توانیان دۆستایەتی هەردوو گەلی ئازربایجانی و کورد لە ناوچەکانی دەسەڵاتی خۆیاندا بە دەست بهێنن و پشتیوانی لە خەباتی جیابوونەوەخوازیان لە ئێران بکەن و هانیان بدەن کە داوای سەربەخۆیی بکەن. لە لایەکی ترەوە خۆیان حازر کردبوو کە لە رێگەی دامەزراندنی حیزبی تودەوە کە داوای یەکپارچەیی خاکی ئێرانی دەکرد، گوایە هەموو ئێران بگۆڕێ بۆ دەوڵەتێکی سەر بەکۆمونیزم.

بەڵام ئەنجامی هەڵبژاردنە پەرلەمانی یەکانی ئێران لە ساڵی ١٩٤٢ دا جەزرەبەیەکی پڕ ژان بوو لە ناوەندی سۆڤیەت کەوت، کە گرەوی لە سەر ئەم رێبازەی دوایی دەکرد: حیزبی تودە تەنیا هەشت کەسی بۆ گەیەنرایە پەرلەمانی ئێران، سییانیان لە سەر داوا و گوشاری راستەو خۆی بەریتانییەکان بوو، کە بە هیوا بوون لەو رێگەیەوە سۆڤیەتەکان ئارام بکەنەوە، چواری تریش بە گوشاری راستەو خۆی هێزی داگیرکەری سۆڤیەتی گەیشتنە پەرلەمان. واتا حیزبی تودە توانی تەنیا یەک کەس، کە بەراستی لە لایەن گەلەوە هەڵبژێردرابێ، بگەیەنێتە پەرلەمان؛ سۆڤیەتەکان کە ئەمەیان بینی بایاندایەوە و رێبازی خۆیان گۆڕی، ئەوە بوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٣وە دەستیان بە گەمەکەی تریان کرد، و کەوتنە جوڵاندنی سەربازە کوردی و ئازربایجانی یەکان. جەنگی جیهانی دووەم تەواو بوو؛ نازییەکان شکان. ئەمەش ئەوترسانەی لە لای سۆڤیەتەکان رەواندەوە کە ئەگەر بێت و لە ناوچەکانی باکوری رۆژاوای ئێراندا گۆڕانکاری بکات، ئەوا ئەگەری کاردانەوەی جیهانی چێدە بێت. ئەوەی پترش هانیدا ئەوە بوو کاتێ کە هەر سێ دەوڵەتە بەڵتیکی یەکەو ناوچەی بیسارابیای رۆمانی و بەشێک لە فنلەندەی داگیر کرد، تا دوای جەنگ چ کاردانەوەیەکی جیهانی لێنەکەوتەوە؛ هەروەها قاییل بوونی رۆژاوا بەوەی کە یەکێتی ی سۆڤیەت چەند بەشێکی تری پۆڵەندە بخاتە سەر خاکی خۆی؛ ئەمە لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەتە رۆژاواییەکان قسەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە بۆیە چوونەتە دووەم جەنگی جیهانەوە تا پارێزگاری ئاسایش ویەکێتی ی ئەم پۆڵەندایە بکەن.

دوا جاریش یەکێتی ی سۆڤیەت توانی ئەو خاکانەی وەربگرێتەوە کە لە ساڵی ۱۹۱۸دا بە پێ ی پەیمانی بریست- لیتوفسک دابوی بە ئەڵمانیا، هەروەها قرم یشی وەرگرتەوە کە لە ساڵی ۱۹۲۱ دا تەنازولی لێکرد بوو بۆ تورکیا. لەبەر هەر هەموو ئەم هۆیانە، سۆڤیەتەکان تاقە یەک پرسیاریان لە خۆ دەکرد: مادامێکی مەسەلەکان بەم شێوەیەیە ئیدی بۆچی گەمەی وەدیهێنانی ئامانجە گشتی یەکان بەرەو کەنداوی فارسی بە دەستپێکێک لە رۆژ هەلاتی ناڤینەوە دەست پێنەکرێ؟

## کومونیستی دەوراندیدە (پێشەوەری)، و کۆماری ئازربایجان

سۆڤیەتەکان، یەکەم نەقلەیان لە ئازربایجانەوە دەستپێکرد. ئەوە بوو لە ساڵی ۱۹۱٤ وە کۆمونیستێکی کارامەی دەوراندیدەیان بۆ نارد کە نەک هەر بە بەڵگە دڵسۆز و کارامەو خاوەن ئەزمونی دورو درێژ بوو، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەشدا ئازەری و خەڵکی تەورێزی ئێران بوو، ئەوکۆمونیستە جەعفەر پیشەوەری بوو کە لە ساڵی ۱۹۲۱وە خزمەتی بەلشەویکەکانی کرد بوو؛ واتا لەو کاتەوە کە بەلشەویکەکان حکومەتێکی سەر بەخۆیان لە ناوچەی گەیلانی ئێران دا دامەزراند، ئەو حکومەتە چەند هەفتەیەک دەوامی کرد و لە ۱۹۲۱/۲/۲٦ هەرەسی هێناو روخا. شایانی باسە ئەو پەیمانەی کە سۆڤیەتەکان ئەو رۆژگارە لەگەڵ ئێرانییەکاندا مۆریان کرد و بەو پێ یە لە ئێران کشانەوە، مافی ئەوەی داپوونێ کە هەر کاتێک پێویست بکات سنوری خۆیان لە باشوردا هەڵبژێرن و ئەو پەیمانە تاکو ئەمڕۆش وەکو خۆی ماوەتەوە.

پیشەوەری، ساڵانی یەکەمی نێوان هەرەسهێنانی ئەو ئەزمونی جوداخوازییەو هەڵایسانی دووەم جەنگی جیهانی لە تاراوگەولە یەکێتی ی سۆڤیەتدا بە سەر برد؛ لەوێندەر زۆر پۆستی حیزبی بەرزی گرتە دەست. وەختێ کە گەڕایەوە بۆ تەورێز، سەدان ئازەری لەو ئازەریانە لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە کە لە باکو لە دایک بوبون. هێزو خۆشەویستی ئەم پیاوە کێشەی نەتەوەیی ئازەر بوو کە بە بێ چارە سەر مابوەوە. بە پێ ی پەیمانی ساڵی ۱۹۲۱ی نێوان ئێران و سۆڤیەت، روباری ئاراس کرا بە سنوری نێوان هەرتک دەوڵەت. بەڵام روباری ئاراس نەک هەر سنوری هەردوو وڵاتی جیا دەکردەوە، بگرە بووش بەرەمزی دابەشکردنی گەلی ئازەری؛ چونکە ئەو گەلە تورکی زمانە دابە شبوون بە سەر دوو وڵاتدا؛ نزیکەی یەک ملیون ئازەری بوون بە هاو وڵاتی سۆڤیەتی و نزیکەی ملیون و نیوێک وەکو هاو وڵاتی ئێرانی مانەوە. هەڵبەتە دەسەڵاتی حوکمرانی پەهلەوی کەوتە بەکار هێنانی سیاسەتێکی رەگەز پەرستانە دژ بە ئازەرییەکان و چەوساندنەوەیان، وەکو چۆن هەمیشە ئەم سیاسەتەی لەگەڵ کورد و کەمینە نەتەوەییەکانی تری نێو ئێراندا بەکار هێناوە. هەر ئەمەش هەنجەتی بۆ ناسیۆنالستە ئازەری یەکان خوڵقاند کە بۆ دەرویەک بگەڕێن لەو سیاسەتە رەگەز پەرستیە رزگاریان بکات.

مێژونوسی ئێرانی نیمچە رەسمی (امیر صادقی)ش رەخنەی لەو سیاسەتە ئێرانی یە گرتوە کە لەو سەرو بەندەدا پەیرەو کراوەو لە کتێبێکی دا کە لە ساڵی ١٩٧٧دا چاپ و بڵاو بوەتەوە نوسیویەتی: "رەزای یەکەم مامەڵەی هاو وڵاتی پلە دووی لەگەڵ هاووڵاتیانی ناوچەکانی ئازربایجان دەکرد، یان بەهاووڵاتی کۆیلەی فارسی دەزانین کە دەبێت بە زوترین کات لە باری نەتەوەییەوە بتوێنرێنەوە. بە کار هێنانی زمانی تورکی ئازربایجانی (ئازەری) قەدەغە کرد. کاتێ سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٤١دا بە لەشکرەوە هاتە نێو ئێران، هەر بەمەبەستی پروپاگەندە رێگەی رۆژنامەیەکیان دا کە بە زمانی ئازەری دەربچێت، ئەمە وایکرد ئازەرەکانی ئێران سەرلەنوێ ئەو دیوی سنور بدەن: براکانیان لەوبەری روباری ئاراسەوە بێ چ گیروگرفتێک زمانی زکماک و نەتەوەیی خۆیان بە کار دێنن، جگە لە دەر چوونی چەندین کتێبی ئەدەبی و سەرهەڵدانی بزاڤی شانۆگەری بە زمانی ئازەری، کە هەموو ئەمانە خۆیان لە خۆیاندا بەشێکی گرینگن لە سەلماندنی ناسنامەی نەتەوەییان. پشەوەری و هاورێکانی لە ساڵی ١٩٤٥دا توانیان ئەم ناسنامەی نەتەوەییە بکەن بە بیانوو و پێ ی لە سەر داېگرن و پشتی پێ ببەستن".

پیشەوەری یەکێک بوو لەو نوێنەرانەی کە یەکێتی ی سۆڤیەت بۆ (پەرلەمانی ئێرانی) نارد بوونی، بەڵام ئەنجومەن رازی نەبوو ئەو پیاوە هەڵبژێردرێ و رێگەی نەدا لەو دەورە پەرلەمانی یەدا بەشداری بکات کە لە ساڵی ١٩٤٤وە دەستبەکار بوو. بەمجۆرە چالاکی پیشەوەری و تەگبیرکەرە سۆڤیەتییەکانی لە چوارچێوەی تەورێز قەتیس ما. بەڵام پیشەوەری، هەرگیزو بۆ ساتێک لەوە غافڵ نەدەبوو کە باشترین ئەنجام لەم (ئەقڵە بچوکەوە) بە دەستبێنێ. ئەوە بوو زۆر بەلەز لە سیاسەتی کۆمونیزمی بایدایەوەو رویکردە خەتی حیزبی جەماوەری، خەتی بەرەی نیشتمانی، یەکەم هەنگاویش لەم بوارەدا ئەوە بوو ناوی رێکخستنی حیزبی تودەی ئازربایجانی گۆردرا بۆ حیزبی دیموکراتی ئازربایجانی.

جەنەراڵ (سالم ئاتاکیخوف) لە ١٩٤٥/٩/٣دا بانگهێشتنی قازی محمد و سەرانی (کۆمەڵە)ی کرد کە لە کۆبونەوەی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی ئازربایجانی دا ئامادە بن. هەڵبەتە جەنەراڵ ئاتاکیخوف زۆری مەبەست بوو شاندی کوردی بەشداری کۆبونەوەکە ببێ و بایەخی زۆری پێدەدا، کوردەکان، کە بە درێژایی مێژووی خۆیان دۆست و هاوپەیمانی ئازەرییەکان نەبوون، سەیریان کرد لە تەورێزدا زۆر بەگەرمی مامەڵەیان لەگەڵدا کرا، دیارە ئەمە بە ئەمری راستەوخۆی ئاتاکیخوف بوو. هەرچەندە کوردو ئازەر ئەو میانەیەیان نەبووە، بەڵام کوردەکان ئەم تەگبیرەی سۆڤیەتیان بۆ رێکخستنی ئەم کۆبوونەوەیە، زۆر بە لاوە پەسند بوو.

هێزی پیادەی سۆڤیەتی بە پشتیوانی چەند زرێپۆشێکەوە بەرپەرچی ئەو هێزە ئێرانەیەی دایەوە کە ئێران بە لەز لە تارانەوە ناردبووی تا بەزوترین کات ئەو بزاڤە

جوداخوازییه سەرکوتبکات. ئەوە بوو هێزی سۆڤیەت نەیهێشت ئەو هێزەی ئێران پێ بنێتە خاکی ئازربایجانەوە شۆڕشگێرانی (ئازەری)ش بە پشتیوانی سۆڤیەت هەندێ خاکی سنوری و پێگەی سوپا و پۆلیسی ئێرانییان لە پاریزگاکەدا گرت. سۆڤیەتەکان،جوداخوازەکانیان بە چەکی ئەڵمانی چەکدار کرد، کە لە قۆناغێکی دواتر دا کوردەکانیش سودیان لێوەرگرت. سۆڤیەتەکان لە ساڵی ١٩٤٢دا، لە عەمارێکی چەکی سەرەکی تاراندا، دەستیان بە سەر دەهەزار تفەنگی ئەڵمانیدا گرت. بیانوشیان ئەوە بوو کە لە بەرەکانی شەڕدا پێویستیان پێیەتی و سوود لەو هەموو تەقەمەنییە وەردەگرن کە لە سوپای ئەڵمانی گرتبوویان. بەڵام ئێرانی یەکان پاشان توانیان پێچەوانەی ئەو بیانوەی سۆڤیەتەکان بسەلمێنن، کاتێ سەیریان کرد ئەو چەکانە بە هیچ جۆرێ لە ئێران نەبراونەتە دەرێ، ئەویش بە بەراورد کردنی ژمارەکانیان لەگەڵ ژمارەی ئەو تفەنگانەی کە پاش روخانی هەردوو کۆماری کوردی و ئازربایجانی تەمەن کورت، دەستیان بە سەردا گرتنەوە. حامییەی رەزاییە تاقە سەربازخانە بوو کە توانی لەرووی شۆڕشگێرەکاندا بوەستێ، ئەویش تا رۆژی١٩٤٥/١٢/١٧ کە سۆڤیەتەکان هەڕەشەیان لێکرد دەبێ تەسلیم بە هێزەکانی حیزبی دیموکراتی ئازربایجان ببێ. ئەوە بوو فەرماندەی حامییە کە نێردرا بۆ تەورێز و لەوێ بەتۆمەتی بەربەرەکانی شۆڕش دادگایی کراو و حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو. بەڵام ئیعدام نەکراو بە ژمارەیەک لەو کۆمونیستانە گۆڕدرایەوە کە لە تاران گیرا بوون.

## پێشوازییەکی گەرم لە باکۆدا

جگە لەوەی باسکرا، وەکو ئاماژەمان کردێ سۆڤیەتەکان لاپەڕەیەکی نوێیان سەبارەت بە پەیوەندی دگەڵ مەسەلەی کوردیدا کردەوە. ئەوە بوو قازی محەمەد و هەندێ لە سەرانی کورد، کە هەندێکیان بەشداری سەردانی یەکەمی باکۆ (١٩٤١)یان کرد بوو، جارێکی تر دەعوەت کران تا سەردانی شاری باکۆ ی پایتەختی کۆماری ئازربایجانی سۆڤیەتی بکەن. کوردەکان، ئەمجارە یان دەبوایە زۆر بە نهێنی بجوڵێنەوە. ئەوە بوو یەکەم هەنگاو پەیوەندی بە پزیشکێکەوە کرا لە رەزاییە، ئەوجا بە پاس بران بۆ تەورێز. ئیدی لەوێندەرەوە سەفەرەکەیان بە هەمان شێوەی سەفەرەکەی ساڵی ١٩٤١ بە قیتار دەسپێکرد و بەقیتاری سۆڤیەتی لە سنور پەڕینەوەو گەیشتنە باکو. کوردەکان ئەمجارەش زۆر بە گەرمی پێشوازی کران: شاندێکی پێشوازی رەسمی لە ویستگەی قیتاردا لە پێشوازییان وەستا بوو. کۆمەڵە کیژۆڵەیەکی مەکتەبلی چەپکە گوڵیان پێشکەش کردن و لە ئەنجامدا برانە ئوتێلێکی گەورەی باکوری شار.

بۆ بەیانی رۆژی دوایی، کۆبونەوەیەک لە نێوان شاندی کوردی و راوێژکارە سۆڤیەتییەکاندا کرا، تا باسی ئەو داخوازییانە بکەن کە کوردەکان لە ئێوارەی هەمان رۆژدا دەیخەنە بەر دەست (باقروف)ی سەرەک وەزیرانی کۆماری ئازربایجانی

سۆڤیەتی. (قاسم ئیلچانی زادە)یان هەڵبژارد تا رەشنوسی داخوازییەکان بنوسێتەوە؛ چونکە دەستخەتی خۆش بوو. کورد، تەنێ چاوە نۆڕی پارەوچەک بوون لە سوڤیەت، چونکە پێیان وابوو مەسەلەی ئیعتراف کردن بە ئوتونومی براوەتەوە و پێویست بەوە ناکات گفتوگۆی لە سەر بکرێ.. بەڵام کاتێ شاندە کوردییەکە ئەو داخوازیانەیان هەستە بەردەم راوێژکارە سۆڤیەتەکان، زۆریان پێ سەیر بوو کە داوایان لێکرا جارێ ئەو مەسەلەیە دوا بخەن، لە کاتێکدا گرینگترین خاڵی سەفەری کوردەکان مەسەلەی پارە و چەک بوو، کەچی سۆڤیەتەکان تەنانەت بەر لەوەی لەلایەن (باقروف)ـەوە بەرەسمی پێشوازی لە شاندی کوردی بکرێ، ئەو هەڵوێستە سارد و سڕەیان نواند.

باقروف، بە لەهجەیەکی تورکی وەها کە کوردەکان تێ ی دەگەیشتن دەستی بە قسان کرد، بەدور و درێژی باسی هەڵوێستی سوڤیەتی لەمەڕ کێشەی ئەو نەتەوانە کرد کە هێشتا کێشەکانیان چارە سەر نەکراوە. لە قسەکانیا و لە نێوان چەپڵەی کوردەکانەوە رایگەیاند کە هەرگەلێک زمان و رۆشنبیریی تایبەتی خۆی هەبێ، دەبێ خۆی حوکمی خۆی بکات. هەر لە بواری باسی گەلانی ناو چوار چێوەی ئێراندا، ئاماژەی بۆ فورسی فارسی زمان و گەلانی گیلەکی زمانی کەنارەکانی دەریای خەزەر و گەلی ئازەری تورکی زمان و خەڵکی کوردستانی کوردی زمانی کرد. ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە هەڵوێستی سۆڤیەت بەرانبەر بە ئێران ئەوەیە کە هەر یەکێک لەو گەلانە پێویستە سەربەخۆیی خودی خۆی هەبێ و تورکی ئازەربایجان یەکەم کەس دەبن کە بەم مافە شاد دەبن.

سەرانی کورد، بەدەم گوێگرتنەوە سەری رەزامەندییان دەلەقاندو زۆر بە هێمنی گوێیان لە ووتەکەی دەگرت و چەپڵەیان بۆ لێدەدا. بەڵام ئەم هێمنییەیان لە دەستدا کاتێ کومونیستی فێڵباز هاتە سەر کێشەی کورد و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، ئەو گوتەنی بۆ بێ بەختی، مەسەلەیەکی زۆر پەلەنییە و وەدیهاتنی ئازادی کوردان نابێ بەوە لێک بدرێتەوە کە تەنیا ئازادی کوردی ئێرانە، بەڵکو دەبێ ئەم ئازادییە رۆڵەکانی کورد لە عێراق و تورکیاشدا بگرێتەوە.

لە سەری رۆیی و گوتی ئەوەی کە لە ئایندەدا خەبات بۆ وەدیهێنانی بکرێ بریتی یە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆو یەکخستنی هەموو گەلی کورد. جا تا ئەو رۆژ و دەرفەتە دێتە پێشێ، پێویستە لە سەر کوردی ئێران خۆیان ئامادە بکەن کە لە چوار چێوەی ئازەربایجانی خودموختارا بژین. باقرۆف، پاش درکاندنی ئەو دوا پەرەگرافانەی کەمێک وەستا و روانییە دەوروبەری تا کاریگەریی قسەکانی لە سیمای میوانە کوردەکانیدا بخوێنێتەوە. مرۆڤ زۆر بە ئاسانی دەیتوانی هەستی نیگەرانی لە سیمای زۆربەی کوردانەدا بخوێنێتەوە. کە زمان حاڵیان دەیپرسی، ئاخۆ دەعوەتی ئەمجارەیان بۆ باکۆ، بۆ ئەوە بووە کە ئەم قەرارە نومێد برەیان بە گوێدا بدرێ.

هەر چەندە قازی محمد تازە هاتبوە نێو گەمەی سیاسییەوە و هێشتا ساڵێک بە سەر ژیانی سیاسی پراتیکی و مەیدانی ئەودا نەبوری بوو، کە چی زۆر هێمن و بە ئەعسابی ساردەوە رەفتاری کرد. ئێدی ئەوە ئاشکرا نی یە کە ئاخۆ ئەم هەڵوێستەی زادەی زانیاری پێشوەختەی خۆی بووە دەر هەق بەمەنتیقی بیر کردنەوەی باقروف، یان پێشتر لەگەڵ لایەنە مەسولەکانی تری سۆڤیەتدا لە مەڕ خودموختاری کورد قسەی کرد بوو، یان ئەوەی هەڵێنجا کە باقروف بەوقسانە رای برا ئازەری یەکانی خۆی بۆ ئەوان دەردەبڕێ، کە دیارە حەزیان دەکرد ئازربایجان بە یەکگرتویی وەمێنێ و لە نێوان کورد و ئازەردا دابەش نەکرێت.

ئێدی هەڵوێستی قازی محمد بە هەر چییەک پشت ئەستور بوو بێ، گرینگ ئەوەیە کە هاتە سەر بەر پەرچدانەوەی گوتەکەی باقروف، گوتی کورد بۆ ئەوە خەبات ناکەن کە لە دەسەلاتی ئێرانی رزگار بێن و بچنە ژێر دەسەلاتی ئازربایجانەوە کە تازە بووە بە دەوڵەتی سەربەخۆ. هەروەها لە سەری رۆیی و گوتی ئەوەی ئازەربایجانی یەکان بۆ خۆیان بە باشو گونجاوی دەزانن، کورد بە شتێکی زۆر خراپ و کەمبایەخی دەزانن بۆ خۆیان. گوتەکەی بەمە کۆتایی هێنا: "ئێمە سوور دەبین لە سەر داوای سەربەخۆیی بێ ئەوەی مەسەلەی کورد لە دوورو لە نزیکەوە بە چارەنوسی ئازربایجانی تازەوە بیەستینەوە".

## تایەکێتی سۆڤیەت هەبێ

پاش ئەوەی باقروف، بۆ چونی دەوڵەتەکەی خۆی سەبارەت بە مەسەلەی کوردی ساغ کردەوە وەکو ئەوەی بارێکی قورسی لە سەر شانی خۆی لادابێ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و هاتە سەر موناقەشەی داخوازییەکانی کورد، ئەوە بوو کۆڵەمبێتی گوشی و کێشای بە سەر مێزەکەدا و بە حەماسەوە گوتی: "تا یەکێتی ی سۆڤیەت هەبێ، پێ ی ناوێ کورد نیگەرانی چارەنوسی خۆیان بن" ئەوجا قازی محمد هەستایە سەر پێیان و بە حەماسەوە رایگەیاند کە گەلە بێدەسەلاتەکەی شادمانە بە گوشینی ئەو دەستە دۆستانەیەی کە بۆی درێژ کراوە و گوتی: "ئێمە نەک هەر ئەو دەستە دەگوشێن، بەڵکو ئامادەین ماچیشی بکەین". وەختێ بەوردی دەست بە موناقەشەی داخوازییەکانی کورد کرا، قازی خواناسی لە مهابادوە هاتوو، توانای دبلۆماسی خۆی، کە تازە بەدەستی هێنابوو، نواند. هەروەها نمونەیەکی هونەری گێڕانەوەشی نواند کە کورد هەزاران ساڵەو لە رێگەی گێڕانەوەی داستانان و بەسەرهاتی مێژوویییەوە پراوەیان لە سەر کردوە، قازی محمد بە ناوەتاو ئەو حیکایەتە کوردییەی بۆ ئامادە بووان گێڕایەوە کە دەڵێ: "جارێک، ئاغایەک تاژی یەک دەدات بە جوتیارێکی روتەی هەژاری کورد. رۆژی دوایی جوتیارەکە دەچێتە لای ئاغا و لە رادەبەدەر سوپاسی دەکات و مەنتباری خۆی بۆ دەردەبڕێ. ئاغا قسەکان بە جوتیارەکە دەبڕێ و لێ ی دەپرسێت، دیاری یەکی هیچ ئەم

هەموو منەت و شاباشەی بۆچی یە؟ جوتیاری هەژار دەڵێ: من دەزانم لەو ساوە کە ئەم تاژییە چاکەت پێشکەش کردوم، لێبڕاوی ئەسپێکیشم پێشکەش بکەیت. ئاخر چۆن بە بێ ئەسپ راوم پێدەکرێت؟ دیارە پاش ئەوەی ئەسپەکەم پێشکەش دەکەیت، بە کەرەمی خۆت خۆراک بۆ خۆم و ئالیک بۆ ئەسپەکەم دابینەدەکەی. هەڵبەتە دڵنیاشم لەوەی کە دوا دیاریت ژبیرناکەیت و کاتێ تاژییەکەت دامێ بیرت لێ کردۆتەوە: خانوویەک بۆ خۆم و ئەسپەکە. ئا ئەمە وام لێدەکات ئەم هەموو سوپاسە بکەم و ئەمڕۆکە خۆم بە بەختەوەرترین کەسی ئەم دنیایە بزانم".

باقروف، یەکسەر وایدەرخست کە لەم حیکایەتەوە لە ویست و مەبەستی قازی محمد حاڵی بووە، ئەوە بوو گفتی دا کە هەر هەموو ئەو داخوازیانەی لە لیستەکەیاندا نوسراون جێ بەجێ دەکرێن: تفەنگ، چەکی ئوتوماتیکی، ئالیبات، هەروەها گفتی دا کە جگە لە داخوازییەکانی دی، دەستور دەردەکات کە بە زوترین کات تانک و (زرێپوش)یش بۆ مهاباد بنێردرێ. جگە لەوانە، لەسەر کۆمەکی دارایی و دانی دەزگایەکی چاپ و رادیۆیەک و تەرخانکردنی چەند کورسییەکی خوێندن بۆ ژمارەیەک لاوانی کورد لە ئەکادیمیای سوپایی باکۆ، رێککەوتن.

لەکۆتاییدا باقروف پێشنیازی کرد کە دەزگای سیاسی (کۆمەڵە) و ناوەکەی بگۆڕن و گوتی: "ئەمڕۆکە بەتەواوەتی ئەڵمانیا و یاپان لە دەسەڵات کەوتوون و دیموکراتییەت لە جیهاندا بە هۆی کۆمەکی راستەوخۆی وولاتە یەکگرتوەکان و بەریتانیای مەزن و یەکێتی ی سۆڤیەتەوە، سەرکەوت.. ئەمڕۆکە بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەی (کورد)یش دەتوانێت لە سایەی دیموکراتییەت دا بە ئامانجەکانی خۆی بگات". شاندی کوردی هیچ نارەزاییەکیان دەربارەی ئەم پێشنیازە دەر نەبڕی؛ مادامێکی زلهێزێکی وەکو یەکێتی ی سۆڤیەت بووە بە دۆست و هاوپەیمان، ئیدی هەر ناوێک لە بزاڤەکە بنرێ گرینگ نی یەو شایانی موناقەشە نییە.

شاندەکە بۆ رۆژی دوایی لە باکۆوە بۆ مهاباد وەرێ کەوت، هەر ئەندامێکی شاندەکە وێنەیەکی رەنگاورەنگی لە چوارچێوە گیراوی هاورێ ستالینی بۆ خرایە جانتاکەیەوە. سۆڤیەتەکان بۆیە ئەم دیارییەیان بە یەک بە یەک ئەندامانی شاندەکە دابوو تا ببێ بە رەمزێک کە( ستالین)ی مەزن ی مۆسکۆ نیشینی تازە سەرکەوتوو لە دووەم جەنگی جیهاندا، لە پشت تێکرای ئەو مەسەلەیەوەیە کە لە سەری رێککەوتوون.

## یەکەم وەجبە تفەنگی ئەڵمانی

کوردەکان هەر کە گەڕانەوە خێرا دەستیان بە جێ بە جێ کردنی ئەوشتانە کرد کە لە باکۆ لە سەری رێککەوتبوون. قازی محمد راپۆرتێکی دورو درێژی لە مەڕ سەفەرەکەیان، خستە بەردەم کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی (کۆمەڵە). راپۆرەکە زۆرشتی تێدا بوو:

لەسەر سەفەرەکە، لەسەر ئەو بەڵێنانەی کە سۆڤیەتەکان پێیان دابوون، لە سەر ئارەزووی سۆڤیەتەکان بۆ گۆڕینی ناوی بزوتنەوەکە بە جۆرێ کە دەلالەت لە نێوەرۆکی دیموکراتی و کار کردن لە سایەی دروشمی دیموکراتیەتدا: ئەوە بوو کۆمەڵە نێوی خۆی گۆڕی و کردی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان. بەڵام هەیکەلی ڕێکخستنی کۆمەڵە هەر وەکو خۆی هێڵرایەوە و شەقڵی کومونیستانەی نەگرتە خۆ و قازی (محمد)ش ئەو سەرکردەیە بوو کە کەس شانی لە شانی نەدەدا.

ئەوە بوو کە بڕیاری لە سەر بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان دراو گرینگترین شتێک کە مرۆڤ لە حەوت خاڵی بەرنامەکەدا بەدی دەکرد ئەوە بوو کە داوای سەرەکی کۆمەڵە، کە بریتی بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی یەکگرتوو، گۆڕا بۆ خەبات لە پێناوی وەدەست هێنانی خودموختاری لە چوار چێوەی ئێراندا. پێدەچێت سەرکردایەتی سیاسی، مەبەستیان ئەوە بوو بێ کە ئامانجەکانیان دابەش بکەن بەسەر ئامانجی نزیک و ئامانجی ستراتیژیدا و لەمەشدا ئایندەی نادیاری ئێرانیان لە بەرچاوگرتبێ. ئامانجە دورو ستراتیژییەکانیان وەکو خۆی مایەوە: کوردستانی گەورە، لە چیای ئاراراتەوە لە باکور، بۆ باکوری دۆڵی دووروبار لە باشور، لە حەڵەبەوە بۆ کەنداوی فارس لە رۆژهەڵات. بەڵام ئامانجە هەنوکەییەکان، بە کورتی لە بەرنامەی حیزبدا دیاریکرا بوون و ئەمانە بوون:

١-کوردی ئێران داوای خودموختاری دەکەن لە هەموو بوارە ناوچەییەکاندا.

٢- زمانی کوردی، زمانی رەسمی دەبێت، خوێندن لە کوردستاندا بە زمانی کوردی دەبێت.

٣- پێویستە پەلە بکرێ لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کوردستاندا، کە بەپێی دەستوری ئێرانی مەسئولیەتی حوکم کردنی ناوچەکە دەگرێتە ئەستۆ.

٤- هەموو فەرمانبەرانی حکومەتی لە کوردستاندا دەبێ کورد بن.

٥- دەرامەتی گشتی کوردستان، لە ناوچەی کوردستانداو لە بوارجیا جیاکانیدا سەرف دەکرێ.

٦-حیزبی دیموکراتی کوردستان، هەموو هەوڵێکی پێویست دەدات بۆ خۆشکردنی برایەتی و دۆستایەتی لەگەڵ گەلی ئازەرو کەمە نەتەوەییەکانی تری ناوچەی کوردستان.

٧- حیزب بەڵێن دەدات کە کار بکات بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی کۆمەلایەتی و تەندروستی و رەوشی ئابوری گەلی کورد، ئەویش لە ڕێگەی پەرەپێدانی دەزگاکانی پەروەردە و تەندروستی و بازرگانی و کشتوکاڵییەوە.

لەکاتێکدا کە ئێرانییەکان بە ترس و سەرسامییەوە دەیانڕوانییە ئەم داوایانە، کوردەکان بە هەنگاوی زۆر میانەڕەویان دەزانی. هەروەها چاودێرە بیانییەکانیش پێیان وا بوو

کۆمەڵە بەم داوا میانەڕەوانەیەی دەیەوێ خۆی لە بەرگێکی دیموکراتیانەدا بنوێنێ. (ولیم نیگلتون)ی دیپلۆماتی ئەمریکی لەم بارەیەوەنوسیویەتی: "کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، ئەم شەقڵە دیموکراسیانەیەی گرتەخۆ، ئەمە خۆی لەخۆیدا گوزارشت بوو لەو پەرەسەندنەی کە بەسەر کۆمەڵەدا هات. چونکە کۆمەڵە تا ساڵێک پێشتر کۆمەڵەیەکی دەستە جەمی بوو لە قۆناغی موناقەشە کردنی تیۆری و پێشنیاز کردندا دەخولایەوە، ئەم کۆمەڵەیە گۆڕا بۆ ڕێکخراوێکی سیاسی کاریگەرو بە توانا و پشت ئەستور بەسەرکردایەتی یەکی بە توانا، گۆڕا بۆ ڕێکخراوێک کەپشت بە ئەزمون و ئامۆژگاری سۆڤیەتی ببەستێ.

بزاڤی سیاسی تازە، سەرکردەیەکی جەماوەری خۆشەویستی هەبوو، و نمونەیەک بوو لەو سەرکردانەی کە لەگەڵ قوناغی ستالینی یەتدا نەدەگونجا. ئەویش قازی محمد بوو کە شەقڵ و دەسەڵاتی شەخسی خۆی بە سەر بزاڤی نەتەوەیی کوردا کێشا. هەڵبەتە ئەمە ئەو شتە بوو کە ئەندامانی (کۆمەڵە) هەر لە سەرەتاوە لێ ی دەترسان. دیارە سۆڤیەتەکان ئەمیان پێ باشتر بوو لە کەسانی تر بۆ پۆستە تازەکەی ئامادە و پەروەردەیان دەکرد. ئەویش لە لای خۆیەوە پێ ی وا بوو کە ڕێگەی سۆڤیەتی، هەر چەندە خوارو خێچیش بنوێنێ، تاقە ڕێگەی دروستە کە لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی سەرکەوتنی گەلی کوردستان".

بەلام ئەو کۆمەکە سۆڤیەتی یەی کە قازی محمد و هاورێکانی دڵی خۆیان پێ خۆشدەکرد و بە تەمای بوون، بەو خێراییە نەگەیی کەچاوەنۆڕ دەکرا. بەلام یەکەم وەجبەی چەک زۆر بە خێرایی و بە شەو گەیی؛ بریتی بوو لە هەزار ودووسەد تفەنگی ئەڵمانی و تەقەمەنی یەکی یەکجار زۆر کە سۆڤیەتەکان لە هێزی دەرەکی ئێرانیان گرتبوو. لە سەرەتای کانونی یەکەمدا ئەو چاپخانەیەش گەیی کە باقروف گفتی دا بوو بنێرێ. ئەوە بوو زوو بە زوو چەندین بلاٶکی کوردی و لە پێش هەموویانەوە رۆژنامەی کوردستان دەستیان بە دەر چوون کرد.

ئالەم کاتەدا ڕەوشی ئازربایجانی ئێرانی زۆر بە خێرایی و بە کۆمەکی سۆڤیەتی گۆڕا: ئەوەی کە لە سەرەتای مانگی ئەیلولدا روویدا؛ بریتی بوو لە دامەزراندنی حیزبی دیوکراتی ئازربایجانی و وەدەرنانی پاشماوەی دەسەڵاتی ئێران لە پارێزگاکە، لە رۆژی ١٢/١٢/١٩٤٥دا گەیبە ئەوەی کە دامەزراندنی کۆماری ئازربایجانی خود موختار بە سەرۆکایەتی کومونیستی دەوراندیدە (جەعفەرپیشەوەری) رابگەیەنێ.

ئەوە بوو وەکو لاسایی کردنەوەی رژێمی کومونیستی سۆڤیەتی، ئەنجومەنێکی نیشتمانی بەبێ هەڵبژاردن و تەنیا لە ئەندامانی حیزبی دامەزرا. موڵکایەتی زەوی و زار هەڵوەشایەوە و فیودال ئەهێلرا، ئەمەش بووە هۆی هەلاتنی فیودال و خاوەن زەوی و

زاران و نوێنەرانی بورژوای ئێرانی بۆ تاران. هەموو بوارەکانی ژیان گۆڕانکاری سۆڤیەتیانەیان بە سەردا هێنرا؛ ئیدی هەر لە دامەزراندنی دەزگای پەرەسەندوی سانسۆرەوە بیگرە تا دەگاتە گرتنی بە کۆمەڵ و لە نێو بردن وپاکسازی و دامەزراندنی دەزگای ئاسایشی غونەیی وەک هینەکانی ستالین.

لەسەر پێداگرتنی کومونیستە ئازربایجانی یەکان و هەروەها لە سەر داوای (سۆڤیەت)ش، قازی محمد چەند نوێنەرێکی کوردی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی تەورێز نارد تا لەوێندەر نوێنەرایەتی خەڵکی کوردی ئەو پارێزگایە بکەن. بەلام نوێنەرانی کورد لە کۆی (١٠١) کورسی تەنیا پێنج کورسییان درایێ. نوێنەرانی کورد هەر لەیەکەم ساتەوە ئەوەیان بۆ روون بوەوە کە حکومەتی ئازربایجان، کە زۆر بە پەلە بوو بۆ بەلشەفاندنی ناوچەکە، بە تەما نی یە بچوکترین دەرفەت بە کورد بدات تا بەشداری دەسەلات بکەن؛ بۆیە فراکسیۆنی کورد پاش چەند رۆژێک لە ئەنجومەنی تەورێز کشانەوە و بۆ مهاباد گەڕانەوە.

بەمجۆرە، هەموو نیشانەکان ئەوەیان دەنواند کە کورد پێویستی بە ئەزمونی خودموختاری لە سایەی دەسەلاتی ئازربایجانیدا نی یە. وەکو چۆن نوێنەرەکانیش نامەیان بە خودی (باقروف)ی سەرەک وەزیران راگەیاند بوو. ئەو بیرەیان لە لا چەسپی بوو کە پێویستە لە پاڵ کۆماری ئازربایجاندا، کۆماری (کورد)ش دابمەزرێ.

# فەسڵی هەشتەم

*کۆماری یانزە مانگە*

**ئەوت و جەنگی سارد خەونی سەربەخۆیی کورد لە باردەبەن.**

دیمەنەکە هەر لەو تابلۆ بەنێو بانگە دەچوو کە (لینین)ی تێدایە و شۆڕشی ئوکتوبەری ساڵی ۱۹۱۷را دەگەیەنێت. کرێکارانی رۆژی پێشوتر لە مەیدانی چوار چرادا سەکۆیەکی دارینی گەورەیان دروستکرد بوو. سەکۆکە بە هەر سێ رەنگی سوور و سپی و کەسک، کە رەنگەکانی ئاڵای کورد بوون، رازێنرابوەوە. ئاڵای حیزبی دیموکراتی کوردستان (کۆمەڵەی جاران) بە هەر چوار دەوری مەیدانەکەدا هەڵکرابوو. شنە بایەکی هێدی ئەم ئاڵایانەی دەشەکاندەوەو لە هەموو لایەکەوە سێبەریان بە سەر مەیدانەکەدا بڵاو دەکردەوە. ئەو بەفرەی کە دوێنێ باری بوو، هێشتا لە سەر شەقام و بەسەربانی ماڵانەوە مابوو.

ئەو رۆژە،رۆژی ۱۹٤٦/۱/۲۳بوو. واتە دووەم رۆژی مانگی ریبەندانی کوردی بوو. بەڵام لە رۆژ ژمێری مێژوودا، ئەو رۆژە یەکەمرۆژی تەمەنی یەکەم کۆمارو دوا کۆماری تا ئێستای کوردە. هەزاران کەس هەر لە ئێوەڕۆوە رویان کردە ئەوێندەر: ئێدی لە خاون پیشەو فەرمانبەرو کاسبکارانی شاری مهابادەوە بیگرە تا دەگاتە میران و جەنگاوەرانی هۆزو تیرەکانی دەورو بەری مهاباد وەکو (گەورک)، (مامەش)، (مەنگوڕ) ،(هەرکی) و (بەگزادە). هەر هەموو بەکورتەک و شەرواڵ و مێزەرو دەرسۆکی خۆماڵی کوردییە هاتبوون.

بەڵام نوێنەرانی هەردوو هۆزی (شکاک) و (جەلالی) کە لە باکورەوە هاتبوون، جلەکانیان لە جلی قوقازییەکان دەچوو، بە قاپوتی لبادو سەرکڵاوی لبادەوە دیمەنێکی خەمگینیان هەبوو لە چاو دیمەنی رەنگاو رەنگی جل و بەرگی نوێنەرانی تیرە وهۆزەکانی دی دا. زۆربەی خەڵکی شار قاتی مەدەنی ئەوروپاییان لەبەر دابوو، کە بۆ بۆنە گرینگەکان لە بەریاندەکرد؛ زۆربەیان لەگەڵ چاکەتو پانتۆڵدا دەرسۆک و مێزەری کوردیان لە سەر کرد بوو، تا دیمەنێکی کوردی- ئیسلامی وەربگرن.

شاندێک لە ئەندامانی کۆمەڵە چوون بۆماڵی سەرۆکەکەیان و لە وێوە لەگەڵیدا بۆ مەیدانی چوار چرا هاتنەوە. قازی محمد جل وبەرگی تایبەتی بەم بۆنەیەوە لەبەر کرد بوو: لە تەورێز خەیاتێکی تایبەتی جل و بەرگی سەربازی راسپارد بوو کە قاتی ژەنەراڵێکی روسی بۆ بدروێ تا لەم رۆژەدا بۆ یەکەمجار لەبەریبکات. هەندێ لە هاورێکانی، ئەوانەی زۆر مەیلیان بەلای روسی دا نەبوو، داوایان لێکرد کە کڵاوی روسی لە سەر نەنێ، بۆیە لەگەڵ جلە روسییەکاندا عەمامە سپی یەکەی خۆی لە سەرنا

وەکو رەمز و هێمایەک بۆ پایە ئاینی یەکەی. ئەوجا بەر لەوەی سەر بکەوێتە سەر سەکۆیەکە، پالتۆ ئارێکەکەی داکەند. کە سەرۆکی حیزب کەوتە نوتق دان، ئاپورای خەڵکەکە کڕو بێدەنگ بوون.

قازی محمد، لە نێو ئاپورای خەڵکەکەدا هەستی بەبوونی ئاقە یەک روسی کرد. ئەو پیاوە ئەفسەرێک بوو کە راسپێردرابوو، موتابەعەی مەسەلە کوردییەکان بکات. ئەم ئەفسەرە لە سەر جێبێکی ئەمریکی یەوە چاودێری ئاهەنگەکەی دەکرد. گوتەکەی قازی محمد لە چارەکە سەعاتێک پتری نەخایاند. بە کورتی و بە روونی بۆ ئامادە بووانی ئاشکرا کرد کە کورد گەلێکە مێژوو، و زمان و رۆشنبیری تایبەتی خۆی هەیەو لە سەر خاکی خۆی، لە کوردستاندا دەژی و مافی خۆیەتی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبێ. بۆیە ئالێرەوە دامەزراندنی کۆماری مهابادی کوردی رادەگەیەنێت. سوپاسی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کرد کە وەکو نوێنەری گەلی کورد و لە بری گەلی کورد، ئەویان (قازی محمد) بە سەرۆکی ئەم کۆمارە هەڵبژاردووە.

هەر چەندە ووتەکە کورت بوو، بەڵام قازی محمد ئەوەندەی دەرفەت هێنا کە سوپاسی یەکێتی سۆڤیەت بکات بۆ ئەو کۆمەکە مەعنەوی و مادییانەی پێشکەشی کردوون؛ ئیدی چ ئەو کۆمەکەی کە وەریان گرتبوو،چ ئەوەش کە هێشتا وەریان نەگرتبوو. هەر وەها پیرۆزبایی لە برا ئازەری یەکانیش کرد بە بۆنەی سەر بە خۆییانەوە، چونکە ئەوانیش کۆمەکی چاکیان پێشکەش بەگەلی کورد کرد بوو، هەروەها چاوەڕوانی ئەوەشیان لێدەکرا لە هەر دەرفەتێکدا کۆمەکی پێویست پێشکەش بە کورد بکەن. کە قازی محمدی سەرەک کۆمار، دامەزراندنی کۆمارەکەی راگەیاند و ویستی لە نێو چەپڵە رێزانی حەشاماتی خەڵکەکەوە بێتە خوارێ، ئیدی بوو بە تەقەی خۆشی و نزیکەی سێ سەد جەنگاوەری کورد بە جارێ تەقەیان بە ئاسماندا دەکرد.

## هەمیشە لە ماڵەوە بەشی میوانە روسەکان، ڤودکا وەلاوە نرابوو

پاش ماوەیەکی کورت ئەوە دەرکەوت کە راگەیاندنی کۆماری کوردی و گفت و بەڵێنی پێشکەش کردنی یارمەتی بە برا ئازربایجانی یەکان، هێشتا زوو بووە.. وا دیارە قازی محمد، مەوعیدی راگەیاندنی کۆمارەکەی بە سۆڤیەتەکان نەگوتبوو، و بۆیە ئەوانیش (سۆڤیەتەکان) لەلای خۆیانەوە نەیانتوانی بوو هاورێکانیان لە تەورێزدا بۆ ئەم هەواڵە ئامادە بکەن، چونکە ئەم هەواڵە بەلای ئەوانەوە (ئازربایجانی یەکان) بریتی بوو لەوەی بەشێک لە خاکی کۆماری ئازربایجانی خود موختار بێتە دابڕین و دەوڵەتێکی کوردی لە سەر بێتە دامەزراندن.

نیشانەکانی نارەزایی و واتەوات دەربارەی ئەم رەفتارو کارە کوردییە بە ئاشکرا لە رووداوێکی بچکۆلەدا دەرکەوت، کە دوو هەفتە پاش ئەو کۆبوونەوە مێژووییەی

مەیدانی چوار چرا روویدا، دوو ئەندامی گەورەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە تەوریز بوون بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاروباران، دکتۆر سەمەدۆف، کە ئەفسەرێکی گەورەی سۆڤیەتی بوو، و سۆڤیەت بۆ مەبەستی خۆیان لە خەستەخانەی تەوریز وەکو پزیشک دایان نابوو، جا ئەم ئەفسەرە لێ ی پرسی بون کە بۆچی کوردان بێ ئەوەی دوا رەزامەندی سۆڤیەتی وەربگرن، سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندوە و دەوڵەتیان دامەزراندووە؟ دیارە کە قسەکانیان درێژە دەکێشێت، قسەیان لێکدی هەڵدەبەزێتەوە.

دوای چەند رۆژێک کە قازی محمد رێ ی دەکەوێتە تەوریز هەمان پرسیاری لێدەکەن. قازی محمد وەڵامی دابوەوە کە (پرماکوف) ئاگاداری تەدارەک دیتنی کوردان بووە.بە چاوی خۆی و لە سەر ئوتومبیلە کەیەوە لە دایکبونی کۆمارەکەی دیتوە. پرماکوف، بەوە خۆی پەراندەوە کە گوایە وێرای هەموو ئەوەش چرای کەسکی بۆ راگەیاندنی کۆماری نێو براو هەڵنەکردووە. بەڵام پێدەچێت جەنەراڵ (سالم ئاتاکیخوف) کە رالسپێردرا بوو سەر پەرشتی کاروباران لە کوردستاندا بکات، قەناعەتی بە بۆچونەکانی قازی محمد کردبێ یان لە موسکۆ و باکۆوە ئامۆژگاری بۆ نێردرابێ. بۆیە کەوتە بەر پەرچدانەوەی سەرۆکی تورەی ئازربایجانی و هێدی کردنەوەی و کەوتە ستایشی هەنگاوەکانی کوردان. (دیریک کینان) کە وەکو دیپلوماتێک لە (UN) کاری دەکرد و لە پەنجاکاندا بایەخێکی تایبەتی بە دۆزی کورد دەدا، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە گوایە (سالم ئاتاکیخوف) بەر لەو گفتوگۆیە و وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە، لە مۆسکۆوە بە تەلەفون رەزامەندی وەرگرتووە. ئیدی لەو دیمانەو دیدارەدا سەرۆکی تازە کورەی کورد تێگەیەنرا کە حکومەتی مهاباد ناتوانێت روو بەرووی تاران و ئازربایجان و رەنگە وولاتانی تریش بوەستێ، ئەگەر پشتیوانی زلهێزێکی نەبێ. ئاشکرایە مەبەست لەو زلهێزە یەکیەتی سۆڤیەت بوو، کە سروشتی رووداوەکانی ئەو وەختانە وایان لێدەکرد کە بێ بە تاقە زلهێزێک بتوانێ ئەو دەورە بدینێ.

قازی محمد توانی روبەروی ئەوبۆچونەی سۆڤیەت ببێتەوە کە دەیویست ناوچەی کوردستان بخرێتە ژێر دەسەڵاتی ئازربایجانی. قازی محمد بۆ ئەم مەبەستە سیاسەتێکی ئاقڵانە و هێمنی گرتە بەر، لە لایەکەوە نەیدەویست پشتیوانی سۆڤیەتی بدۆرێنێ و لەلایەکی ترەوە پشت بە هەستی نەتەوەیی خرۆشاوی مهابادی ئەو رۆژگارە، هەڵوێستی توندی نەتەوەیی دەنواندو سازشی لە سەر مەسەلە نەیەوەییەکان نەدەکرد. تابەمجۆرە توانی لە ئەنجامدا رەزامەندی سۆڤیەت بە دەست بێنێ بۆ راگەیاندنی کۆماری کوردی لە مهاباد. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی کۆماری کورد و پشتیوانە سۆڤیەتەکانی هەر رواڵەتی بوو، چونکە بۆچونی قازی محمد لەمەڕ باردۆخ و رەوشی کۆمارەکەی زۆر دوور بوو لە بۆچونی سۆڤیەتەکان و هەڵویستی گشتی یەکێتی سۆڤیەت.

کوڕەکەی قازی محمد، کە لە باسی سەفەری یەکەمی کوردەکان بۆ باکۆ، ئاماژەمان بۆ کرد، لە ساڵی ١٩٧٩ دا کە دیانەیەکم لەگەڵدا ساز دا، ئەوەی بۆ دوپات کردمەوە کە سۆڤیەتەکان میوانی نیمچە دایمی بوون لە ماڵە گەورەکەیاندا لە مهاباد: "لە وەخت و ناوەختی رۆژدا و هەندێ جاران لە نیوە شەویش دا دەهاتن و لەو ناوچەیەدا دەیانکرد بە رۆژی خۆیان، سەردەکەوتنە سەربانی خانوەکە و بە پێ دەیانکێشا بە سەربانەکەدا و بەدەنگی بەرز داوای خواردنەوەیان دەکرد. هەر چەندە بابم مەی نەدەخواردوە، بەڵام هەمیشە ڤۆدکای لە ماڵەوە هەڵگرتبوو بۆ میوانە رووسەکان".

لە شوباتی ١٩٤٦ دا یەکەم وەجبە کۆمەکی سۆڤیەت گەیی. کوردەکان پاش ئەوەی ئەو چەکانەیان وەرگرت کە لە جەندرمەی ئێرانی گیرابوون ، پێنج سەد پارچە چەکیان بەدوو وەجبە لە سوپای سۆڤیەتی وەرگرت. چەکەکان بریتی بوون لە تفەنگ و دەمانچەی سوپایی چیکی و ئەمریکی و تفەنگی رەشاش. هەروەها رادیۆیەک دانرا، لە سەعات چوارەوە تاسەعات دەی شەوێ بە زمانی کوردی بەرنامەی بڵاو دەکردەوە. ئەمە یەکەمین رادیۆ بوو کە بە زمانی کوردی پەخشی دەکرد. رادیۆی دەنگی کوردستان لە شەستەکان و هەفتاکاندا لاسایی ئەو رادیۆیەی دەکردەوە.. هەروەها سۆڤیەتەکان، کەرستەو تفاقی تەواوەتی تیپێکی موسیقایی سوپایشیان نارد، ئەم تیپە مارشی سوپایی و سروودی شۆڕشگێری کوردی لێدەدا، بە تایبەتی سرودی نەتەوەیی (ئەی رەقیب) کە یونس رەوف دڵداری شاعیر لە مهابادا داینا بوو.. هەروەها ئامێرە موسیقی یە سۆڤیەتی یەکان؛ ئاوازی خۆیان لە رادیۆ و بۆنە رەسمی یەکان و نمایشەکانی سوپای کوردی تازە دامەزراودا لێدەدا.

## ئەقیب سەلاحەدین قسموف مەشق بە سوپای کورد دەکات

قازی محمد، لەو ماوەیەدا لە دامەزراندنی وەزارەتەکەی بوەوە. (سیف الدین)ی برای کرا بە وەزیری بەرگری بە حوکمی ئەوەی کە تا ئاخرو ئۆخری دووەم جەنگی جیهانیش ئەفسەرێکی گەورە بوو لە (دەرەک)ی ئێرانیدا. هەر چەندە مەبەست لە دامەزراندنی ئەم وەزارەتە تەنیا ئەوە نەبوو کە ببێ بە دەزگایەکی سوپایی چالاکی ئەوتۆ کە بەرگری لە سنوری کۆمارەکە بکات دژی زێدەگاڤی یە چاوەڕوانکراوەکانی ئێران، بەڵکو بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوە بوو کە ببێ بە بناغەی دەزگایەکی کارگێری (اداری) ئەوتۆ کە پشتی پێ ببەسترێ بۆ دابین کردنی هاوسەنگی ناوخۆ. و بریکاری ئەو هێزە بێ کە خێڵە جەنگاوەرەکان هەیان بوو، و پشتیان پێنەدەبەسترا. لەبەر ئەم هۆیە قازی محمد، (سیف الدین)ی برای خۆی کرد بە وەزیری بەرگری و بەخۆیشی بەشداری لە هەڵبژاردنی فەرماندە و ئەفسەرەکانی سوپای کوردیدا کرد. ئەوە بوو تێکەڵەیەکی سەیر لە حەفتا ئەفسەرو دەرەجەدار دامەزرێنران تا ناوەندی سەرکردایەتی سوپا پێک بهێنن. ئەرکی ئەم سەرکردایەتی یە ئەوە بوو کە رێبەرایەتی ئەو هێزە سوپاییە بکات کە قەرار بوو

وەکو سەرەتا لە (١٢٠٠) سەرباز پێک بێت. کۆماری مهاباد لە مەسەلەی ئەفسەراندا دەیتوانی پشت بەو دە ئەفسەرە گەنجە ببەستێ کە بە هۆی هەڵوێستی نەتەوەییانەوە لە سوپای عێراقی هەڵاتبوون و تازە پەیوەندییان بە کۆمارە ساواکەی مهابادەوە کردبوو، ئەمانە ئەفسەری راستەقینە بوون لە سوپای عێراقیدا، بەڵام قازی محمد و دەوروبەرەکەی لەبری ئەوە هەستان زۆربەی ئەفسەرەکانیان لە کەسانی باوەڕپێکراوی بنەماڵەکانی مهاباد دامەزراند.

لە مانگی ئازاردا راوێژکاری سوپایی سۆڤیەتی، ئەقیب (سەلاحەدین قاسموف) گەیشتە مهاباد، تا کادری پێویست بۆ سوپای کوردی مەشق دابدات و پێ بگەیەنێت. ئەم ئەفسەرە گەنجە لە کوردەکانی یەکێتی ی سۆڤیەت بوو. کۆماری کوردی پلەی سەرهەنگی داپێ، کەچی پێیان دەگوت [illegible] ئاغا. دامەزراندنی ئەو سوپابچکۆلەیە هەر هەموو وەرزی بەهاری خایاند، لەو ماوەیەدا مەشقێکی یەکجار بەزەبرو توندیان پێ کرا کە بریتی بوو لە مەشقی دوئێل (مبارزە) و بەکار هێنانی تفەنگ و چەکی رەشاش و نارنجۆکی دەستی.. هەروەها ژمارەیەک سەرباز مەشقی شوفێرییان پێکرا بۆ هاژۆتنی ئەو ئوتومبیل و زرێپۆشانەی کە سۆڤیەت ناردبوویانن.

مرۆڤ زۆر بە ئاسانی و هەر بە تەمەشا کردنێکی رەوتەنی ئەو کۆمەکانەی کەسۆڤیەت پێشکەش بە کۆمارەکەیان کرد بوو، دەیتوانی دیدو بۆ چونی سۆڤیەت سەبارەت بەو کۆمارەی کە بە رەزامەندی خۆیان هاتە دامەزراندن، بزانێت، بۆ وێنە کۆمەکەکە بریتی بوولە: دە ئوتومبیلی سۆڤیەتی، دە ئوتومبیلی ئەمریکی، دەجێب قیادە، کە ئەمە بە هەمووی نەیدەکردە تاقە دڵۆپێک لەو دەریا کۆمەکەی کە ئەمریکا لە ماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا بۆ سۆڤیەتی هەڵرشت، کوردەکان لە سەفەری دووەمیاندا بۆ باکۆ لیستێکی چەکی قورسیان پێشکەش کرد، لێ ئەو چەکە قورسانە ئێستاشی لەگەڵ بێ نەگەیشتنە دەستی کوردان. نە ئەو تانکانەی کە( باقروف)ی سەرەک وەزیران گفتی دا بوو بۆ مهابادیان بنێرێ و نەتۆپەکان. تەنانەت ئەو چەکە دژە تانکانەش کە سۆڤیەتەکان دەیانگوت ناردویانن، وەختێ گەیشتنە جێ، بریتی بوون لە قونبەلەی مولوتوف نەک چەکی دژە تانک. دیارە سوپاییە کوردەکان بەمە زۆر تووڕەو نائومێد بوون. سۆڤیەتەکانیش، هەرچەندە کوردەکان داوای کۆمەکی سوپایی زیاتریان دەکرد یان داوایان لێدەکرد بەلای کەمەوە بەڵێنەکانی پێشویان بێننە دی، ئەوا بەڵێنی چەوری تازەیان دەدا و هیچ ی دی..

هیچ جۆرە کۆمەکێکی دارایی نەنێردرا، ئەو داوایەش جێ بەجێ نەکرا؛ کە کوردەکان لێکدا لێکدا داوایان دەکرد رادیویەکی بەهێزی ئەوتۆیان بۆ بنێرن کە کوردی عێراق و تورکیاش بتوانن بەرنامەکانی وەربگرن و گوێیان لێ ی ببێ. ئەم هێمایانە ئەوە دەگەیەنن کە سۆڤیەتەکان ئەو گەرم و گوڕییەی جارانیان لەمەڕ ئەزموونی کوردی ئەماو

ئەو جۆشو خرۆشەی هەوڵیان دامرکایەوەو وەستا. هەر چەندە ئەوە شتێکی ئاشکرا و دیار بوو، بەڵام قازی محمد و ئەندامانی حکومەتەکەی ئەمەیان بە هەند وەرنەگرت و بەو ئاماژەیەیان نەزانی کە ئاینده و چارەنوسی کۆماری کورد دیاری دەکات.

## کاریگەرییەکی ناخۆش و وەروخێن

ئیدی مهاباد بەرە بەرە بوو بە مەڵبەندی سەرلەبەری بزافی رزگاریخوازی کوردی، بوو بەو مەڵبەندەی زۆر هێز و رێبازی فیکری کوردی رووی تێبکەن. لە چیاکانەوە میرو سەرەک خێڵەکان بەخۆو جەنگاوەرانیانەوە پەیوەندییان پێوە کرد. زۆری نەبرد دوانزە هەزار جەنگاوەر لە دەوری مهاباد خڕکرایەوە، بە تایبەتی لە باشوری شاردا و لە نزیکی سنوری ئێرانی خەنیم دا. هێزەکەی هۆزی شکاک بە سەرکردایەتی تاهیر خانی کوڕی سەرکردەی ئەفسانەیی، سمکۆ لە هەزار و سێ سەد سوارە پێک هاتبوو. لقە جیاوازەکانی هۆزی هەرکی-ش هەزار سوارەو حەوت سەد پیادەیان نارد بوو. حەمە رشیدی جەنگاوەری دەورانديدەش کە چەند ساڵێک پێشتر لە ناوچەکانی سەقز وبانەدا شەڕی ئێرانی یەکانی کرد بوو، بەخۆ و سێ سەد جەنگاوەروە پەیوەندی بە کۆماری کوردەوە کرد. ئیدی کۆمار لە نێوان خۆی و هێزی هەر خێڵێک دا ئەفسەرێکی پەیوەندی دامەزراند. مهاباد ئازوقە و خۆراکی هەموو ئەو جەنگاوەرو خێڵەکیانەی دابین دەکرد.

توانای شەڕ کردنی ئەم هێزانە لە هۆزێکەوە بۆ هۆزێکی دی جیاواز بوو، لەکاتێکدا کە هەندێ لەم خێلانە شێوازی شەڕی خۆی بە جۆرێک گۆڕی بوو کە دەیتوانی زیانی گەورە بە دژمن بگەیەنێ، هەندێ خێڵی دی لە سەر هەمان شێوازی شەڕی سوارچاکی کە زۆر جاران گەڕیدە رۆژاواییەکان ستایشیان کرد بوو، و شەقڵێکی شاعیرانەو رۆمانسیانەیان پێدا بوو، مابوونەوەو چ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتبوو. دیارە سوارە وسوارچاکانی کورد بە نێوبانگ بوون لەم جۆرە شەڕانەداو زۆر بە توانا بوون لە بەکار هێنانی رم و سەرەنێزان دا بە رادەیەک کە زۆر جاران سەرکەوتنی گەورەیان بە سەر سوپای نیزامیدا بە دەست هێنا بوو. بەڵام داهاتنی تفەنگی ئوتوماتیکی و دەوری گرینگی لە پاراستنی هێزەکانی پیادە لە ساڵانی دوایی سەدەی رابردوودا، وایکرد کە سوارەی کورد ئەو باڵا دەستییەی جارانیان بە سەر دژمنی خۆدا نەمێنێ. لەبەر ئەوەی هەندێ هۆزو خێڵ هێشتا تازە لە هەوڵی فێر بوونی شێوازی تازەی شەڕدا بوون، یان هێشتا بە شێوەی پراتیکی مومارەسەیان نەکرد بوو، بۆیە کۆمارە ساواکەی کورد لە سەری بوو، بایەخی زۆر بە دامەزراندنی سوپایەکی هاو چەرخ بدات کە زەبت و رەبتی تێدا بێت و سەرکردایەتییەکی کارامەی وەهای هەبێ کە بتوانێت سەرکەوتن بە دەست بێنێ، پاش ئەوەی ئەو سەردەمە بە سەر چوو تەنیا سوار چاکی و ئازایەتی بتوانێ سەرکەوتن و باڵا دەستی سوپایی مسۆگەر بکەن. مێژونوسی ئێرانی (حسن ارفع) کە

بە خۆی سەرکردایەتی چەندین هێرشی سەرکوتکاری شۆڕشەکانی کردوە لە ساڵانی ١٩٢٠و ١٩٤٠دا، لە یاداشتنامەکانیدا زۆر بە دورو درێژی و بە ستایشەوە باسی چۆنیەتی شەڕی کوردی کردوەو نوسیویەتی: "هەرچەندە زۆربەی جەنگاوەرانی کورد بە سواری ئەسپی کوردی توندو تۆڵ هێرش دەکەن، بەڵام شێوازیان یەکجار دورە لە شێوازی ئاسایی سوارچاکان کە بە پلەی یەکەم پشت بەڕم و نێزە و شمشێر دەبەستێت، چونکە سوارەی کورد هەوڵدەدەن بە چەکی سپییەوە بێنە مەیدان و بە خەنجەران کە زۆر لێهاتوانەوە عەمەلی دێن بە خێراییەکی سەر سوڕ هێنەری وەها کە تەواو لە دژمنیان نزیک دەکاتەوە هێرشی دێن، ئەوسا لە ئەسپەکانیان دادەبەزن و بە دەمانچەو تفەنگەکانیان دەکەونە شەڕ".

زۆر جار، دوو سوار سواری یەک ئەسپ دەبن، یەکێکیان لە ڕێگە دادەبەزێ و دەکەوێتە ئەم سەنگەرو ئەو سەنگەرو بەو شێوەیە دەکەوێتە مژولکرنی هێزەکانمان، بەمجۆرە سوارچاکی دووەم دەپارێزێ کە بەپەلە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە تا سوارچاکێکی دی لەگەڵ خۆیدا بێنێ کە ئەویش هەمان کاری سوارچاکی یەکەم دووبارە دەکاتەوە. ئەوانەی بەو جۆرە بۆ نزیکترین شوێنی سەنگەرەکانی ئێمە دەگوازرانەوە، کوێرانە دەکەوتنە تەقە کردن لە ئێمەو سەنگەر گۆڕکێیان دەکرد و بەمەش ترسییان دەخستە دڵی سەربازەکانمانەوە. ئەم تاکتیکەیان بریتی بوو لەگرتنی هەموو گردو بەرزاییەکانی دەوروبەری سەنگەرەکانی دژمنەکەیان، ئەوجا بازنەی گەمارۆکەیان بەرە بەرە تەنگ دەکردەوە تا رادەیەک کە بتوانن دژمنەکەیان لە نێو بەرن یان ناچاری بکەن کە خۆ بە دەستەوە بدەن".

"هەر چەندە من لە ساڵانی ١٩٢١دا و ١٩٢٢دا شەڕی (شکاک)م کردوە، لە ساڵی ١٩٤٧دا شەڕی (مریغای)م کردوە لە ساڵی ١٩٤٥دا شەڕی (حەمە رشید)م کردووە؛ بەڵام یەکەمجار کە لە ناوجەرگەی هێرشێکی کوردیدا خۆم بینی یەوە، رۆژی ١٩٢٢/٧/٢٤ بوو، ئەویش لە کاتی چەند هێرشێکی نائومێدانەدا بوو بۆ سەر کەتیبەیەکی پیادەی پەهلەوی. کوردەکان بەدەم هێرشەوە هاوارێکیان دەکرد کە هەر لە هاواری عەزمبەکانی جەزایر دەچوو کاتێ کە هێرشیان بۆ فەرەنسییەکان دەبرد.. خۆ کە شەڕ لە گوندو بارەگاکان نزیک دەبوەوە، ژنانیش هەمان هاواریان دەکرد (هۆی هۆی). ئەلهەقی ئەم هاوارانە زۆر ناخۆش و ورە روخێنن بوون".

### کۆمەک لە عێراقی دراسێوە

سوپای کورد لە دوانزە هەزارکەس پێک هاتبوو، هێزەکەی مەلامستەفای بارزانی لە هەموو هێزەکانی دی بەزەبت و رەبت تر و پر ئەزمون و خۆراگرتر بوو لە مەیدانی شەڕدا، روداوەکانی دواتریش دروستی ئەم بۆ چونەیان سەلماند. مەلا مستەفا بارزانی

که بەراستی بە چاکترین سەرکردەی سوپای کوردو بلیمەتی ئەو مەیدانە دێتە ژماردن، یەکێک بوو لە سیاسیە زیرەک و ڵیهاتوەکانی نێو کوردی عێراق، ئەم پیاوە لە ناوچەی بارزانی نزیکی ئێران شۆڕشی دژی حکومەتی عێراق و هاوپەیانە ئینگلیزەکانی بەرپا کرد. زۆر جار شەڕی هێزی نیزامی حکومەتی عێراقی کرد بوو، بەمەش شارەزاییەکی باشی لە شەڕدا پەیدا کرد بوو. دوا شۆڕشی ئەوە بوو کە لە مانگی ١٩٤٥/٤دا هەڵایسا وتا مانگی ئەیلولی خایاند و ناچار بوو پاشەکشە بکات و لە بەردەم هێزی عێراقی باڵا دەست بە سەر جەنگاوەرانی دلێری بارزانی دا، بگەڕێتەوە، چونکە هێزی عێراق لەروی تەکنولۆژیاوە زۆر باڵا دەست تر بوو لە جەنگاوەرانی دلێری بارزانی. بەتایبەتی دوای بەشداریکردنی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە شەڕەکاندا و بۆردومانکردنی دڕندانەی سەنگەرو گوندی کوردەکان.

بارزانی، لەو پاشەکشەیدا، خۆی لە ناوچە کوردییەکانی تورکیا نەدا، چونکە شارەزای سوپای تورک بوو، و ئاگاداری ئەو هەموو رق و کەرب و کینەش بووکە ئەم سوپایە لە کوردی هەڵگرتبوو و چارەنوسی دەرفەتێک بوو بۆ لێدانی کورد. هەروەها بڵاو بوونەوەی هەواڵی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی لە مهاباداو رزگار بوونی ناوچەیەک لە دەسەڵاتی ئێرانی و بەریتانی لە کوردستانی ئێران دا، مەلامستەفای بۆ ئەوێندەر راکێشا. بارزانی تامەزرۆی هەر دەرفەتێک بوو تا لە رووی سیاسییەوە بە دیار بکەوێ و توانای سوپایی و فەرماندەیی خۆی بنوێنێ، ئەمەش هۆیەک بوو بۆ بڕیاردانی یەکجارەکی: بارزانی بڕیاریدا لە سنوری ئێران بپەڕێتەوە، سێ هەزار جەنگاوەری لەگەڵدا بوو، پتر لە هەزار و دووسەد کەس لەوانە شەڕکەرو جەنگاوەری یەکجار بەتوانا و گوێ رایەڵی شەخسی فەرمانەکانی بارزانی بوون. ژمارەی یاوەرانی بارزانی گەییە پتر لە دوانزە هەزارکەس.

زۆربەی جەنگاوەرەکان ماڵ و منداڵی خۆیان لەگەڵ خۆدا هێنابوو، و لە کاتێکی باشدا، واتا بەر لە دەستپێکردنی وەرزی زستان کە نیدی ج حەرەکەیەک لەو ناوچە شاخاوەی یە سەختەدا نامێنی، پەڕی بوونەوە. گەلێک لەو ئەفسەرانەش کە پەیوەندییان بە بارزانی یەوە کرد بوو، بەگەڵی کەوتن و هاتنە ئێرانەوە. دیارترینیان نەقیب عبدالعزیز گەیلانی بوو، کە کوڕی گەورەی میری کورد شێخ عبداللا بوو، شێخ عبداللا یەکێک بوو لە دیارترین، و بە دەسەڵاترین سەرانی کوردی عێراق. بگرە بنەماڵەی عبداللا سەرکردەی راستەقینەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد بوون بەر لە دەرکەوتنی قازی محمد لە شانۆی روداوەکان. لە ترسی ئەوەی نەبادا کێشەی رێبەرایەتی بکەوێتە نێوان ئەم دوو بنەماڵە هەڵرکەوە، سۆڤیەتەکان چارەسەرێکی زیرەکانەیان بۆ ئەم مەسەلەیە دۆزییەوە: ئەوە بوو هەرکە نەقیب عبدالعزیز لەگەڵ بارزانییدا گەییە مهاباد، روسەکان ناردیان بۆ خوێندنی سوپایی لە یەکێک لە ئەکادیمیا سوپاییەکانی سۆڤیەت. بەمە ئەو

پیاوەیان لە ناوەندی رووداوەکان دور خستەوە و ( قازی محمد ) یان لە گیرو گرفتی ئەو رزگار کرد.

سۆڤیەتەکان لە لایەکی ترەوە بە وەرگرتنی ئەم خوێندکارە سوپاییە نێوداره، ئەوەیان بۆ خۆ مسۆگەر کرد کە ئەگەر زروف بخوازێ لە کاتێ پێویست داو لە رێگەی ئەوەوە گوشار بخەنە سەر بابی. سۆڤیەتەکان لە هەمان کاتدا هەوڵیان دەدا کە بارزانی بە خێرایی دەسەلاتی سیاسی پەیدا نەکات، چونکە چاک دەیانزانی کە کەسایەتییەکی بە هێزە و کەڵکەڵەی رێبەرایەتی لە سەردایە. تەنانەت باقروف-ش لە دوا سەفەری سەرانی کوردا بۆ باکۆ، بە خەباسەتەوە ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە دەکات و دەڵێ ئەگەری ئەوە هەیە کە بارزانی لەسەر داوای بەریتانییەکان بۆ ئێران هاتبێ و بیەوێ ئەزمونی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردان تێک بدات و ویستی بەریتانییەکان بە جێ بێنێ.. لەم دوو نمونەیەوە ئەوەمان بۆ بەدیار دەکەوێ کە سۆڤیەتەکان لەم بۆنەیەدا هەمان شێوازی نامەردانەو نزم و زیرەکانەیان بە کار هێناوە کە دەوڵەتە گەورەکان لە مامەڵە کردنیاندا لەگەڵ ئەو بابەتانەدا کە پەیوەستە بە بەرژەوەندی زیندوی گەلانی بچوکەوە، پەیڕەوی دەکەن. واتا هەر لە هەوەڵەوە جم و جوڵی هەر هەموو سەربازەکانی شەترەنجی ئەم گەمە پەیوەستەیان بەئەزمونی کوردەوە لە مهابادا، دیاری کرد بوو.

بەلام یەکێک لەو سەربازە کوردانە، کەسایەتییەکی بەزکماک زیرەک و سەرناس بوو، توانایەکی زۆر گەورەی هەبوو لە دەرک کردنی رەوتی کاروباران و شیکردنەوەیان و وەرگرتنی هەڵوێستی راست و دروست دەربارەیان. هەر هەموو ئەوانەی لەم قۆناغە کۆڵیونەتەوە و واقیعیانە هەڵیانسەنگاندوە هەستیان بەوە کردوە کە ئەو کەسایەتی یە دەیروانی یە رووداوەکان و چاوەنۆڕی دەرفەتی گونجاوی کردوە تا دەسەلات و توانای رێبەرایەتی خۆی بنوێنێ. ئاشکراشە بارزانی، لەم رووەوە گرەوی لە سەر دەوری سۆڤیەتەکانیش کردووە. هەر کە گەییوەتە مهاباد، بە بەردەوامی هاتوچۆی ئەفسەرو راوێژکارە سۆڤیەتەکانی کردووە، لە چەندین دیداردا لەگەڵ ئەفسەرانی سۆڤیەتیدا، هەوڵی داوە ئەوەیان بۆ بسەلمێنێ کە هەر ئەو کوڕی رۆژە و پێویستە پشتیوانی لێ بێتە کرن و متمانەی پێبکرێ و چاوەنۆڕی دەستکەوتی لێبکرێ. بارزانی زۆر بە توندی لە رووی هەموو ئەو کەسانە وەستایەوە کە ناقایل بوون بەوەی پەیمانێکی توندو تۆڵ لەگەڵ سۆڤیەتدا هەبێ: بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوە بوو کە تەنێ سۆڤیەت دەتوانن مانەوەی کۆمارەکە دا بین بکەن یان هەوڵی لە نێودانی بدەن، هەرگیز بەو هەنجەتانە قایل نەبوو کە دەیانگوت لە حاڵەتی پەیمانی نێوان کورد و سۆڤیەتدا، ئەمریکا و ئینگلتەرا دەستەو ئەژنۆ دانانیشن.. بەلام دوای چەند مانگێک. پاش لە دەست چوونی دەرفەتان، ماهیەتی ئەو یاسایانەی دەرک کرد کە بوون و مانەوەی کۆماری (کوردی) یان دیاریدە کرد.

بارزانی یەکێک بوو لەو چوار کەسەی کە کۆماری کوردی لە سوپای خۆیدا، پلەی جەنەراڵی دانێ. لەناوەندی شاردا خانویەکیان بۆ کرد بە بارەگاو تا رۆژگاری ئەمرۆش ماوە و لەم دواییانەدا کرا بە ئوتێل. لە ساڵی ۱۹۹۷دا رێزدار (جعفر عبدالجواد)ی خاوەنی ئەم خانووەم بینی و بەدەم گێرانەوەی بیرەوەرییانی خۆی سەبارەت بەو رۆژانە گوتی: "دیمەن و رواڵەتی بارزانییەکان زۆر جیاواز بوو لە دیمەن و رواڵەتی کوردی مهاباد. زۆرمتمانەیان بە خۆ هەبوو، زۆر متمانەیان بە سەرکەوتن هەبوو، چ ترسێکیان لەمەڕ ئەوە نەبوو کە ئایندە چی بێ یە و چی پێدەبێ. هەرچەندە زۆر چاک دەیانزانی کە هەڵبژاردەی سوپای کۆمارن و لە هەموو هێزەکانی دی بە تواناتر و پڕ ئەزموونترن، بەلام ئێمە هیچ جۆرە لە خۆبایی بوونێکمان لێ نەدەبینین".

بارزانی، رەزامەندی قازی محەمەدی وەرگرت تا بەشێک لە هێزەکەی لە نزیکی مهابادا بهێڵێتەوە، نزیکەی هەزار جەنگاوەری کوێزایەڵی فەرمانەکانی خودی بارزانی لە ناو مهاباد جێگیر بوون، ئیدی باقی هێزەکەو خێزانەکانیان دابەشکران بە سەرگوندەکانی باشورو رۆژاوای مەهابادا. بنەماڵەی بارزانی لە شارۆچکەی نەغەدەدا جێگیر بوون. کە ئەوساکە چ بایەخێکی نەبوو، کەچی رۆژگار وای هانی کە ئەم شاروچکەیە دەورێکی دی لە مێژوی بنەماڵەی بارزانیدا بدینێ: ئەویش ئەوە بوو بارزانی ناچار بوو پاش سی ساڵ لەو مێژووە، خۆی و خێزانەکەی و ژمارەیەک لە یاوەرانی لە ساڵی ۱۹۷۵دا وپاش داروخانی شۆڕشی ۹۷٥/۹۷٤ لەو شارۆچکەیەدا نیشتە جێ بێن.. پاش ئەوەی هنری کسینجر و ریچارد نیکسون بە شێوەیەکی حەیابەرانە لە بەڵێنە درۆکانی خۆیان ژێوان بوونەوە پشتیان کردە بزاڤی کوردی. لە ساڵی ۱۹۷٥ لە نەغەدە دیمانەیەکی رۆژنامەوانیم لەگەڵ بارزانی دا کرد، رەنگە ئەم دیمانەیەی من دوا دیمانەی رۆژنامەوانێکی بێگانە بووبێ لەگەڵیدا، بەر لەوەی بە نەخۆشی شێرپەنجە بمرێ. هەستم کرد هەموو ئاواتێکی ئەوەیە، پاش پتر لە نیو سەدە رێبەریکردنی شەڕی پارتیزانی دژی عێراقی یەکان و تورکەکان، کە بتوانێ لە نوێوە دەست بەشۆڕش بکاتەوە.

## پەیوڕانی شەڕی شاخ

لەئەنجامی مەشقی بەردەوام و چروپرو هەنگاونانی گورج و گۆڵ لە باری رێکخستنەوە، لەمانگی ئازاری ۱۹٤٦ دا سوپای کۆماری کوردی بەیەکجارەکی هاتە دامەزراندن و لە دایک بوو. زۆربەی سەرانی کورد لەو رۆژانەدا لە مهاباد خڕ بوو بوونەوە. بارزانی لە هەر هەموویان بەجۆشتر بوو بۆ شەڕ، حەجمانی لەبەر برابوو، و بۆ دەرفەتێک دەگەڕا کە توانای سوپایی خۆی بنوێنی.

بارزانی یەکانیش تینوی پێکادان بوون لەگەڵ سوپای ئێرانیدا کە هێزەکانی لەسەر سنوری باشوری دەوڵەتی کوردی، لە سەقزو سەردەشت و بانەدا خڕکرد بوەوە و دەیویست لەوێوە لەشکرو تۆشەن بکاتە سەر خاکی کوردان.

کوردەکانی لە لای خۆیانەوە باسی پێشڕەوییان بۆ باشور دەکرد؛ تا ئەو خێڵ وهۆزە کوردانەی پارێزگای کرمانشا، کە هێشتا لە بن دەسەڵاتی ئێرانییەکاندا بوون، رزگار بکەن. هەروەها باسی ئەگەری پەلاماردانی خودی کرماشانیان دەکرد تابەزەبری چەک ئەو ناوچانەش بخەنە سەر کۆماری کوردی. کە دوو کەتیبە هێزی سوپای ئێرانی بەرەو سەقز کەوتە پێشڕەوی، بارزانییەکان بۆسەیکیان بۆ نایەوەو چاوەڕوانیان کرد تا بکەوێتە بۆسەکەوە ولێ ی بدەن. بارزانی یەکان بە حوکمی ئەزموونی زۆریان لە شەڕی هێزەکانی عێراق و تورکیا کە چەندین ساڵی خایاند بوو، شارەزاییەکی زۆریان لە بواری ئەو جۆرە شەڕانەدا پەیدا کرد بوو.

(پسپۆڕانی شەڕی شاخ)، ئەمە ئەو ناوە بوو کە رێزدار (روان روبسن)ی حاکمی عەسکەری عێراق لە سەردەمی إنتدابی بەریتانیدا لە بارزانی یەکانی نابوو. جا ئەو پسپۆڕانەی شەڕی شاخ هێندە بە سەبرو حەوسەڵە بوون دەیانتوانی یەک رۆژی تەواو بێ ئەوەی جوڵەبکەن لە ناو سەنگەرەکانیاندا بمێننەوە. تا هێزی دژمن بە تەواوەتی بکەوێتە بۆسەکەیانەوە ودڵنیا ببن لەوەی کە شوێنەکەیان قایە و پشتیان بەتاڵ نییە، ئەوجا پەلاماری بدەن؛ بۆیە زەرەری گیانیان یەکجار کەم دەبوو. یەکێک لە ئامیر بەتالیۆنەکانی حەوزی رەواندوز، پاش تێپەڕ بوونی چەندین ساڵ بە سەر ئەو رووداوەدا بۆی گێرامەوە کە "نهێنی شەڕەکانمان لەوەدایە کە هەوڵدەدەین خەسارەتمان کەم بێ".

نۆرەی (فورس)ش هات، کە بەلەز نێردرا بوون تا لە نزیکەوەو بە چاوی خۆیان لەو رۆژەی مانگی نیسانی ١٩٤٦دا ئەو نهێنی یە بدیەن و بە دەستی بارزانی یەکان تالآو بنۆشن. کاتێ هێزی ئێرانی گەییە (گەوهەر ئاوا) سەیریان کرد دنیا کرو کپەو چ شتێک لە گۆڕێ نییە، ئەمە تەماحی خستنە بەر کە پشویەک بدەن، بە تایبەتی ماوەیەکی زۆر بە پای پیادە هاتبوون و شەکەت بوو بوون. ئیدی بارزانی یەکان بە بێ خشپە لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردە سەرو خەسارەتێکی یەکجار گەورەیان لێداو ناچاریان کرد بە پەلەپروزێ و سەر لێ شێواوی بەرەو سەقز پاشەکشە بکات. دیپلۆماتی ئەمریکی (دیریک کینان) بە تەوسەوە باسی ئەو شەڕە دەکات و دەڵێ :"بارزانی یەکان فەرمانیان بە هێزی ئێران دا کە بەرەو دوا بروات".

هێزێکی تری (ئێرانی)ش بە سەرکردایەتی نەقیب (خەسرەوی) کە کوڕەی خەڵکی سننە بوو، تووشی هەمان چارە نووس بوو؛ کاتێ کە لە رۆژی ١٩٤٦/٥/٢٠دا ویستی هێزێکی بارزانییەکان راوبنێ، بارزانی یەکان بۆسەیەکیان بۆ نایەوەو بە دژە هێرشێکی لەنکاودا غافڵگیریان کرد و زەرەرو زیانێکی گەورەیان لە ئێرانییەکان داو نەقیب (خەسرەوی) بە خۆیشی لە مەیدانی شەڕەکەدا کوژرا. ئیگلتون، کە لە مهاباد و دەورو بەریدا چاودێری رووداوەکانی دەکرد، نوسیویەتی کە: "ئەم رووداوە هەتەرەشی ئێرانییەکانی برد و ورەیان بێ ئەماو بە جارێ ئەترەیان بەردا" ئێرانی یەکان هێزێکی

سوپایی پێنج هەزار کەسییان بە پشتیوانی تانک و تۆپ و فڕۆکە و بەسەرکردایەتی خودی (ڕەزم ئارا)ی سوپا سالاری ئەو وەخت، ئامادەو تەیار کرد. هێزی کوردیش خۆی لە سێزدە هەزار کەسێک دەدا کە لە خەلکی عەشایەر پێک هاتبوون و لە نێوان سەقزو سنوری عێراقدا خڕ ببوونەوە و هێزی تایبەتی بارزانی یەکانیشیان لەگەلدا بوو؛ کە خەلکەکە بە هەلبژاردەی هێزی کوردیان دەزانین، چەکی هێزی کورد تەنیا چەکی سووک و چەند سووکە تۆپێک بوو. هێزی کورد تاقە یەک چەکی دژە تانک و دژە فڕۆکەیان نەبوو.. بۆیان دەرکەوت کە ئەو چەکەی (دۆستە سۆڤیەتەکان) بە ناوی چەکی دژە تانکەوە بۆیان ناردوون، قونبەلی مولوتوف بوو.

لەگەل ئەمەشدا، ڕەوش و بارو دۆخەکە ئالۆز بوو، چ کەسێک ئەنجام و ئاکامی شەڕەکەی بۆ پێشبینی نەدەکرا. ئێرانی یەکان لە سەرەتاوە هەولیاندەدا وا بنوێنن کە گوایە حەزیان بە چارەسەرێکی ئاشتیانەیە، هەر چەندە ئەو ئەگەرەش لەسەر زاران بوو کە گوایە ئێران یەکان بە فێل و دەهۆن و دەیانەوێ دەرفەتی پتر وەدەست بێنن تا بتوانن دەسەلاتی خۆیان بۆ هەموو ناوچەکان بگەڕێننەوە، بە تایبەتی دوای کۆتایی دووەم جەنگی جیهانی و سالانی داگیرکاری بەریتانی و سۆڤیەتی. ئیدی ئەو هۆیانە هەر چییەک بن کە ئێرانییەکانیان هاندەدا ڕێگەی ئاشتی بگرنەبەر، (ڕەزم ئارا) پێشنیازی کرد کە لیژنەیەکی کوردی- ئازربایجانی هاوبەش بنێردرێ بۆ بانە تاگفتوگوی لەگەلدا بکات دەربارەی ئەوەی کە ڕێگەی ناردنی ئازوقە و پێداویستی سوپایی بۆ سەربازخانەی بانە نەیەتەگرتن و ئەو ڕێگەیە کراوەبێ.

هەرچەندە سەرۆکی شاندی کوردی بەر لە چەند ڕۆژێک گفتی نەگرتنی ڕێگەکەی دابوو، لێ ئێرانی یەکان زۆریان دل پێوە بوو بەلێننامەیەکی نوسراویان لەو بارەیەوە دەستبکەوێ.. بەلێنی ئەوەشیان دا کە ڕێگە بدەن لیژنەیەکی کوردی بە شێوەیەکی بەردەوام لە شاری بانەدا هەبێ، ئەگەر کوردەکان بەلێنی ئەوە بدەن کە هێزەکانیان بەرنە دوری سێ کیلۆمەتری باکوری شارو دوری چوار کیلومەتری ڕێگەی ئازوقەی سەربازخانەی بانە.

بەلام ئەندامانی شاندی کوردیش لە لایەن خۆیانەوە پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەو بەلێننامەیە ڕاستەوخۆ لە لایەن حکومەتەکەیانەوە لە مهاباد، پەسند بکرێ، چونکە ئەمەیان بەجۆرە دان پێدانانێکی ڕاستەوخۆی ئێرانی یەکان، بە حکومەتی کوردی مهاباد دەزانی. نابەمجورە پێشڕەوی هەردوو هێزەکە ڕاگیرا. هەروەها ئەو هێرشە کوردییەش کە نەخشەی بۆ دانرابوو بەرەو باشور بکرێ، بە فەرمانی سەرکردایەتی ڕاگیرا، هەرچەندە بارزانی زۆر پێ ی لە سەر زەرورەتی دەستپێکردنی هێرشەکە داگرت.

## کۆماری مهاباد... وولاتێکی نموونەیی بوو؟

پایتەختی کۆماری کوردی،لەو ماوەیەدا شان بە شانی کۆماردکە گەشەی سەندو پەرسەندنێکی باشی بە خۆوە بینی، واتە رێک بە پێچەوانەی کۆماری ئازربایجانی دراوسێیانەوە،کە بە ئاشکرا روالەت و شەقلی ستالینی یەتی پێوە دیار بوو. لە کاتێکدا کەش و هەوای ئازربایجان، کەش و هەوای مولکایەتی گشتی بوو،

حوکمی پۆلیس و تیرۆری فیکری زال بوو، مهاباد لەوکاتانەدا بۆیەکەمجار بوژانەوەی ئابوری و ئازادییەکی سیاسی ئەوتۆی بە خۆوە بینی کە ئەم گەلە لە هیچ قۆناغێکی مێژووی دورودرێژی خۆیدا بە خۆیانەوە نەبینی بوو. حکومەت خەرجی و مەسرەفی خۆی لە باج و خەراج کۆ دەکردەوە، حیزب ئابونەی ئەندامانی خۆی وەردەگرت و خێزانە دەولەمەندەکانیش پیتاکیان دەداین سەرەک خێلەکانیش بۆ ئەوەی گوێرایەلی خۆیان بۆ حیزب بسەلمێنن پیتاکیان دەدا. بازار، بە هۆی کەل و پەلی قاچاغی عێراقەوە کە هەندێ جار دەگەییە بازارەکانی تەورێزو تەنانەت بازارەکانی (تاران)ش، بوژایەوە. بەلام ئەو قەرزەی کە لە حکومەتی ئازەربایجانی و لە مانگی کانونی دووەم دا وەرگیرا بوو، لە دەرامەتی ئەوشەکرە درایەوە کە کارگەی شەکری (میاندواو) بەرهەمی دەهێنا. بە پێچەوانەی ئەو وەزع و حالەی لە ئازربایجاندا باوبوو، هاوولاتی کۆماری کوردی دەیتوانی بەو پەڕی ئازادی بێ و بچێ و سەفەر بکات. هەموو هاوولاتی یەک بۆی هەبوو چەک هەلبگرێ، ئاسایش بەرادەیەک بەرکەمال بوو کە پۆلیسی کوردی بە درێژایی یەک دانە سال تەنیا پێنج کەسیان گرت.

هیچ سانسۆرێک لە سەر رۆژنامە نەبوو، یەکەمین کتێبی دەرسی ی قوتابخانان بە زمانی کوردی هاتەنوسین و بۆ چاپ ئامادە کرا. گوێگرتن لە رادیۆی بێگانە ئاسایی بوو لە پال گوێگرتن لە رادیۆی کوردی کە رۆژانە شەش سەعاتان کاری دەکرد و بەرنامەی بلاو دەکرەوە. ئیدی دەسەلاتی سۆڤیەتی لە وێندەر بوو بە سفر. هەر چەندە حیزب، رێکخراوی قوتابیان و لاوانی لە سەر شێوەی سۆڤیەتی دامەزراند و بەرپرسانی کورد لە کاتی قسە کردندا ستایشی سوپای سوریان دەکرد و زۆرجار لە گوتاری رەسمی و بەیانات و گوتاری رادیۆییدا ئاماژە بۆ یەکێتی ی سۆڤیەتی مەزن دەکرا،لێ لەو بۆنانەدا زاراوەی وەک: مارکسیزم، لینینزم، ریفۆرمی کشتوکالی و خۆمالی کردن.. هتد بەکار نەدەهێنران. زۆر بە دەگمەن وێنەی ستالین لە دایەرەکانی کۆماری دادەبینرا. بە پێچەوانەوە وێنەی قازی محمد لە چوار چێوەی رەنگا و رەنگ بەرەنگی ئالای (کۆمەلەی جاران) لە هەموو شوێنێک داو بە تەنیشت نەخشەی کوردستانی گەورەوە هەلواسرا بوو، کە کۆماری کوردی وەکو خالێکی بچووک تێیدا نیشانە کرا بوو.

خەلکی کۆمار، لە حالەتی خەونێکی نەتەوەیی رەنگین دا دەژیان. سرودی نەتەوەیی بۆ هەموو پارچەکانی کوردستان دەگوترا. جگە لە هەستی نەتەوەیی، نەوت-ش یەکێک

بوو لەو فاکتەرانەی کە سنوری خەونی کوردی دیاری دەکرد، وەکو لەم برگە سرودە نەتەوەییەدا بەدیار دەکەوێ:

نەفتم ئاوی ژیانە لە سیرت وکەرمانشانە،

بابا گورگور دەزانە لە موسڵیش هەمانە.

کورد، بەرادەیەک لە خەونی ئایندەی خۆدا نقوم بوو بوون کە کەسیان هەستی بەوە نەدەکرد کە کێشەی دەوڵەتان لە سەر ئەو ناوچەیەی کە ئەوان تێیدا دەژین، لە راستیدا بۆ دەست بە سەرا گرتنی ئەو ناوی ژیانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا دەشیا بگەنە ئەو ئەنجامگیری یە، ئەگەر زەمینەی مێژوویی و هێماو ئاماژە سەرەتاییە ئاشکراکانیان هەڵبسەنگاندایە و بیانخوێندباوە کە بە ئاشکرا بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچوون: روس و بەریتانی یەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا رێک کەوتبوون لە سەر دابەشکردنی ناوچە پرنەوتەکانی باکور و باشوری ئێران. هەروەها لە سەر هەم ئاهەنگی هاوبەش رێک کەوتبوون کە چۆن لە ناوچەکەدا روو بەرووی دەسەڵاتی ئابوری گەشە کردوی ئەوسای ئەڵمان بوەستنەوە.

وەختێ بەلشەویکەکان، لە ساڵی ۱۹۲۱دا لە ئێران کشانەوە ودەسبەرداری هەموو ئەو مافانەی خۆیان بوون کە ئەو پەیمانە بۆی دابینکردبوون، کاروبارەکان گۆڕان.. بەریتانی یەکان بە پێ ی پەیمانی ساڵی ۱۹۰۹ بیرە نەوتەکانی خۆیان پاراست و لە رێگەی کومپانیای نەوتی ئەنگلو- ئێرانی یەوە کەوتنە رەعەمەل هێنانی. هەرچەندە تاران بۆ ماوەیەکی کەم ئەم پەیمانەی هەڵوەشاندەوە، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە رەزا شای یەکەم سیاسەتێکی تازەی بۆ دانی مافی بەرهەمهێنانی نەوت دانا.. لێ بەریتانیا ساڵی ۱۹۳۳دا مافی بەرهەمهێنانی تری بە پێ ی مەرجی تازە وەدەست هێنایەوە.

وەختێ جەنگی جیهانی دوەم کۆتایی هات و بارودۆخی ئێران هاتەوە تایم، بەریتانیا و دنیای رۆژاوا بە چاوی گومانەوە دەیانڕوانی یە هەوڵەکانی سۆڤیەت بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتیان لە ئێران و لەوەشە بیەوێ مافی بەرهەمهێنانی (نەوت)ش وەربگرێ.

## پیترۆڵ و جەنگی سارد

پێدەچێت سەرانی کۆماری مهاباد ئەم زەمینە مێژووییەیان لەبەر چاو نەگرتبێ. هەروەها ئەو هەنگاوەی تری سۆڤیەتیانش کە لە ساڵی ١٩٤٤دا نایان، بە جدی وەرنەگرتبێ. لەو کاتانەدا کە سۆڤیەتەکان مژولی جوڵاندنی سەربازانی شەترنجەکەیان بوون لە کوردستان و ئازربایجاندا وخەریکی ئامادە کردنیان بوو بۆ گەڕی (جولە) ئایندە، مافی دەرهێنانی نەوتیان لە سەرانسەری باکوری ئێران دا وەدەست هێنا، لێ حکومەتی ئێران مەسەلەی یەکلایی کردنەوەی ئەم بابەتەی بۆ دوای جەنگ دواخست.

بیانوشی بۆ ئەمە قەرارێکی وەزاری پێشو بوو لە لایەکەوە و هەنجەتی ئەوەش بوو کە بەردەوامبوونی شەڕ ڕێگە نادات ئەم ئیمتیازو مافە بە یەکێتی ی سۆڤیەت بدرێ.

لەبەر ئەم هۆیانە سۆڤیەتەکان بە لایەکی تردا بایاندایەوە؛ ئەویش بریتی بوو لە پشتیوانی و بە هێز کردنی جوداخوازی کورد وئازەر، لێ لەم هەوڵەیاندا ڕوو بەڕووی نارەزایی و مقاوەمەتی توندو تیژی حکومەتی ئێرانی دەبوونەوە کە ئامەزرۆوتینوی ئەوە بوو هەموو خاکی خۆی لە ڕووی سیاسی و سوپاییەوە بێنێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی، لەو کاتانەدا کە کورد مژوڵی تەواو کردنی بینای یەکەم دەوڵەتی خۆیان بوون لە مهاباد و دەیانویست بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنن کە دەتوانن خۆیان بەڕێوە بەرن، حکومەتی ئێرانی پەنای وەبەر هەموو کەناڵێکی گەمەی دبلوماسی دەبرد تا شارەکانی باکوری- ڕۆژاوی وەربگرێتەوە و لە مەترسی دەریان بهێنێ.

وەختێ هاوپەیمانان لە ساڵی ۱۹٤۱دا چوونە خاکی ئێرانەوە، بەڵێنیان دا کە لەگەڵ تەواو بوونی جەنگدا بکشێنەوە. بەراستیش ساڵی ۱۹٤٦دانرا بۆ ئەم کشانەیەوە. ئەوە بوو ئەمریکی یەکان لە ڕۆژی ۱۹٤٥/۱۲/۳۱دا کشانەوە. دوا سەربازی بەریتانیش لە ڕۆژی ۱۹٤٦/۳/۲ دا لە خاکی ئێران کشایەوە. لێ سۆڤیەتەکان بە پێچەوانەی بەڵێنەکانەوە بوونی سەربازی و سیاسی خۆیان لە ئازربایجاندا زیاد دەکرد و ڕاوێژکارانی سۆڤیەتی لە مهابادا مەشقیان بە سوپای کورد دەکرد.

ئێرانییەکان هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی خۆیان وەگەڕ خست تا سۆڤیەتەکان ناچار بکەن خاکی ئێران بە جێ بهێڵن، ئیدی لە ڕێگەی پارانەوەو تکاوە بیگرە تا ڕژدبوون لە سەر پێشکەش کردنی داخوازی ڕەسمی و گوشاری ئەمریکی و بەریتانی. بەڵام ئەم هەوڵانە کەم و زۆر هەڵوێستی سۆڤیەتی نەدەگۆڕی. بەڵام سەرۆکی تازەی ئەمریکی (هاریس ترومان)، سور بوو لە سەر ئەوەی کە ڕوو بەڕووی کاریگەری سۆڤیەت بوەستنەوە، ئەو سۆڤیەتەی کە هەموو هێماکان وایان دەنواند کە بەرەو ئەوە دەچێ ببێ بە دەوڵەتێکی زلهێنر، بە تایبەتی دوای ئەمانی ئەڵمانیای نازی، جا ئەگەر ئەم لەڕوو وەستانە لە ڕێگەی نەتەوە یەکگرتوەکانیشەوە بێ کە ئەمریکا لەو سەرو بەندەدا سەر پەرشتی دامەزراندنی دەکرد.

نوێنەری ئێران لە ڕۆژی ۱۹٤٦/۱/۱۹دا سکاڵا نامەیەکی دایە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی و شکاتی کرد بوو کە سۆڤیەت دەست لە کاروباری نێو خۆی ئێران وەر دەدات. وولاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکاو بەریتانیا و فەرەنسای هاوپەیمانی ئەمریکا پشتیوانیان لەو سکاڵاپەی ئێران کرد. ئەمە یەکەمین سکاڵا بوو کە دوای دوو ڕۆژ لە دامەزراندنی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی درا بە ئەنجومەنی نێوبراو، بەر لەوەی ئەم ئەنجومەنە هێشتا پەیڕەوی ناوخۆی داتابێ. لە مانگی ئازاردا نوێنەری ئەمریکا و بەریتانیا لە مۆسکۆ، نارەزایی نامەیەکی ڕەسمیان دژ بە ڕەفتاری سۆڤیەتی پێشکەش

کرد. دیگول، بەخۆی بانگەوازێکی ئاراستەی کرملین کردو داوای کرد لە ئێران پاشەکشە بکات.

هەر چەندە ئەنجومەنی ئاسایش نەیتوانی بگاتە بڕیارێکی ئیلزامی،تەنانەت پاش سکالای دووەمی (ئێران)ش کە لە ١٨/٣/و١٢/٤/١٩٤٦ پێشکەشی کردەوە. بەڵام یەکێتی ی سۆڤیەت کە دەترسا تووشی گۆشەگیرییەکی نێو دەوڵەتی ببێ، نەیتوانی بەرگەی ئەو هەموو گوشارانە بگرێ کە لە لایەن رای گشتی جیهانی یەوە دەکرایە سەری.

کاتێک کە سەرەک وەزیرانی ئێران (احمد قوام) کە لە مانگی ک٢ ئەم پۆستەی وەرگرتبوو، نیشارەتی دایە سۆڤیەت سەبارەت بە مافی دەرهێنانی نەوت، سۆڤیەتەکان لێبڕان گۆڕانی بنەڕەتی لە سیاسەتی خۆدا لە رۆژ هەڵاتی ناڤین بکەن و لە سەر بناغەیەکی تازە سیاسەتی خۆ رۆبنەنەوە. بڕیاریاندا جارێ کۆمەک و پشتیوانی ئازربایجانی یەکان و کوردەکان رابگرن ولەبری ئەوە هەوڵبدەن لە گەڵ حکومەتی ئێرانیدا بگەنە رێکەوتنێکی وەها کە لە لایەکەوە یەکێتی ئێران بپارێزێ و لە لایەکی ترەوە روسەکان مافی دەرهێنانی نەوت وەدەست بهێنن. (ج.س هووروفیتس) ی ئەمریکایی پسپۆڕ لە کاروباری رۆژ هەڵاتی ناڤین،لە ساڵی ١٩٤٦ دا لە تەعلیقێکی دا لە سەر ئەم بابەتە دەڵێ: "لەروانگەی سۆڤیەتی یەوە ئەم کارە بریتی بوو لە گرتنەبەری دوو رێگە بۆ یەک ئامانج، ئەویش نزیک بوونەوە بوو لە کەنداوی فارس".

(احمد قوام) لە مانگی ئازاردا ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا گەیاندە دوا قۆناغەکانی. وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت (گرۆمیکو) لە کاتی ئاڵۆزبوونی تەنگژەکەدا رایگەیاند کە هێزەکانی سۆڤیەت بەم زووانە و لە ماوەی کەمتر لە شەش هەفتەدا خاکی ئێران بە جێ دێڵن "ئەگەر رووداوی تازەی چاوەنۆڕ نەکراو نەیەتە پێشێ". رەنگە ریستبێتی بەم رستەیەی دوایی، سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی گفتوگۆی ئێران و سۆڤیەت، بە مەسەلەی مافی دەرهێنانی نەوتەوە ببەستێتەوە.

بەڵام رەوتی کاروبارەکان زۆر بە خێرایی چووە پێشێ: لە ٤ی نیساندا قوام و سەفیری سۆڤیەت لە ئێران (ا.گ.سادخیکوف) رەشنوسی دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی ئێرانی- سۆڤیەتییان خستە بەردەم رۆژنامەوانان. ئەوە راگەیەنرا کە ئەم رێکەوتننامەیە بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بەردەوام دەبێ و لە ساڵی ١٩٦٦ دا کۆتایی دێت. رێکەوتنەکە ئەوەشی تێدا بوو کە سۆڤیەتەکان لە ٢٥ ساڵی یەکەمدا ٥١ ٪ی بەشەکانی کۆمپانیاکە دەبەن و پاشان کەم دەکرێتەوە بۆ ٥٠ ٪ هەروەها لە بەشێکی تایبەتی رێکەوتننامەکەدا ئاماژە بۆ ئەوە کرا بوو کە ناوچە نەوتاوییە دەوڵەمەندەکان بریتین لە هەردوو پارێزگای ئازربایجان و کوردستان، واتا هەموو ناوچەی باکوری رۆژاوای ئێران بەدرێژایی سنوری عێراق و تورکیا.

## روخانی ماڵە کارتۆنی یەکە

ڕێکەوتننامەکە هەر ئەوەندەی مابوو ئەنجومەنی نوێنەرانی ئێرانی لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگ پەسندی بکات و ئەوسا سۆڤیەت هەموو ئەوشتانەیان چنگ بکەوێ کە مەبەستیان بوو.

قوام هەر بۆ ئەوەی نیازپاکی خۆی نیشان بدات هەستا دوو نوێنەری حیزبی تودەی لە کابینەی وەزارەتی ــانی وەرگرت. ئیدی سۆڤیەت بێ سێ و دوو قوربانییان بە سەربازی شەترەنجی ئازربایجانی و کوردی داو بە خواردنی دان.

لەو کاتەنەدا کەسەفیری سۆڤیەتی (سادخیکوف) لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە مەسەلەی ئازربایجان (مەسەلەیەکی ناوخۆی ئێرانی یە) و پێویستە دەست بە گفتوگۆی ئاشتییانە لە نێوان تاران و ئازربایجاندا بکرێ تا ئازربایجان بگەڕێتەوە باوەشی ئێران و جۆرە خود موختارییەکی هەبێ، لە هەمان ئەو کاتانەدا دەسەڵاتی ئاکومونیستی لە مهابادا پشت گوێ خراو سۆڤیەتەکان بەتەواوەتی فەرامۆشیان کرد، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە چارەنوسی بەکوێ دەگات و ئەوە بوو لە کاتی گفتوگۆی ئەوت دا بە جارێ پشت گوێ خرا. سەفیری ئەوکاتی ئەمریکا لە تاران، لەم بارەیەوە دەڵێ: "داروخانی ماڵی کارتونی ئازربایجانی و کوردی سەرکەوتن بوو بۆ سیاسەتی دروست و هەڵوێستی بنجبری نەتەوە یەکگرتوەکان بەرانبەر بە یەکێتی سۆڤیەت". هەروەها لە سەری دەڕوات و لە پێشبینی یەکیدا کە ڕەنگە بۆ هەشتاکانیش دروست بێ، دەڵێ: "نابێ باوەڕ بەوە بکەین کە کرملین بەم شکستە حەابەرەیە رازی دەبێ و، وەدەست هێنانی مافی دەرکردنی ئەوت وای لێدەکات کە هەوڵدەدات دەسەڵاتی سیاسی و ستراتیژی لە سەرانسەری ئێراندا وەدەست بێنێ".

ئیدی بوکەڵەکانی دەستی مۆسکۆ لە تەورێزدا خێرا بایاندایەوە ، کەوتنە خۆ سازاندن لەگەڵ ڕەوت و، ڕێبازی تازەی سۆڤیەتدا، تەنانەت هاوڕێ پیشەوەری ڕایگەیاند کە ڕێکەوتن لەگەڵ تاراندا (بەداخەوە) زەروری یە "چونکە ئەمریکا و بەریتانیا مەسەلەی ئازربایجانیان کردووە بە هەنجەت بۆ خوڵقاندنی گیروگرفت بۆ دۆستی گەورەمان: یەکێتی سۆڤیەت". بابەمجورە گفتوگۆ لە نێوان ئازربایجانی یە ستالینی یە هاوسۆزەکانی کۆمونیزم و حکومەتی ئێرانی لە تاراندا دەستیپێکرد، حیزبی تودە هاتە مەیدانی سیاسییەوە و چەندین خۆپیشاندان و مانگرتنی لە سەرانسەری وڵاتدا ڕێک خست.

ئەم ڕەوشە تازەیە و ئەو نزیک بوونەوە دیارە لە یەکێتی ی سۆڤیەت کردییە کارێک کە عەشایەری کەمە نەتەوەیی تری وەک (بەختیاری) و (قەشقەیی) لە باشوری وڵاتدا کە شەقڵێکی ئاینی هەبوو، بە پشتیوانی و هاندانی ئینگلیزەکان ڕابەڕن و ڕوو

بەرووی حکومەت بینەوەو داوای لێبکەن کە سنورێک بۆ ئەم سیاسەتی (داشکان بەلای چەپ)دا دابنێ. هەروەها بەرنامەی کۆمەکی ئەمریکی-ش کەوتە لەقین و ئەمەش وای لە (قوام) کرد کە لە مانگی ت١/١٩٤٦ دا گۆڕانکارییەک لە وەزارەتدا بکات و وەزیرە کۆمونیستەکان دەر بکات و وەزارەتێکی بە هێزی وەها دابنێ کە سور بێت لە سەر پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی سەر بەخۆی دوور لە سیاسەتی سۆڤیەت، بۆیە هەر هەموو ئەم کارانەی کرد چونکە دەیزانی رەوتی گشتی کاروبارەکان هاتۆتەوە تایی خۆی و بە چ ئاراستەیەکدا دەڕوات.

لەم کاتەدا سوپای ئێران کەوتەوە سەر پێیان و ئەوسوکایەتی یە گەورەیەی لەبیر کرد کە لە ماوەی داگیرکردنی ئێراندا بە سەری هاتبوو. پێدە چوو رازی بێ لەو دەورەی کە (قوام) لەم قۆناغەدا بۆ سوپای دانا بوو؛ کە بریتی بوو لەوەی دەزگایەک بێ هەنگاوی گونجاوی ئەوتۆ بنێ کە چارە نوسی وولات دیاری بکات. سەرەک وەزیران لە ١٩٤٦/١١/٢٥دا فەرمانی بە سوپادا کە ئازربایجان و کوردستان، بە هەنجەتی نزیکبوونەوەی ریفراندۆمی گشتی بگرێتەوە و هەر بەرگرییەکی چەکدارانەی لەم دوو پارێزگایەدا هاتە رێ سەرکوتی بکات. ئەوەی هەست دەوروژێنێ، لە هەروەتی ئەم گۆڕانکارییە خێرایانەی ئێراندا، ئەوەی بوو کە قازی محمد لەو کاتانەدا لە تاران بوو،بروسکەیەکی نارەزایی نارد دژی ئەو ئەخشەیەی کە بۆ داگیر کردنی کۆماری کوردی دانرا بوو. هەروەها بە پشتی دۆستە سۆڤیەتەکان، لەو گفتوگۆیەدا کە لە مانگی ئەیلول دا لە تاران کردی، زۆر بە توندی رەفزی ئەوەی کرد کە مهاباد بۆ باوەشی ئێران بگەرێتەوە. کاتێ هێزەکانی ئێران بە سەرۆکایەتی ئامیر لیوا (هەمایونی) لە سنوری هەردوو کۆمارە بێ خاوەنەکە نزیک بوونەوە، هەنگێنێ کوردەکان کەوتنە گومان لە دروستی کۆمەکی یەکێتی سۆڤیەتی مەزن بۆیان.

شاندێکی کوردی لە سەرەتای مانگی کانونی یەکەمدا بەلەز چوو بۆ شاری رەزاییە تا چاوی بە (هاشموف)ی کونسولی سوڤیەتی لەوێندەر بکەوێ، لەوەوە بزانن کە هەڵوێستی سۆڤیەتی چییە. هاشموف، هەموو هەوڵێکی وەگەرخست تاکوردەکان تێ بگەیەنێ کە ئەنجامی کارەکان ئەنجامێکی باش دەبێت و تاران بە تەمایە چەند یەکەیەکی سوپایی رەمزی بنێرێ بۆ سەرپەرشتی کردنی رەوتی هەڵبژاردنەکانی ئایندەو هەرکە هەڵبژاردن تەواو بوو، ئیدی سوپا لە خاکی هەردوو کۆمارەکە دەکشێتەوە. لەبەر رۆشنایی ئەم قسەیە، ئەنجومەنی جەنگی لە مهاباد فەرمانی بۆ هێزە کوردییەکان دەرکرد کە هیچ جۆرە مقاوەمەتێک لە بەرانبەر پێشرەوی هێزەکانی ئێران نەکەن. بەلام دوای چەند رۆژێکی کەم بە ئاشکرا ئەوە دەرکەوت کە چارەنوسی کۆماری مهاباد لە راستیدا پەیوەست بوو بە چارەنوسی کۆماری ئازربایجانەوە.

له رۆژی۱۹٤٦/۱۲/۱۳ دا پێشینەی هێزی ئێرانی خۆی بە شاری تەورێزدا کرد، بێ ئەوەی یەکێتی ی سۆڤیەت چ کاردانەوەیەک دەربڕێ بۆ رزگار کردنی سیستەمی ستالینی ئەو رژێمەی کە خۆی بەشداری لە دامەزراندنیدا کرد. لە ئەنجامی ئەو رەفتارە توندو تیژانەدا کە دەزگای ئاسایشی حکومەتەکەی پیشەوەری کردیان، چەند گروپێکی ئەنتی کومونیزم کەوتنە پەلامار دان و داگیر کردنی بارەگا حیزبی و حکومەتی یەکانی تەورێز و گەلەک ئاژاوە و پێکادان بەرپا بوو، و جەماوەری تورە چەندین کومونیستیان کوشت. خەڵکی ئاژاوەچی زانییان کە (محمد بیریا)ی وەزیری پەروەردەی جاران پەنای وەبەر خەستەخانەی سۆڤیەتی بردوەو لەوێندەر خۆی شاردۆتەوە، ئەوە بوو پەلاماری خەستەخانەی نێو براویان داو کابرایان گرتو بەستیان بە ئوتومبیلێکەوەو تا مردن هەر رایانکێشا. بەڵام پیشەوەری و ئەندامانی گرینگی وەزارەتەکەی، لەکاتی خۆیدا بۆ باکۆ هەڵاتن و لەوێندەر پەنایان وەبەر هێزەکانی سۆڤیەت بردو،ئیدی کوردەکانیش یەقینیان پەیدا کرد کە چارە نوسی کۆمارەکەیان پاش روخانی تەورێز، نەمان ،و روخانە. ئەوە بوو لە رۆژی ۱۹٤٦/۱۲/۱۷ دا چارە نوسی کورد دیاریکرا.

**سێدارەکانی مەیدانی چوار چرا**

قازی محمد سواری ئوتومبیلەکەی (سیدان) خۆی بوو. ئەم ئوتومبیلە سۆڤیەتەکان بە دیاری داهویانێ. جلی مەدەنی لەبەر کردو جلی سوپایی سۆڤیەتی بۆ یەکجارەکی لەبەرداکەند. چەندکەسێک لە یاوەرە نزیکەکانی لەگەڵی چوون. قازی محمد گەییە بڕیارێکی پێچەوانەی راو تەگبیری زۆربەی خەڵکی، هەروەها بارزانی زۆری لەگەڵ گوت کە لە مهاباد وەدەرکەوێ و پەنا بۆ یەکێتی سۆڤیەت یان عێراق بەرێ، بەڵام سودی نەبوو: قازی محمد بڕیاریدا کە لە نێو گەلەکەیدا بمێنێتەوە، لە نێو ئەو گەلەدا کە سوێندی خوارد بوو رێبەرایەتیان بکات و بیانپارێزێت. ئێدی وەکو داب و نەریتی کوردان، لێبرا لە شار دەرکەوێ و بچێتە پێشوازی سەرکەوتوو، و خۆ تەسلیم بکات.

ئوتومبیلەکەی قازی محمد و یاوەرەکانی بە سەر جادەی زوقم و شەختە گرتودا بەرەو باکورو روەو رەزاییە وەرێ کەوت،کاتێ ئوتومبیلەکە ۱۳ کیلو مەتران رێگەی بڕی و گەییە نزیکی گوندی (قەرەتەپە) بەرایی هێزەکەی جەنەراڵ هەمایونی بە دیارکەوت. هەنگێنێ قازی محمد دەستوری بە شوفێرەکەی دا کە بوستێت. ئیدی لەپاڵ ئوتومبیلەکەدا وەستا وچاوەڕوانی گەیشتنی هەمایونی کرد. هەمایونی سەرکەوتوو بەرێزەوە داوای لێکرد کە سواری ئوتومبیلەکەی خۆی ببێ و لەگەڵ هێزەکەدا بەرەو مهاباد بچێت. ئێرانی یەکان بۆ ئێوارە شارەکەیان داگیر کرد. شار، لەتۆ وایە شاری شەبەنگانە، چ مقاوەمەتێکی نەکرد. جەنەراڵ هەمایونی هەرلە مەیدانی چوار چراوە کۆتایی کومارەکەی راگەیاند و ئەوەی راگەیاند کە ئیدی شار گەڕایەوە باوەشی ئێران. ئیدی قازی محمد بە دەستبەسەری لە ماڵی خۆیدا مایەوەو سەرکردەکانی تر گیران.

دەولەتی کوردی، بەر لە چەند رۆژێک هەیبەت و بوونی راستەقینەی خۆی لە دەست دابوو؛ بە هۆی ئەوناکۆکی یەی کە لە سەرەتای دامەزراندییەوە لە نێوان (شێران) و (هەلپەرستان)دا هەبوو. لە نێوان چەکدارانی عەشایەرو بورژوایانی شاردا هەبوو، ئەو ناکۆکییانەی کە کۆمار بە درێژایی تەمەنی خۆی نەیتوانی چ چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە. سەرانی هەندێ خێڵ ویستیان بەرگری تایبەتی بکەن، وەکو خێڵی (گەورک) و (زرازی) کە لێکۆلەرەوەی ئەڵەمانی پسپۆڕ لە کاروباری ئەرمن (الیهمات هاویت) باسی دلێری و بوێریانی کردووە.

بەڵام ئەو هاوارەی کە ئەوان بردیانە بەر عەشیرەتی شکاک، لە لایەن سەرەکی ئەم خێڵەوە (ئەمیرخان شریفی)یەوە کە کۆماری کوردی پلەی جەنەڕاڵی دابوێ، وەها وەڵام درایەوە کە: "مخابن ناتوانین هیچ یارمەتییەکتان بدەین چونکە هەمو ئەسپەکان رەوانەی پاوان کراون". بە پێچەوانەی شکاکەوە ئەسپی پیاوانی (هەرکی) (بۆ پاوان رەوانە نەکرابوون) بەڵکو هەندێک لە رۆڵەکانی ئەم خێڵە، سواری ئەسپەکانیان بوون و بە پەلە بەرەو رەزاییەو تەورێز وەرێکەوتن تا بەشداری بکەن لە لەنێو بردنی کۆماری ئازربایجانی دراوسێیاندا. ئیدی بەرە بەرە هێزەکانی تری کۆماری مهاباد کەوتە هەرەس هێنان و لە نێو چوون. تەنیا ئەو هێزە بچوکە نەبێ کە هەڵبژاردەی هێزەکانی کۆمار بوو، بەنێو بەفرو سەرمادا بەرەو سنوری عێراق و ئێران کشایەوە و خۆی لە گوندە شاخاوییە دورە دەستەکاندا پەنادا.

گەرچی ئەم کۆمەڵە جەنگاوەرە توانیان خۆیان دەرباز بکەن، لێ چارەنوسی قازی محمد و یاوەرە نزیکەکانی زۆر زوو دیاری کرا. لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٧دا دادگایەکی سوپایی ئێرانی لە مهاباد دانرا و قازی محمد و هەردوو وەزیری بەرگری و ناوخۆی کۆماری کوردی بە تۆمەتی یاخی بوون و خیانەتی گەورە تاوانبار کردو حوکمی لە سێدارەدانیان بە سەر دا درا. چونکە (محمد رەزا شای پەهلەوی) سور بوو لە سەر جێبەجێکردنی ئەم حوکمە، بۆیە هەمو هەوڵێکی تەمیز کردنەوەو سوککردنی ئەم حوکمە بێ ئاکام مایەوە. لەو کاتەدا کە هاوپەیمانانی سەرکەوتوو لە دووەم جەنگی جیهانیدا، شاری (نورنبرگ)ی ئەڵەمانییان، بە حوکمی پێگەی تایبەتی شارەکە، هەڵدەبژارد بۆ دادگایی کردنی تاوانبارانی جەنگ، شای ئێران سور بوو لە سەر ئەوەی کە حوکمی ئیعدام کرنی قازی محمد لە مەیدانی چوارچرادا جێبەجێ بکرێ. ئەو چوار چرایەی کە لەوێندەرەوە جیابوونەوەی مهاباد لە ئیمپراتوریەتی ئێرانی راگەیەنرا.

لە ئێوارە وەختێکی درەنگی رۆژی ١٩٤٧/٣/٣٠دا، دەنگی پاچ و بێڵی ئەو سەربازە ئێرانیانەی کە خەریکی داچەقاندنی سێ قەنارە بوون لە مەیدانی چوارچرا، وەستاو خامۆش بوو، ئەوە بوو لە بەرە بەیانی رۆژی ئایندەدا و هەر لەوێدا نوێنەرانی یەکەمین کۆماری کوردی لە سێدارەدران. لە مانگی ئایندەش دا (٥) سەرکردەی تری کورد هاتنە

خەنەقاندن و سی و یەک سەرکردەی تریش خرانە زیندانەکانی شاوە و بێ سەرو شوێن کران وکەس نەیزانی چییان بەسەر هێنرا.

## پاش شکست و داروخان

مەلامستەفای بارزانی، کە رۆژێک پێش روخاندنی مهاباد، خۆی گەیاند بووە ئەوێندەر تا قەناعەت بە پێشەوا قازی محمد بکات کە لە مهاباد وەدەرکەوێت و خۆی بە دەست هێزەکانی ئیرانەوە نەدات.. ئەم پیاوە یەکەم کەس بوو کە بە هوشیارییەوە هەستی بەرەوتی کاروبارەکان کرد. لای ئاشکرا بوو کە ئەو بڕیارەی دژی بەرژەوەندییەکانی کورد دراوە، بڕیارێکی سیاسییە، شکستی کورد پتر شکستێکی سیاسییە تا شکستی سوپایی بێت. هەندێ هاوعەسری خۆی گوێیان لێ ی بوو کە چۆن نائومێدی خۆی لە دۆست و هاوپەیمانی خۆیان؛ لە یەکێتی ی سۆڤیەت دەربڕی بوو، گوتبووی: "هێزی ئێران بەسەر کوردا سەرنەکەوتوون، بەڵکو بەریتانیا و وولاتە یەکگرتوەکان بە سەر یەکێتی ی سۆڤیەتدا سەرکەوتوون".

هەڵبەتە ئاکامی نسکۆکە، سەبارەت بە بارزانی و هاوەڵەکانی جیاوازتر بوو لە هی پیاوەکانی تری کۆماری کوردی: چونکە ئەوان ئێرانی نەبوون، هاوولاتی عێراقی بوون؛ بۆیە نەدەکرا بە خیانەتی گەورە تۆمەتبار بکرێن. بارزانی دەیزانی کە ئەوپەرەکەی تەسلیم بە عێراق دەکرێنەوە، بۆیە بارزانی، پاش ئەوەی قازی محمد خۆی بە دەستەوەدا، سەردانی جەنەراڵ هەمایونی فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی کرد و ئاگاداری کردەوە کە خۆی و خەڵکەکەی کە ژمارەیان دوانزە هەزار کەس دەبن، بەتەمان بۆ زێدی خۆیان؛ بۆ بارزان بگەڕێنەوە؛ بە مەرجێ بەریتانیا گوشار بخاتە سەر عێراقی یەکان و گیانیان بپارێزرێ. هەمایونی بایەخێکی تایبەتی بە بارزانی دەدا، ئەمەش لەوەدا دەرکەوت کە هەموو دەسەلاتێکی خۆێ وەگەڕ خست تا زەمینە بۆ بارزانی خۆشبکات کە سەفەری تاران بکات و بەخۆی ئەم پێشنیازەی بخاتە بەردەم بەریتانییەکان. بارزانی پتر لە هەیڤەک لە (بەهو)ی ئەفسەران دا لە تاران مایەوە. زۆر بەرێزەوە وەکو میوانێکی رەسمی مامەڵەیان لەگەڵدا کرا.

کاتێ بەریتانی یەکان پێیان راگەیاند کە وەلامی بەغدا ئەوەیە کە گوایە ناکرێ ئەم داوایەی جێبەجێ بکرێ، ئێرانی یەکان پێشنیازی ئەوەیان کرد کە بارزانی یەکان لە ناوچەکانی چیای (الوند)ی رۆژاوای (هەمەدان)ی دەوروبەری ناوچەکوردنشینەکانی ئێران نیشتە جێ بکرێن. هەرچەندە بارزانی دڵی پێوە بوو کە ئەم پێشنیارە قەبوڵبکرێ، بەلام شێخ ئەحمەدی براگەورەی، کە سەرۆکی رەسمی عەشیرەت بوو، و دوابڕیارش بە دەستی ئەو بوو، پێشنیازی گۆرینی رەفز کرد. هەڵبەتە بوونی ئەم هێزە چەکدارو شەرکەرو چەلەنگە، لەم ناوچە سنورییەدا کە تازە ئازاد کرابوەوە، مایەی

نیکەرانی هەمایونی بوو، ئەمە پالّی پێوە نا کە بچێتە نەغەدە و سەردانی شێخ ئەحمەد بکات و داوای دوا وەڵامی لێبکات و بزانێ بەتەمای چییە. بەڵام شێخ ئەحمەد نەیدەویست هەروا سوک وناسان گرێی دڵی خۆێ بۆ بکاتەوە. بۆیە پێ ی گوت بەخۆ و خێڵەکەیەوە، زەمانەتی بەریتانی و عیراقی هەبێ یان نەبێ، بۆ عێراق دەگەڕێنەوە. لە سەری رۆیی و گوتی چاوەروانی بەهاردەکەن تا رێگە بکرێتەوە و بتوانن ناوچە سنورییە سەختەکان ببرن. هەمایونی، ئەم هەڵوێستە نادیارو ئاڵۆزەی لە بەرگران بوو، سەبری سواو بە شێخ ئەحمەدی گوت کە تەنیا سێ رێگەتان لە بەرە و چوارەمی نی یە: یان دەمودەست و بێ چاوەڕوان کردنی خۆشبونی هەوا بۆ عێراق بگەڕێنەوە،یان چەک دابنەن و تەسلیم بە ئێران بێن وگوێ رایەڵی بڕیاری ئێران بن، دەنا بە پێچەوانەوە دەبێ خۆ بۆ شەڕی سوپای ئێران ئامادە بکەن. هەمایونی نەغەدەی بە جێ هێشت و گوتی دوو رۆژی دی بە هێزەکەیەوە دێتەوە بۆ وەڵام و بڕیاری کوردان. بە راستیش دوای دوو رۆژان هاتەوە. بەڵام کاتێ هێزی سوپایی ئێران بە پشتیوانی تۆپ و تانک، پاش دوو رۆژان هاتە نێو نەغەدەوە، تاقەیەک بارزانی ی لەو داوانزە هەزار بارزانی یەی نەبینی، لەتۆ وایە زەوی قووتی داون.

شتێک بوو لە بابەتی مەحاڵ کە هیچ تاقمێک بتوانێت بەو زستانە سەختە، کە لە زۆر شوێندا بە شەوان پلەی گەرمی دەگەیە سی غرەی خوار سفرەوە، ئەو رێگاوبانە شاخاوییە ببڕێ و چوار سەد کیلومەتر رێگا بەنێو زریان و رەنوو و هەرەسی بەفردا بڕوات. کەچی بارزانی یەکان بە حوکمی ورە بەرزی و خۆراگری و خۆشەویستی و گوێرایەڵی بۆ سەرۆکەکەیان ئەمەیان کرد. ئەم کوردانە باشترین چەکی ناو عەمارەتی کۆماری مهابادیان، بەرلەوەی هێزەکانی ئێران دەستی بە سەردا بگرن، لەگەڵ خۆدا هێنا بوو، لەوانە: پتر لە سێ سەد تفەنگی هەڵبژاردە، سەدوبیست رەشاش، دوو تۆپی مەیدانی و کۆمەڵێک نارنجۆکی دەستی زۆر.

## محمد رەزا شای پەهلەوی هەڵوێستی توند بوو

بارزانی یەکان، لە سەرەتادا، لە لایەن هێزەکانی جەنەراڵ هەمایونی یەوە تەنگەتاو نەکران. جەنەراڵ هەمایونی پێ ی وابوو مانەوەی لە بارەگای زستانەی خۆیدا زۆر چاکترە لەوەی ئەو کوردانە راوبنێ کە تەواو دوور کەوتبونەوە. بەڵام شا کە هەزارکیلۆمەترێک لەوێندەرەوە دوور بوو، زۆر توند بوو، سوور بوو لە سەر ئەوەی کە دەبێ هێزە هەڵبژاردەکەی کۆماری مهاباد دەرس و پەندێکی وەها دابدرێت کە هەرگیز ژبیری نەکات. ئێرانییەکان لە سەرەتادا ویستیان بە پێ ی سیاسەتی (کوتی بکەو کۆتی بکە) عەشیرەتی هەرکی بکەن بەگژ بارزانی یەکاندا، بەڵام ئەم هەوڵەیان سەرنەگرت. ئەوە بوو هێزەکانی سوپای ئێرانیان خستە مەیدانەوە و بارزانی یەکان بەرەو سنووری عێراق چوون؛ دیارە هەم کەشو هەوا لە بار بوو، هەم شارەزای ناوچەکەش

بوون، ئیدی شەڕەکان بریتی بوون لە سووکە پێکادانی ڕۆژانەو پەراگەندە کە زیانی ئێرانی یەکان زۆر لە هی بارزانی یەکان زیاتر بوو ئیدی ئێرانی یەکان پەنایان وە بەرتۆپ و فڕۆکان بردو کەوتنە بۆردومان و تۆپبارانی ئەو ژن و منالانەی کە بەلوتکە و زناراندا هەڵدەگەڕان یان بە قەد پالی هەزار بە هەزاردا دادەگەڕان. بەلام بەو حالەشەوە لە سەرەتای نیساندا گەیشتنەوە خاکی عێراق و لە شەڕی ئێرانییان خەلەسان. لەم کاتانەدا هەندێ کەنالی کوردی دەسەلاتدار لە بەغدا، توانیان کارێکی وەها بکەن کە عێراقی یەکان چ کارێکی سوپایی دژی بارزانی یەکان ئەنجام نەدەن؛ بە لای کەمەوە دەرهەق بەو ڕۆژە.

بەو جۆرە مەلامستەفا و شیخ ئەحمەد لە ناوەندی هەیڤی نیساندا خێلەکەیان گەیاندەوە ناوچەی بارزان بێ ئەوەی عێراقییەکان یان بەریتانییەکان هیچ دژایەتییەکیان بکەن. شێخ ئەحمەد بە خۆو چەند پیاوێک و هەموو ژن و منداڵەکانەوە تەسلیم بە حکومەتی عێراق بوو ،وەزع و حالیان زۆر شڕ بوو. ماندو وشەکەت بوون، پێویستیان بە ماوەیەکی زۆر هەبوو تا ماندوێتی ئەو سەفەرە دژوارەیان لە لەش دەر بچێت و وەحەسێنەوەو بێنەوە سەرخۆ. بەلام مەلامستەفا وای بەچاک زانی لەگەل کۆمەلێک جەنگاوەری هەلبژاردەدا، بۆ ناوچە سەختە سنورییەکانی تورکیا پاشەکشە بکات و لەوێ خۆ پەنا بدەن و چاوەنۆڕ بکەن کە ئاخۆ ڕۆژگار چ شتێکی تازەیان دێنێتە ڕێ.

پاشان بە دیارکەوت کە ئەم بڕیارە، یەکجار ئاقلانە وحەکیمانە بووە. دەرکەوت کە کابینەی حکومەتی عێراق پڕە لەو عەرەبە ناسیونالستانەی کە لەژێر کاریگەری دامەزراندنی جامیعەی عەرەبیدا بوون، ئامادە نەبوون هیچ نەرمییەک و ئاسانکارییەک لەگەل ڕۆلەکانی نەتەوەی کوردا بنوێنن، بنەمالەی هاشمی لەم بارەیەوە هاوبیرو بۆ چونی ئەندامانی کابینەی وەزارەتی ئەو وەختە بوون. وەختێ لە سالی ۱۹۳۹ دا مەلیک غازی بە دەعمی ئوتومبیل مرد، تاجی پاشایەتی بەمەلیک فەیسەلی دووەمی کوڕی غازی برا، کە هێشتا منداڵ بوو.. کە فەیسەل و ناسیونالستە عەرەبەکان سەیریان کرد خۆیان خودان بڕیارو دەسەلاتن، لێبڕان زۆر بە ساردی و بە توندی مامەلە لەگەل کوردا بکەن. کۆمەلێک لەو ئەفسەرە کوردانەی کە وازیان لە سوپای عێراقی هێنا بوو، و لەگەل بارزانی دا پەیوەندییان بە سوپای کۆماری کوردەوە بوو، لەگەل شێخ ئەحمەدا تەسلیم بوو بوونەوە. حکومەتی عێراق هەر بۆ ئەوەی بیانکات بە پەندو عیبرەت بۆ خەلکانی دی گرتنی و دانی بە دادگایەکی سوپایی، حوکمی ئیعدام دران و زۆر بە خێرایی حوکمەکە جێبەجێکرا. یەکێک لەو ئەفسەرانە نەقیب عزت عبدالعزیز بوو، هەر چەندە ئەم پیاوە یاوەری شەخسی (وەلی عەهد) بوو، بەلام ئەمە شەفاعەتی بۆ نەکرد و دادی نەدا.

بارزانی، لە بەغداوە زانیاری دروستی بۆ هاتبوو، و زۆر چاک دەیزانی کە هەمان چارەنوسی ئەو ئەفسەرانەی دەبێ و دەسەلاتدارانی بوغز لەزگی عێراقی زۆر لێ ی بە داخن. بۆیە لە ئایاری ۱۹٤۷دا لێبڕا لە عێراق وەدەر بکەوێ. هەر چەندە دەیزانی دەبێ جارێکی دی بگەڕێتەوە بۆ ئێران، ئەو ئێرانەی کە بارزانی و جەنگاوەرەکانی خۆێنی چەند ئەفسەرو سەربازیانیان رشتبوو، و ئەمە خۆی لە خۆیدا زۆر کۆسپی دەهێنایە رێگەی خۆی و جەنگاوەرەکانی، بەلام ئەم کارە پێویستی بە موناقەشە نەدەکرد: چونکە چ رێگەیەکی دی لە بەردەم نەبوو. هەروەها زۆر چاکی دەزانی کە (تورک)ش ئامادە نین پێشوازی سەرکردەیەکی کوردی ئەسرەوت بکەن و لەو ناوچە کوردییەدا نیشتە جێ ی بکەن، کە سوپای تورک بە هەزار ناری عەلی کۆنترۆلی کردووە.

## رەوی مێژوویی بۆ یەکێتی ی سۆڤیەت

نابەمجۆرە هیچ شوێن و ولاتێک نەما بارزانی و هاوەلەکانی رووی تێبکەن تەنیا هاوپەیمان و دۆستەکەی دۆینییان، یەکێتی سۆڤیەت نەبێ. پێدەچێت (هاشموف)ی کونسولی سۆڤیەت لە رەزاییە، پاش روخانی کۆماری مهاباد بەلێنی بە بارزانی دابووبێ کە خۆی و هاوەلەکانی هەرکاتێ بیانەوێ روو بکەنە یەکێتی ی سۆڤیەت، ئەوا لەوێندەر پێشوازی دەکرین و پەنادەدرێن.

بارزانی، لە ۱۹٤۷/٥/۲۰دا جەنگاوەرەکانی کۆ کردوەوەو ئەم بڕیارەی پێراگەیاندن و گوتی هەر کەسێک لە خۆی رادەبینێ و حەز دەکات لەگەل ئەودا بڕوات و هیچ پەیوەندییەکی خێزاندری نای بە ستێتەوە، دەتوانێت لەم سەفەرو رەوە نادیارەدا بە گەلی بکەوێت. هەلبەتە کێشەکە لەوەدا نەبوو کە کێ بێتە هەلبژاردن تا لەگەل بارزانی دا بۆ ئەم سەفەرە نادیارە بچێت، بەلکو بە پێچەوانەوە خەلکەکە ئەوەندە زۆر بوون، بارزانی ناچار بوو ژمارەیەکی زۆریان رەفز بکات، بە تایبەتی لەوانەی کە هەستی دەکرد بەرگەی ئەم سەفەرە دژوارو دورو درێژو نادیارە ناگرن.لە ئەنجامدا بارزانی پێنج سەد کەسی هەلبژاردەی لە رووی توانای بەدەنی و خەملینی فیکری و توانای جەنگاوەرییەوە هەلبژارد. هەندێ ژێدەران دەلێن ژمارەی هاوەلانی بارزانی لە هەشت سەد کەس پتر بوون.

بەرەبەیانی ۱۹٤۷/٥/۲۷ بەرەو باکور کەوتنە رێ و دەبوایە ماوەی ۳٥۰ کیلۆ مەتر رێگە بە پێیان ببڕن. چەندین ئەسپ و هێستریانش لەگەل خۆدا برد بۆ گواستنەوەی چەکی قورس و ئازوقە و سواری برینندارەکانیان، بە تایبەتی لە دوا قۆناغەکانی سەفەرەکەدا. بەفر لوتکەی چیای (دەلان پەر)ی داپۆشی بوو، (دالان پەر) ئەو چیایە بوو کە سێ سال لەوە بەر نوێنەرانی کوردی تورکیا و عێراق و ئێران لەوێندەر کۆبوبونەوە و سوێندیان خوارد بوو کە هەرکاتێک پێویست بکات کۆمەکی یەکتر بکەن

و لێبڕان بکەونە هەنگاونان و زەمینە خۆشکردن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی یەکگرتوو، ئەمە ئەو ئامانجە بوو کە لەو ڕۆژەی مانگی مایسی ١٩٤٧ دا لە هەر کاتێکی دی دوورتر دەهاتە بەر چاو.

بارزانی یەکان لە یەکەم ڕۆژی سەفەرەکەیاندا سنوری تورکیایان بڕی و بۆ سبەی بەیانی خۆیان بە خاکی ئێراندا کردو بەرەو باکور درێژەیان بەرێگەی خۆیان دا، لە سەرەتادا بە کۆمەڵ دۆڵی (تەرگەوەڕ)یان بڕی و بەناو دۆڵی (سومای) کەوتن و شارەکانی (شاپور) و (قەتور) یان بڕی بێ ئەوەی ج هێزێکی ئێرانی یان عێراقی ڕێگەیان پێبگرێ. هەمایونی لەو ڕۆژانەدا لە شاری (خوی) بوو و چاوەڕوانی هاتنی شا بوو کە قەرار بوو یەکەم سەردانی باکوری ڕۆژاوای ئێران بکات.

لە (خوی) هەواڵی جم وجوڵی بارزانی یەکانی پێگەیی، شا پەڕینەوەی بارزانی یە چەکدارەکانی بە خاکی ئێراندا بۆ یەکێتی ی سۆڤیەت، بە تەحەدای شەخصی خۆی لە قەڵەم دا. بۆیە فەرمانی دەرکرد کە دەست بە جێ بارزانی یەکان ڕاوبنرێن و لە نێو ببرێن، ئەوە بوو بە پێ ی ئەخشەیەکی دارێژراو بڕیاردرا کە دوو کەتیبەی ئێرانی لە دۆڵی قەتوردا ڕێ بە بارزانی یەکان بگرن و بیانهێننە ناو شەڕەوەو هەر هەموویان قەتڵ و عام بکەن و نەیەڵن شتاقیان دەر بچێت. هەروەهاچەند یەکەیەکی سوپایی دیکەش بۆ باکوری دۆڵەکە نێردران تا ئاگاداربن ئەوەک بارزانی یەکان لە بۆسەکە دەر بازبن.

بەڵام هێزەکانی ئێران لە ئاستی ئەزمون و توانای جەنگاوەری پێشمەرگە کوردەکاندا نەبوون. ئەوە بوو کۆمەڵێک جەنگاوەری کورد لە باکوری قەتورەوە سەریان هەڵدایەوەو بەمەش دەرکەوت کە بارزانی جارێکی تریش گەمارۆی ئێرانی یەکانی تێک شکاندو دەرباز بوو.

بارزانی یەکان جارێکی دی خۆیان بە ناوچە شاخاویەکانی باکوری ڕۆژاوای (خوی)دا کرد و خۆیان لەوێندەر حەشارداو لە چاو وون بوون، هەرچەندە شا بە خۆی هێشتا لە ناوچەکەدا بوو، و فەرمانی شەخسی دەرکرد بوو کە تاقیبی بارزانی یەکان بکرێ و بە هەر نرخێ بوە لە نێو ببرێن و هەڕەشەی لە فەرماندەی هێزە سوپاییەکە کرد کە ئەگەر ئەم کارە ئەنجام نەدات و سەرکەوتن بە دەست نەهێنی دەیداتە دادگای سوپایی. بەڵام ئەو زیانەی کە هێزەکانی ئێران لە بارزانی یەکانیان دا هیچ نەبوو لە چاو ئەو زیانانەدا کە بە هۆی کەش و هەوا و دژواری شاخەکانەوە لێیان کەوت. هەرچەندە قەد پاڵ و زەندۆڵ و بناری شاخەکان پەناگەی چاک بوون و بارزانی یەکان لە هێرشی ئاسمانی ئێران دەپاراست، بەڵام ژمارەیەک هێستر و ئەسپ و کۆمەڵێک ئازوقەی زۆریان لە دەست دا، بە تایبەتی لە کاتی پەڕینەوەیاندا بەو پردە هەڵواسراوانەی سەر ڕوبارە تیژەکانی قوڵایی دۆڵەکاندا. هەروەها ژمارەیەک لە جەنگاوەرانیانش بە هۆی ڕووداوی لەو بابەتە گیانیان لە دەستدا. هێزەکانی ئێران لە ئەنجامدا توانیان ڕاستەوخۆ بکەونە شەڕەوە

لەگەڵ هێزەکانی مەلامستەفادا. هێزێکی پیادەی ئێرانی لە رۆژی ١٩٤٧/٦/٩ ویستی لە دوری چل کیلومەتری باکوری (خوی)دا بۆسەیەک بۆ بارزانییەکان بنێتەوە؛ لەکاتێکدا ئەو هێزە بەرێوە بو بۆ شوێنی دانانی بۆسەکە، لەودەمەدا کە بەقەد پاڵێکی هەزار بە هەزاردا تێدەپەرین، لە نکاودا خۆیان لە ناو بۆسەیەکدا بینی یەوە کە پسپۆرانی جەنگی شاخ، بارزانی یەکان بۆ ئەوانیان نابوەوە، لە نێو تاوێرو رەوەزەکانەوە، لەبنارو قەدپاڵەکانەوە گوللە بەسەر ئێرانییەکاندا داباری. پاشان بەر نارنجۆکی دەستی و موشەکی کوردان دران. هەر چەندە ئێرانی یەکان تاقە یەک کوردیان نەبینی، کەچی سەد جەنازەیان لە مەیدانی شەرەکەدا بەجێهێشت و ناچار بوون دوای شەرێکی یەک سەعاتی بەشپرزەیی و پەشێوی پاشەکشە بکەن و بریندارەکانیان بە دووی خۆیاندا رابکێشن و لەم پاشەکشەیەدا (١٦) کەسیان کەوتنە دەستی کوردەکان. لەوشەرە بەدواوە ئیدی هێزەکانی ئێران بە خۆدا چوونەوەو دوراو دوور کەوتنە تاقیبی بارزانی یەکان و ئیدی خۆیان لەوە بوارد کە شەری راستەوخۆیان لەگەڵدا بکەن.

لە رۆژی ١٩٤٧/٦/١٠دا بارزانی یەکان هەستیان کرد لە مەقسەدی خۆ نزیک بوونەتەوە، بە تایبەتی کاتێ کە بە دەستە چەپیاندا لوتکەی چیای ئاراراتی بەفر گرتوی بەرزتر لە ٥ هەزار مەتریان لێ بە دیار کەوت. ئەم چیایە بە دوا خالی باکوری وولاتەکەیان دێتە ژماردن و کوردان بەم لوتکە گرکانی یە دەڵێن (چیای نوح). کەچی دیمەنێکی دی هێندەی دی ورەی بارزانی یەکانی بەرز کردەوە، ئەویش دیمەنی ئەو دۆڵە بوو کە روباری (ئاراس)ی پێدا دەرۆیی، ئەم روبارە بۆ ئەوان بایەخی مێژوویی تایبەتی هەبوو، چونکە ناوەرۆی روبارەکە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان تورکیا و ئێران و یەکێتی ی سۆڤیەتی پێک دەهێنا و بەستێنی ئەو بەری روبارەکە بۆ ئەوان دەیکردە سەلامەتی و ئاسودەیی و کۆتایی هاتن بەو سەفەرە سەخت و دژوارەیان کە لە ماوەی دوو هەفتەدا و بە نێو بەفرو زریان و هەڵگەران و داگەران بە چیاو دۆڵ و لوتکە و زنارانداَ (٣٥٠) کیلۆمەتریان بری.

بارزانی، دوو کەسی لە هاوەڵەکانی خۆی نارد تا خانەخوێ یە کۆمونیستەکانیان، لە هاتنیان ئاگادار بکەنەوە. دوای چەند رۆژێک ئەو خەڵکە شەکەت و ماندووە، بە جل و بەرگی شرەوە خۆیان بەروباری ساردو زێدەتەزی ئاراسدا، دا. کە یەکەم زرێپۆشی ئێرانی لە نێو قامیشەلانەکانەوە دەرکەوت، سەیریان کرد چەند تفەنگێک و جەنازەی دوو پێشمەرگەی خنکاو لە ناوی ساردی ئاراسدا لەرەخی روبارەکەدا کەوتوون. بەلام مەلامستەفای بارزانی بە خۆو (٦٤١) کەسەوە گەیی بوونە ئەو بەری روبارەکەو ژیانی غوربەت و ئاوارەییان لە یەکێتی ی سۆڤیەتدا دەست پێکرد و ئەوە بوو بۆ ماوەی یانزە ساڵ و چوار هەیڤان لە شانۆی روداوە سیاسییەکان دورکەوتنەوە، بەر لەوەی لە نوێ بە دیار بکەونەوە و رێزی پێشی پێشەوەی روداوە سیاسییەکانی رۆژهەلاتی ناڤین بگرن.

# فەسلی نۆیەم

*خەباتی کوردی عێراق لە رای ئوتونومی دا.*

## گەڕانەوەی رۆڵەی ئەمەکدار

زەعیم عبدالکریم قاسم، لەبەرە بەیانی ١٩٥٨/٧/١٤دا، کودەتایەکی سوپایی بەرپا کرد. رژێمی پاشایەتی روخاند، خۆی کرد بە سەرۆکی وڵات و بوو بە بەهێزترین پیاوی عێراق لە بەغدا. ئەم پیاوە بروسکەیەکی بۆ بارەگای کرملین نارد. (نیکیتا خروشۆف)ی سەرۆکی کرملین، بروسکەکەی وەرگرت. ئەم بروسکەیە رەوتی کاروبارانی گۆڕی. داوا لە سەرانی سۆڤیەت دەکات رێگەی مەلامستەفا بارزانی بدەن کە بۆ عێراق بگەڕێتەوە.

ئەم ئەفسەرە عێراقییە (عبدالکریم قاسم) هەرهەمان ئەفسەر بوو کە ١٣ ساڵ لەوەبەر توانی بووی بە پرۆسەیەکی لێهاتوانە، راپەرینی شۆڕشگێرانی کورد لە ناوچە شاخاوییەکانی باکوری رۆژهەلاتی عێراقداسەرکوت بکات و هێزی سەرەکی کوردان بە سەرکردایەتی بارزانی، راوبنێ و ناچاری بکات لە عێراقەوە بەرەو ئێران بچێت، بەمەش رژێمی پاشایەتی عێراقی بۆ ماوەی پتر لە دە ساڵێک لە کێشەی کورد خەلەساند.

وەکو لە فەسلی پێشتردا ئاماژەمان بۆ کرد، بارزانی و ٦٤١ کەس لە نزیکترین یاوەرو هەڤاڵانی، پاش روخانی کۆماری مهاباد، ناچار بوون پەنا وەبەر یەکێتی ی سۆڤیەت بەرن.. دیارە بارزانی و یاوەرەکانی لە تاراوگەش دا هەر چاویان لەوە بوو کە دەرفەتێکیان بۆ برەخسێت و جارێکی دی بۆ زێدو نیشتمانی خۆیان بگەڕێنەوە.

هەڵبەتە، مامەڵەی سۆڤیەت لەگەڵ کوردەکاندا باش نەبوو. شایانی ئەوانە نەبوو کە تا دوێنێ دۆستیان بوون. هەروەها ئەو بانگەشەیەش کە گوایە بارزانی بە درێژایی ساڵانی مانەوەی لە سۆڤیەتدا، خوشگوزەرانەو بە پلەی جەنەراڵ لە سوپای سۆڤیەتیدا ژیاوە، تەنیا زادەی خەیاڵی رۆژنامەوانانی ئەمریکی بوو؛ وەکو چۆن ناوی (مەلای سوور)یان لێنا. ئەوەی سەیرە (دیریک کینان)ی دیپلۆماتی پسپۆڕ لە کاروباری رۆژهەلاتی ناڤین دا، لە باسی مێژووی کوردا ئەم لەقەبەی (مەلای سوور) بەکارهێناوەتەوە.

لێ حەقیقەتی مەسەلەکان لەوە واقیعی ترە: بارزانی لەقەب ونازناوی (مەلا)ی لە سەردەمی لاویداو لە بارزان وەرگرتوە. ئەویش ئەوکاتانە بوو کە کەوتە سەر ئەو بیرەی خۆی فێری نوسین و خوێندنەوە بکات بێ ئەوەی بچێتە هیچ قوتابخانەیەکی رەسمی.. ئەوە بوو کەوتە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە بە پێویستی دەزانیر تا جیهانبینی و

ـــــەفەیەکی تایبەتی دەربارەی جیهـ‌ن بە ‌ دروـ ـ بکات. ئەمەش وای لە دیهاتییەکان کرد وەکو زاناو شاردزایەک تەمەشای بکەن وەکو چۆن تەمەشای هەر مەلایەکیان دەکرد.

هەڵبەتە ئەو بانگەشەیەش کە گوایە لە یەکێتی سۆڤیەتدا خۆشی گوزەراندوە، ئەمەش هەر هێندەی لەقەبی (مەلای سوور) دروستە. خۆی و یاوەرەکانی لە ساڵانی یەکەمدا، بەتەواوەتی لە کوردەکانی یەکێتی ی سۆڤیەت دابڕێنران و لە گوندە جۆراو جۆرەکانی دەوروبەری شاری باکۆی پایتەختی ئازەربایجانی سۆڤیەتی دا نیشتەجێ کران.

گەلێک لە نزیکترین نزیکانی بارزانی بۆیان دوپات کردومەتەوە کە ئەو بارزانی یەی لە سوپای کۆماری مهابادا جەنەڕاڵ بوو، لە یەکێتی سۆڤیەت دا ناچار بوو کار بکات و بەرەنجی شانی خۆی قووتی رۆژانەی خۆی پەیدا بکات. بۆ وێنە سەبەتەو دەستکێشی دەچنی.

لە پایزی ساڵی ۱۹۷۳دا، سەفەرێکی ناوچە کوردییەکانی نزیکی سنوری (عێراق-ئێران)م کرد. لەم سەفەرەم دا پیاوێکم لەگەڵ بوو، کە لە رەوی ساڵی ۱۹٤۷ دا بۆ یەکێتی سۆڤیەت، گاردی تایبەتی بارزانی بوو. ئەم پیاوە بەدەم وەبیر هێنانەوەی یادەوەریەکانی ئەو رۆژگارانەوە بۆی گێڕامەوە کە: "ساڵانی یەکەمی مانەوەمان لە یەکێتی ی سۆڤیەت دا ناخۆش بوو. هەستمان نەدەکرد لە نێو دۆست داین. وەکو میوانی ناوەخت مامەڵەمان لەگەڵ دا دەکرا. هەرچەندە هەندێ فەرمانبەری کوردی زانمان بە دەورەوە هەبوو، بەلام ئەو ئامۆژگاری و زانیاریانەی بۆمان دەهاتن، هەمیشە بە زمانی روسی یان ئازەری بوو. کەسمان نەبوو ئەو دوو زمانە بزانێ. زۆر جار گومانمان دەکرد کە گاڵتەمان پێدەکەن و بە نیمەی جوتێری پاشکەوتوو رادەبوێرن".

بێگومان سۆڤیەت دەترسان لەوەی کوردی سۆڤیەتش بکەونە ژێر کاریگەری بیری رزگاریخوازی یاوەرانی بارزانی یەوە، بەتایبەتی لەو دەمەدا کە توندترین هێرشی سەرکوتکاری و تواندنەوەی نەتەوەیی، نەتەوە ناجۆرجی یەکانی ناوچەی قەفقاز لەلایەن ستالینەوە جێ بەجێدەکرا. لەلایەکی دی یەوە سۆڤیەت چ کارێکیان بەو کوردانە نەما کە شوێنێکی تایبەتیان لە گەمەی ئەو شەترەنجەدا بۆ دانرا بوو، کە سۆڤیەت بەتەمابوو لە ناوچەی رۆژهەلاتی ناڤین دا ئەنجامی بدات.

کاتێ بارودۆخی ناوچەی رۆژهەلاتی نزیک و رۆژهەلاتی ناڤین لە سەرەتای پەنجاکاندا کەوتە گۆڕان، سیاسەتی سۆڤیەتیش دەرهەق بە مەسەلەی کورد کەوتە گۆڕان و لە نوێ سەری هەڵدایەوە. تورکیا، کە کێشەی کوردی هەبوو، و هێشتا بە چارەنەکراوی مابوەوە، بوو بە ئەندامی ناتۆ. هەروەها رژێمی پاشایەتی عێراق بەکەمینەی کوردەوە، کە لەوقۆناغەدا کەمینەیەکی هێدی و ئارام بوو، بوو بە ئەندامی پەیمانی (سەنتو-

بەغدا) کە لە بەرەتدا نز بە سۆڤیەت بۆ. بەمجۆرە کورد باوی هاتەوەو بوو بە فاکتەرێکی گرنگ بۆ سیاسەتی سۆڤیەتی؛ چونکە دەیتوانی بیانجولێنێ، یان لە هەر کاتێکدا بیەوێ بیانجولێنێ، سوودیان لێ وەربگرێ و بیانکات بە فاکتەری گوشاری ناوخۆ دژی ئەو دوو دەوڵەتەی (تورکیا و عێراق) کە لە ناوچەکەدا برپرەی پشتی سیستەمی هاوپەیمانیەتی رۆژاوایان پێک دەهێنا. ئەوە بوو سۆڤیەتەکان لە ناوچەی قەفقازدا رادیۆیەکیان بە ناوی (دەنگی کوردستان)ەوە دانا. ئەم رادیۆیە بە یارمەتی مەلامستەفا بارزانی و پەنابەرانی دی یەوە لەپەنجاکاندا بەرنامەی بانگەشیی و هاندانی پەخش دەکرد. خەڵکێکی زۆری کورد گوێیان لێدەگرت؛ چونکە چ رادیۆیەکی کوردی دی نەبوو. هەروەها چەند کورسیەکی خوێندنش لە زانستگەکانی باکۆو تاشقەندو مۆسکۆ بۆ کوردە ئاوارەکان تەرخان کرا. خودی (بارزانی)ش لە دوا ساڵانی مانەوەی لە یەکێتی ی سۆڤیەت، جوگرافیاو ئابوری و مێژوو و زمانی روسی لە زانستگەی موسکۆ خوێند.

هەڵبەتە تێکەڵاو بوون لەگەڵ هاوولاتیانی کوردی سۆڤیەتیش دا روویدا. ئەوە بوو گەلێک لە یاوەرانی بارزانی کیژە کوردی سۆڤیەتییان خواست. هەروەها هەندێکیان کیژە رووسیانش خواست. لە حەفتاکاندا سەردانێکی کوردستانم کرد. کۆمەڵێک پێشمەرگەی قژزەردی چاوشینم بینی، کە دوایی بۆم دەرکەوت ئەمانە توخم و تۆوی ئەو ژن و ژنخوازییەی نێوان کوردو روسەکانن.. بە تێپەڕ بوونی رۆژگار و بەتایبەتی پاش مردنی ستالین، بارزانی توانی بازنەی ئەو گۆشەگیری یە بشکێنێ کە بە سەریدا سەپێنرا بوو. هەر لەوێوە پەیوەندی لەگەڵ کوردی عێراقدا بەرقەرار کرد. ئەمە جگە لەو پەیوەندییانەی کە لەگەڵ پایەدارانی رەسمی و حیزبی سۆڤیەتی دا بەرپای کرد.

دەزگای ساواکی ئێرانی لە ناوەراستی پەنجاکاندا هەستی بە هاتوچۆی زۆر نهێنی پەیک و تەتەرانی کورد کردوە و لەلای خۆی تۆماری کردوە، کە بە خاکی ئێران داو لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و کوردستانی عێراقدا رویداوە.

ژێدەرو سەرچاوە ئێرانی یەکان دەڵێن ئەو تەتەرانەی، زانیاری سیاسیان لە مەلا مستەفاوە بردوە بۆ هەواداران و لایەنگرانی بارزانی لە عێراق و بە پێچەوانەشەوە مەعلومات و زانیاری زۆر وردیان دەربارەی دوا رووداوەکانی عێراق بردۆتەوە بۆ بارزانی کە لە تاراوگەدا و لە یەکێتی سۆڤیەتدا دەژیا.

## نزیکبونەوەیەک لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقیدا

دووری بارزانی، کردی یە کارێک کە بزاڤی رزگاریخوازی کوردی لە عێراقدا بە شێوەیەکی تازە رێک بخرێتەوە. حیزبی هیوا کە لە ساڵی ١٩٣٩دا وەکو کۆمەڵەیەکی نهێنی دامەزراو پاشان وەکو حیزب هاتە کۆڕی خەبات و چالاکی و چەلەنگی

ئاشكراوە، خۆی هەڵوەشاندەوە. هەروەها شێخ محمودش کە سەرکردەیەکی دیکەی کورد بوو، بە چەند ساڵێکی کەم دوای دووەم جەنگی جیهانی وەفاتی کرد. ئەم سەرکردەیە لە بیستەکانداو لەبەر رۆشنایی بەڵێنی هاوپەیمانان کە ئوتونومی بە کورد بدەن، دەوڵەتی کوردستانی دامەزراندو خۆی کرد بە مەلیکی ئەو دەوڵەتە. ئینگلیزەکان لە سەرەتادا دانیان بە خۆداگرت و تەحەمولی بارودۆخەکەیان کرد. چونکە شێخ هەموو چالاکی یەکی خۆی بۆ باشوری کوردستان تەرخانکردبوو. ئەوە بوو ئینگلیز دەرفەتیان بۆ رەخساو بە ئاسانی دەستگیریان کردو تا ساڵی ١٩٤٤ لە زیندان دا مایەوەو پاشان ئازاد کرا.

کاتێ بارزانی، لە ساڵی ١٩٤٥ دا لە وڵات وەدەرکەوت، بۆشاییەک کەوتە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی یەوە. جا بۆ پرکردنەوەی ئەم بۆشاییە نوێنەرانی رۆشنبیرانی شار کە زۆربەیان کۆنە ئەندامی کۆمەڵەی هیوا بوون، لە ئابی ١٩٤٦دا پارتی دیموکراتی کوردیان دامەزراند. ئەم پارتە لە سەر شێوەی حیزبی دیموکراتی ئێران دامەزرا، بارزانی بە سەرۆکی پارت هەڵبژێردرا. بەڵام لەبەر دووری بارزانی، سەرکردایەتی سیاسی پارت درایە دەست میرحاج ئەحمەدی ئەفسەرو هەمزە عبداللەی ئەوقات.

جگە لە پارتی دیموکراتی کورد، کە پاشان بوو بە پارتی دیموکراتی کوردستان، شیوعییەکانیش توانیان بنکەیەکی جەماوەری لە کوردستانی عێراقدا، بە تایبەتی لە نێو کرێکارانی سەر چاوەکانی نەوتی کەرکوک و وەرزێرانی کورد دابمەزرێنن. حیزبی شیوعی عێراقی لە ساڵی ١٩٣٤دا دامەزرا. خۆی بە نوێنەرو تاقە پارێزەری بەرژەوەندی چینی کرێکارو جوتیاری عەرەب و کورد دەزانی. بەدرێژایی خەباتی بێ ووچانیان دژی رژێمی پاشایەتی عێراق، بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردیان بەکۆسپی سەر رێگەی خەباتی چینایەتی زانیوەو بە "خیانەتی وردە بورژوایان لە قەڵەم داوە دەرهەق بە شۆرشی جیهانی".

قوناغی نێوان دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان و گەڕانەوەی بارزانی، وەکو (هاینر گشتراین)ی پسپۆری سویسری لە کاروباری رۆژهەلاتی ناڤین دا، دەڵێت: "پتر قوناغی ناکۆکی نێوان پارت و حیزبی شیوعی عێراقی بووە تا قوناغێک بێت لە قۆناغەکانی خەباتی رزگاریخوازی کورد".

حیزبەکەی مەلامستەفا پابەندو هەڵگری بیرو باوەڕێکی ئایدولوژی ووشکی وەک هی شیوعییەکان نەبوو، بەڵکو هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یەوە کۆکەرەوەی گەلەک رێبازی فیکری باوی نێو بزاڤی رزگاریخوازی کورد بووە. توانای ئەوەی هەبوو شان بەشانی یەکدی و بەپێ ی پێویست گروپی: نەتەوەیی، دیموکراتی، سوسیالستی، کۆماریخوازی، یان ئاینی موحافەزەکار بگرێتە خۆ. پارتی دەیتوانی لە بارودۆخی کونجاودا دروشمی گونجاو لەگەڵ ئەو هەلومەرجەدا بەرز بکاتەوە. ئەم پێکهاتەیە

یارمەتی پارتی دەدا کە وەکو هاوپەیمان و شەریکی ڕێبازە سیاسییە جیاوازەکان خۆی بخاتە روو. پارتی هەر لە سەرەتاوە رایگەیاندوە و تاکو ئەمڕۆش باوەڕی بە پرانسیپی پێکەوە ژیانی عەرەب وکورد لە چوارچێوەی عێراقی یەکگرتودا هەبووەو ئەم پرانیسپەی کردووە بە یەکێک لە ئامانجە سەرەکی یەکانی خۆی.

ئیدی ئایا پارت ئەم دروشمەی بەراستی یە یان زروف ناچاری کردوە؟! وەڵامی تەواوی ئەم پرسیارە قورسە زۆر جاران کە موناقەشەم لەگەڵ کادرانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا، لەسەر ئەم بابەتە بووە، ئەوەم بۆ بە دیارکەوتوە کە ئەم دروشمە تاکتیکی یە خۆیەخۆ هێندێ نێوەرۆکی دروشمە ستراتیژییەکەی کوردی لە خۆ گرتوە کە بریتی یە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی وەکو چارەسەری یەکجارەکی دۆزی کورد: دەوڵەتێکی یەکگرتوی کوردی کە هەموو رۆڵەکانی نەتەوەی کورد لە تورکیا و ئێران و سوریا ش دا بگرێتەخۆ. هەروەها ئەوەم هەڵێنجاوە کە هەر ئەم ئامانجە ستراتیژییە بووەتە مایەی بەرز کردنەوەی وورەی شۆڕشگێرانی کورد و کۆڵنەدانیان.

هێندێ کوردی توندڕەو، رەخنە لە پارتی دەگرن کە گوایە دروشمی کاتی هەڵگرتوەو داوای چارەسەری جوزئی مەسەلەی کورد دەکات، داوای برایەتی کوردو عەرەب دەکات. بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان، هەمیشە توانیویەتی هەموو ئەو گروپە سیاسییە کوردییانەی کە سەنگێکیان هەیە، کۆ بکاتەوە. هەموو هێزە سیاسییەکان، جگە لە شیوعی یەکان، لە دەوری خۆی خڕ بکاتەوە.

حیزبی شیوعی لە چلەکان و پەنجاکاندا تاقە حیزب بوو، کە شان بەشانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەرنامەی سیاسی و کادرو هەیکەلێکی ڕێکخراوەیی وەهای هەبوو بتوانێت ڕێکخستێکی نهێنی زۆر چالاک و چەلەنگ بەرێوەبەرێ. دوای راپەڕینە سیاسییەکانی ساڵانی ١٩٤٨ و ١٩٥٢ و پاشان قەدەغە کرنی چالاکی یەکانی حیزب لەلایەن حکومەتی نیزامی (سوپایی، عەسکەری) وەختەوە، ئیدی جۆرە هەماهەنگی و کارێکی هاوبەش لە نێوان شیوعی یەکان و نەتەوەییەکانی کوردا پەیدا بوو، بە تایبەتی کە لە ساڵی ١٩٥٢ دا بۆ یەکەمجار کوردێک بوو بە سکرتێری حیزبی شیوعی عێراق، ناوی نهێنی ئەم کوردە (باسم) بوو. هەڵبەتە ئەمە خۆی لەخۆیدا سەرەتاو بانگەوازیک بوو بۆ رەوینەوەی تەمی ساردی نێوان کورد و حیزبی شیوعی عێراق.

باسم، سەرکردایەتی ستالینی جارانی بەوە تاوانبار کرد کە ریبازێکی هەڵپەرستانەی دەرهەق بە دۆزی کورد گرتۆتە بەر، هەروەها پشتیوانی خۆی بۆ کورد راگەیاند کە کورد مافی دیاریکردنی چارەنوسی خۆیان هەیە، ئەگەر کار بگاتە ئەوەش کە نزیکەی ١-٣ی خەڵک و رووبەری عێراق لە دەوڵەتی عێراق جیا بکرێتەوە. پاش مەرگی ستالین و تەواو بوونی سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی و دژایەتی کردنی هەموو گەلانی غەیرە

جۆرجی ناوچەکانی پشتی قەفقاز کە لەلایەن دکتاتۆرەکەی سۆڤیەتەوە پەیڕەوی دەکرا، ئەم ڕێبازە تازەیەی حیزبی شیوعی عێراق دەرهەق بە کورد گرتی یە بەر، لەلایەن سۆڤیەتیشەوە پیشتگیری تەواوی لێکرا.

هاریکاری ناڤبەرا هەردوک حیزبی شیوعی و پارتی گەییە رادەیەک کە هەردووک حیزب بە تەما بوون بە یەک لیستی هاوبەش بەشداری هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ۱۹۵۳ بکەن. لە یەکێک لە کونفرانسە حیزبییەکانی ساڵی ۱۹۵٦ی حیزبی شیوعی دا، داخوازییەکانی کورد بە شێوەیەکی زۆر ڕونتر، ئەگەر چی لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەییەکانی کوردا نەدەهاتەوە، لە پرۆگرامی حیزبدا تۆمار کرا. لە لایەکی دییەوە پەیوەندی ناڤبەری هەردوک حیزب هێندە گەرم بوو کە هاپەیمانی کوردی- شیوعی، کردییە کارێک کە هەندێ لە کادرانی سەرکردایەتی شیوعی لە ناوچە کوردییەکاندا پەیوەندی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بکەن.

## جەمال عەبدولناسر هلوسۆزی خۆی بۆ کورد دەردەبڕێ

هەر لەم کاتانەدا هێزێکی سیاسی دیکە هەبوو، ئامادە نەبوو ببێ بە هاوپەیمانی شیوعییەکان. بۆیە کەوتە گفتوگۆی ئەوە کە جۆرە هاوپەیمانییەکی دی لە عێراقدا بهێنێتە گۆڕێ.

بزاڤێکی سیاسی بەرفرە لە سەر ئاستی هەموو نیشتمانی عەرەب دەستی کرد بە بانگەشە بۆ وەدەستهێنانی یەکێتی یەکی عەرەبی یان هەر جۆرە یەکێتی یەکی عەرەبی لە سەر بناغەی کۆماری- نەتەوەیی، ئەم بزافە لە نێو گەنجەکان و سەرکردەکانیاندا زۆر بلاوو باو بوو.. لە ساڵی ۱۹٥٤ دا لە میسر جمال عبدالناصر حوکمی گرتە دەست و بوو بە قیبلەنمای هەموو ئاوات و ئامانج و هیوا نەتەوەییەکانی عەرەب.

شاندێکی هاوبەشی کورد، لە ساڵی ۱۹٥۷دا، سەردانێکی جمال عبدالناصریان کرد، دکتۆر جەمال نەبەزش وەکو نوێنەری ڕەوتی سێیەم لەگەڵ شاندی نێوبراودا بوو. ئەو دکتۆر جەمالەی کە ئێستا لە زانستگەی بەرلین دا دۆزی کورد بەدەرس دەڵێتەوە. ناسر، بە تەواوەتی پشتگیری خۆی لە مەسەلەی کەمە نەتەوەییە ناعەرەبەکان دەربڕی. هەر لە ئەنجامی ئەم سەردانەوە ڕادێوی قاهیرە دەستی بە بلاوکردنەوەی بەرنامەیەک بە زمانی کوردی کرد، دیارە ئەم جۆرە ئینکەبەرییەک بوو لەگەڵ ڕادێوی دەنگی کوردستان کە لە خاکی سۆڤیەتەوە بە کوردی بەرنامەی بلاو دەکردوە. کە لە ساڵی ۱۹٥۸ دا یەکێتی ی لە نێوان میسرو سوریا دامەزرا، و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو هاتە گۆڕێ، کوردی سوریاش هەندێ ئاسانکاریان لەگەڵدا کراو ئەوگوشارانەی بە سەریاندا سەپێنرا بوو هەندێ کەم کرانەوە.

بارودۆخەکە بەرادەیەک هاتەبار،کە کوردێکی ئەندامی پەرلەمانی عێراقی پێشنیاری کرد ماددەیەکی تایبەت بە مافی گەلی کورد بخرێتە دەستوری ولاتەوە. دەبوایە بۆ پشتیوانی و جێ بەجێکردنی ئەم پێشنیارە نیمزایەکی زۆر لە سەرانسەری عێراقدا کۆبکرێتەوە. بەلام دەسەلاتی عێراقی وای بە چاک زانی جارێ سەبر بکرێ و چاوەروانی روداوی ئایندە بکرێ؛ وەکو چۆن پتر لە دەسالێک بوو لە پاش تەواو بوونی دووەم جەنگی جیهانی و رزگاری کوردستانی عێراقەوە کرد بووی بە عادەت ئەم جۆرە هەلوێستە بێ موبالاتانەیەی هەبێ دەرهەق بە دیاریکردنی چارەنوسی خەلکی کورد کە ژمارەیان لە سێ ملیون کەس پترە ونیشتەجێ ی باکورو باکوری رۆژهەلاتی عێراقن.

حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، هێزی ئنتیدابی بەریتانی و دەولەتی عێراقی پاش انتداب، هەموو بەلێنەکانیان دەرهەق بە کورد هاتە سەر ئەوەی چەند قوتابخانەیەکی کەمتر لە قامکی دەستان بە کوردی بکەنەوەو رێ بە دەرچونی تاقە یەک گوڤاری مانگانەی کوردی بدەن. رۆژنامەوانی چیکوسلوڤاکی م-سیگموند، لە سالی ١٩٥٧دا سەفەرێکی بۆ عێراق کردوەو یەکێک لەو قوتابخانانەی بینیوەو لە گەرانەوەیدا بەمجۆرە وەسفی کردوە: "دەرگای قوتابخانەکە بریتی بوو لە پەردەیەک کە لە گوونی ئارد دروست کرا بوو. ژوورێکی ٧×٥ مەتری لە پشت ئەم پەردەیەوە بوو، ئیدی سەندوقە شکاوو کورسی و رەحلەی دارو قەرەوێلە و چەند فانۆسێکی سەقەتی بە ئارێک و پەیکی تێدا دانرا بوو. شانزە زەلامی زل قوتابی بون و دەبوایە فێری خوێندن و نوسین بن".

قوتابخانەکە نێوی (کەشتی نوح) بوو. ئەمە دەربرین و زاراوەیەکە، رۆژنامەوانی نێو براو گوتەنی پڕ بە پێستی بارودۆخی هەموو ناوچەکەیە: واتا هەموو ناوچەی کوردستان، کە حکومەتی عێراقی پاش دە سال ئارامی و کپی سیاسی و سوپایی بە ئانقەست بەوجۆرە پاشکەوتوەی هێشتبووەوە. ئەمە هەموو بەشداری و هەول وکۆششێکی حکومەتی عێراقی بوو بۆ چارسەرکردنی مەسەلەی کورد لە هەموو رووبەکی رۆشنبیری و ئابوری و کۆمەلایەتییەوە.وەنەبێ تەنیا وەزع و حالی کوردستان وا بووبێ، بەلکو شوێنانی تری عێراق-ش بە ئاشکرا پاشکەوتوو بون.

هەرچەندە هێڤی و ئاواتی ئەنجامدانی پرۆژەی ئەشوغای گەورە هەبوو، بەلام عێراقی سالی ١٩٥٨ لە هەموو کۆنە کۆلۆنی یەکانی عوسمانی پاشکەوتووتر بوو.

## زەعیم قاسم، حوکمی پاشایەتی عێراق دەروخێنێ

کاتێک کە لە بەرەبەیانی ١٩٥٨/٧/١٤دا، رژێمی پاشایەتی عێراق لە رێگەی کودەتایەکی نیزامی یەوە رووخا، مەلیک فەیسەلی دووەم، کە لە نەوەکانی شەریفی بە

ئاف و دەنگی مەکە بوو، لەگەڵ نوری سەعیدی دبلوماتی بلیمەتی دا، کە سیاسەتی نێوخۆی پشتگوێ خستبوو، ڕوو بە ڕووی کۆمەڵێک گیروگرفت بوو بوونەوە کە چارەسەرکردنیان بەلاوە زۆر قورس بوو: لە لایەکەوە جیاوازییەکی یەکجار گەورە لە نێوان ئاستی کۆمەلایەتی و بژێوی دەرەبەگان و گەورە موڵکداران و جوتیاران و بەدوودا هەبوو. ئەو جوتیارو بە دووانەی کە خزمیان بوون یان لە ڕوی خێلایەتی یەوە گوێڕایەڵیان بوون. ئەمانە تەنانەت خاوەنی ئەو پارچە زەویانەش نەبوون کە کاریان لەسەر دەکرد، هەروەها گوندی عێراقی هێشتا لە وەزع و حاڵێکا دەژیا وەکو ئەوەی لە سەردەمی حامورابی دا بن، بارودۆخی تەندروستی زۆر خراو بوو. لە ٣٠٪ منداڵانی ساوا دەمردن. پەتاو نەخۆشی واگیری وەک بلهارزیا و تەراخوما و سیل یەکجار بلاو بوو. بەلام عبدالکریم قاسم زۆر لە نکاودا مێژووی وولاتەکەی گۆڕی، وەک مێژو نوسی ئێرانی حەسەنی ئەرفەع دەڵێ بە خێرایی و کوتوپڕی چەخماخەی ئاسمان وولاتەکەی گۆڕی.

لەوکاتەدا (جەلال بایار)ی سەرۆکی تورکی لە فڕۆکەخانەی ئەستەموڵ چاوەڕوانی ئەو فڕۆکەیە بوو کە دەبوایە گەورە سیاسەتوانانی عێراقی بگەیەنێتە تورکیا تا بەشداری لە کونگرەی دەوڵەتانی پەیمانی سەنتۆدا بکەن کە قەرار بوو ئەو ڕۆژە بێتەگرێدان.. ڕێک لەو ساتانەدا بوو دەنگی دەسترێژی گوللەی مەفرەزەکانی جێ بەجێکرنی فەرمانی ئیعدام لە بەغدا دەگەییە کەشکەلانی فەلەک. مەلیک فەیسەڵ و هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی لە هەوەڵ ڕۆژی کودەتاکەدا کوژران. نوری سەعید جلی ژنانی لەبەر کردو ویستی هەڵێ، لێ پیاوانی شۆڕش پێیان زانی وجەماوەری خەڵکی تووڕە لاشەکەیان لەت وپەت کردو بۆ ماوەی چەندین سەعات بە شەقامە تۆزاویەکانی بەغدایا ڕایانکێشا.

شۆڕشگێران بۆ ڕۆژی دووەم بەرنامەی سیاسی تازەی خۆیان ڕاگەیاند: ڕژێمی پاشایەتی هەڵوەشێنرایەوە و ڕژێمی کۆماری لە جێ دانراو ڕایگەیاند کە بە تەمایە لە پەیمانی سەنتۆی ئیمپریالستی بکشێتەوە، بەمەش کێشەیەکی دی هاتە گۆڕێ کە خۆی لە خۆیدا هەرەشە بوو لە ئەمن و ئاسایشی ڕۆژئاوا لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناڤین دا. ئەم کێشەیەش بوو بە سەرباری کێشەی گرژی نێوان عەرەب وئیسرائیل و کێشەی بەرپا بوونی یەکێتی ی لە نێوان میسرو سوریا.

لە مەیدانی سیاسەتی نێوخۆدا، سەرکردایەتی کودەتاکە ڕایانگەیاند کە بە نیازن ئەو بیرە نەوتانە خۆماڵیبکەن کە کۆمپانیاکانی بەریتانیا تالانیان دەکرد. هەروەها هەموو زیندانیە سیاسی یە کوردو شیوعی یەکانیش ئازاد کران.

ڕژێمی تازەی عێراق بەڵێنی بەکورد دا، کە بۆ یەکەمجار لە بەڵگەنامەیەکی ڕەسمیدا وەکو (برا) ئاماژەیان بۆ کرا، کە وەزع و حاڵی یاساییان لە چوارچێوەی کۆماری

عێراقدا رێکخرێ. هەروەها بەڵێنی ئەوەیان درایێ کە لە ئایندەدا خود موختاریان بدرێتێ و رێگە بدرێن زمانی کوردی وەکو زمانێکی رەسمی بەکار بێنن. بەڵێنیان درایێ کە ژمارەیەک قوتابخانەو دەزگای رۆشنبیری کوردییان بۆ بکرێتەوە. وەکو هەنگاوێکی سەرەتایی و گرینگ، ئەو بروسکە مێژوییە بۆ کرملین فرێکرا، کە بریتی بوو لە بەخشینی سەرۆکی کورد لە هەموو ئەو تاوانانەی کە جاران ناراستەی کرا بوون، و رێگەدانی کە بۆ بەغدا بگەڕێتەوە. جارێکیان بارزانی لە یادی ئەو رووداوەدا گوتی: "ئەو رۆژە مانای ووشەی بەغدامان بە بیردا هات کە مانای (دیاری خوا) دەگەیەنێ".

## کوردو شادییەکی کەمخایەن

رۆژێک بوو لە رۆژەکانی هەوەڵی ت١، هەزاران کەس لە لایەنگرانی بارزانی لە فرۆکەخانەی بەغدا خڕبوونەوەو چاوەنۆڕی ئەو فرۆکە تایبەتی یە بوون کە لە موسکۆوە دەهات. ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی بە جلی مەدەنی و ژمارەیەک لە پێشوازیکەرانی عەرەب کەنوێنەری رژێمی کۆماری تازە بوون، لە ریزی پێشەوەی جەماوەری پێشوازیکەراندا بوون کە هەندێکیان جلی کوردییان لەبەردا بوو. بارزانی، کە ئەو کاتانە لە تەمەنی ٥٨ساڵیدا بوو، کە لە فرۆکەی (دوگلاس) دابەزی؛ دەستی بۆ ئەو جەماوەرە بەرز کردەوە کە هاتبوونە پێشوازی کردنی، ٥ کەس لە نزیکترین کەسانی لە پشتی وەستان، لەو کەسانەی کە لەگەڵیدا بۆ نیشتمان گەڕابونەوە، لەوانە: شێخ سلێمان و شێخ بابو، ئەم دوانە خزمی خۆی بوون، یەکەمیان خوارزای خۆی بوو، دووەمیان ئامۆزای بوو، هەروەها ئەسعد خۆشەوی کە جاران ئەفسەری سوپای عێراقی بوو، و لەگەڵ بارزانی دا پێکەوە لە کۆماری مهاباد خزمەتیان کرد بوو.

جەماوەری خەڵکەکە پربەزار هورایان دەکێشا: (بەخێر بێیتەوە بارزانی) بارزانی پاش چاک و خۆشی و دەست لەملانێ لەگەڵ هەمزە عەبدوڵلا و حیلمی شەریفی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەگەڵ یاوەرەکانیدا سواری ئەو ئوتومبیلە بووکە چاوەڕوانی دەکرد. بە پێ ی پروپاگەندەکان ئەو ئوتومبیلە هەمان ئوتومبیلەکەی عبدالاله بوو کە لە یەکەم رۆژی شۆڕش دا کوژرا، قاسم فرمانی دا بوو ئەو ئوتومبیلە بۆ سەرۆکی کوردو هاوپەیمانی ئایندەی تەرخان بکرێ. شوفێرەکە بەرەو ماڵی سەرەک وەزیرانی کوژراو (نوری سەعید) ئوتومبیلەکەی هاژۆت، واتا بەرەو ئەو ماڵەی کە بڕیاردرا بکرێ بە بارەگای بارزانی لە مانگەکانی ئایندەدا.

رۆژنامەوانێکی عێراقی ئەو رۆژانەی بە زەماوەندێکی خۆش شوبهاندوە، بەمەش ئاماژەی بۆ ئەو پێشوازییە گەرمە کردووە کە(عبدالکریم قاسم)ی عەرەب لە بارزانی مستەفای کوردی کرد. هەڵبەتە ئەم (زەماوەندە) بێ وێنەیە هەروا بە ئاسانیش سەری نەدەگرت: چونکە زۆر کۆسپ و بەرهەڵستی لە رێگەدا بوو. لە کاتێکدا جێگری

سەرەک وەزیران و وەزیری ناوخۆ عبدالسلام عارف سانسۆری عەسکەری خستەسەر هەموو بلاو کراوەو چاپەمەنییە کوردییەکان، (عبدالکریم قاسم)ی سەرەک وەزیران لە رۆژی ٧/٢٧ دا پێشوازی لە شاندێکی کوردی کرد بە سەرۆکایەتی ابراهیم ئەحمەد کە یەکێک بوو لە سەرکردە دیارەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. کورد بە شێوەیەکی گشتی پشتگیریان لە رژێمی تازە دەکرد و چاوەڕوانی شتی زۆریان لێدەکرد، پشتیوانیان لە روخانی مەلیک فەیسەڵ و کشانەوە لە پەیمانی سەنتۆی کرێگرتەی رۆژاوا کرد. لەو کاتەدا کە پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی پشتیوانی خۆیان لە رژێم راگەیاند، جەمال نەبەز، کە نوێنەری رەوتی سێیەم بوو، پشتیوانی خۆی بۆ رژێمی تازە بەوەوە بەستەوە کە ئەم رژێمە تا چەند بە دەنگ داخوازییەکانی کوردەوە دێت و جێ بەجێیان دەکات.

قاسم، پێشنوسی دەستوری تازەی عێراقی کە ئاماژەیەکی تێدا بوو بۆ ئەوەی کە عەرەب و کورد شەریکن لە عێراقدا، خستە بەردەم شاندی کوردی، بەلام هەر هەمان دەستور مادەیەکی ئاشکراشی گرتبووە خۆ کە دەڵێت عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب؛ دیارە ئەمە لەگەڵ بۆ چونی کوردا نەدەگونجا. بەلام سەرباری ئەمەش پەیوەندی نێوانیان هەر بەخۆشی مایەوە.

بارزانی گەڕایەوە، هاوسەنگی هێز بە ئاشکرا بە قازانجی کورد شکایەوە. ژمارەی ئەندامانی حیزبەکەی بارزانی گەییە پتر لە بیست هەزار ئەندام. ئیدی بوژانەوەیەکی رۆشنبیریی کوردی راستەقینە دەستیپێکرد. چەندین کتێب و گۆڤاران بە زمانی کوردی بلاوکرانەوە. ئەمە جگە لە رێدان بە خوێندن بە زمانی کوردی لە سەرانسەری قوتابخانە سەرەتاییەکانی باکوری وولات. لە بەغدای پایتەخت-شدا کۆڕی زمانەوانی کوردی هاتە دامەزراندن، رادیۆی بەغدا کەوتە بلاوکردنەوەی بەرنامەیەکی تایبەتی بە زمانی کوردی. رەمزێکی دی بۆ ئارامی کۆماری تازە زیاد کرا کە بریتی بوو لە خەنجەری کوردی لەپاڵ شمشێری عەرەبیدا. لە بەهاری ساڵی ١٩٥٩دا، دوا پەنابەری کورد لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕانەوە. هەڵبەتە ئەمە نیگەرانی دەخستە دڵ ودرونی حوکمرانانی وولاتانی پەیمانی سەنتۆی دراوسێوە.. ئێران و تورکیا قایل نەبوون پەنابەرەکان بە خاکی ئەواندا بگەڕێنەوە. چونکە نەدەکرا فڕۆکەی عەسکەری سۆڤیەتی بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنرێ بۆیە لە رێگەی دەریاوە گوێزرانەوە. یاوەرانی جارانی بارزانی، بەخۆو ماڵ و منداڵەوە لە مینای ئودیسای دەریای رەشەوە سواری ئەو کەشتیانە بوون کە بۆ گواستنەوەیان تەرخانکرابوون. ئاژانسی دەنگوباسی یونایتدپرس بەمجۆرە باسی ئەو رووداوەی کردووە: "کەشتی کروسیا، کە ١١٠ هەزارتۆن هەڵدەگرێ، بەرەو بەسرە کەوتە رێ، ٨٥٥ جەنگاوەری کوردی هەڵگرتوەو لە وێندەر جنسی یە عێراقییەکانیان دەدەنەوە".. بمینەوەو لە دەزگاکانی حیزبدا کار بکەن. بەلام زۆریان بۆ زێدو نیشتمانی

خۆیان گەڕانەوە. گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی مێرگەسور، بارزان، یان نامێدی. ئەمانە، پاش تێکچونی کورد لەگەڵ قاسم دا، بوون بەکۆڵەکەو بڕەبڕەی پشتی بزاڤی چەکداری نوێ ی کورد.

بارزانی، لە نیسانی ١٩٥٩دا، مۆڵەتی دەرکردنی یەکەم ڕۆژنامەی ڕۆژانەی کوردی بەناوی (خەبات) وەرگرت.. لە ساڵی ١٩٦٠دا مۆڵەتی ڕەسمی بۆ پارتی وەرگیرا کە بتوانێت بە ئاشکرا چالاکی و چەلەنگی یەکانی خۆی ئەنجام بدات، دیارە ئەمە یەکەم جار بوو لە مێژووی پارتی دا ڕێ بدرێ بە ئاشکرا چالاکی ئەنجام بدات، چونکە پێشتر لەبەر ئەم هۆ یان ئەو هۆ مەحروم بوو لە ئازادی کاری سیاسی، هەڵبەتە ئەو گفت و بەڵێنی ئوتونومی یەی بە کورد درابوو، بە شێوەیەکی ئاسایی نەدەڕۆیی. چونکە هەر لە سەرەتادا ناکۆکی ئاشکرا لە نێوان هەردوولادا هەبوو، بە تایبەتی لەسەر ئەم مەسەلانە: دیاری کردنی سنوری ناوچە کوردنشینەکان لەگەڵ ناوچە عەرەب نشینەکاندا.. ئایا کانە نەوتەکانی کەرکوک و خانەقین بخرێنە سەر ناوچەی ئوتونومی بەو حەساوە زۆربەی دانیشتوانیان کوردن؟ ڕێژەی دەرامەتی نەوت چەندی بۆ کوردستان تەرخانبکرێ تا لە هەردوو ڕووی ئابوری و کۆمەلایەتی یەوە گەشە بکات و لە پاشکەوتوویی ڕزگار ببێ؟ هێزی چەکداری ناوچەی ئوتونومی تا چەند سەربەخۆ بێ و تا چەند پەیوەست بێ بە دەسەلاتی ناوەندییەوە؟ خەڵکی عەشایەری کورد ڕێ دەدرێن چ جۆرە چەکێک و چەند چەک هەڵگرن، بە تایبەتی کە پاش شۆڕشی چواردەی تەموز ڕادەی چەکداری زیادی کرووە؟.

## پیترۆڵ؛ خاڵی ناکۆکی سەرەکی

بەلام نەوت هەر لە هەوەڵەوە تاکو ئەمڕۆ فاکتەری هەرە گرینگی مەسەلەکانی پێک هێناوە. سیاسەتی ڕۆژهەلاتی ناڤین و جیهان و زلهێنەرەکان، هەر هەمووی بەدەوری نەوتدا سوڕاوەتەوە. هۆی هەڵگیرسانی هەموو شەرەکانی ناوچەکە، لە نیلەوە بیگرە تا کەنداوی فارسی لە سالانی سییەکانی ئەم سەدەیەوە یان لە پێناوی کۆنترۆڵ کردنی ناوچە پرنەوتەکان بووە یان لە پێناوی ڕێگە خۆشکردن بووە بۆ گەیشتن بەو کانە نەوتانە.

ئاشکرایە لە پێناوی ئەو ئامانجەدا دەیان شەر هەڵگیرسێنراوە و چەندین ڕژێم ڕوخێنراون. هەڵبەتە عێراقی یەکان و کوردش لە نزیکەوە هەستیان بەو بابەتە ستراتیژییەی نەوت کردووە؛ لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٨دا هێزی پیادەی دەریایی ئەمریکی لە لوبناندا دابەزی. فەڕەنساو بەریتانیا پەلاماری کەناڵی سویس-یان دا. هێزی بێگانە پشتیوانی و کۆمەکی حوسەینی مەلیکی ئوردنیان کرد دژی فەلەستینییەکان هەر هەموو ئەم کارانە بۆیە ئەنجام دران تا بەرژەوەندییەکانی ڕۆژاوا لە

نەوت بێتە پاراستن. تەنانەت دامەزراندن و دروستکردنی پەیمانی (سەنتۆ)ش بریتی بوو لە دامەزراندنی پشتێنەیەک لە وولاتانی سەربە رۆژاوا، وەک: تورکیا، عێراق، ئیران، ئەفغانستان تا دەگاتە پاکستان.

ئەگەر ناکامی کارەسات ئامێزی کۆماری مهاباد غوونەیەک بێ و هێشتا لە هزرو بیرا بزرنگێتەوە، ئەوا کورد پێویستیان بەم بەڵگەیە نەبوو کە چارەنوسی نەتەوەییان بەمجۆرە پەیوەست بووە بە نەوتەوەو هەر نەوت ئەم بایەخە ستراتیژییەی بۆ وڵاتەکەیان پێک هێناوە. کورد ناوی گرینگترین سەرچاوەو کانگای نەوتیان لە سرودە نەتەوەییەکانیاندا تۆمار کردووە.. بارزانی و کورد سور بوون لەسەر ئەوەی کوردیش بەشیان لە گڕی فانۆسە سیحرییەکەی عەلادین دا هەبێ و بەوە قاییل نەبن عەرەب وکۆمپانیا رۆژاواییەکان هەر خۆیان لەبەر ئەو گڕە سحری یە گەرم بکەنەوە. هەڵبەتە بوونی زەخیرەی (احتیاطی) نەوت لە سێگوشەی نێوان موسڵ و کەرکوک و خانەقین دا، شتێک بوو لە هەزاران ساڵەوە زانرا بوو: "فریشتەکانی خوا دابەزینە سەر زەوی و مەشخەڵ و شولەی ئاگرەکەیان لە کوانوی ئاگردا خەفە کرد". (دانییال-٣). ئەم ئاگرەی کە نەبوخەز نەسری پاشای بابلی بەر لە ٢٥٠٠ ساڵ، جولەکەکانی پێ دەترساند، تائەمڕۆی هەر لە بڵێسەدایە.

باوەگوڕگوڕ، ئەو ناوەیە کە کورد لەو گڕی غازە هەڵایساوەی هەڵقوڵاوی نێو تاوێرەکانی باکوری کەرکوکیان ناوەو لە ساڵی ١٩٢٧وە زێڕی رەش لە ناوجەرگەی خاکی کوردستانەوە دەردەهێنرێ. بۆ وێنە کۆمپانیای نەوتی عیراقی بەریتانی لە ساڵی ١٩٦٠دا توانی نزیکەی پەنجا ملیۆن تۆن نەوت لەوکانگایە دەر بێنێ کە بایی دوو سەد ملیۆن جونەیهی سافی بوو.

بەپێ ی هەندەک مەزەندان، بیرەنەوتەکانی کەرکوک لە ساڵانی شەست دا بە تەنێ بایی بیست ملیار مارکی ئەڵمانی بەرهەمی داوە. دیارە ئەم پارەیە بەشی ئەوە دەکات هەموو کەسێکی خەڵکی عێراق لە ژیانی نێو زنج و کەپران دەرباز بکات. کەچی وەکو هانز هاوزر-ی رۆژنامە نوسی ئەڵمانی کە لە ساڵی ١٩٧٥دا سەفەرێکی کوردستانی کردوەو ئاماژەی بۆ ئەم حەقیقەتە کردووە: تەنیا کورد بێبەش بوون لەم سەروەت و سامانەی کە لە خاکی ئەوان دا دەردەهێنرێ.

ئەندازیارێکی بەریتانی کە بە خۆی لە کۆمپانیای نەوتی عێراقدا کاری کردووەو بە چاوی خۆی ئەو ساتە مێژووییەی دیتوە کە بۆ یەکەمجار نەوت لە بیرە نەوتەکانی باوەگوڕگوڕەوە فیچقەی کردوە.. لە وەسفی ئەو ساتانەدا دەڵێ : "کاتێ کاری هەڵکەندنمان گەیە بیری باوەگوڕگوڕ، نەوت هێندە بەتەوژم فیچقەی کرد، هەر هەموو دەزگاکانی هەڵکەندنی برد بە حەوادا. نەوت و غاز هێندە بە تەوژم بەرز بووەوە. کەوتە سەرووی هەموو بورج و ریکەکانەوە، بوویە هەورێکی رەش و هەڵمێکی کوشندەی

بەسەر کرێکارەکاندا دابارناند. ئیدی نەوت بە هەموو دۆڵ و کەلێنەکانی دەورو بەرماندا ڕێ ی کرد، خۆشبەختانە نەوتەکە گڕی نەگرت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا چەند کەسێک خنکان. ئەوانی دی زۆر قارەمانانە کەوتنە ڕزگار کردنی هاوڕێکانیان. پاشان بۆمان بە دیارکەوت کە ئەم بیرە نەوتە یەکێکە لە بیرە نەوتە هەرە مەزنەکانی هەموو جیهان.

یەکێک لەو هۆیانەی کە کوردی هاندا پشتیوانی لە شۆڕشی قاسم بکەن، ئومێدی ئەوە بوو کە پرۆسەی تالانکردنی بەردەوامی سامانی نەتەوەییان لەلایەن کومپانیاکانی ڕۆژاواوە بوەستێ؛ چونکە ڕژێمی تازە، ڕایگەیاند کە بەنیازە ڕوو بە ڕووی ئەو پرۆسەی تالانکرنە بوەستێ و سنوری بۆ دابنێ. کوردەکان زۆریان پەلە نەکرد لە داوا کردنی بەشە نەوتی خۆیاندا، چاوەنۆڕی ئەو ڕۆژە بوون کە چیتر ئەم سامانە بەرەو هەندەران نەبرێ. بە هیوا بوون کە ڕژێمی عێراقی بە خۆی ئەم مافە بستێنێ. بەڵام ڕاگەیاندنی خۆماڵیکردنی نەوت لە لایەن قاسمەوە، دوای سێ ساڵان ئەوجا دەست بە جێ بەجێکرنی کرا، واتا لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦١وە کە بڕیار بوو لەو ڕۆژەدا ٩٩٪ ی کانە نەوتەکان خۆماڵی بکرێن.

لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا، دردۆنگی کەوتە نێوان عێراق و کورد و بە ئاشکرا پەیوەندییەکانیان تێک چوو. هەرچەندە بەپێ ی ماددەی سێیەمی دەستوری کاتیی عێراقی: "عەرەب و کورد شەریکن لەم وڵاتەدا". بەڵام لە مەیدانی پراتیکی دا ئەوە بە دیارکەوت کە حوکمڕانانی تازە، ئامادە نەبوون بە جدی گیروگرفتی کەمە نەتەوەییەکان لەبەرچاو بگرن.

دیار بوو (قاسم)ش وەکو فیودالەکانی بەرلەخۆی، عێراقی بە دەولەتێکی عەرەبی یەکگرتوو دەزانی. ڕژێم بە ئانقەست خۆی لە جێ بەجێکرنی بەڵێنەکانی دەدزی یەوە کە قوتابخانەی کوردی بکاتەوە، بگرە لە هەندێ شوێندا پاشگەز بوەوەو بەڵێنەکانی بەتەواوتی پشتگوێ خست.

کاتێ ڕژێم ڕایگەیاند کە بە تەمایە مەرج و باجی زێدە لەسەر چاندن و فرۆتنی توتن دابنێ، کە بەرهەمێکی سەرەکی کوردستانی پێکدە هێنا، باروودۆخەکە هێندەی دی گرژ بوو. قاسم پەنای وەبەر ئەو شێوازە کۆنانە بردەوە کە ڕژێمانی حوکم لە عێراق و ئێران و تورکیادا دەرهەق بە کورد پەیرەویان کرد بوو؛ ئەویش بریتی بوو لە هاندانی کورد لە یەکترو تەفرەقە نانەوە لە نێوانیاندا. بۆیە قاسم کەوتە چەکدارکرنی عەشایەری زێبارو ڕێکانی کە لە ڕۆژانی کۆماری مهابادەوە دژایەتی بارزانیان دەکرد؛ ئیدی قاسم کەوتە هاندانی ئەم خێڵانە لە بارزانی ودژی بارزانی.

لەلایەکی دی یەوە ڕوداوەکان دەریانخست ئەو پاڵپشتانەی کە قاسم پاڵی دابوو پێوەی، پاڵپشتی زۆر لاوازن. ئەمە ئەوکاتە دەرکەوت کە (عبدالسلام عارف)ی جێگری سەرەک وەزیران، لە ئەیلولی ساڵی ١٩٥٨ دا ویستی پیلان لە قاسم بکات، ئەوە بوو پیلانەکەی سەری نەگرت و یارو دەستگیر کراو پلەو پایەکانی لە دەست دا.

لە ئازاری ساڵی ١٩٥٩ دا هەندێ ئەفسەری (ناسری) سەر بە جمال عبدالناصر، ویستیان لە سەربازخانەی موسڵەوە کودەتایەکی نیزامی بەر پا بکەن، لەوە بوو بگەنە بەغدا ئەگەر قاسم فریا نەکەوتباو بارزانی بێ لایەن نەکرد با و پاشان پەنای بۆ یەکە چەکدارەکانی شیوعی یەکان نەبرد بوایە بۆ سەرکوت کردن و دامرکاندنەوەی کودەتای ئێوبراو؛ بۆیەش پەنای وەبەر یەکە چەکدارەکانی شیوعی برد، چونکە نەیدەتوانی هێزەکانی خۆی لە بەغداوە فرێ بکات.

بەڵام دکتاتۆر، وەفای بۆ ئەو شیوعییانە نەبوو کە ڕزگاریانکرد. ئەوە بوو لێیان هەڵگەڕایەوەو سەدان کادرو ئەندامی حیزبی شیوعی دەستگیر کرد، ئەم هێرش و پەلاماری گرتن و ڕاوەدونانە مەسیحی یەکانیشی گرتەوە، کە زۆریان ناچار بوون بۆ کوردستان هەڵێن و ئەمەش وای لە قاسم کرد هێندەی دی گومان لە کورد بکات.

لەو سەردەمەدا دژایەتیکردنی کورد پتر پەرەی سەند، ئەمەش زەمینەی بۆ تەقاندنەوەی بارودۆخەکە خۆشکرد. ئەوە بوو لە ساڵانی ١٩٦١-١٩٧٠دا شۆڕشی ڕزگاریخوازی کورد بەرپا بوو و هەڵایسا. زۆر ئەفسەری کورد لە سوپا دەرکران، فەرمانبەرانی کورد لەکار دەرکران، ڕێکخراوە پیشەییە کوردییەکان داخران و هەڵوەشێنرانەوە. ڕۆژنامە و گوڤارە کوردییەکان قەدەغەکران.. ڕۆژنامەی (خەبات)ی ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە وتارێکیدا لە ئازاری ١٩٦٠دا حکومەتی بەوە تاوانبار کردوە کە مادەی سێیەمی دەستوری کاتی، کەباسی شەریکایەتی و برایەتی عەرەب و کورد لە حوکمڕانی عێراقدا دەکات، نەک خۆ سەپاندنی ئەمیان بەسەر ئەویاندا، پیشتگوێ دەخات.. ئەوە بوو (خەبات)ش هاتە داخستن و ژمارەیەکی زۆر لە سیاسەتوانانی چەلەنگ و چالاک دەستگیر کران.

## قاسم، داواو کاری کوردان پشتگوێ دەخات

لە هاوینی هەمان ساڵدا، شاندێکی کوردی ویستی قاسم ببینێ، قاسم جواوی لێ گێڕانەوە کە مانگێکی دی چاوەنۆڕ بکەن،کەچی دوای مانگەکەش هەر نەیدیتن و تەنها ئەوەندە ڕێ بە شاندی ئێو براو درا کە یاداشتنامەیەک بۆ قاسم بنووسن، یادداشتنامەکە، بڕیارەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی سەبارەت بە ئۆتۆنومی کورد، لە چوارچێوەی کوماری عێراقی تێدا بوو. خاڵی گرنگی ئێو یادداشتنامەکە بریتی بوو لەم خاڵانە کە لە هەموو هەوڵەکانی دواتریش دا دوبارە بوونەتەوە:

١- زمانی کوردی، لە پاڵ زمانی عەرەبیدا، دەبێت بە زمانی رەسمی و پەسند لە ناوچەکانی ئوتونومی دا.
٢- پۆلیس و سوپا لە ناوچەی ئوتونومی دا دەبێ کورد بن و زمانی کوردی زمانی قسە کردن و کاروباری رەسمی دەبێت.
٣- ئەنجومەنی جێ بەجێکردنی ناوچەی ئوتونومی خۆی بەرپرسیار دەبێت لە هەموو کاروبارێکی پەروەردەو فێرکردن و رۆژنامەوانی و راگەیاندن و تەندروستی و کارگێری ناوچەیی.
٤- سیاسەتی دەرەوەو بەرگری و ئابوری و دارایی کاری دەسەڵاتی ناوەندی دەبێت، بەمەرجی کورد بەشی خۆی لە هەموو مەڵبەندە سەرکردایەتی یەکانی دەسەڵاتی ناوەندی دا هەبێ، هەر لە جێگری سەرکۆمارەوە بیگرە تا دەگاتە وەزیرەکان و یاریدەدەرانی وەزیرەکان.

قاسم، وەڵامی ئەم داوایانەی نەدایەوە. بارزانی یەکەم کەس بوو هەستیکرد قاسم، ئەو پیاوەی لە سەرەتادا زۆری بە باڵا دا هەڵگوترا، ئایەوێ ئوتونومی بۆ کوردستان دابین بکات و ناشیەوێ دیموکراتیەت بۆ عێراق بگێرێتەوە یان کار بۆ وەدیهاتنی یەکێتی ی عەرەبی بکات. بارزانی هەستیکرد کە هەموو خەمێکی قاسم ئەوەیە شوێنەکەی خۆی بپارێزێ و لە لوتکەی دەسەڵاتدا بمێنێتەوە بەوەی هێزە سیاسی و نەتەوەیی و ئاینی یەکان لێکدی تیژ بکات و هان بدات و بەگژ یەکیاندا بکات.

لە پایزی ساڵی ١٩٦٠دا بارزانی و قاسم بە یەکجارەکی لێکدی جودا بوونەوە؛ لەکاتێکدا بارزانی بە سەردانێکی نیعلامی چوو بووە مۆسکۆ. قاسم بەوە تاوانباری کرد کە کرێگرتەی پەیمانی سەنتۆیە. لەو کاتەدا کە قاسم ئەو تۆمەتانەی دەدایە پاڵ بارزانی، بارزانی لە تەنیشت نیکیتا خروشوف و سەرانی تری سۆڤیەتی دا لە سەرتریبونی شەرەف وەستا بوو و دەیروانی یە مەیدانی سوور و لەگەڵ ئەواندا تەمەشای ئەو نمایشە سوپاییەی دەکرد کە بە سەر رێگەی بەفرگرتودا و بە بۆنەی یادی شۆڕشی ئوکتوبەرەوە رێیان دەکرد.

هەرچەندە ئەم سەردانەی بارزانی دەنگدانەوەیەکی باشی بوو و لە بواری راگەیاندن دا سەرکەوتنی بە دەستهێنا، بەڵام بارزانی لە مۆسکۆ گەڕایەوە بێ ئەوەی سەرکەوتنێکی عەمەلی ئەوتۆ بە دەست بێنێ، هەروەها نەیتوانی چ کفت و بەڵێنێک لە سۆڤیەت وەربگرێ کە یارمەتی بدەن. بارزانی، فەرمانی دا ژمارەیەک لە جەنگاوەرانی گوێرایەڵی خۆی لە بارزانەوە بێن بۆ بەغدا تا پاسەوانی ماڵەکەی و بارەگای حیزب بکەن و خۆی و بارەگاکە بپارێزن. وا دیارە ئەم کارە پاکانەی خۆی هەبوو؛ لە مانگی کانونی یەکەمدا کرێکارانی عەرەب، بەفیتی حکومەت لە بەردەم ماڵی بارزانی و

بارەگای پارت دا کەوتنە خۆ پیشاندان و هوراکێشان دژی کورد و داوا کردنی یەکێتی ی عەرەب.

کاتێ خۆپیشاندەران ویستیان پەلاماری خانووەکە بدەن، کێشکچی یەکانی بارزانی تەقەیان لێکردن و چەندین کەسیان لێکوشتن و بریندار کردن. بەمەش دوا پردی کاری هاوبەشی نێوان کورد وعێراق لە سایەی حوکمرانی قاسم دا رووخا.

ئا بەمجۆرە ئەو زندە خەونە خۆش خۆشانەی کە لە ساڵی ١٩٥٨ وە دەستیپێکرد، پوچەڵ بوەوە. پاش بە سەر چوونی وەرزی (بەهاری کوردی- عێراق) پایزێکی تاری جێیگرتەوە؛ بارزانی دەیزانی ماوەیەکی ساردو سڕی سەهۆڵبەندانی پڕ لە کێشەی تفت و تاڵ لە سەردەسەلات، ئەم قۆناغەی خەباتی گەلەکەی دەگرێتەوەو ئەم قۆناغە دەپێچێتەوە. بۆیە لە مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٦١دا ماڵەکەی لە بەغدا بە جێهێشت؛ دەستبەرداری ئەو هەموو خۆشگوزەرانی یە بوو کە حکومەت لە بەغدا بۆی دابین کردبوو، دەستبەرداری ماڵی زۆر و ئوتومبیلەکەی وەسی و موچەی مانگانەی مۆڵ بوو، و گەڕایەوە بۆ شاخ.

# تەسی دەیەم

*"... لە نەزانانەوە فێر بووم..."*

## جەنگی ئەهلی عێراقی - کوردی تا ساڵی ۱۹۷۰

"هەواڵێک لە بەغدادا دەگوترێتەوەو دەماو دەم دەکات کە گوایە هێزی ئاسمانی عێراقی ساڵی پار پتر لە سەد گوندی کوردی لەگەڵ عاردیدا تەخت کردوە کە تەنیا ژن و منداڵیان تێدا بووە؛ چونکە هەموو پیاوەکان داهوویانە شاخ. لە بەغدایا کەس باوەڕ ناکات سوپای عێراقی بتوانێت بە سەر جەنگاوەرانی کوردا سەر بکەوێت یا ژمارەشیان کەم بێت. چونکە سوپای عێراق، یەکەی جەوەڵی لێهاتوی نییە. ئەوانەش کە شارەزاییان لە شەڕی شاخ دا هەیە هەموو کوردن. لە کاتێکا حاڵی حازر پێکدادانی تازە لە نزیکی شاری سلێمانیدا دەستپێکردوە، دەرفەتی سەرکەوتنێکی ئەوتۆ لە گۆڕێ نییە کە شایەنی باس بێت. لە لایەکی دییەوە ئەم کارە سوپاییانە سەرکێشی و قومارێکی گەورەیە بۆ خودی قاسم، چونکە ناچار بووە ئەو یەکە سوپاییانە بنێرێت بۆ شەرگەکان کە لە بنەڕەت دا. بۆ پاراستنی پایتەخت و کۆنترۆڵی کاروبارەکانی پایتەخت تەرخان کرا بوون".

رۆژنامەنوسی ئەڵمانی دیار (گیزل هیرفرزنگ)ی سەر نوسەری گۆڤاری(مەسیحی یەکان و جیهان) لە ساڵی ۱۹٦۲ دا بەو رستانەی سەرێ پوختەی ئەو وێنانەی بەرجەستە کرد کە خەریک بوو لە رۆژاوا دا دەربارەی (کوردستانی هۆڤی) و ئەو جەنگی رزگاریخوازییەی کە خەڵکە کوردەکەی هەڵیان گیرساند بوو، دروست دەبوو.

ئەم شۆڕشەی کە بە گەورەترین شۆڕشی مێژووی گەلی کورد دەژمێردرێ، لە سەرەتادا بە شێوەیەک دەستی پێکرد لە تۆ وایە تەنیا هەندێ روداوی پەراگەندەیەو لە ئەنجامی ناکۆکی و پێکدادانی ناوخۆیی کوردانەوە دروست بووە. بارزانی، لە سەرەتای پایزی ساڵی ۱۹٦۰دا توانی بە کەمتر لە ۵۰۰ جەنگاوەر زۆربەی هەرە زۆری ناوچەی باکور، لەو خێڵانە پاک بکاتەوە کە چەکیان لە حکومەت وەرگرتبوو بۆ دژایەتی بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان. ئیدی ئەوە بوو ناوێکی ناشیرین و حەیابەرە لەو ئاغاوات و شێخ و پیاوانەیان نرا کە قاییل بوون حکومەت بە ئارەزووی خۆی جلەویان بکات، وەکو چۆن ئەمە حاڵیان بوو لە سی یەکان و چلەکاندا. ئەم ناوەش کە پڕ بە پێستیان بوو بریتی بوو لە جاشی شەست و یەک -۱۹٦۱. ئەم ناوە تاکو رۆژگاری ئەمڕۆش لە سەرانسەری کوردستاندا باوەو بە هەموو ئەو کوردانە دەگوترێ کە هاوکاری حکومەتە دوژمنەکان دەکەن و چەک دژی شۆڕشگێرانی کورد هەڵدەگرن. کە بارزانی توانی جاشەکان راو بنێ و بە تەواوەتی تەنگیان پێ هەڵچنێ، زۆربەی لاوانی ئەو خێڵانە

وازیان لە جاشایەتی حکومەت هێناو گەڕانەوە بۆ کوردستان و پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەی بارزانی یەوە کرد.

بارزانی بەو پەری توانا و عەزمی بەتینەوە لە ماوەی چەند مانگی پاشتردا کەوتە قایمکردنی سەنگەرەکانی و بیناکردنی بنکەیەکی ماددی و بە شەری نەوتۆ کە بتوانێت خۆی لە بەردەم هێرشی ئایندەی هێزی چەکداری نیزامی و سوپایی و پۆلیس و دەرەک رابگرێ. بارزانی، توانی تا هەیڤی ت ۱، رووبەرێکی هەشت هەزار کیلۆمەتری چوارگوشە لە ناوچە شاخاوییە سەختەکانی نزیکی سنووری ئێران رزگار بکات و عەماری ئازوقە و ئوردوگای مەشقی سەربازی و بارەگای سەرەکی شۆڕشی سەرانسەری سنووری عێراق لەگەڵ ئێراندا کەوتنە دەست هێزەکانی بارزانی و سنووری عێراق-ئێرانیان لێ پاککرایەوە، تا رێگە خۆش ببێ کە لە ئایندەدا کەلوپەلی پێویست لەو دیوەوە بگاتە شۆڕشگێڕان.

ژمارەی چەکدارانی بارزانی، بە مەزەندەی سوپا سالاری ئەو وەختی ئێران، لە کۆتایی ساڵی ۱۹٦۰دا گەیییە نزیکەی حەوت هەزار جەنگاوەر، بارزانی، توانی بە هۆی ئەم هێزەوە زۆر ناوچەی گرینگی ستراتیژی لە شاخ و دۆڵ و گوزەرو پردو مەخفەری سنووری بگرێ. پۆلیسی مەخفەرەکانی سەر سنوورو سەربازی سەربازخانە بچوکەکانی نێو دۆڵ و شاخە دوورە دەستەکان، هەموو چەک کران. بارزانی، ئەمجارەش، وەکو ساڵی ۱۹٥٤، رێ ی بە سەربازو پۆلیسە چەککراوەکان دا بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان.

بەرانبەر بەم رەوش و بارودۆخە، حکومەتی بەغدا هەمان ئەو هەڵەیەی دوبارە کردەوە کە حکومەتی تورکیا بەر لە سەد ساڵێک بەرانبەر بە یەکێک لە شۆڕشەکانی کورد کرد بووی. هیلموت فون مولتکە، کە ئەو سەردەمانە راوێژکاری نیزامی عوسمانییەکان بوو، لە کتێبێکی دا بە نێوی (چەند نامەیەک لە تورکیاوە) باسی ئەو بابەتەی کردووەو گێراوێتی یەوە کە چۆن لە سالانی ۱۸۳۸و ۱۸۳۹دا هێزێک لە سەربازانی نیجباری کورد رەوانەی سوریا دەکرێت بۆ دامرکاندنەوەی ئەو پەشێوییەی لەوێندەر بەرپا دەبێت. جا نوسیویەتی و دەڵێ: "ئەو کوردانەی کە پتر لە نیوەی هێزەکەمانیان پێک دێنا لە راستیدا دژمنی یەکەمان بوون. کەوتنە تەقە کردن لە ئەفسەرو سەربازە نا کوردەکان، زۆربەی دەروو وپیادەرێ یە شاخاوییەکانیان لێگرتین. زیاد لە جارێک هەوڵیاندا خودی حافظ پاشای فەرماندەی گشتی هێزەکە لە پەناوە بکوژن. هەندێکی تریان چەکەکانیان فرێ دا و جلە سەربازییەکانیان دراندو بەدەم گۆرانی یەوەو بە خۆشحالی یەوە بۆ گوندەکانی خۆیان گەڕانەوە".

زۆر زەحمەتە فەرماندەو سەرکردە سوپاییەکانی عێراق، کتێبەکەی ئەم راوێژکارە شارەزایەیان دیتبێ. چونکە ئەوە بوو رژێمی عێراق لە ئەیلولی ۱۹٦۱دا چوار کەتیبەی سوپایی بۆ سە نشمەرگەکانی بارزانی نارد، زۆربەی هەرە زۆری ئەم قوەتە لەو

کوردانە بوون کە بە ئیجباری گیرا بوو. سەربەر بویە لەگەڵ یەکەم تەقەدا بە چەک وجل و بەرگەکانیانەوە پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کردو پاشان هەزاران سەربازی کوردی عێراقی دیکەش هەمان ڕێچکەی ئەوانیان گرتەبەر.

## ١٩٦١: سەرەتای شۆڕشی کورد

گەلێک لە کوردەکان و ژمارەیەک لە چاودێران، کە ڕەوتی ڕووداوەکانیان دەبینی، هەستیان دەکرد ئەم شۆڕشە تازەیە هەوێنی ڕێبازێکی تازەی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە کە ڕاپەڕین و بزاف و شۆڕشەکانی پێشووی کورد بە خۆیەوەی نەبینی بوو. ئەمەش وایدەکرد کە لە شۆڕشەکانی پێشوو جیاواز بێت. کورد ئەمجارەیان تەنیا، مۆلتکە گوتەنی (بەزکماک جەنگاوەر) نەبوون، بەڵکو ئەمجارەیان دیار بوو کە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو دەخەبتێن. بۆ یەکەمین جار ڕۆشنبیرانی شارو پیاوانی عەشایەری جەنگاوەر، سوسیالستانی داواکاری ڕیفورمی زەوی و خەڵکانی ڕەوەند لەیەک بەرەدا کوبونەوەو لە پێناوی دیاریکردنی چارەنوس و جۆری ژیانیاندا دەجەنگێن، هەرچەندە ئەمە دوای هەوڵێکی زۆر و چەندین نسکۆ هاتبووە دی. ئەمە جگە لەوەی کە شۆڕشی تازە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی یەوە گەلێک مەوداو ڕەهەندی سیاسی روون ولایەنی سوپایی و جەنگاوەری لەخۆ گرتبوو.

حەسەن ئەرفەعی ئەفسەرو مێژوو نوسی ئێرانی دەربارەی ئەم خاڵە دەڵێ: "هەلو مەرج و زروفی ئەمجارە یەکجار جیاواز بوو؛ حکومەتی عێراقی پشتیوانی ئینگلیزی لەگەڵ نەبوو. هەر خۆی روو بەرووی کوردەکان بوو بوەوە. گۆڕانێکی ریشەیی لە هوشیاری نەتەوەیی و سیاسی کوردەکاندا روویدا. ڕۆڵەی گەلێک لەو خێڵانەی کە تا ئەوکاتانە لەگەڵ حکومەتدا بوون، پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد. ئەمە جگە لە پەیوەندی کردنی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازو ئەفسەری کوردی ناو سوپای عێراقی، بە شۆڕشەوە. ئەو ڕادیۆیانەش کە لە دیمەشق و قاهیرەوە بە زمانی کوردی بەرنامەیان پەخش و بلاو دەکردەوە، پشتیوانیان لە کورد دەکردو ورەیان بەرز دەکردنەوە و ئەوەیان دەسەلماند کە شەڕی ئەمجارە شەڕی نێوان خێڵە کوردەکان نییە، بەڵکو خەباتێکە ئایندەیان دیاری دەکات و رزگار بوونیان لە کۆت و زنجیری عێراق، بەندە بەو شۆڕشەوە".

قاسم، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم شێوازە تازەیەی شەڕی ئەمجارەی کورد، پەنای بردە بەر هەمان شێوازی کە زۆر حوکمرانی تری ڕۆژهەڵاتی ناڤین بۆ (چارەسەری) کێشەو گرفتەکانیان لەگەڵ کەمنەتەوەییەکان و گروپە نەژادییەکان بە کاریان هێنا بوو: ئەوە بوو فەرمانی بە هێزی ئاسمانی دا کە یەکەمجار ناوچەی بارزان بۆردومان بکات و ئەوجا هەموو ناوچەکانی تری ژێر دەسەلاتی پارتی بۆردومان بکات. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێزی حکومەت هەر لە پاشەکشەدا بوو. خۆ فەرماندە سوپاییەکانی ئەگەر بە

قافلە و بەپشتیوانی تانک، هەموو پیداویستی یە لوجستنی یەکانیان پێنەگەیەنرایە، نەیاندەتوانی لەو شوێنە کەمانەشدا وەمێنن کە لە ژێر کۆنترۆلی خۆیاندا بوو. ئیدی فرۆکەکانی قاسم، بەو دە فرۆکە ئەفاسەیەشەوە کە لە ناو هەموو سوپاکانی رۆژهەلاتی ناڤیندا، تەنیا سوپای عێراقی هەیبوون، کەوتنە پەلامارداانی گوندەکان و پاوان و هۆبەی خێلە رەوەندەکان و تەنانەت شاروچکەکانیش.

ئەم بۆردومانانە بوونە مایەی کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە ژن و منداڵ و خەڵکی بێ تاوانی مەدەنی بێ ئەوەی چ پەیوەندییەکیان لەگەڵ شۆڕش و بزاڤی چەکداریدا هەبێ. بەلام ئەمە ورەی کوردی نەڕوخاندو نەترەیان بەرنەدا، کەوتنە گواستنەوەی ماڵ و بنکەکانیان بۆ نێو دۆڵە قوڵ و پڕ پێچ و پەناکان. یەکجار وریایانە و شارەزایانە ئەو لوتکە و قەد پاڵە نسێیانەیان بەکار دەهێنا کە فرۆکە نەیاندەتوانی کەشفیان بکات و هاتو چۆیان بدینێ.

فرۆکەوانێکی عێراقی باری سەرنجی خۆی دەربارەی ئەو گیروگرفتانەی کە رووبەرووی خۆی و هاوڕێکانی دەبوەوە، بەمجۆرە دەربڕیوە: "چالاکی هێزی ئاسمانی زۆر سنوورداربوو، لە رووی ستراتیژی یەوە لە نرخی نەبووواندا بوو، چونکە لوتکە قوچەکان و دۆڵ و زەنوێرە تەنگەکان بواریان نەدەدا فرۆکەکانمان بە نزمی بفڕن و کاری خۆ بکەن کە تەنیا لەو رێگەیەوە دەیانتوانی دەست بوەشێنن". هەر چەندە هەموو ئەمانە فاکتەری یاریدەدەر بوون بۆ کوردو بەر هەڵست وکۆسپ بوون بۆ کاری هێزی ئیزامی عێراقی، ئەوجاش زیانی کورد گەلەک بوو، بە تایبەتی لە نێو بردنی ران و گاگەل و مالات کە بنەمایەکی بنەڕەتی بژێوی و ژیانیانی پێک دەهێنا. ئەمە جگە لە سوتاندنی مەزراو پاوان و پوش، هەر هەموو ئەمانە گیروگرفتی گەورەیان بۆ کورد دەنایەوە.

سەرەڕای هەموو ئەم گیروگرفتانەی کە حکومەت بۆ شۆڕشگێرانی کوردی چێدەکرد، ئەوجاش نەیدەتوانی شۆڕشەکەیان سەرکوت بکات و لە نێوی بەرێت یان رایبگرێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم هێرشە توندو تیژانەی حکومەت بووە مایەی نزیکبونەوەی ئاشکرای رەوت و رێبازە کوردییە جیاجیاکان لێکدی و زیاد بوونی چالاکی هاوبەشیان، تەنانەت تەیارێکی چەپی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە دوای دەرچونی بارزانی، لە بەغدا مابوەوە بەناوی ئەوەی گوایە هاوئاهەنگی لەگەڵ باقی رێکخراوە چەپەکان، بە حیزبی شیوعی عێراقیشەوە دەکات، تەنانەت ئەم تەیارەش بارەگای لێکناو لێبڕا پەیوەندی بە شۆڕشەوە بکات. بەمەش هەموو دەزگا حیزبی یەکە هاتە شاخ.

ئەم دووا گۆڕانکارییە، یارمەتی شۆڕشگێرەکانی دا کە لە رووی رێکخستنەوە خۆیان بە هێز بکەن، کە تا ئەو کاتە لەو رووەوە لاواز بون. ئەوە بوو کادران و ئەندامانی لێهاتوی پارت تەرخان کران بۆ کاری حیزب و کەوتنە بەهێز کردنی لایەنی سیاسی مەسەلەکە،

که ئەویش تا ئەوکاتە بێ خودان و پشتگوێ خراو بوو، ئەوە بوو کادران و ئەندامانی حیزبی روویان کردە ناوچە دوورە دەستەکان تا هوشیاری سیاسی لە نێو جەماوەری جوتیاراندا بلاوبکەنەوە. هەر لەو کاتانەوە دیار بوو کە جۆرە دابەشکردنێکی کار لە نێو شۆڕشدا هەیە: لەو دەمانەدا کە دەزگای حیزبی، کە بارزانی سەرۆکی بێ هەڤرکی بوو، خۆی بۆ چەلەنگی و چالاکی سیاسی تەرخان کرد بوو، بارزانی هەموو هەوڵو کۆششی و کاتی خۆی بۆ پرۆسەی بنیاتنانی سوپای شۆڕش تەرخان کرد.

## سوپایەکی شۆڕشگێر لە جەنگاوەرانی شەڕی پارتیزانی

وەکو چۆن هوشیاری سیاسی لە لای کوردی عێراق پەرەی سەند، لە بواری جەنگاوەریش دا پەرەسەندنی دیار روویدا. بۆ یەکەمجار لە مێژووی خەباتی چەکداری کوردا هێماو نیشانەکانی لە دایکبوونی سوپایەکی شۆڕشگێر لە ئاسۆوە دەرکەوت. کورد جاران پشتیان بە جەنگاوەرانی هەمە جۆری خێڵەکان دەبەست و هەر بەو شێوەیەش لە سەدەکانی رابردوودا شەڕی ئێران و عوسمانی یەکانیان کرد بوو. ئەو شێوەیەش بریتی بوو لەوەی کە ناو بەناو داوا لە خێڵەکان دەکرا بەشداری لە کردەی سوپایی دا بکەن، جا ئەوانەش پاش ئەوەی کارەکانیان ئەنجامدەدا دەگەڕانەوە بۆ گوندو شوێنی خۆیان و درێژەیان بە ژیانی مەدەنی ئاسایی خۆیان دەدا، وەک مەڕوماڵات بە خێوکردن و کشتوکاڵ کردن. چەکەکانیان، لە دەرێ ی گوند، یان لە ئەشکەوتە دوورە دەستەکاندا دەشاردەوە تا حکومەتی عێراقی نەتوانێ بیاندۆزێتەوە و دەستیان بە سەردابگرێ و خاوەنەکانیان بەناوی یاریدەدانی شۆڕشگێرانەوە، دەستگیر بکات.

هەڵبەتە ئەم سیستەمە، زۆر لایەنی خراوی هەبوو. لە پێش هەموویانەوە ئەوە بوو کە پیاوانی خێڵەکان گوێرایەڵی سیستەمێکی یەکگرتوی ورد نەبوون، کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردنیان زەحمەت بوو. هەروەها زەحمەت بوو لە هەموو کاتێکی پێویست دا بانگ بکرێن بۆ چەک هەڵگرتن؛ چونکە هەندێکیان خەڵکانی سەر بە خێڵی کۆچەر بوون یان لەو کاتە پێویستانەدا سەرقاڵی کاری جووتیاری و وەرزێری خۆیان دەبوون و نەیاندەپەرژا. بەڵام ئەزموون و تەجرەبەی مەیدانی بارزانی و کارکردنی لە لەشکری نیزامی کۆماری مهاباد گەیاندی یە قەناعەتێک، کە دام و دەزگاکانی پارتیش هەمان قەناعەتیان هەبوو، کە پێویستە هێزێکی سوپایی دایمی هەبێ و لە رووی سیاسییەوە ئامادەو پەروەردە بکرێت. راو وبۆچوونی هەردوک لا لەو خاڵەدا یەکیانگرتەوە کە قۆناغی ئێستا وا دەخوازێ لەشکرێکی نیمچە نیزامی (عەسکەری) لە هێزی پێشمەرگە پێک بهێنرێ کە بتوانی ئەرکە مێژووییەکان لە ئەستۆ بگرێ.

هەرچەندە هێڵی جەبهەش لەم شۆڕشەدا هێڵێکی نە چەسپاوو ناجێگیر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویست بوو چەند پێگەو سەنگەرێکی پشتەوەو رێگاوبان و پرد

بپارێزرێن و تەنیا پشت بە گرتنی شوێنانی کاتی نەبەستریٚ، بەڵکو ئەو شوێنانە بخرێنە ژێر رکێفی تەواوەتی و بەردەوامی شۆڕش یان هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی زۆر لە بن دەستی شۆڕش دا بمێنێتەوە.

سروشتی جوگرافی کوردستان کە پڕە لە دۆڵ و شوێنی شاخاوی و سەخت و عاسی و قایم، رێ ی لەشکرێکی نیمچە نیزامی دەدا کە لە شێوەی شەڕی پارتیزانی دا چالاکی خۆیان ئەنجام بدەن و لە ناوچە رزگار کراوو نیمچە رزگارکراوەکانەوە دەرچن و پەلاماری هێزو سەنگەرو پێگەکانی دژمن بدەن و پاشان بگەڕێنەوە بۆ شوێنە سەخت و قایمەکانی خۆیان تا لەوێندەر وەحەسێن و خۆ بۆ کاری نیزامی و هێرشی تازە ساز بدەن.

لە ساڵی ١٩٦٢وە ئیدی (لەشکری شۆڕشی کوردستان) دامەزرا. سەربازانی ئەم لەشکرە پێیان دەگوترا پێشمەرگە. ئەفسەرەکان پێیان دەگوترا سەرمەرگە. بڕیاردرا لەشکری نێو براو یەک جۆرە جل و بەرگی هەبێ کە بریتی بوو لە جلی کوردی خاکی و قەمسەڵەو شاشکی کوردی. پێکهاتەی ئەم لەشکرە بەمجۆرە بوو: دەستە،پەل، لق = ١٠٠ جەنگاوەر، بەتالیۆن ٣٠٠-٤٠٠ جەنگاوەر.. فەرماندەو مەسوولی ناوچەکان و هێزەکانیش دیاری کرا. هێز بریتی بوو لە ٢٠٠٠-٥٠٠٠ جەنگاوەر.. هەر هێزێک بە ناوی ئەو ناوچەیە یان شارۆچکەیەوە نێودەنرا کە لە سنوری دا بوو. ئەم هێزە لە سەری بوو پێشمەرگەکانی بجوڵێنێ و مەشقیان دابدات و هاوئاهەنگی دەگەڵ جەنگاوەرانی خێلەکاندا بکات.

چەکی پێشمەرگە هەمە جۆر بوو: سەرچاوەی چەکیان، هەموو دەوڵەتانی دنیا بوون؛ بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی خاوەنی پیشەسازی سوپایی بوون. مەحاڵ بوو بە چەکی شانی پێشمەرگەدا بزانرێ کە چ دەوڵەتێک چەک بە کورد دەدات. چەکی هەمە جۆریان لە شان بوو؛ بەریتانی، بەلجیکی، ئەمریکی، روسی، تفەنگی ئەڵمانی ی مونتاژ کراوی ئێران، ماوزەری تورکی، رەشاش و دەمانچەی (برێن) و (ستێن) و چەند بازۆکایەکیان -ش پێ بوو کە هەندێ ژێدەر دەبێژن گوایە کورد لە کۆمەڵەی (دەستی رەش)یان کڕیوە. هەروەها هەندێ نارنجۆکی دەستی و مینی دژەتانکی دەستکردی خۆماڵییان هەبوو، هەندێ هاوەنی جەوڵی کە لە هێزەکانی عێراقیان گرتبوو. هەندێ دەستەو مەفرەزەش لەو چەکانەیان پێ بوو کە کاتی خۆی بارزانی یەکان لە دوای روخانی کۆماری مهاباد و گەڕانەوەیان لە ساڵی ١٩٤٧ لە ئێران. لەگەڵ خۆدا هێنا بوویان.

بەڵام سەرچاوەی هەرە سەرەکی چەکی لەشکری کوردستان خودی سوپای عێراقی بوو. عبدالله پشدەری کە یەکێک بوو لە ئامیر هێزەکان بۆی گێرامەوە: "دەچووینە لایان و بە پێ ی پێویستی خۆمان چەک و تەقەمەنیمان لێوەردەگرتن. هەروەها ئەو خەڵکانەی کە لە ناو سوپای عیراقی یەوە هەڵدەهاتن و پەیوەندییان بە ئێمەوە دەکرد، هەرچییەکیان

لە چەک وتەقەمەنی و شتی دی بەردەست بکەوتایە لەگەڵ خۆدا دەیانهێنا. ئەمەش بۆ خۆی چەکێکی زۆری بۆ دابین دەکردین". بەپێ ی مەزەندەو تەقدیری ئەو چاودێرە سوپاییانەی کە چاودێری ئەم بزاڤە کوردییەیان کردووە، ژمارەی ئەو سەربازو پۆلیسانەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردووە تا ساڵی ١٩٦٢ گەیوەتە پتر لە ٣ هەزار کەس. هێزەکانی بارزانی، کە ژمارەیان ١٠-٢٠ هەزار کەسێک دەبوو، توانیان بەهاوکاری جەنگاوەرانی خێڵە کوردەکان، لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٢ دا دەسەڵات بەسەر بەشی هەرەزۆری کوردستانی عێراقدا بگرن و رۆژنامەوانانی بێگانەیان دەعوت کرد تا سەردانی ناوچە رزگارکراوەکان بکەن و رووداوو دەنگوو باسان تۆمار بکەن.. هەروەها رێکخراوی خاچی سووری نێو دەوڵەتیش داوای کرد رێ ی بدرێ چەند یەکەیەک بنێرێ بۆ ناوچەکە تا یارمەتی خەڵکی مەدەنی و قوربانیانی کاری تیرۆری هێزی ئاسمانی عێراقی بدەن. بەڵام حکومەتی عێراقی زۆر بە توندی ئەو داوایەی رەتکرەوەو قاییل نەبوو کە خاچی سوور چ یەکەیەک بۆ ئەوێندەر بنێرێ.

شایەت عەیانێکی ئێرانی، کە لەو سەروبەندەدا لە ناوچەکە بووە، بە تەوسەوەو بە مجۆرە باسی وەزع و حاڵی هێزی عێراقی کردووە: "دەزگا رەسمییەکانی راگەیاندنی عێراقی، هەر کاتێ قافڵەیەکی زرێپۆش و تانکی عێراقی بیتوانیایە بگاتە یەکەیەکی عێراقی گەمارۆدراو لە لایەن پێشمەرگەوە یان یەکەیەکی جێگر لەو ناوچانەی کە ژێردەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوون، ئیدی دەیکرد بە رۆژی خۆی و ئەمەی وەکو سەرکەوتنی سوپایی گەورە بڵاو دەکردەوە و ئیدی ئەم جۆرە جم وجوڵە وا دەردەخرا کە سەرکەوتنی گەورەیە بە سەر هێزی یاخی بوواندا.

بەڵام شۆڕشگێران هەموو شاخ و بەرزاییەکانی دەوروبەری ئەم یەکانەیان دەگرت و هەموو رێیەکیان لێدەگرت. جا ئەو هێزە عێراقیانەی بە هەزار شەرمەنق و بەخەسارەتی زۆرەوە دەگەیینە ئەو شۆێنانە، کاتێکیان بە خۆ دەزانی چواردەوریان گیراوەو هەرمەی نەمانیان لە سەرە و ناتوانن پەل بهزێون. لە ئەنجامدا چ چارێکیان نەدەما تەنیا ئەوە نەبێ لە شوێنی خۆدا سەنگەر لێبدەن و خۆیان قایم بکەن و چاوەنۆڕ بن بەفرۆکە ئازوقەو خواردەمەنی و پێداویستی یەکانی تریان بۆ بخرێتە خوارەوە. یان رێگەی پاشەکشە بگرنە بەرو زەرەرو زیانێکی زۆری گیانی و ماددی قەبوڵ بکەن و ناوچەکە بۆ کوردەکان بە جێ بهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ ئەو بنکانەی کە لێوەی هاتبوون".

دیارە ئەم کردەی پاشەکشەیە، بۆ سوپای عێراقی کە شارەزایی لێ ی نەبوو، قورسترین کردەی سوپایی بوو، زۆر جار هێزێکی پشتیوان دەنێردرا بۆ یارمەتی ئەویەکانە تا بە سەلامەتی پاشەکشە بکەن. هەنگێنێ شۆڕشگێرانی کورد پەلاماری ئەو هێزی پشتیوانەشیان دەداو بەمەرەدی یەکەکانی تریان دەبردن.. هەڵبەتە سوپای عێراقی زەرەرێکی یەکجار گەورەی لەم کردارە سوپاییە بێ ناکامانە کرد. ژمارەی کوژراوانی

سوپای عێراقی لە ساڵی ١٩٦١ دا گەیبە پتر لە سێ هەزار کەس، وەکو ئاماژەمان بۆ کرد سێ هەزار کەسی تریش پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە کرد.

## ئێمە گەلی ئایندەین

حەقیقەتێک لە گۆڕێ بوو کە رۆژ بەرۆژ پتر روون دەبوەوە تا وایلیێهات لە لای هەمووان هەمان مەعنای پەیدا کرد، ئەویش ئەوە بوو کە هیچ یەکێک لەم دوولایەنە ناکۆکە نەیدەتوانی بەبێ کۆمەکی دەرەکی بەسەر لایەکەی دیدا سەربکەوێ. بەلام زلهێنەرەکان وێرای ئەوەی کە بەم حەقیقەتەیان دەزانی، ئەوجاش نەیاندەویست خۆ لەم کێشەو ئاستەنگە هەڵقورتێنن، بە تایبەتی کە هێشتا چ ئاسۆ و مەودایەکی روونی دیار نەبوو. یەکێتی ی سۆڤیەت کە کاتی خوێ بارزانی داڵدە دابوو و مافی پەنابەری سیاسی دابوێ، هەڵوێستی بەرانبەر بە شۆڕش رارا بوو. ئەو دەنگوباس و هەواڵانەش کە گوایە فڕۆکەکانی سۆڤیەت بەشەو دێنە ئاسمانی کوردستان و چەک و تەقەمەنی و پێداویستی یە لوجستی یەکانی دی بۆ شۆڕشگێڕانی کورد دەخەنە خوارەوە، هیچ بنج وبناوانێکی نەبوو، بەڵکو زادەی خەیاڵی رۆژنامە نوسێکی خەڵکی ئەڵمانیای فیدراڵی بوو کە هێشتا لە کەشو هەوای جەنگی ساردا دەژیا و پێ ی وابوو سوپای سۆڤیەتی خاکی کوردستان وەکو پردێکی زەمینی بەکار دێنن بۆ گەیشتن بە ئاوی کەنداوی فارس. وەختێ تەنگژەو قەیرانی نێوان قاسم و کورد گەیبە لوتکە، قاسم، شاندێکی رەسمی بۆ مۆسکۆ نارد تا وا لە سۆڤیەت بگەیەنێ کە بارزانی بەکرێگیراوێکی ئیمپریالزمە، و داوای کۆمەکی سوپایی لە سۆڤیەت بکات بۆ رژێمی عێراقی. وا دیارە سەرانی کرملین، وەکو چۆن گۆڤاری (دیر شپیگل)ی ئەڵمانی نوسیویەتی، هەڵوێستەکەیان بەمجۆرە هەڵسەنگاندوەو تاوتوێ کردووە: قاسم کە قەرزاربارو چاو بەرەخواری چاکەی سۆڤیەتی دەبێت، لە رۆژهەلاتی ناڤین دا بۆ سۆڤیەت چاکترەو کەڵکی زیاتر دەبێت لە سەرۆکی کوردی (رەوەند) لەم پێودانگەوە، سۆڤیەت چ کۆمەکێکی راستەوخۆی کوردی نەکرد. بەڵکو بە پێچەوانەوە چەندین فڕۆکەی جەنگی تیژفڕی دا بە رژێمی بەغدا.

بارزانی لەو رۆژگارەدا لە دەرگای لایەنەکەی تر، واتا لە دەرگای وولاتە یەکگرتوەکانیشی داو داوای لێکرد کە یارمەتی گەلی کوردی چەوساوە بدات. بارزانی هەمان ئاوەرۆک و گازی لەو بروسکەیەشدا دوبارە کردەوە کە ناردی بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان. بارزانی لە ساڵی ١٩٦٢دا بە دانا ئادەم سمیث-ی رۆژنامە نوسی گوت: (ئێمە گەلی ئایندەین) بە سەر کۆمارەکەت بڵێ: "ئێمە قاسم لە نێو دەبەین و توانای ئەوەمان دەبێت بەردی بناغەی هێمن ترین و جێگیرترین دەوڵەتی رۆژهەلاتی ناڤین دابنەین، ئەگەر ئەمریکا دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکات". بەلام واشنتون بەرانبەر بەو داواو گازی یە بێدەنگ بوو و لە جێ ی خۆی نەجولا.

هەروەها دەوڵەتەکانی دیکەش، ئەوانەی ناوچەکەیان بەلاوە مەبەست بوو، زۆر بە هێمنی و دوو دڵی یەوە چاوەڕوانی پەرەسەندنی ڕوداوەکانیان دەکرد و چاودێریان دەکرد. گەلێک لە بەرعۆدە و مەسوولانی ئیسرائیل ڕایانگەیاند، کە لە کاتێکدا ئازادی هەر نەتەوەیەک بە ڕەوا و پێویست دەزانن، بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پاراستنی ئارامی و سەقامگیری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بۆ ئەوان لە هەر شتێکی دی پێویست ترو گرینگترە. دیارە حاڵی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنش لەوە چاکتر نەبوو. لە مۆسکۆدا مقۆمقۆ پەیدا بوو گوایە ترسی ئەوە لە گۆڕێ یە هاوکاری لە نێوان کورد و جولەکەدا بەرقەرار بێ. ڕادیۆی بەریتانیاش سۆڤیەتی بەوە تاوانبار دەکرد کە پشتگیری بزاڤی کوردان دەکات. لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەگەری ئەڵمانیای دیموکراتی، حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژاوای بەوە تاوانبار دەکرد کە پشتیوانی ڕێکخستنە نهێنی یەکانی کورد دەکات.

## دەوڵەمەندترین وولاتی کودەتای سوپایی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دا

جیاوازی ڕاو بۆ چونان لەمەڕ تەبیعەت و ماهیەتی بزاڤی کوردی ڕەوشی سوپایی لە خودی کوردستاندا نەگۆڕی. لەوکاتانەدا کە شۆڕشگێرانی کورد زۆر بە مکومی ناوچە رزگارکراوەکانی ژێردەسەلاتی خۆیان دەپاراست، خۆشەویستی میللی قاسم بە هۆی ناکامی لەشکرکێشی یەکانی بۆ سەر کورد، تەواو هاتە خوارەوەو ئەو خۆشەویستی یەی جارانی لە لای خەڵکی نەما.. هەروەها شیوعی یەکان و نەتەوەییە ناسرییەکان لە مەیدانی سیاسەتی نێوخۆدا کەوتنە گوشار خستنە سەر قاسم. قاسم سەیری کرد تەنیا یەک ڕێ ی لەبەرە تا لەم ناستەنگە دەرباز بێ و هەم دڵی نەتەوەییەکان و هەم دڵی هێزەکانی دژبە ئیمپریالزم ڕازی بکات؛ ئەویش قوماری داگیرکردنی کوێت بە هێزی سوپایی. ئەم داوایەی عێراق هەمان هەراو هەنگامەی نایەوە کە لە سەردەمی مەلیک غازی یەکەمدا نایەوە. جا بۆ جێ بەجێکردنی ئەم مەبەستە، قاسم هەستا چەندین هێزی سوپایی گەورەی لەکوردستان و هەڵبەتە لە ڕووی نەزانییەوە لە خودی بەغداوە کێشایەوە و لە نزیکی بەندەری بەسرەدا خڕی کردنەوە. بەڵام ئەم قومارە بۆی بوو بە تەوقی شەڕو بەر لەوەی دەست بە جێ بەجێکردنی بکات، چووە گەردنی خۆی: بەیانی ڕۆژی ١٩٦٣/٢/٨ چەند ئەفسەرێکی هەوادارو سەر بە حیزبی بەعس کودەتایان لێکرد. بەمەش قۆناغێکی تازە لە مێژووی عێراقدا دەستیپێکردو بوو بە دەوڵەمەندترین وولاتی کودەتای سوپایی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا؛ ئەوحیزبی بەعسەی کە لە دیمەشق دامەزراو لە ئایندەدا دەوری کاریگەی لە مێژووی گەلی کوردا بینی، خۆی بە حیزبێکی ناسیونال سوسیالست دەزانی و لە پێناوی بوژانەوەو ژیانەوەی نەتەوەی عەرەبدا دەخەبتی.. ئەم حیزبە لە عێراقدا دەسەڵاتی گرتە دەست و ئیدی دوای ساڵێک لە سوریاش هاتە سەر حوکم. سەر کردەی کودەتاکە عبدالسلام عارف بوو کە لە ڕۆژانی هەوەڵی شۆرشی ١٩٥٨/٧/١٤دا جێگری سەرەک وەزیران و وەزیری ناوخۆ بوو.

پاش سەرکەوتنی کودەتای ساڵی ۱۹٦۳ پلەی موشیری بە خۆی دا. قاسم، لە ناو وەزارەتخانەی بەرگریدا بوو کە هێزی کودەتاچییەکان بە فڕۆکە و تانکەوە پەلاماریان دا. هەر چەند بەرگری لە خۆی کردو هێزێکی شەش سەدکەسی لە چەتربازان پشتیوانیان لێکردو تا دوافیشەک شەڕیانکرد، بەڵام لە ئەنجامدا هێزی کودە تاچییان خۆیان بە نێو وەزارەتخانەی بەرگری دا کردو قاسم-یان لەژێر دارو پەردووانددا دەرهێناو هاواری بە سەردا دەکردن: "من رزگارکەری گەلی عێراقم" ئەوە بوو پاش ماوەیەکی کورت بە پێ ی "داب و نەریتی عێراقی" ئیعدام کراو رێ و رەسمی ئیعدام کردنەکەیان لە رادیۆوە راستەوخۆ بڵاوکردەوە.

کورد بوو بوون بە هێزێکی سوپایی گرینگ. عێراق لە روی ئابینی و سیاسی و نەتەوەییەوە حاڵی شپڕبوو. کورد ئەم گۆڕانکارییەی رژێمیان بە دەرفەت زانی بۆ گەڕاندنەوەی هاوسەنگی سیاسی لە عێراقدا. پارتی دیموکراتی کوردستان، پێشترو ژێراوژێر پەیوەندییان لەگەڵ گەورە لێپرسراوێکی باڵی سوپایی حیزبی بەعس دا، لە قۆناغی خۆ ئامادە کردندا بۆ ئەم کودەتایە، کرد بوو. ئەو رۆژە قەرار درابوو کورد پشتیوانی رژێمی ئایندەی بەعسی بکات و ئەوانیش لەبری ئەمە دان بە ئوتونومی کوردستانی عێراقدا بنەن. بۆیە کومیتەی ناوەندی پارتی، یەکسەرو پاش سەرکەوتنی کودەتاکە، بروسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ حوکمرانی تازە نارد.

لەو کاتانەدا کە عارف سەرقاڵی هێرشی پاکسازی بوو کە زۆر جاران شێوەی قەساوخانەی بەشەری دەگرتەخۆ. لەم هێرشانەدا دوا لایەنگرانی قاسم لە نێو بران و هەزاران شیوعی دەستگیرکران و کوژران. رێک لەم کاتانەدا یەکەمین گفتوگۆ لە نێوان حکومەت و کوردا دەستپێکرد. لە مانگی ئازاردا فەرمانرەوای تازە بە خشینێکی گشتی بۆ هەموو جەنگاوەرانی کورد دەرکرد. کەچی (شاندێکی میللی) لە بەغداوە بەرەو چیا سەرکەش و سەختەکانی مەڵبەندی بارزانی کەوتەرێ. شاندی نێوبراو رووبەرووی پیاوێکی نەرمونیانی دڵاوا بوونەوە، کە بە خۆشیان باوەڕیان نەدەکرد. بارزانی دەستبەرداری زۆر داخوازی لاوەکی بوو، و هەر هەموو ئەو گومانەی رەواندەوە کە گوایە بەنیازی جیابوونەوەیە.

بەڵام بارزانی لە هەمان کاتدا بەدوودڵی و ترسەوە دەیڕوانی یە ئەو گۆڕانکارییە گشتیانەی کە لە مەیدانی عەرەبیدا روویان دەدا. توانی سوود لە گفتوگۆی یەکێتی ی فیدرالی نێوان عێراق و سوریا و میسر لە قاهیرە بگرێ و یەکێک لە پیاوەکانی خۆی (کە پاشان بوو بە یەکێک لە خەنیمەکانی)؛ جەلال تاڵەبانی لەگەڵ وەفدی عێراقیدا بۆ نەوێندەر بنێرێ. تاڵەبانی، لە بەیروت، بەدەم رێوە بۆ قاهیرە، بە نوێنەرانی رۆژنامەگەری راگەیاند کە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت دا ساردی تێکەوتووە، ئەپچراوەو تەنیا دواخراوە؛ چونکە مەسەلەی یەکێتی ی عەرەب بۆ حکومەتی عێراقی پێویست

ترو گیرینگترەو کوردش دەیانەوێ لەنزیکەوە چاودێری ئەم گفتوگۆیە بکەن و ئەو شوێنە بزانن کەوەک نەتەوەیەکی ناعەرەب لە نێوماڵی عەرەبی هاوبەشدا بۆی دانراوە. جەمال عەبدولناسر، لە قاهیرە وەکو هەموو جارێک، هاو سۆزی خۆی بۆ دۆزی کوردی دەربڕی، بێ ئەوەی قسەیەکی وەها بکات کە ببێ بە ماڵ بەسەرییەوە، هەروەها وەڵامی ئەو پێشنیـازەشی نەدایەوە کە جەلال تاڵەبانی پێشکەشی کردو بریتی بوو لەوەی هەرێمێکی کوردی لە نێو هەرێمەکانی دەوڵەتی فیدرالی تازەدا هەبێ و کوردی پارچەکانی تری کوردستانیش بتوانن بێنە ناوی یەوەو لەگەڵی تێکەڵ بێن.

(لوموند)ی فەرەنسی لەو ماوەیەدا راگەیاندنێکی رۆژنامەوانی عبدالناصری بلاو کردەوە کە دەڵێ: "بە بۆچوونی ئەو شەڕ دژی کورد کارێکی ناپەسندەو هاوکاری عەرەبی بەرانبەر بە ئیسرائیل لاواز دەکات". ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە کە کورد "رۆڵەی نەتەوەیەکی رەسەنن و مێژوویەکی دێرینیان هەیە". هەر لەو راگەیاندە رۆژنامەوانی یەدا دەڵێ: "کورد رۆژگارێکی دوورودرێژ لەگەڵ دراوسێ عەرەبەکانیاندا ژیاون" عبدالناصر لە سەری دەروات و دەڵێ ئەو پێشنیازو بیرو بۆچونانەی کە نوێنەرێکی بارزانی پێ ی راگەیاندوە بەرای ئەو (ناسر) قابیلی جێ بەجێکردنە، دەشڵێ ئاموژگاری (موشیر عارف)ی کردوە کە داخوازییە رەواکانی کورد قەبوڵ بکات.

## سیاسەتی هەڕەشەو ئەمڕ خستنەبەر

بەلام ئامۆژگارییەکەی ناسرو ئامادەیی ناسر کە گوشار بخاتە سەر رژێمی بەعسی بەغدا تا بەقسەی بکەن و کورد بەلای خۆدا راکێشن و ئەمە قازانجی عەرەبە، سەرینەگرت. هەرچەندە گفتوگۆیەکە زۆر بە خاوی و سستی دەرۆیی، بەلام وا دیار بوو حکومەتی بەغدا بڕیاری دابوو لە سەر هەمان سیاسەتی کۆن، واتا سیاسەتی شەق و نان، بڕوات. لە لایەکەوە قانونی کارگێری لامەرکەزی کە لە ١٩٦٣/٧/١ دەرچوو، و وەزع و حاڵی کەمە نەتەوەییەکانی رەچاو کرد بوو؛ هەر بە پێ ی ئەو قانونە رێدرا زمانی کوردی وەکو زمانی رەسمی لە پارێزگای سلێمانیدا کە تازە لە سێ یەکەی کارگێڕی پێک هێنرا بوو، بەکار بێت.. لەلایەکی ترەوە حکومەت کەوتە گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی ئەو شوێنانەی کە کورد بە چاوی تایبەتی یەوە تەماشایان دەکرد و بریتی بوون لە ناوچە پڕ نەوتەکانی کەرکوک و خانەقین و ناوچە نێزدی نیشتەکانی ئەم بەرو ئەو بەری روباری دیجلە (شێخان و ژەنگار) ئەوە بوو دەستکرا بە دەرکردن و راگوێزانی کورد لەو ناوچانە.

ئاشکرایە حکومەت دەیویست بەم کارەی، رووبەری ناوچە کوردنشینەکان کەمبکاتەوەو بریتی بێ لە ناوچە شاخاوی یە سەختە دوورە دەستەکانی باکوری رۆژهەلات و ناوچە کوردنشینە پڕ نەتەوەکان بکات بە ناوچەی عەرەبنشین. ئەوە بوو لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا هەزاران ماڵباتی کورد لەو ناوچانەوە بە ئوتومبیلی سوپایی باربەر، بۆ قولایی

بیابانەکانی باشوری عێراق راگوێزران و لە نێو کەپرو چیخ دا نیشتەجی کران و بە تۆبزی ملکەچی سیاسەتێکی داڕێژراوی تواندنەوەی نەتەوەیی کران. لەم لاشەوە هەزاران کرێکاری عەرەب بەخۆو عەیالەوە گواسترانەوە بۆ ئەم ناوچە پر نەوتانەو لەوێندەر ئاکنجی کران. "تەسکەرەو ناسنامەی درۆشیان بۆ پڕکرایەوە کە گوایە لە دایک بوو و دانیشتوی ئەو ناوچەیەن".

بەلاّم حکومەت هەر زوو نیازی راستەقینەی خۆی دەرخست و هەموو ئەندامانی ئەوشاندە کوردی یەی گرت کە بۆ گفتوگۆ لە بەغدا بوون.. ئەوە بوو حکومەت لە شەوی ٩-١٠/٦دا بەراشکاوی رایگەیاند کە گفتوگۆی لە گەڵ کوردا بڕی و شەریان لەگەڵ دەکات. مێژونوسی تورک (جمال الاداغ) لە باسی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی عێراقدا، بەمجۆرە باسی روداوێکی ئەوسای شاری سلێمانی کردووە: "لەو شەوەدا کە حیزبی بەعس لێبرا پەلاماری کورد بدات، حەرەس قەومی بەعس، ٢٦٧ کەسیان لە رۆشنبیرو منداڵ و نیشتمانپەروەرانی کوردی شاری سلێمانی لە نێو جێگە هێنانە دەرێ و بۆ دەرێ ی شاریان بردن و لە وێندەر فرمانیان پێکرا کە گۆڕێکی دەستەجەمی هەڵکەنن، ئەوسا هەموو بەر دەستڕێژی گوللە دران و هەموویان لەو چاڵەدا نێژران، رێک وەکو ئەو قەسابخانانەی کە هیتلەر بۆ جولەکەی دانان".

بۆ رۆژی دوایی هەڕەشە لە لایەنگرانی بارزانی کراو داوایان لێکرا بێ هیچ مەرجێک خۆ بە دەستەوە بدەن و لەیەک کاتدا بە تۆمەتی کومونیستی و زایونیستی و جوداخوازی تاوانبارکران. هەروەها هەڕەشەی کوشتن لەوانەکرا کە حەز دەکەن لە ریزی بارزانیدا بمێننەوەو بەگژ سوپای عێراقی دا بچن کە بەرەوناوچەکە پێشڕەوی دەکات.

هەرەشەی ئەوەش کرا لە هەر گوندێکەوە تاقە یەک فیشەک بتەقێنرێ و تاقە تەقەیەک لە سوپای عێراقی یان حەرەس قەومی یان جاشەکان بکرێ، یان هەر گوندێک داڵدەی (یاخی)یانی کورد بدەن، ئەوا ئەوگوندە تەختدەکرێ. ئەوجا خەلاّت وپاداشتێکی سێ ملیون مارکی، کە دواتر زیاد کرا بۆ پازدە ملیون مارک، تەرخانکرا بۆ هەر کەسێک مەلامستەفا بەزندویەتی یان بە مردویەتی دەستگیر بکات. تا بەمجۆرە لەشکر کێشی گەورە بۆ سەر ئەم کەمە نەتەوەیە کە ئامادە نەبوو ملکەچی فەرمانەکانی رژێم بێ، دەستپێکرد.

### دەمانتوانی وەکو کۆتر راویان بکەین

ناکۆکی بەینی کورد وحکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، سەرەرای گۆڕانی حکومەتەکانیش هەر وەکو خۆی مایەوە؛ ئیدی لە سەردەمی عبدالکریم قاسم پێیاوەرە تا عبدالسلام عارف و زەعیم عبدالرحمن عارفی برای (١٩٦٦) و تا دەگاتە لیوا احمد حسن البکر.

(بیرنهارد لیبیرمان)ی رۆژنامەوانی نەمساوی لەگۆڤاری (یانەی نوێ)دا بەمجۆرە باسی ئەو حاڵەتەی کردووە: "حاڵەتەکە لە هەوەڵەوە بە گفتوگۆ دەربارەی ئوتونومی بۆ کورد دەست پێدەکات، ئەوجا ئۆرەی چەند هێرشێکی کۆچاندن و ڕاگوێزان دێت، پاشان هێرشی ئاسمانی دەست پێدەکات و لە ئەنجامدا شەڕی سەخت وبەرفراوان هەڵدەگیرسێت".

ڕێسایەکی دیکەش لە هەموو ئەم قۆناغانەدا خۆی دوبارە کردەوەو بە نەگۆڕی مایەوەو لە هاوینی ١٩٦٣شدا هەر بە نەگۆڕی مایەوە.لەشکرکێشی و هێرشەکانی عێراق وەکو چاوەنۆڕ دەکرا ج سەرکەوتنێکیان بە سەر شۆڕشگێڕانی کوردا نەهێنا. هێزی پێشمەرگە، بەرەڤانی و بەرگری لە سەنگەرو پێگەو شوێنەکانی خۆی کردو توانی پاشەکشە بە هێزەکانی عێراق بکات کە ژمارەیان پتر لە شەست هەزار سەرباز دەبوو. بۆ یەکەمجارو لە مەیدانی ئەم شەڕانەدا کارایی و کاریگەری ڕێکخستنی نیمچە نیزامی لەشکری کورد بەدیارکەوت، ئەو لەشکرو هێزانەی وایان لێهات تەنیا بەوەندە نەوەستن کە پەلاماری هێزی پشتیوان و یاریدەدەری عێراقی بدەن و ناو بە ناو سووکە هێرشێک بکەنە سەر دژمن. بەڵکو یەکە کوردییە مەشق دیدەکان گەیینە ئاستێک بتوانن بە پێ ی نەخشەی تایبەتی دژە هێرش بکەن و هێزی دوژمن تەفروتونا بکەن.

بۆیە یەکەمین جار هێزێکی گەورەی پێشمەرگەی پتر لەیەک لیوا جەنگاوەر، لە مانگی تەمموزدا و لە چیای هەیبەسوڵتان دا ڕووبەڕووی هێزێکی حکومەت بوونەوە، هێزی حکومەت کە هەستیکرد دەرەقەت نایەت و تێشکانێکی پڕ شەرمەزاری لە بەردەمە، بە ناچاری لە مەیدانی شەڕ هەڵات و پاشە کشەی کرد. هەروەها لە ناوچە شاخاوییە سەخت و عاسییەکانی دەورو بەری ڕەواندوزدا کە پڕە لە دۆڵ و شیوو لوتکەو زنارو پێچ و پەنایان، کەتیبەیەکی پیادەی عێراقی لە بن و بساتەوە لە نێوبرا، هەروەها کەتیبەیەکی تریش تەفرو توناکراو زەرەرو زیانێکی ماڵی و گیانی زۆری لێکەوت.

تیمێک لە بەیامنێرانی دەزگای ڕادیوو تەلەفزیونی ئەڵمانیای فیدرالی (NRD) پاش سەفەرێکی دژواری مەیلەو ئەفسوناوی، خۆی گەیاندە ئەو ناوچانە و بە چاوی خۆیان ئەو ڕوداوانەیان بینی و فلیمی سینەماییان لە سەر ئەو شەڕانەو ئاکامەکانی ئەو شەڕانە ئامادە کرد.

(ک.دیتمان)ی ڕۆژنامەوان بەمجۆرە باسی ئەو ڕوداوانەی گێراوەتەوە: "شەڕەکە ڕۆژێک درێژەی کێشا. پێشمەرگە ڕۆژی پێشوو پردێکی ئاسنیان تەقاندەوە کە وا مەزەندە دەکرا قافڵەیەکی نیزامی دەیەوێ بە سەریدا بپەڕێتەوە. ئەوجا پێشمەرگە لە دووری سەد مەترێک لە پشت پردەکەوە، لە پاڵ تاوێرە بەردەکاندا سەنگەریان گرت و چاوەڕوانی هاتنی هێزەکانی حکومەت بوون. هەرکە بەرایی ئەم هێزەی حکومەت

گەیی، فەرماندەی هێزی حکومەت فەرمانی دا ئوتومبیلێکی جێب قیادە بنێردرێ بۆ پشت پردەکە تا شناسایی ناوچەکە بکات و بزانێ لەوێندەر چ باسە. کاتێ قافلە حکومەتی یەکە هیچ نشارەتێکی بە گومانی لە جێبەکەوە پێنەگەیی، ئەمە دڵنیای کردن کە گوایە دنیا ئارامەو چ شتێک لە گۆڕێ دا نی یە، هەر چەندە جێبەکە نەشگەڕایەوە. هەرکە قافلە حکومەتی یەکە وەگەڕ کەوت ئیدی لە هەموو لایەکەوە گوللە بڕنەوو دەسرێژی رەشاشی عەیار۷/۱۲ ملم وەکو بارانی بوهارێ لە سەنگەرەکانی پێشمەرگەوە بەسەریاندا داباری، سەنگەری پێشمەرگە بە بەرزاییەکانی دیار جادەکەوە بوون، بەمەش قافلە حکومەتی یەکە بوو بە هەدەفێکی ئاسان و زەق و کەوتە بەر رەحمەتی گوللەی ئەنگێوەی کوردی ئاسراو بە دەست راستی و قافلەکە بە جارێ شڕو وڕ بوو".

رۆژنامەوانی ئێوبراو، پرۆسەی یەخسیرکرنی ئەو سەربازانەشی تۆمار کردووە کە لە شەرەکەدا نەکوژران و بە سەلامەتی دەرچوون و لە خانویەکی بە بەرد دروستکراوی نزیکی شوێنی بۆسەکەدا حەبس کران. هەروەها دەربارەی جادەکەشی نوسیوە کە چۆن پڕبووە لە پاشماوەی ئوتومبیلی ئیزامی بارەبەری سوتاوو جێب قیادەی روسی. پێشمەرگە، بۆ بەیانی رۆژی دوایی، سەربازە برینداڕەکانیان؛ ئەوانەی برینەکانیان قورس بوو، بە ئوتومبیلی ئیزامی ناردەوە بۆ یەکەو سەربازخانەکانی خۆیان بەڵام یەخسیرەکانی دی، لە سەربازو ئەفسەر، بۆخەستەخانەکانی پشتەوەی شۆڕش رەوانە کران. دەربارەی چارەنووسی خەڵکەکەی دی، دیتمان بە شێوازێکی ئەوتۆ نوسیویەتی کە ترسی پێوە دیارە: ترس لەو تارمایی مەرگەی کەباڵی بە سەر هەموو ناوچەکەدا کێشاوە: "سەندوقێکی لە پەتووە پێچراوی لەخۆڵا چەقیو.. یەکەم جەنازە بوو کە چاوم پێ ی کەوت.. تا لە لوتکە قوچەکان نزیکتر دەبوینەوە جەنازەی زۆرمان دەهاتە رێ. ئەو رۆژە ۱۷یا ۱۵ بگرە پتر لە چل جەنازەم تەنیا لەو لوتکەیەدا بینی.. کوردێکی ردێن زەرد یاوەرمان بوو، بە زمانی ئینگلیزی و بەداخ و کەسەرەوە گوتی : "نازانم بۆ ویستویانە بگەنە ئەم لوتکەیە. ئایا پێیان وا بووە دەتوانن تێیدا بمێننەوە و بیپارێزن، تا هێزی کۆمەک و پشتیوانی سوپایی تریاندەگاتێ؟ هەڵەی کوشندەیان ئەمە بوو؛ چونکە ئیمە دەمانتوانی وەکو کۆتر راویان بکەین.. جەنازەی دیکەش لە نێو داروەوەنەکاندا هەن گەر حەز دەکەی بیاندینی".

دیتمان دەڵێ ژمارەی تەواوەتی ئەو جەنازانەی کە لە مەیدانی شەڕەکەدا ژماردونی، پتر لە هەشتا جەنازەی سەربازانی سوپای عێراقی بووە، ئەو سوپایەی کە لە بنەڕەتدا بۆ شەڕی دەشت و بیابان ئامادە کرا بوو نەک بۆ شەڕی نێو چیایان: "هەشتا جەنازەی لاوی هاوتەمەنی من، کە دەکرا لە بەغدا یان لە موسڵ دا بیاندینی. هەشتا جەنازەی بێ جوڵە کە وردە وردەو بە پێ ی تێپەڕ بوونی کات رەنگی خاکەکەیان وەردەگرت؛ کاتێ هەتاو لە لوتکەی چیا بەرزەکان نزیک دەبوەوەو بەرەو خۆرنشین دادەکشا".

وا دیارە کوردەکان هەموو جەنازەکانیان نەناشتبێ، ئەمەم پاش دە ساڵ بۆ روون بوەوە کاتێ لە پایزی ساڵی ١٩٧٣دا بە یاوەری وێنەگرێکی ئاژانسی سفێن سیمون و چەند یاوەرێکی کورد سەردانی ناوچەکەم کردەوە.

ئەو رۆژە بە چیاکەی تەنیشت شاری رەواندوز دا هەڵگەراین، ئەوچیایەی کە کەتیبەیەکی عێراقی تێدا لە نێو برابوو. لێرەو لەوێ ئێسک و پروسکی رەنگ بواردوومان دەبینی. کە دەستم دایە یەکێک لەو ئێسکانە بۆم دەرکەت کە ئێسکی رانە، کە زیاتر ناوچەکە گەڕاین، ئێسک و پروسکی پترمان بەرچاو کەوت، ئیدی هەتاوو باو باران کاریان تێ کردبوون و رەنگێکی ئامال قاوەییان وەرگرتبوو. زۆر بەرێزو حورمەتەوە ئیسکەکانمان لە جێ ی خۆ دانایەوە. دیارە یاوەرەکانیشمان لە ئاستی ئەم دیمەنەدا کڕو بێدەنگ بوون. کاتێ ئێواریٚ چووینە خانویەکی لە بەرد دروستکراو کە بەتەما بووین شەو لەوێندەر رۆژ بکەینەوەو هەموو شنگمان لەبەر بڕا بوو. ئەوکاتە حەقیقەتی شتەکەمان بۆ بەدیار کەوت و زۆر سەرسامی کردین: کاک عبدالله پشدەری کە پێشمەرگەیەکی دوراندیدە بوو و پتر لە شۆڕش و راپەرینێکی بینی بوو، بە شێوازێکی زۆر هێدی و بێ ئەوەی خۆی شێلو بکات بۆی باسکردین کە کورد بۆیە هەموو جەنازەکان ناشارنەوەتا ئەگەر حکومەتی بەغدا قوەتێکی دیکەی نیزامی بنێرێ بۆ ئەم شاخانە، با سەربازەکان بە چاوی خۆیان بیدیتن کە چ چارەنوسێکیان لە پێشە.

## تابلۆیەکی سریالی لە ئاسن و خشت

کوردیش، لە شەرگەکان وبگرە لە نێو خەڵکی (مەدەنی)یش دا زەرەرو زیانی زوریان وێکەوت. هێزی حکومەت لەم هێرش و لەشکرکێشی یەدا ٨٧٥ گوندی کوردیان داگیرو تەخت کرد. خەڵکی ئەم گوندە بێ دیفاعانە، بەر لەوەی فرۆکەی عێراقی بکەونە بۆردومانی گوندەکانیان، پەنایان وەبەر دۆڵ و بناران برد بوو، تا لە پاڵ تاوێران دا خۆ پەنا بدەن؛ بۆیەش ئەمەیان کرد بوو، چونکە دارو درەختی قەد پاڵ و بنارەکان گەلەک تەنک بوون و بەشی خۆ وەشارانی ئەو خەڵکەی نەدەکرد. فرۆکەی عێراقی زەبری کوشندەیان لە کورد دا، بە تایبەتی لە قۆناغەکانی هەوەڵی هەڵگیرسانی شەڕدا. چونکە خەڵکەکە، بە تایبەت ژن و منداڵ ئەزموونی ئەوەیان نەبوو لە کاتی هاتنی فرۆکاندا چۆن خۆ وەشێرن، بۆیە هەرکە گوێیان لە دەنگی هاتنی فرکان دەبوو، لە ماڵ دەردەپەڕینە دەرێ و دەکەوتنە ئەو ساکەگۆڕە و ئیدی فرۆکەی سەر بە هێزی عێراقی و دەستکری بەریتانی و سۆڤیەتی، دەکەوتنە دروێنەیان.

تیمێکی رۆژنامەوانی سەر بە گۆڤاری (شتێرن)ی ئەڵمانی و وێنەگری فەرەنساوی (کلود دیفارجیە) و نوسەری ئەڵمانی (گوردیان تروبلر) توانیان هەندێ بەڵگەنامەی

زیندوو بە دەست بێنن کە ئەم کارە تیرۆرکاری و کۆ کوژییەی مەدەنیانی بێ چەک مەحکوم بکات، ئەویش لە ڕێگەی وێنەگرتن و تۆمار کردنی دەنگی خەڵکی یەوە. ئەم تیمە دوای بیست و چوار سەعات ڕێ بەپێ وبە سواری قاتر، بە شەکەتی و ماندویەتی لە ڕێگەی ئێرانەوە خۆیان بە یەکەم شاری کوردستانی عێرقیدا کرد. گوردیان، دەربارەی ئەم سەفەرەی نوسیوەو دەڵێ: "پاش ئەم سەفەرە دژوارە پیاو تەنیا بیر لە یەک شت دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە بەزەیی بە حاڵی خۆیدا بێتەوە، ژێوان بێ لەوەی کە ئەم هەموو ئەزیەتەی خۆی داوە ئەمجا بۆ شوێنێ بگەڕێ کە لێ ی پاڵ بکەوێ.. بەڵام ئەو دیمەنەی دیتمان، بەس بوو بۆ ئەوەی بیر لە هیچ شتێکی زاتی نەکەیەوە. بە سەرسامی لە بەردەم دیمەنی شاردا وەستاین، سێ یەکی خانوەکانی شار بەر بۆردومانی فڕۆکە جەنگی یەکانی عێراق کەوتبون و ڕوخابون و بوو بوون بەدارو پەردو. نیمچە مەحاڵ بوو پەیوەندییەکی مەنتیقی لە نێوان ئەو خەڵکەی کە بەر لە بۆردومانەکە لێرە دەژیان و لە نێوان شێوەو دیمەنی ئەوخشت وشیش و ئاسنەدا بدۆزی یەوە کە تەواو لە تابلۆیەکی سوریالی دەچوو. بەڵام هەستمان دەکرد تا تۆزێک لە مەوبەر ژیان لەبن دارو پەردوی ئەم شارە چکۆلەیەوە هەڵدەقوڵا، پێم وایە جەنازەی هەژارێک هەست و سۆزی مرۆڤانی زیاتر دەهاروژێنێ تا دەوڵەمەندێکی تێک شکاو.

کاتێ چەند پیاوێکی چەکداری کورد لە نێودارو پەردوەکانەوە وەردەر کەوتن و بەرەو پیرمان هاتن، هەستم کرد هەر هەموویان مژول و سەرقاڵی بنیاتنانەوەی ماڵەروخاوەکانن؛ ئەگەر وایان نەکردبایە، شەوێ لە سەرماندا ڕەق دەبوونەوە. هەر هەموو بە منداڵ و ژن و پیرەمێرەوە بەشداری بیناتنانەوەی خانوەکانیان دەکرد. کە خودا قوەت و ماندونەبوونیان لێکدی دەکرد، چ ڕوناکی و بزەیەکی نەدەکەوتە سەر سیمایان. زۆر سەرمان لە هەڵسوکەوت و جم و جوڵی بێ ووچانی ئەمانە سورما؛ ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بووبێ کە لە ناخی خۆدا زانیویانە ئەوەی ئەمڕۆ ڕۆیدەنەنەوە، سبەینێ دەبێت بە هەدەفی بۆردومانێکی ترو دەروخێتەوە. چونکە چ چەکێکی دژە ئاسانی نەبوو کە ئەم شارە بپارێزێت و لەو چارەنووسە سەیرەی دوربخاتەوە.

## پشتیوانییەکی دبلوماسی لە بلۆکی ڕۆژهەڵاتەوە

هەموو هەوڵ و تەقەلاکانی حکومەت بە فیرۆ چوو. بارزانی لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٣دا فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی هەموو کوردستان بوو جگە لەدەشتاییەکان وهەندێ شاری گەورە. هێندەی هێز هەبوو بتوانێ چاودێری ئەو ڕوداوە سیاسیانەی جیهان بکات کە ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ خۆیدا هێنانی. سۆڤیەتەکان، لە لایەکەوە حەزیان نەدەکرد یەکێتی ی عەرەب سەربگرێ و لە لایەکی تریشەوە ڕژێمی عارف کەوتە ڕاوەدونانی شوعییەکان، بۆیە دانیان بە شۆڕشگێرانی کوردا ناو ئەو پرۆسەی "کۆکوژی و قەتڵ و

عامەیان کە لە عێراق دا بەرقەرار بوو" مەحکوم کرد. رادیۆی موسکۆ لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣دا. رایگەیاند کە "کورد تاقم و دەستەیەکی تەعەدا کەرنین، بەڵکو خەبتینی وان، بەرگری یە لە خۆیان".

سۆڤیەت ئەو هەموو چەک و تەقەمەنی و تفاقە سوپاییانەشیان راگرت کە لە دوای شۆرشی (قاسم)ەوە (١٩٥٨) بۆ عێراق دەنێردرا. بەڵام بەریتانیا بەلەز ئەمەی قۆزتەوە، نەک هەر چەکی قورس و تەقەمەنی بە عێراق دا، بگرە ئەرکی مەشقداداتی ئەفسەرانی عێراقیشی گرتە ئەستۆ. یەکێتی ی سۆڤیەتیش لە لای خۆیەوە کەوتە هەوڵی دۆزینەوەی رێگایەک تا دۆزی کوردی بگەیەنێتە کەناڵە جیهانی یەکان و بیخاتە بەردەم نەتەوە یەکگرتوەکان کە ئەو دەمانە هێشتا رێکخراوێکی نێو دەوڵەتی ئەوتۆ بوو کە متمانە بە خۆی و بە سکرتێرەکەی (یوثانت) دەکرا. لە مانگی حوزەیراندا مەنگولیای میللی. کە لە هەموو دەوڵەتەکان پتر گوێرایەڵی موسکۆ بوو، لە یادداشتنامەیەکدا داوای لە سکرتێری نەتەوە یەکگرتوەکان کرد کە مەسەلەی کورد بخرێتە خشتەی کارەکانی کۆبونەوەکانی ئایندەی کۆمەڵەی گشتی یەوە. هەنجەتی مەنگۆلیا ئەوە بوو کە ئەمە ناڕەزاییەکە دەربارەی ئەو قەسابخانانەی هێزی ئاسانی عێراقی دژی خەڵکی مەدەنی بەرپایان کردوەو بانگەوازێکە بۆ راگرتن و وەستانی دەستبە جێ ی شەڕ.. یەکێتی سوڤیەتیش داوایەکی لەو چەشنەی خستە بەردەست ئەنجومەنی ئابوری و کۆمەلایەتی نەتەوەیەکگرتووەکان. هەروها کەناڵ و دەزگاکانی راگەیاندنی دەوڵەتی بلۆکی رۆژهەلات، بە تایبەتی ئەڵمانیای دیموکراتی، گەلە کۆمەکییەکی بەربلاویان کرد بۆ پشتیوانی و هاوکاری گەلی کورد.. رەنگە تەنیا رێکەوت بوو بێ کە رێکخراوی بەرگری لە مافی مرۆڤ، لە مانگی ت١/هەمان ساڵدا حکومەتی عێراقی بەوە تاوانبارو مەحکوم بکات کە (قەتلی و عام) دەکات. ئەم هەڵمەتە دبلۆماسییە بەر فراوانەی دەوڵەتە کومونیستی یەکان بۆ پشتیوانی لە دۆزێکی رەوای حاشا هەڵنەگری وەکو دۆزی کورد، کارێکی وایکرد، هەڵوێستی ئەو دەوڵەتە رۆژاواییانەی کە دروشمی بەرگری لە مافی مرۆڤیان هەڵگرتبوو، زۆر لاواز بکەوێتە روو.

(دیریک کینان)ی دپلومات، توانی ئەوکارەساتە مێژوویەی کە لە ساڵی ١٩٤٥ وەوتا نەهۆی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی گێژ دەدا، روون بکاتەوەو لەم بارەیەوە نوسی: "(رای گشتی) لە زۆربەی وولاتە دیموکراتییەکاندا دورو نزیک چاودێری رەوتی خەباتی رزگاریخوازی کوردی دەکرد و بە ئاشکرا هاوسۆزی دەگەڵ دەکرد. بە تایبەتی کە وێنەی کورد لە هزرو بیری عەوامی خەڵکی ئەو وولاتانەدا، وێنەی پیاوانی رەشید و جوامێرو رۆڵەی نەتەوەی کۆن و رەسەن بوو،و لە بەدبەختی خۆیاندا بە سەر سێ وولاتاندا دابەشکراوبوون، رێک وەکو حالی پولەندای بەرلە سەدوبیست ساڵ. لە

رۆژاواش دا بایەخ بە کورد دەدرا ئیدی چ بایەخ بەو لایەنی رۆمانسی یەی لە مەڕ کورد و وولاتی کوردەواری بیستیرابوو، چ وەکو جۆرە هاوبەشی یەکی ویژدانی بووبێ لەو چارەنوس و قەدەرەی بە سەرکوردا سەپێنرا بوو.

لەلایەکی دی یەوە، بەریتانیا و ولاتە یەکگرتوەکان هاوپەیمانی تورکیا و ئێران بوون و نەیاندەویست ئەو وولاتانە لە خۆ برەنجێنن و هەستیان بریندار بکەن. وەختێ یەکێتی سۆڤیەت دەستبەرداری ناردنی چەک بوو بۆ عێراق، بەریتانیا و ئەمریکا جێگاکەیان گرتەوە. ئەمە وای لە یەکێتی ی سۆڤیەت کرد کە ئیمپریالیزمی رۆژاوا بەوە تاوانبار بکات کە شەریکن لە هەڵمەتی قڕکردنی نەتەوەی کوردا کە لە پێناوی ئازادی خۆیدا دەخەبتێ؛ ئەلهەقی یەکێتی ی سۆڤیەت لەم خاڵەدا لە سەر هەق بوو". کورد، کە دیتیان یەکێتی ی سۆڤیەتی مەزن نەک هەر لە رووی راگەیاندنەوە کۆمەکیان دەکات بەڵکو ئەوەتا لە بواری (پراتیک)ش دا کەوتۆتە خۆ بۆ پشتیوانی دۆزەکەیان، ئیدی هومێدێکیان وەبەر هاتەوەو دڵخوشی خۆیان بەوە دەدایەوە کە سۆڤیەت دەست بدەنە باڵ دۆزەکەیان و تەنانەت بارەڕیان وابوو کە کۆمەکی بواری راگەیاندنش خۆی لە خۆیدا کاریگەرییەکی زۆر گەورەی هەیە و خزمەتێکی گەورەی دۆزی گەلەکەیان دەکات. بەڵام کاتێ کۆمەڵەی گشتی سەر بە نەتەوەیەکگرتوەکان لە مانگی ئەیلول دا دەستی بە کۆبونەوەکانی خۆی کرد، کوردەکان توشی ناهومێدی یەکی گەورە بوون: مەنگۆلیا بێ هیچ روونکردنەوەیەک یاداشتنامەکەی خۆی وەرگرتەوەو ژێوان بووەوە. دیاربوو یەکێتی ی سۆڤیەت، کەوا دەزانرا لە پشت ئەم هەنگاوەوە بووبێ، جارێکی دی سیاسەتی خۆی بەرانبەر بە گەلی کورد گۆڕی و هەمدیس بە لای عێراقدا بایدایەوە.

بارزانی، کە بەم گۆڕانکارییە ریشەییەی سیاسەتی سۆڤیەتی زانی، رایگەیاند کە رۆژێک لە رۆژان باوەڕی بەوە نەبووە "کورد بتوانێ لە رێگەی دبلوماسییەوە بەمافەکانی خۆی بگات". و "سەرکەوتنی ئێمە تەنیا لە لولەی تفەنگدایەو هەر تفەنگ و قوەت ئەنجامی خەباتمان دیاری دەکات". بەڵام لە قسەکەیدا بۆ هاوڕێکانی، حەقیقەتێکی باس نەکرد ئەویش ئەوە بوو کە کورد رەنگە بە خۆیان هۆیەک بووبن بۆ ئەم بادانەوە کوتوپڕوگێرگۆڕینە لە نکاوەی سۆڤیەت.

### ئایا هەموو عەرەب نەژادن؟!

جگە لەو باسانەی سەرێ، کورد هەندێ دەستکەوت و سەرکەوتنی نیزامی بە دەست هێنابوو کە مژدەی سەر کەوتنی پێ بوو، عێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ وە دووچاری کێشەو ململانێ ی بەردەوام بوو بوو لە سەردەسەڵات. عارفی سەرکۆمار لەم ململانێ یەدا سەرکەوت وباڵی چەپی حیزبی بەعس لە سەر حکوم لادا. سویا زۆر ماندوو بوو، عارف و باڵی راستی حیزبی بەعس بە سەرکردایەتی احمد حسن البکر، کە پاشان لە

سالی ١٩٦٨دا بوو بە سەرکۆماری عێراق، لەگەڵ کوردا کەوتنە گفتوگۆ. لە شوباتی ١٩٦٤ دا بەڵێنیان دا "کەلە چوار چێوەی گەلی عێراقدا مافی نەتەوەیی کورد بدەن".
ئەوە بوو بە ئاوبژیوانی (جەمال عبدالناصر)و (احمد بن بلا)ی سەرۆکی جەزایر، شەڕ وەستا و ئاگر بەس ڕاگەیەنرا. بەڵام ڕێسا گشتی یەکەی پەیوەندی کوردی- عێراقی زۆری دەوام نەکرد، عارف جێ پێ ی خۆی قایم کرد، هەر کە هەستی بە قوەتی خۆی کردو جڵەوی حوکمی گرتە دەست، ڕێسای گۆڕین دوبارە بووەوە. ئەوە بوومیداڵێکی تازە داهێنراو نێونرا میداڵی ئازایەتی. ئەم میداڵیەیەو کەسانە دەبەخشرا "کە بەشدارییان لە دامرکاندنەوەی یاخیبونی یاخییان و خیانەتکاران و پاککردنەوەی خاکی وڵاتی خۆشەویستمان لە جودا خوازان و نۆکەرانی ئیمپریالیزم دەکرد". زۆر مەسوول و بەرعۆدەی ڕەسمی بە ئاشکرا ڕایانگەیاند کە "ئەوەی ڕاستی بێ گەلێک نی یە بە نێوی کورد. ئەو خێڵ و تیرەو تایفانەش کە ئێژن کوردین، بەڕەگ و نەژاد عەرەبن". ئەمە دەقاو دەق کاوێژ کردنەوەی ئەو قسانەیە کە مەسوول و بەرعۆدە تورکەکان کردویانە بە بنێشتە خۆشەی ژێردانیان. ئەوە بوو جارەکی دی شەڕ هەڵگیرسایەوە.

لەلایەکی دی یەوە، یەکەم قەیرانی نێو سەرکردایەتی کوردی سەری هەڵدا. جەلال تالەبانی، بارزانی بەوە تاوانبار دەکرد کە لە گفتوگۆدا لەگەڵ حکومەت هەڵوێستی تاکڕەوانەی دکتاتۆرانەی هەبووە. دیارە ئەمە هەڵجەتێک بوو تا لە سەرەوە کودەتایەک لە نێو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بەر پا بکات، (نیسانی ١٩٦٤) بەڵام نەیتوانی بەسەر (لایەنگرانی بارزانی)دا کە زۆرینە بوون لە نێو پارتی دا، سەربکەوێ. تالەبانی هیچی بە هیچ نەکردو ناچار لەگەڵ تاخمێک لە هەوادارانی خۆیدا بۆ ئێران هەڵهات.

بارزانی، پاش سەرنەکەوتنی ئەم هەوڵی دووبەرەکی یە، پایەی خۆی بەهێز کرد. لە مانگی تشرینی یەکەمدا فەرمانی داو ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٦٣ کەس پێکهێنرا، تا دەزگایەکی ئوتونومی لە کوردستانی عێراقدا یەک لایەنە دابمەزرێنن بێ ئەوەی گوێ بەرەزامەندی حکومەتی ناوەندی بدەن. ئەنجومەنی نێو براو نەک هەر نوێنەری خەڵکی ناوچەرزگارکراوەکانی لەخۆ گرت، بەڵکو جگە لە کورد، نوێنەری مەسیحی یەکانی کوردستانیشی، کە بریتی بوون لە ئاسوری و ئەرسەدۆکس و کلدان و کاسۆلیک و نوێنەری تورکمانیشی گرتە خۆ.

بارزانی، لەکۆتایی سالی ١٩٦٤دا کۆمەڵێک داخوازی، کەلە لایەن ئەم ئەنجومەنەوە دارێژرا بوەوە، پێشکەش بە حکومەت کردو داوای ئاشتی و ئوتونومی تەواوەتی بۆ کوردستانی عێراق کرد. هەر چەندە ئەو پەیوەندی و گفتوگۆیانەی لە ئەنجامی ئەم هەنگاوەوە هاتنە گۆڕێ هیچ ئاکامێکیان نەبوو، بەڵام بایەخەکەی لەوەدا بوو کە ئەو

بیرو بۆچونانەی لەو قۆناغەی گفتوگۆ کەدا موناقەشە کران، پاشان بوونە بناغە بۆدارشتنی نیوەرۆکی بەیانی ئازاری ۱۹۷۰ و بوو بە بناغەیەکی بتەو بۆ هەموو ئەو گفتوگۆیانەی بەمەبەستی چارە سەری یەکجارەکی ناکۆکی یەکان دەکران.

ئەگەر چی لە شاری سلێمانی دا قۆناغێکی تری گفتوگۆ دەست پێکرایەوە، بەلام لەراستیدا بەمەبەستی خۆسازدان بوو بۆ شەڕ، ئەوە بوو لە ئایاری سالی ۱۹٦٥ دا هێرشێکی سوپایی گەورە دەستپێکرد. ئەم هێرشەش مایە پوچ مایەوەو بوە هۆی "روخان و وێران کردنی گوندێکی زۆر بە هۆی بۆردومانی ئاسمانی یەوە. ویرانی یەکی ئابوری فراوان هەموو کوردستانی گرتەوە. ئەمە جگە لە هەشت هەزار کوژراو وپێنج هەزار بریندار لە ریزەکانی سوپای عێراقی دا". وەکو مێژوونوسی میسری (القمراوی) لە سالی ۱۹٦۷ دا باسیکردووە. لە کۆتایی سال دا (عبدالرحمن البزاز) پۆستی سەرەک وەزیرانی عێراقی وەرگرت؛ سێ یەم کەس بوو کە لەو سالەدا ئەم پۆستە لە ئەستۆ بگرێ. ئەم پیاوەش لە سەر هەمان سیاسەت بەردەوام بوو. ئەوە بوو لە سەردەمی ئەودا هێرشێکی دی دەستپێکرد بەمەبەستی پێشڕەوی بەرەو سنوری عێراق- ئێران وپاشان لەتکردنی بەرەی کورد بۆ ناوچەی باکورو ناوچەی باشور. هێزەکانی حکومەت سیاسەتی (زەمینی سوتماک)یان زۆر بەفراوانی بەکار هێنا. ئەمە وای لە کورد کرد هێندەی دی رق ئەستور بن و عەزمیان جەزم بکەن و رژد بن لە سەر شەڕی مان و نەمان و بەرگری و بەرەڤانی لە هەربستە خاکێکی خۆیان. تا بەمجۆرە ئەم هێرشەش کە تا مانگی ک ۲ی سالی ئاینده بەردەوام بوو، دوچاری شکستێکی گەورە بوو؛ ئەم شەڕە بە حەساوی تەعلیقێکی رادێوی دەنگی کوردستان رۆژی یەک ملیۆن دۆلار لە سەر حکومەتی عێراقی دەکەوت.

پاش ئەوەی فرۆکە هەلیکوپتەرەکەی عبدالسلام عارفی سەرکۆمار کەوتە خوارەوە و ئەفسەرە بەعسی یە حوکمرانەکان (عبدالرحمن عارف)ی برایان لە جێ ی دانا، لە نیسانی ئەو سالەدا (۱۹٦٦) قوناغێکی دیکەی گفتوگۆ دەستی پێکرد. لەوە دەچێت بارزانی زۆری هیوا بە عبدالرحمن عارف هەبوو بێ، چونکە ئەوە بوو خێرا لە ۱۷/٤/۱۹٦٦ دا پێشنیاری کرد کە شەڕ بۆماوەی مانگێک بوەستێ. عبدالرحمن عارف ئەم پێشنیازەی بە لاوە سەیرو چاوەروان نەکراو بوو، خێرا پێ ی قاییل بوو، و بگرە سەرۆکی کوردی دەعوەت کرد بۆ بەغدا تا راستەوخۆ گفتوگۆی لەگەل بکرێ. بەلام بارزانی پیاوێکی پر ئەزمون بوو، هێشتا ئەو بەلێنە جۆراوجۆرانەی لە بیر مابوون کە فەرمانڕەوایانی عەرەب دابویانێ و پاشان لێ ی پاشگەز بوو بوونەوە، بۆیە لە وەلامی ئەو دەعوەتەدا گوتی: (لەئەزانانەوە فێر بووم) و ئەم گوتەیە چووە مێژووەوە.

روداوەکانی ئاینده، دروستی ئەو هەلوێستەی (بارزانی)یان سەلماند، عارف لە سەر هەمان سیاسەتی هەلپەرستانەی دوو فاقی فەرمانڕەوایانی پێش خۆی بەردەوام بوو:

لەو رۆژەدا کە بارزانی بۆ سەردانی بەغدا دەعوەت کرد، قەرارێکی دەرکرد زەعیم شکری العقیلی، کە زۆر لە کوردان کۆڵدار بوو، بکرێ بە سوپا سالاری سوپای عێراق و ژێراوژێر داوای لێکرد "بەیەکجارەکی کێشەی کورد لە نێو بەرێ و پاکی بکاتەوە". ئەوە بوو لە ١٩٦٦/٥/١ دا جارێکی دی شەڕ لە دۆڵ و چیاکانی کوردستان دەستی پێکردەوە. عوقەیلی زۆر بە لە خۆبایی بوونەوە رایگەیاند کە "خاینان لە سەرخاکی پیرۆزی کۆماری عێراقدا قڕ دەکات".

## وانەیەک لە مەڕ بەڕێوەبردنی شەڕی جەوەڵی

بۆ یەکەمجار، لە سەرەتای دەستپێکردنی هێرشی عەسکەری بۆ سەر کوردستان،حکومەتی عێراق توانی کەتیبەیەکی جەوەڵی بخاتە ناو شەڕەکانەوە. فەرمان بەم کەتیبەیە درا کە تەوەری نێوان رەواندوزو سنوری ئێران بگرێ، و ئەو تاقە رێگا هەرە گرینگە ببڕێ کە کورد بە کاری دێنێ بۆ هێنانی پێداویستی یە لوجستی یەکانی خۆیان لە ئێرانەوە، ئەوجا کە لە داگیر کردنی تەوەرەکە بوەوە، ئەوجا قڕ بخەنە هێزی کورد لە حەوزی رەواندوزدا. بەڵام ئەوەبوو شەڕی کانی یە کوردە قەوما؛ هەڵبەتە رەوتی ئەم شەڕانە هێندە پڕ ئەزمون و پەندو دەرس بوو کە تا ئێستاش لە زۆر کۆلێژو دەزگای نیزامی رۆژهەڵات و رۆژاوا دەخوێنرێ و هەڵدەسەنگێنرێ. ئەوە بوو پاشان بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنەوە زۆر ئافەرین و ستایشی کورد کرا، پاش ئەوەی رۆژنامەوانان و نوسەرانی رۆژاوایی، هەموو ووردو درشتێکی شەڕەکەیان تۆمارکرد و مانشێتی هەمیشەیی لە سەر لاپەڕەی رۆژنامەکان دەرکەوت، وەک: "هێزی پێشمەرگە چەندین لیوای سوپای عێراقی دەبەزێنێ و قڕدەکەن".

ئەو زانیارو ژمارە دروست و ئامارە دەوڵەمەندانەی لە سەر شەڕەکە بڵاو بوونەوە، لە راپۆرتێکی فەرماندەی کوردی (عبداللە پشدەری) و لێکۆڵینەوەیەکی زانستی پسپۆڕێکی نیزامی ئەڵەمانی، کە لە ساڵی ١٩٧٠ دا ئامادەی کرد بوو، وەرگیراون، هەڵبەتە ئەمە لە پایەی ئەو دەستکەوتە مەزنەی کوردان کەم ناکاتەوە. بە پێ ی ئەم لێکۆڵینەوە زانستی یە، سوپای عێراقی یەک لیوا و نیوی لە هێزەکانی خۆی، بەپشتیوانی سێ یان چوار کەتیبە تۆپخانەو پۆلێک فرۆکەی جەنگی، لە حەوزی رەواندوزدا خڕ کردەوە. نەخشەی گشتی شەڕەکە، کە دوای شەڕەکە لە بارەگای لیوای چوارەمی جەوەڵی دا، لە بناری چیای هیندرێن: کە ٢٨٧٥ مەتر بەرزە، دۆزرایەوە، وا هی بووە کە هێزەکانی عێراق، زنجیرە چیاکانی نێوان لوتکەی هندرێن ولوتکەی زۆزک کە (٢٢٠٠٠م) بەرزە، بگرن، ئەوجا پێشڕەوی بکەن و لە هەردوو رەخی رێگەی هاملتون دابەزرێن. ئەوجا نۆرەی کەتیبەی تانک دێت تا بە رێگا نێو دەوڵەتی یەکەدا پێشڕەوی بکات بۆ ئەو هەدەفەی بۆی دانراوە.

—

بەلام سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، زانیاری تەواویان دەربارەی ژمارەی سەربازو جۆری چەک و سەعاتی سفرو نەخشەی شەڕی هێزەکانی عێراق هەبوو، ئەم زانیاریانە لە ڕێگەی پیاوانی شۆڕشەوە، لە بەغداوە هاتبوو. کە باسی ئەو شەڕەم لە مسعود بارزانی پرسی، وەلامی دایەوە، کە پیاوانی دەزگای پاراستن ئەو زانیاریانەیان وەدەست هێناوە. هەر چەندە پسپۆڕانی نیزامی بێگانە پێیان وایە کورد لە ڕێگەی هاو ئاهەنگی تەواوی موخابەراتی کوردی و موخابەراتی دەولەتێکی بێگانەوە تەفاسیلی نەخشە عێراقی یەکەیان دەست کەوتوو.

بەهەر حال کورد نەخشەیەکی بەرگریان لەو تەوەرەگرینگە بەسەرپەرشتی فەرماندەییەکی ناوەندی، دانا. فەرماندەیی مەیدانی بە عبدالله پشدەری سپێردرا. ئەم پیاوەم لە شەڕەکانی ١٩٧٤/ ١٩٧٥ دا بینی و ناسیاویم لەگەل پەیدا کرد، پیاوێکی باریکەلەی چاوشین بوو، بەروالەت لە نێچیرڤانێکی هێدی و هێمن دەچوو. پشدەری هێزێکی (٣٥٠٠) کەسی خڕ کردەوە. کە عێراقی یەکان بە هێزێکی(٢٠) هەزار کەسییەوە و پاش بۆردومانێکی چڕو پڕ هێرشیان دەستپێکرد، کوردەکان زۆر بەتوندی بەر پەرچیان دانەوە، بەر پەرچدانەوەیەک کە لە ئەقل دا نەبوو. ڕەوشەکە بوو بە کارەساتێکی ئالۆزوکاو. شەڕ لە هەموو قوژنەکانەوە گەرم بوو، لە ٤/٥ تا ١٠/ ٥/ ١٩٦٦ بەردەوام بوو.

کوردەکان بەرگری و بەرەڤانییەکی قەهرەمانانەیان کرد: کەتیبەی چواری جەوەلی هەموو چیای هندرێنی گرت. هێزی حکومەت لە قولی زۆزکەوەش، هەر چەندە خەسارەتێکی زۆری لێکەوت، پێشڕەوی خۆی هەرکرد. حکومەت لەم شەڕانەدا پتر لە دوو هەزار جەنگاوەری لە دەست دا. هێزی عەسکەری تەواو شپرزە بوو، دەبوایە هێزە هێرشبەرەکەیان کە تەواو وڕەی ڕوخا بوو، و ئەترەی بەردا بوو، و شنگی لە بەر بڕابوو، بگۆڕن و بەگوێرەی ڕوداوە تازەکانی شەرگە سازی بدەنەوەو دایەزرێنن، بۆ ئەمە پێویستیان بە دوو ڕۆژان هەبوو.

پشدەری، لە شەوی دوانزەی ئایاردا، کە دلنیا بوو ئەم تەوەرە هەرەگرینگە هەموو قوربانی یەک دێنێ، بەخۆی فەرماندەیی هێرشێکی سەرکەوتوی وەهای کرد کە لە بنج و بناوانەوە ڕەوتی شەڕەکانی گۆڕی و ڕاستەوخۆ کاری کردە سەر ئاکامی شەڕەکان. هەندێ مەفرەزی بچوکی پێشمەرگە، بە شەوو بە دزییەوە خۆیان بە بەینی هێزەکانی عێراقدا کردو لە وێندەر خۆیان لە سەنگەری نادیاری ئەوتۆ نا کە هێزە عێراقی یەکان پێیان نەحەسێن و لەوێ چاوەنۆڕی ئەمرو فەرمانی فەرماندەیی خۆیان کرد. نەخشەکەی پشدەری وەها بوو کە دژە هێرشی کوردان لە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی‌دا، بەر لەخۆرنشینێ بە چەند سەعاتێک بکرێ: مەبەست ئەوە بووکە هێزەکانی عێراق بخرێنە شەڕی شەوەکی یەوە، کە هیچ شارەزاییەکیان لێ ی نییە، لە لایەکی تریشەوە

هێزی پێشمەرگە لە شەڕی فڕۆکەی عێراقی بخەلەسن، کە بە بولێڵی نێواران و بە شەوان دەورو کاریگەییان نەدەما.

سەعات چواری ئێوارێ، تۆپبارانی کوردی دەستیپێکرد، هەر چەندە ئەم تۆپبارانە بۆ ئەو بابەتە شەڕە هێندە کەم نمود بوو، مایەی پێکەنین بوو. بەڵام بەلای کوردەکانەوە هێزێکی زۆر گەورە بوو. پشدەری شەش تۆپی عەیار (٢٥) رەتڵی هێنا. ئەم تۆپانەیان لە شەڕەکانی پێشوترا لە سوپای عێراقی گرتبوو، کورد بۆ یەکەمجار تۆڕێکی پەیوەندی بێتەلیان بە کار هێنا بۆ ئاراستە کردنی هەر شەش تۆپەکە. پشدەری فەرمانی دا هەر شەش تۆپەکە بە جارێ بارەگای کەتیبەی چواری جەوەڵی لە بناری چیای هندرێن دا تۆپباران بکەن. بارەگای نێوبراو زۆر بە چڕی تۆپباران کرا.

کە دنیا تاریک بوو بارەگای نێوبراو بەتەواوەتی داڕوخاو وێران بوو. کاتێ قوەت و یەکە عێراقی یەکان لە بارەگای فەرماندەیی عەمەلیاتەکان دابڕان و ئەو پێشمەرگانەش کە دزەیان کرد بووە نێو هێڵەکانیانەوە، بەر دەستڕێژی لە پەستاو بێ پسانەوەیان دان، کەوتنە پاشەکشە لەو شوێنانەی کە گرتبوویان ئەوسا پشدەری فرمانی دایە پێشمەرگە کە پەلاماری هێزە شپرێوەکانی عێراق بدەن. ئەوەبوو لەو قۆناغەدا ئەو پێنج کەتیبە عێراقی یەی لە هێرشەکەدا بەشدارییان کرد بوو، واتا کەتیبەی ١، ٤، ٥، و ١٣، ١٤، هەر هەموویان تەفروتونا بوون و هێزی پێشمەرگەش بێ ئەوەی رەحمیان پێدا بکەن تا شەش سەد مەتری بارەگای سەربازەخانەکەیان لە (رەواندوز) راویان نان.

پشدەری لە دوا راپۆری خۆیدا بە ئەعسابێکی ساردو گوزارشتێکی شاعیرانەوە باس دەکات کە سەدان جەنازە "هێشتا لە لوتکەی هندرین دا لە بن داربەڕووان دا کەوتووە، گەلەک جەنازەش لە نێوگوڵزاری بەهارداو لە ژێرتیشکی هەتاودا، ساردو سڕکەوتون و تیشکی هەتاوەکەش ناتوانێ زەڕەیەک گەرمی بەو جەنازانە ببەخشێت". ئەوجا بە کورتی لە سەری دەڕوات: "هەموو دەستکەوتەکان بەکەڵکی بەکار هێنان دێن". ئەوجا ژمارەی کوژراوانی هێزی عێراقی بە ١٨٠٠ کەس مەزەندە کردوە. هێزی پێشمەرگە جوابیان بۆ هەیئەی سوری عێراقی نارد کە خەڵکانێک بنێرن بۆ وەرگرتنەوەی ئەو (٥٠٠) سەربازە عێراقی یەی کە بەزامداری یەخسیر بوون.

هەڵبەتە ئاشکرایە کە کورد ئەم سەرکەوتنە مەزنەیان بە نرخێکی کەم بە دەست هێنا: پەنجا و دوو شەهیدو سەدو سێ بریندار. دەستکەوتەکانیان ئەمانە بوو: چواردە تۆپی جەوەڵی، دوانزە تۆپی هاوەن، شەش تۆپی رەشاش، چل و چوار رەشاشی مام ناوەندی، سێ سەد رەشاشی سووک، پتر لە هەزار تفەنگ، چل و شەش جیهازی بێتەل، تەقەمەنییەکی یەکجار زۆر، ئەوەدو دوو خێوەتی گەورەی نیزامی (عەسکەری) و پتر لە پێنج سەد پەتۆ.

## قۆناغی گفتوگۆ

پاش ئەم شکستە گەورەیەی عێراق، ئیدی هەردوولا حەزیان بە دەست پێکردنی قۆناغێکی تری گفتوگۆ هەبوو. هەرچەندە ئەو سەرکەوتنەی کورد لە چاو خۆیدا لەسەرکورد هەرزان کەوت، بەڵام باروودۆخی ئابوورییان زۆر خرا و بوو. بە تایبەتی پاش زستانێکی زۆر تووش کە بە دەست کەمی ئازوقەوەو لە ئەنجامی ئابلوقەی ئابووری عێراقەوە دەردی سەری زۆریان دیت. (عبدالرحمن بەزاز)ی سەرەک وەزیرانی عێراق، کە بۆ نزیکەی بیست ساڵ دەچوو، یەکەم سەرەک وەزیرانی مەدەنی بوو، لە گوتەیەک دا رایگەیاند کە تاقە رێگەی دەرباز کردنی وڵات لەو تەنگژە ئابوورییەی دوچاری بووە، کۆتایی هێنانە بە شەڕی باکورو رێکەوتنە لەگەڵ شۆڕشگێرانی کوردا.. ئەوە بوو رێکەوتننامەیەکی دوانزە خاڵی لە رۆژی ١٩٦٦/٦/١٦ دا لە رادیۆ وتەلەفزیۆنی بەغداوە راگەیەنراو لە مێژوودا بە (رێکەوتنی بەزاز) ناسراو رۆیی.

لە کۆتایی مانگی حوزیران دا، (بارزانی)ش رەزامەندی خۆی لە سەر رێکەوتنی نێوبراو راگەیاند کە گرینگترین خاڵی ئەوە بوو زمانی کوردی دەبێتە زمانی خوێندن و زمانی رەسمی لە ناوچە کوردییەکانی وڵاتدا. خاڵێکی تری رێکەوتننامەکە لێبووردنی گشتی بوو بۆ جەنگاوەرانی کورد، ئامادە کردنی بەرنامەیەکی ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی کوردستان کە جەنگ وێرانی کرد بوو. هەروەها گەڕانەوەی ئەو کوردانەی کە لە ساڵی ١٩٦٣ دا راگوێزرا بوون، بۆ ناوچەکانی خۆیان. هەروەها رێکەوتننامەی گۆڕین هەندێ بەندو خاڵی نهێنی تێدا بوو دەربارەی دامەزراندنی پارێزگایەکی کوردی لە شارۆچکە کوردنشینەکانی سەر بە پارێزگای موسڵ و، بەردان و ئازاد کردنی هەموو زیندانی یە سیاسییەکانی عێراق نەک تەنیا کوردەکان. بەزاز لە سەر مەسئولیەتی خۆی بەندو خاڵەکانی ئەم رێکەوتننامەیەی دارشتبوو، هیچ پرس و رایەکی بەو خەڵکە نیزامییانە نەکرد بوو کە لە کۆتایی مانگی حوزێراندا ویستیان کودەتایەک بکەن و ئەوجا رێکەوتننامەکە رەفز بکەن. ئەوەی بەزازو عبدالرحمن عارفی لە کەوتن رزگار دەکرد تەنیا ئەوە بوو دەسبەرداری ئەو بەڵێنانە بن کە بە کوردیان دا بوو،و دەست بەگەڕێکی نوێ ی گفتوگۆ بکەن.

لەگەڵ ئەوەش دا بەغدا لە ماوەی دوو ساڵی گفتوگۆدا، زۆریان لە بەر کورد داهێنا، رەنگە هۆی ئەمە ئەو ترسە بوو بێ کە لەشکستی هندرێن دا دوچاری بوون و هێشتا لەبەر چاویان بوو. ئەوە بوو رێگە درا لە بەغدا رۆژنامەیەکی رۆژانە بە هەر دوک زمانی کوردی و عارەبی بە نێوی (برایەتی) (التآخی) دەربچێت. ئیدی عوقەیلی لە کوردان کۆڵدار لە پۆستەکەی لابراو وەزارەتخانەیەک بۆ کاروباری باکور دانراو وەزیرێکی (کورد)ش بۆ کابینەی وەزارەتی عێراق زیاد کرا. ئەوە بوو دواتر، بەزاز رایگەیاند کە دەشیا ئەم سەرەتایە بێ بە بناغەیەک بۆ چارەسەری یەکجاری کێشەی

کورد لە عێراقدا. بەڵام جارێکی دی و لە ١٩٦٨/٧/١٧ دا (ئەخۆشییە عێراقی یەکە) سەری هەڵدایەوە؛ بەعسی یە هەڵگەڕکەکانی عارف، بە سەرکردایەتی احمد حسن البکر و پشتیوانی چەند ئەفسەرێک کودەتایەکیان بەرپاکرد، ئەوە بوو احمد حسن البکر دوای سیازدە رۆژو لە کودەتایەکی پاشتردا، لە ١٩٦٨/٧/٣٠ دا هەمان ئەو ئەفسەرانەی کە پشتیوانیان لێکرد، دووری خستنەوەو تێزی کردن.

هەر چەندە لە بەیانی یەکەمی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دا، کە ئەلبەکر دایمەزراند، ئاماژەیەک بۆ مەسەلەی کورد نەکرا، بەڵام لە هەندێ بڕیارو هەنگاوی دواتردا، بەشدارییەکی باشی کرد لە سووک کردنی کێشەو تەنگژەی نێوان کورد وحکومەتی ناوەندی، کە بەلای زۆربەی چاودێرانەوە مایەی سەرسامی بوو. بۆ نموونە حکومەت رایگەیاند کە بە نیازە زانستگەیەکی کوردی و کۆڕێکی زانیاری کوردی دابمەزرێنێ کە بارەگاکەی لە بەغدا بێ. (رۆژی نەورۆز)ش کە جەژنی نەتەوەیی کوردە، کرا بە پشوی رەسمی لە عێراقدا.

بەڵام ئەو باری سەرنجە گشتیانەی کە لە مەڕ ئەم هەنگاوانە گەڵاڵە بوون، ئەوە بوو کە حکومەت گەرەکیەتی لە دەسەڵاتی بارزانی کەمبکاتەوەو دوو بەرەکی بخاتە نێو کوردانەوەو تەفرەقەیان تێ بخات. بەتایبەتی کە حکومەت لە بەغدا حیزبێکی کارتۆنی بە نێوی حیزبی (رزگاری) دروست کرد و ئەوجا کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ جماعەتی تاڵەبانی لە لایەک و لەگەڵ شێخ و سەرانی خێڵە دژمنەکانی بارزانی لە لایەکی دی یەوە. هەروەها هێزێکی چەکداری لە کرێگرتەی کورد و عەرەب بە نێوی (سوارەی سەلاحەدین)ـەوە دامەزراند، واتا بە ناوی کەسایەتی ناسراوی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی)یەوە ناوی نا.

## ناپالم و قەسابخانەی بەشەری

جگە لەو کردەوانەی سەرێ، حکومەتی عێراقی زاتی ئەوەی لە خۆیدا بینی کە دەست بەگەڕێکی تری شەڕی عەسکەری بکاتەوە. ئەوە بوو لە مانگی ئازاری سالی ١٩٦٩دا، هێزێکی شەست هەزار کەسی بە سەرکردایەتی خودی ئەلبەکر پەلاماری پارێزگاکانی باکوری دا؛ هەڵبەتە ئەمە بووە هۆی هەڵگیرساندنەوەی شەڕێکی بێ رەزا لە مابەینی حکومەت و بارزانی دا. ئەمجارەش سوپای عێراقی پڕ چەک و چەکدار بە تازەترین چەک و پێداویستی سوپایی، نەیتوانی بە سەر هێزی لەشکری کوردا، کە ژمارەیان گەیی بووە سی هەزار پێشمەرگە، سەر بکەوێ.

کوردش لەلای خۆیانەوە لەوە حالی بوون کە ناتوانن بێ کۆمەکی دەرەکی کاریگەر، حکومەت ناچار بکەن مل بۆ ئاشتی بدات. تاقەشتێک، کە سەبارەت بەم قۆناغەی شەڕ، کە دەساڵە بەردەوامە لە هزروبیردا ماوەتەوە، ئەو قەسابخانە بەشەرییە

سامناکانەیە کە هێزەکانی عێراق دەرهەق بە خەڵکانی مەدەنی بێ چەک و دیفاع بەرپایان کردووە. زۆر پەیامنێری رۆژنامەوانانی سویسری و پەیامنێرانی (لوموند)ی فەرەنسی باسی ئەوەیان کردووە کە چۆن دانیشتوانی مەدەنی بە بۆمبای ناپاڵم و هێشویی بۆردومان کراون.

هەروەها باسی ئەوەشیان نوسیوە کە پیاوانی دەوڵەت سوکایەتیان بە رەبەنانی دێری کلدانی شاروچکەی ئەلقوش کردووەو لە مانگی تەموزی ۱۹۶۹ دا دەست درێژییان کردونەتە سەر. لە ئابی ۱۹۶۹ دا (۷٦) ژن و منداڵی گوندی (داکان)یان لە نزیکی گوندەکەیاندا سەربڕیوەو گوندەکەیان کردوون بە ساکەگۆڕ. هەروەها باسی ئەوەیان نوسیوە کە سەربازانی عێراقی لەمانگی ئەیلول دا خەڵکی گوندی (صوریا)ی ئاشورییان کوشتوەو لە هەمان مانگدا گوندێکی تریان لەگەڵ عاردی دا تەخت کردووەو هەموو خەڵکەکەیان، کە سەدوبیست و یەک کەس بوونە، تیرباران کردوونە؛ لەبەر ئەوەی لە نزیکی گوندەکەیان دا مینێک بە ئوتومبیلێکی عەسکەریدا تەقیوەتەوەو ئەفسەرێک تێدا کوژراوە.. ئەوجا هەر هەمان ئەو سەربازانە کەوتونەتە گەڕان بە دوی ئەو منداڵانەدا کە لەترسا سەری خۆیان هەڵگرتوەو پێنج منداڵیان لێ دەستگیر کردون و تیر بارانیان کردون کە تەمەنیان لە نێوان ۲-۸ ساڵ دا بووە.. دە منداڵی دیکەیان بە پێشکەکانیانەوە توڕداوەتە روبارێکەوە.

دیارە ئەم دیمەنانە رێک لە دیمەنی ئەو تاوانانە دەچن کە لە ساڵی ۱۹٤۲ دا دەرهەق بە (لیدیس) کران. یان لە ساڵی ۱۹٤٥دا لە ناوچەی (سودیت) ئەنجامدران یان لە (مای لای) ڤێتنام دا کران. لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹٦۹ دا زۆر بەڵگەنامەی بنجبڕ دران بە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان کە بە ئاشکرا ئەوەیان دەسەلماند کە هێزەکانی حکومەتی عێراق سێ هەزار گوندی کوردیان بۆردومان کردوەو ماڵەکانیان یان روخاندوە یان سوتاندووە. بەڵام هیچ لایەنێک لە جێ ی خۆی نەبزووت تا جڵەوی عێراقی هاروژاوەکان بگرێ: یەکێتی ی سۆڤیەت پەیوەندییەکی بە تینی لەگەڵ رژێمی عێراقدا هەبوو. ناوەندە پێشکەوتوخوازەکانی ئەوروپای رۆژاواش کێشەی ڤێتنامیان بەس بوو تا بەو بیانوەوە نارەزایی خۆیان دەربارەی مل هوڕییەکانی ئەمریکا دەربڕن.

حکومەتانی ئەوروپای رۆژاواش لایان وابوو کۆتایی هاتنی جەنگی شەش رۆژەی مابەینی ئیسرائیل و عەرەب لە ۱۹٦۷/٦/٦ دا نیمچە ئارامی یەکی بۆ ناوچەی رۆژهەلاتی ناڤین گێڕاوەتەوە. هەر چەندە لە ئارامی و کپی گۆڕستانان دەچوو، بەڵام بەو حاڵەشەوە ئارامی و هێمنی یەک بوو کە ئەو حکومەتانە بە جدی لە خەمی پاراستنی دا بوون، بەو حەساوەی زامنە بۆ وەدەست هێنانی پێداویستی یەکانیان لە نەوتی ناوچەکە، ئەو نەوتەی کە کوردش هەست بەدەورو کاریگەریەکەی دەکەن. بەڵام رۆژاوا هەوڵی داوە وێنەی واقیعی ئەم گەلەو ئەو کارەساتانەی بە سەریدا دەهێنرێ پشت گوێ

بخات و تەنیا لە روانگەی کتێبێکی وەکو کتێبەکەی (کارل مای)یەوە کە وێنەیەکی شاعیرانە لە مەڕ کورد نیشان دەدا، بڕوانە کورد.

**رێکەوتننامەی یازدەی ئازار**

بەلام هەر هەمرو ئەم پشت گوێ خستنە جیهانی یەو هەمرو هەلمەت و هێرشە عەسکەرییەکانی عێراق و بەکار هێنانی زەبرو زەنگ و هاندانی سیاسی نۆکەرانی سەر بە رژێم، نەیانتوانی ئەلبەکر بگەیەننە ئەو سەرکەوتنەی کە بە ئاواتی دەخواست. حوکموانانی بەغدا گەیینە ئەو ئەنجامگیرییەی کە پێویستە لەگەل (برا کوردەکان) داو لە رێگەی لێکدی حالی بوونەوە، چارسەرێکی هەمیشەیی بدۆزرێتەوە؛ لەگەل ئەو برا کوردانەدا کە رژێم ناچار بوو رێزیان لێ بنێ، سەرەڕای رق و کەرب وکینەی ئاشکرای لێیان. لەسەرەتای سالی ۱۹۷۰دا دەسەلاتی تەواو درا بە سەرۆک و ئەمینداری گشتی سەرکردایەتی حیزبی بەعس (میشل عەفلەق)ی خەلکی سوریا، تا لە بەیروت لەگەل کوردەکاندا دەست بە گفتوگۆ بکات. (بارزانی)ش بۆ هەمان مەبەست نوێنەری سیاسی و سوپایی خۆی دارا توفیق و فۆاد عارفی نارد، فۆاد عارف لە سوپای کوردی دا پلەی زەعیم بوو.

کاتێ خەلکی بەغدا، دوای چەند هەفتەیەکی کەم و لە ۱۹۷۰/۳/۱۱ دا تەلەفزیونیان کردەوە، باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد،کەوتنە هەلگلۆفتنی چاوی خۆیان تا راستییان بۆ ساغ بێتەوە؛ بە چاوی خۆیان دیتیان کە ئەلبەکر لە بەردەم کامیرای تەلەفزیون دا باوەشی بە کوڕانی بارزانی (ادریس) و (مسعود)ا کردو ماچی کردن، ئەو بارزانی یەی کە چەند رۆژێک لەوەبەر، حکومەت نزیکەی ۱۵ ملیون مارکی ئەلمانی تەرخان کرد بوو بۆ هەر کەسێک بەزندویەتی یان مردویەتی تەسلیم بە حکومەتی بکات.

هەروەها کەنالەکانی رادیوو تەلەفزیونی رەسمی کەوتنە ستایشی هێزی پێشمەرگە و گوتی: "پیرۆزترین دەزگای خەباتمانن دژی دوژمنی هاوبەش". پاشان ئەلبەکر دەقی بەیانی یازدەی ئازاری خوێندەوە کە گرینگترین خالەکانی بریتی بوو لە دەستکاری کردنی دەستوری عێراقی و بەو پێ یەعێراق لە دوو گەلی عەرەب و کورد پێک دێت، پێویستە عەرەب و کورد خزمەتی نیشتمانی خۆیان، کۆماری عێراق بکەن، دەبێ وەکو برا مامەلەیان لەگەلدا بکرێ و بە یەک چاو تەماشا بکرێن.

ئایا ئەمە بۆ کورد نیشانەی بەرپا بوونی ئاشتی بوو؟ ئایا ئەمە پاش سەدان سال چەوساندنەوەو تالان و حاشاکردن لە ناسنامەی نەتەوەیی و دوو بەرەکی و تەفرەقەنانەوە لە ریزیانداو کۆچاندن و راگوێزان و هەولی قڕ کردنیان نەهاتبووە ئاراوە؟! ئایا ئەمە فەسلێکی نوێ تۆ بلێ کتێبێکی نوێ نەبوو لە مێژووی کورد؟! زۆر

کەس ئەم پرسیارانەو پرسیاری دیکەیان لە خۆ کرد، دوای ڕاگەیاندنی ڕێکەوتننامەی یازدەی ئازارو هەر بەم چاویلکەیەش تەمەشایان کرد. کە چی بارزانی بە خۆیشی لە تەعلیقێکی دا لە سەر بەیانی نێو براو، کە پاشان وەکو قسەی نەستەقی لێهات دەڵێ: "چاوەڕوان دەکەین، تا بدینێن سبەینێ چ لەگەڵ خۆیدا دێنێ".

# فەسڵی یازدەیەم

بۆ یەکەمجار کورد یەک دەگرن

## کورد، شەڕی ١٩٧٥/١٩٧٤ بە پشتگیری ئێرانی-ئەمریکی دەکەنەوە

رۆژێکی خۆش بوو. لە رۆژانی مۆڵەتی پایزەی (تیسینی)ی دەچوو. هەتاو پرشنگدار بوو. شنە بایەکی پاک و بۆنخۆش لە چیاکانەوە دەدها. لە بانیژەی میوانخانەی چۆمان، لە سەر کورسی دانیشتبووین و نانمان دەخوارد، میوانخانەکە دەیروانی یە سەر شاری چۆمان. عەلی، کوڕێکی شازدە ساڵ بوو، بۆ جاری سێیەم چای لەگەڵ خواردنی بەیانی دا بۆ (ئەفەندییانی ئەڵەمانی) تێکردەوە. عەلی ناوە ناوە دەچووە سوچێکەوەو بە شەکر شکێنەکەی دەکەوتە قەند شکاندن. زۆر وەستایانە قەندەکەی دەشکاند، دیکرد بە کوڵۆی بچوکی یەکسان و لەگەڵ چایەکاندا بۆی دادەناین. ئێمەش هەنگوینی خالیسەمان بەنانی تیری گەرمی ئەو بەیانی یەوە دەکرد، نانەکە لە پارچە قوماشێکەوە پێچرا بوو تا سارد نەبێتەوەو تامی تازەیی بمێنێ و پارومان لە ماستی مەڕدەدا.

چوار دەوری بانیژەکە ئینجانەی گوڵ بوو. دیار بوو دەستێکی کارامە لە قوتی بەتاڵ دروستی کرد بوون. خێزانەکەی ئەندازیاری تەلارکاری (دارا بیدار) گوڵی جۆراوجۆری تێدا رواند بوون. (گوڵێ) کە کیژێکی هەشت ساڵەی زەری وەش بوو، بە درێژایی رۆژ و بە شەوقەوە گوڵەکانی ئاو دەدا. کە تیشکی هەتاوەکە لە قژە زەردەکەی دەدا، رەنگێکی ئاڵتونی جوانی پێدەبەخشی.. بوونی ئەو لەوێ، سیمایەکی واقیعی ئەوتۆی بە شوێنەکە دەدا کە پڕ بە پێست و شایستەی ناوەکەی (گوڵێ) بوو.

لە نێو چڕە دارستانی چنارو بەڕووەوە ماڵ و کوچەو کوڵانانی شاری چۆمان مان دەبینی کە بە هەردوو رەخی جادەی نێو دۆڵەکەدا بڵاوبوو بوونەوە. دانیشتوانی شار، نزیکەی (١٥٠٠) کەسێک دەبوون. بینای وێستگەی کارەبا کە تازە دروستکرا بوو، لە نێو سەربانی تەختی خانوەکانی دی یەوە، کە کایان پێوە کرا بوو، بەرز بوو بووەوە. وێستگەکە، کە گوندەکانی دەوروبەری (چۆمان)ش بەنۆرە سودیان لێ دەبینی، بەبۆیەیەکی سپی تۆخ بۆیە کرا بوو. سەربانەکەی قوچەکی بوو؛ لەسەر شێوەی سەربانی ئەوروپایی دروستکرا بوو. سەربانی ئەو خانوانەش کە لە میوانخانەکەدا بوون، هەر بە هەمان شێوە دروستکرا بوون. ئەمە جۆرە بینایە غەریب نەبوو. چونکە (دارا بیدار) کە سەرپەرشتی ئەم خانوانەی کرد بوو، ئەندازەی تەلارکاری لە (درسدن) خوێند بوو و پاشان لە (ئاخن) تەواوی کرد بوو. هەر چی یەک لە ئەڵمانیا

فێر بوو بوو، لەگەڵ خۆی هێنابویەوەو لێرە: لە کوردستاندا لە خشت و بینای هاو چەرخ دا بە کاری دەهێنا. چەند داینە مۆیەکی کارەبا، زۆر بە پەلەو نارێک و پێکی دانرا بوون تا لە ئاوی روباری باڵەکەوە، کە زۆر بەلەز شان بە شانی جادەکە نشێو دەبوەوە، کارەبا بەرەم بهێنن. ئا بەمجۆرە دارا بیدار، تەکنولوژیای پەرەسەندوی گواستبووە بۆ ئەم گوندە دورە دەستەی (کوردستانی کوێی).

ئەنجومەنی گوند، جگە لەوەی کارەبایان بۆ ناو گوندەکە راکێشا بوو، پرۆژەی ئاوی لوولە کێشیانیش دامەزرند بوو. بە سۆندە ئاویان لەکانی و سەرچاوەکانی سەر چیاکانەوە بۆ نێو پیرە گوندی هەمێزی دۆڵەکە، راکێشا بوو. بۆیە ژنان بۆ خۆ حەسابوونەوەو بە گۆزەو تەنەکەو پیپ و بە شان ئاویان بۆ ماڵەوە نەدەهێنا. رێگەی نێو ماڵەکانیان چاک کرد بوو. بارەگایەکیان بۆ لیژنەی کاروباری کۆمەڵایەتی کەوەکو ئەنجومەنی گوند وابوو، دروست کرد. سەرباری هەموو ئەمانە، کرێکاران سەرگەرمی دروستکردنی بینایەکی دی بوون، کە لە رۆژهەڵاتدا باوو پەسند نی یە.

ئێمە لە بانیژەی میوانخانەکەوە گوێمان لە دەنگی مەکینەی بلۆک دەبوو. کرێکارو بەنناکانمان دەبینی چۆن بە عەرەبانەی دەستی خشت و بلۆکیان دەگواستەوەو لە وێندەرەوە بە دەستەبەرە سەریاندەخست بۆ سەربانی نهۆمی یەکەم تا دەست بە دروستکردنی نهۆمی دووەم بکەن . (دارا بێدار)ی ئەندازیار بە شانازیەوە لە ناوەندی ئەو هەراو هەنگامەیەدا دەوەستاو فەرمانی بەوەستا و کرێکارەکان دەداو رێنوێنی دەکردن؛ لە تۆ وایە سەرپەرشتی کۆمەڵێک کرێکارو وەستا دەکات کە تازەترین سلینگی کارەبایی و عەماری خشت و گەڵابەیان لە خزمەت دایە!!.. بریار بوو ئەم بینایە، کە لەتەواو بووندا بوو، بکرێ بە بازارێکی هاوچەرخ. قەرار بوو هەر هەموو دوکان و موغازەکان بگوازرێنەوە بۆ ناو ئەم بینایەو چالاکی بازرگانی بە چاودێری لایەنە بەرپرسەکاندا ئەنجامبدرێ.

دارا بێدار، بیری لەوش دەکردەوە کە قەساوخانەیەکی هاوچەرخی کاشیکراو دروست بکات و لەوێندەر مەرومالات سەر ببردرێ و گۆشت بفرۆشێت و پزیشکی تایبەتی سەرپەرشتی بکات وەکو چۆن لە ئەوروپا باوە. من بۆ خۆم سودان و ئێران و تورکیا و ئەفغانستانم دیتبون و هەندێ ئەزمونم لا دروست بوو بوو، ئەم پرۆژە کوردییە لە چاو واقیعی ئەو وولاتانەدا، ناواقیعی، یان زۆر دوور بوو لە واقیعەوە. ئەم پرۆژەیەی دوایی و چەندین پرۆژەی دی کە لەو رۆژەی پایزی ساڵی ۱۹۷۳ دا دیتمن، رەنگدانەوەی هەوڵ و هیمەتی گەشبینانەی کوردی عێراقی ئەو رۆژانە بوو، رەنگدانەوەی ئەو هیواو خۆزیایانە بوو کە پێیان وابوو بەو زووانە دێتە دی.. سێ ساڵان بەسەر دەست پێکردنی ئاشتی دا تێپەڕی. رەنگدانەوەی ئەو ئاشتی یە بوو کە پاش راگەیاندنی رێکەوتننامەی یازدەی ئازاری ۱۹۷۰ هاتە دی. هەڵبەتە ئەمە

ئاشتی یەک بوو کە لە مێژ بوو ناوچە شاخاوییەکانی باکور بە خۆیانەوە نەبینی بوو، کە ناوچەیەک بوو پتر لە ١/٢ ملیۆن کوردی کۆی سێ ملیۆن کوردی عێراق، تێیدا دەژیان.

بارزانی و سوپا شۆڕشگێڕکەی (هێزی پێشمەرگەی کوردستان) لەم ناوچەیەدا باڵا دەست بوون. بە پەرۆشەوە چاوەنۆڕی ئەو ڕۆژە بوون کە ئاشتی یەکجارەکی بەرقەرار بێ.. دەبوایە لە بەهاری ١٩٧٤ دا نێوەرۆکی بەیانی یازدەی ئازار جێ بەجێبکرێ و ئوتونومی بە کوردستانی عێراق بدرێ؛ واتا پاش تێپەر بوونی چوار ساڵ بە سەر ئیمزا کردنی ڕێکەوتننامەکەدا. هەڵبەتە ئەو کوردانەی لە ناوچە پاشکەوتووە نابوری و کۆمەڵایەتی یە عاسی و سەختەکانی دەڤەری سێ سنوری عێراق و تورکیا و ئێران دا دەژیان، سوودێکی زۆریان لە سێ ساڵی ئاشتی و ئاگربەست وەرگرت.

## پشت بەخۆ بەستن

پارتی دیموکراتی کوردستان، کەباڵی سیاسی بزاڤی ڕزگاری خوازی گەلی کورد بوو، توانی لە ماوەی ئەو ساڵانەدا بچێتە ناوجەرگەی جەماوەری خەڵکەوە. خەڵکێکی یەکجار زۆر، بە تایبەتی لە خوردە جوتیاران، بوون بە ئەندامی پارتی. بە تایبەتی پاش ئەوەی پارت هەڵوێستی بنجبڕانەی دژی گەورە موڵکداران و سەرەک عەشایەرو فیودالان وەرگرت؛ بە تایبەتی بەرانبەر بەوانەیان کە چوو بوونە پاڵ حکومەت و لەوێوە دژایەتی شۆڕشیان دەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان، لە کۆنگرەی هەشتەمی دا لە ساڵی ١٩٧٠، بڕیاری لەسەر ئەوەدا کە: "پشتیوانی تەواو لە ریفۆرمی کشتوکاڵی دەکات لە عێراقدا".

هەروەها لە نێو بردن و نەهێشتنی پەیوەندییە فیودالی یەکانی کرد "بەیەکێک لە ئامانجە سەرەکی یەکانی خۆی". هەروها یەکێک لە خاڵەکانی پرۆگرامی کۆنگرەی نێوبراو دەڵێ؛ پارتی بەرگری لە بەرژەوەندی جوتیارانی کورد دەکات "لە پێناوی نەهێشتنی هەموو ئیمتیازاتێکی دەرەبەگان لە بواری مەڕو ماڵات بەخێو کردندا وەکو پاوان کردنی لەوەڕگەو سەرانە وەرگرتن و هەموو جۆرە هەنجەت و بیانویەکی تری فیودالی".

پارتی، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتیش دا، بزاڤی ڕۆشنبیری کوردی پێش خست و ئەم بزاڤە بوو بە هەڵمەتێکی سیاسی یەکجار کارێگەرو، ئەوە بوو هەڵمەتێکی ڕێک و پێکی نەهێشتنی نەخوێنەواری دەست پێکردو پتر لە دوو سەد قوتابخانەی سەرەتایی بێ چ کۆمەکێکی حکومەتی ناوەندی لە سەر حساوی خۆی و بەیارمەتی خەڵکی ناوچەکان دروستکرد، ئەمە جگە لە دروستکردنی (٧٥) قوتابخانە لە گوندە دورە دەستەکانی نێو چیا سەخت و عاسییەکان.

هەروەها زانستگەیەکی کوردی کەوتە ووتنەوەی وانەی بابەتە زانستی و ئینسانی بە جۆراوجۆرەکان تا پرۆسەی ئامادە کردنی پیشەیی بالا نەکەوێتە ژێر کاریگەری حکومەتی ناوەندی و ئارەزووەکانی حکومەتی ناوەندییەوە، وەکو ئەمە لە زانستگەی سلێمانیدا وا بوو. هەروەها پارت لە بواری تەندروستی دا هەنگاوی پراتیکی باشی نا؛ ئەو بوارەی کە حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق بە ئانقەست لە ناوچە کوردییەکان پشت گوێیان دەخست و لە بنەڕەتدا نەیاندەویست ناوچەکە پێشبکەوێ. جگە لەوەی پارتی زۆری هەوڵدا کەموکوڕی و نوقسانی کادرو دەزگا تەندروستیەکان پڕ بکاتەوە، پتر لە دە خەستەخانەی تەواری و تیمارخانەی لە گوندەکاندا کردەوە. ژمارەی ئەو پزیشکانەی لەم خەستەخانەدا کاریان دەکرد زۆرکەم بوون، بۆیە دەبوایە وێڕای کاری پزیشکی خۆیان، پزیشکیارو پێشخزمەتەکانی ئەو تیمارخانانەش فێر بکەن.

بە توانایەکی کەمەوە، زۆر بواری ژیان چاککران. ئەوەی هاتبوەکرن ئوقلاتەی دوا رۆژێکی خۆشتر و جوانتری پێ بوو. ئیدی بە گوێرەی ئەو پەندە کوردییەی کە دەڵێ : "ئەی شێر پشت بە چنگ و پەلی خۆت ببەستە، پیاوچاکان بە تەنیا فریات ناکەون لە مەینەتی یەکاندا". کوردەکان، لە پاڵ ئەو بزاڤی ئاوەدانی یەوە، هێزی چەکداری خۆشیان چ بە نهێنی و چ بە ئاشکرا رێک خست و بینات نایەوە. من و (ڤولکر هشش) ی وێنەگر کە لە سەفەری ئەو پایزەدا، لە ماوەی شەڕوستاندا، لەگەڵم بوو، بەڵگەی بنجبرمان چنگ کەوت کە کوردەکان لە رووی نیزامی یەوە خەریکی خۆ سازدان و خۆ تەیار کردن بوون.

## رێگەی هاملتون- رەگی ژیانی شەڕگە

سەرکردایەتی کورد، جیێپێکی لاندرۆڤەرو چەند پاسەوانێک و تەرجومانێکی میوانخانەی چۆمانیان خستبووە خزمەتمان. سواری پێرە لاندرۆڤەر بووین و بە جادەی چۆمان- هەولێردا وەڕێکەوتین. ئەم جادەیە بەشێکی گرینگیشە لەو جادەیەی کە تاران بە موسڵەوەو بەرزاییەکانی ئێران بە دەشتاییەکانی عێراقەوە دەبەستێ. دوای نیو سەعاتە رێ، لەم هەرەتی ئاشتی یەدا، کەشو هەوای جەنگ و کوشتارم وەبیر خۆ هێنایەوە.

ئەم جادەیەی کە بە ناوەندی دۆڵی قوڵ و گەلی ی پڕپێچ و پەناو بە سەر پردی تەنگ و تەسکی سەر روباری بەهارەو هاژەی بالەک و ناوچەیەکی شاخاوی سەخت دا تێدەپەڕی، بە درێژایی شەڕی ئەهلی کوردان لە سالانی شەستەکاندا، رەگی ژیانی شەڕگەکانی پێک دێنا. هەر بۆیەش خوێناوی ترین شەڕ لە دەورو بەردا کراوە بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردن و دەست بە سەراگرتنی دا. ئەم جادەیە کە بە ناوجەرگەی

کوردستاندا تێدەپەڕێ، نەک هەر شوێنەوارو کاریگەری لە مێژووی کوردستاندا بە جێهێشتووە، بگرە ئەم مێژووەشی گۆڕیوە. ئەو ڕێگەیە لە لایەن (هاملتون)ی ئەندازیاری نیوزیلاندی یەوە دروست کراودو هەر بە ناوی ئەویشەوە ناونراوە. ئەم جادەیە لە شاری ئەربیلای دەستکردی ئەسکەندەری مەقدونی یەوە کە ئەمڕۆ (ئەربیل)ی پێدەگوترێ، دەست پێدەکات و بە زێدی سۆلتانی هەرە ناوداری کورد سەلاحەدین دا تێ ئەپەڕێ و دەگاتە سنوری عێراق- ئیران. سادەترین جوتیارانی کورد کە زۆریەی هەرە زۆریان ئەخوێنەوارن ناوی هاملتون دەزانن؛ چونکە ئەم جادەیەی کە ئەو دروستی کردووە تاکو ئەورۆکەش گرنگترین ڕێگەی (تەموین)ـەو بەراستی بەو ڕەگی ژیانە دەژمێردرێ کە هەموو هیواو ئاواتێکی کوردی عێراقی پێوە بەندە بۆ وەدەستهێنانی رزگاری و ئازادی.

ئەو تەرجومانەی کە لە گەڵماندا بوو دەیویست پایەی تایبەتی ئەم ئەندازیارەمان لە نێو کوردان دا بۆ دیاری بکات، بە تایبەتی کە دوا ساڵەکانی تەمەنی بۆ کورد ودۆزی کوردی تەرخانکرد بوو. هاملتون، لەو ساڵەدا مرد کە ئێمە ئەم سەفەرەمان تیدا کرد. (١٩٧٣)، لە ساڵی ١٨٨٩ دا لە نیوزیلاندا لە دایک بووە. داک و بابی ئەسکەتلاندین. ئەندازیاری ڕێگاوبان بوو، بۆیە حکومەتی انتداب لە ساڵی ١٩٢٨ دا داوای لێکرد کە سەرپەرشتی دروستکردنی ڕێگەیەک بکات کە تەنیا قاترو وڵاخ پێیدا دەرویشتن.. هاملتون، تەنیا بەکرێکاری ناوچەکە جادەکەی دروستکرد. ناچاربوو تاوێرە بەردی زۆر زەلام بتەقێنێتەوەو قەدمە لەقەوپاڵە زۆر رژدو ڕکەکان دروست بکات. لە ماوەی کار کردنیدا لە کوردستان، سیستەمێکی چاکی بۆ دروستکردنی پردی ئاسن داهێناو بەکار هێنانی ئەم سیستەمی بیناسازییە لە جەنگی دوەمی جیهان و ساڵانی پاشتردا شۆرەت و ناوبانگێکی جیهانیان پێ بەخشی.

هاملتون، دەچوو پارچەی بچوک بچوکی دروست دەکردو لەزروفی زۆر سەخت دا دەگوازرانەوە بۆ ئەو شوێنەی دەویستر‌ا پردەکەی لێ دروست بکرێ، لەوێندەر ئەم پارچە بچوکانە لێکدەدران.. بە مجۆرە پتر لە هەزار پرد لە (پردەکانی هاملتون) لە شوێنە جیاوازەکانی ئیمپراتوریەتی بەریتانیادا دروستکران،ئیدی لە پردی پەڕینەوەی ڕێبوارانەوە لە سەر ئوتوبانەکانی بەریتانیاوە بیگرە تا دەگاتە پردی (مانگلا)ی بە نێو بانگ لە سەر روباری (هندوس)ی پاکستان . هاملتون، هەر هەموو ئەم پردانەی کاتێ دروستکرد؛ پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٠ دا لەو دۆڵ و شیوە هەزار بە هەزارانەدا تاقی کردەوە کە روباری رەواندزی پێدا دەروات. واتا ڕێگەی هاملتونی کوردستان بوو بە سەرچاوەی ئەزمونەکانی پاشتری.

هاملتون، بە خۆی ئاماژەی بۆ گرینگی و بایەخی عەسکەری ئەم جادەیە کردوەو لە ساڵانی دواتردا نوسیویەتی و دەڵێ: "بەمجۆرە نێردرام بۆ کوردستان، کوردستانی

چی! له لایەکەوە هێزە کوردەکان کەڵکەڵەی ئازادی و رزگارییان کەوتبوە سەرو له لایەکی دی یەوە حکومەتی ناوەندی له هەوڵی ئەوەدا بوو ئەم ناوچە شاخاوی یە دژوارە کۆنترۆڵ بکات و دەسەلاتی خۆی تێدا بسەپێنێ. هەر هەموو ئەمەش وای دەخواست که رێگەکە بەزوترین کات لەوێندەر بکرێتەوە".

هاملتون ، به هۆی دروستکردنی ئەم رێگایەوە، بوو بەنزیکترین دۆستی کورد و لایەنگری دۆزی کورد. زۆر به توندی رەخنەی له سیاسەتی رەسمی بەریتانی، بەرانبەر به کورد، دەگرت. پاشان سیاسەتی هەموو حکومەتە عێراقی یە یەک له دوای یەکەکانی پاش تەواو بوونی انتداب ، بەرانبەر به کورد، خستە ژێر وردەبینی رەخنەوە. له ساڵی ١٩٦٨دا ووتارێکی له (دەیلی تەلەگراف دا) نوسیوەو دەڵێ: "فرۆتنی نەوت به رۆژاوا که سەروەت و سامانێکی بێ سنور بۆ عەرەب دابین دەکات، و له هەمان کاتدا کوردستان وێران دەکات و هەژاری و دواکەوتنی بەسەرا دێنێ، من بۆ خۆم ئەمە به گەورەترین شەرمەزاری ئەم سەدەیە دەزانم و هیچ پاکانەیەکی بۆ نی یە. ئەوەی بەلای منەوە سەیرە، بۆ چی حکومەتی عێراقی هەوڵنادات رێگەیەکی دی بجەرپێنێ: پێویستە ئوتونومی بۆ کوردستان، بەمەلا مستەفا بدرێ و کورد بەشی خۆیان له دەرامەتی فرۆشتنی نەوت وەربگرن و هەبێ. پێویستە ئەگەر بۆ تەجرەبەش بێ ئەمە بکرێ تا بزانرێ که ئەگەر رێگەیەکی دی لەگەڵ کوردا بگیرێتە بەر، ئاخۆ کاروبارەکان باشتر دەڕۆن؛ ئایا ئەنجامی ئەم رێگەو شێوازە تازەیە چ دەبێت؟ نازانم خەڵکی ئەوێ بۆ هەوڵنادەن بەم شێوەیە بیر بکەنەوە؟".

کوردەکان تاکو ئەوڕۆش رێزو قەدرێکی زۆر له (هاملتون)ی ئەندازیاری هاوسۆزی خۆیان دەنەن، طارق عقراوی ی رۆژنامەوانی کورد، له گوتارێکی دا له مەر هاملیتون دەڵێ: "تەبیعەتی ئەسکەتلاندییانەی و هەڵسوکەوتی له نێو چیاکانی نیوزیلاندە، وایان لێکرد بوو، که لیقاتی ئەوەی هەبێ. بێ پەروا لەگەڵ کوردی ناوچەکەدا بچێتە راوێ و کەشفکردنی ئەشکەوتانی نێو چیایان . هاملتون شانازی بەوەوە دەکرد که لەگەڵ کوردێک دا پێشبرکێ ی شاخەوانی کردووە. هەروەها له چەکبازی و نیشانشکێنی دا هاوتای باشترین تفەنگچی کورد بوو. مەعلومە که کورد له تفەنگچێتی و سەگڤانی دا بناف و دەنگن".

**دیمەنەکانی ئاشتی**

پیرە لاندرۆڤەر بەرێگەی هاملتون دا بردینی. بەیانی بوو. دنیا هەتاو بوو. رۆژ، رۆژێکی مانگی ئوکتوبەری ساڵی ١٩٧٣ بوو. رێگاجمەی دەهات. هەر پیکاب و لوری به شووتی بوو بەرەو کەلالە دەچوو. تووشی چەندین تراکتۆری پڕ له سێوو هەرمێ و هەنارو ترێ بووین. چەندین ئوتومبیلی دیکەمان بینی که به

رەقەمەکانیاندا دیار بوو ئێرانی بوون؛ ئەمانە پڕ بوون لە گوێنی یە شەکرو چای. هەروەها پڕ بوون لە سەندوق کە نوسینەکانی سەریان بۆ ئەدەخوێترایەوە. جوتیاران، لەمبەرو لەو بەری ڕێگەکەوە وولاخەکانیان دابوە پێش و بارەکانیان بریتی بوو لە بەرەو تۆرتە و کر و بۆ شاریان دەبرد تا لە وێندەر بە نازوقە و خواردەمەنی بدەن، یەکجار بە دەگمەن دیمەنی ئەو سوارچاکە کوردانە دەبینرا کە لە کتێبی گەڕیدە و کتێبەکەی کارل مای و کتێبی (خودان گورگ)ی جۆرج هالبان کە لە سالی ۱۹۷۵دا دەرچووە، وەسف کرا بوون و ناویان دەرکرد بوو.

شوفێرەکەمان ناوی ئەحمەد بوو، داوامان لێدەکرد کە ناوە ناوە بوەستێ تا تەماشای دیمەنی ئەو منداڵە مەکتەبلییانە بکەین کە بۆ ناو خوێندنەوەو سەرژمێری لە ریزدا دەوەستان. یان لە لای ئەو بەنزینخانەیە بوەستێ کە لە کەنارێکی ڕێگاکەوە دانراو بوو، ئەم بەنزینخانەیە بەترومپایەکی دەستی کاری دەکرد، زۆرمان پێ سەیر بوو کە دەیانگوت نرخی یەک لیتر بەنزین لە ۱۲ (فینک)ی ئەڵمانی پتر نابێت. یان لە قاوەخانەیەکی نزیکی جادەکە لابدات و جگەرە بکڕین، هەموو جۆرە جگەرەیەک هەبوو. بە تایبەتی جگەرەی بەریتانی و ئەمریکی. دوای موناقەشەیەکی زۆر جگەرەی جەمهوری شیان بۆ هێناین. ئەمە تاقە جگەرەی عێراقی بوو، کە لە چاکی دا کەم وێنەیە، بەڵام ئەمان توانی بۆ تاقە جارێکیش پارەی ئەو پاکەتانە بدەین کە دەمانکڕین، هەموو کەرەتێک پێیان دەگوتین: "نابێ، ئێوە ئەڵمانین و میوانی کوردستانن، هەرکاتێ دێنە سەردانی کوردستان بە خێر بێن، ئێمە دەزانین میوان لە ئەڵمانیاش دا پێویست ناکات پارەی پێداویستی ی خۆ بدەن، نە وسایە؟".

هەر هەموو ئەم دیمەنانە، ئەو باری سەرنجە لای مرۆڤ دروست دەکات کە لەم ناوچە شاخاوی یەدا چالاکی یەکی بازرگانی چەلەنگ هەیە و ڕەنگدانەوەی ژیانێکی هێدی و نارامە، کە ڕەنگە مرۆڤ لە ناوچە شاخاوی یە کەم پەرەسندوەکانی ناوچەی دەریای ڕۆژهەلاتی ناقین لە ئەوروپادا نەیبینێ. بەڵام هەموو دیمەنەکانی لە دوا ئەنجامدا ڕەنگدانەوەی دیمەنی ئەو ئاشتی یە بوون کە زۆر لە مێژ بوو کوردستان بە خۆوەی نەبینی بوو. لە لایەکی دی یەوە هەر هەموو ئەو کوڕانەی لەم سەفەرەم دا دیتمن، چەکدار بوون؛ ئیدی یان تفەنگیان پێ بوو یان دەمانچە یان خەنجەر. تەنانەت منداڵێکی دوانزە ساڵانم بینی کە زۆر بەشانازی یەوە کلاشینکۆفی هەڵگرتبوو. بەلامانەوە سەیر نەبوو، بەڵکو ئاسایی بوو بۆ وولاتێک کە چەک هەڵگرتن تیایدا نیشانەی پیاوەتی بێ، ئاسایی بوو بۆ ڕۆڵەی گەلێک کە دەیەوێ بە هەموو شێوەیەک دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی ڕەفز بکات. بەڵام هەر زوو باری سەرنجێکی ترمان لا دروست بوو، ئەویش ئەوە بوو ئەو ئاشتی یەی کە دیمەنەکانیمان دەبینی، ئاشتییەکی کاتی و تەمەن کورت بوو. و ئەمە هێمنی و نارامی بەر لە هەڵکردنی باهۆز بوو،

تۆناغێک بوو بۆ پشوودانێک و خۆسازدانەوە بۆ شەڕ. پشوو دانێک بوو کە هەم خەڵکی کوردستان و هەم حکومەتی ناوەندی بەغدا پێویستیان پێ ی بوو: چونکە ئەم سەفەرەی ئێمە کە لە سایەی ئاشتیدا دەمانکرد، بەو مەبەستە بوو کە سەردانی ئۆردوگایەکی هێزی پێشمەرگەی بارزانی بکەین.

## پێشمەرگە: هەمیشە ئامادەی ڕووبەڕوو بوونەوەی مەرگە

لاندرۆڤەرەکەمان، لە پڕ خۆی کرد بە گەلی یەکی زۆر تەنگی جادەی هاملتون دا. ئەم بەرو ئەو بەری ڕێگەکە تاوێرە بەردی زەلام زەلام بوو. زۆر لە پڕو لەنکاو گەیینە ئێرە. شوفێرەکەمان، ئوتومبیلەکەی بۆ ڕێگەیەکی فەرعی سوڕاندەوە، بە گەلی یەکی تەنگەبەردا ڕەت بوو. خاڵی ئۆبەداری لەمبەرو لەوبەری جادەکەدا هەبوو؛ بەڵام هێندە نادیار بوون، ئەگەر کەسێک خۆیی نەبوایە، هەر هەستی پێنەدەکردن. تا زیاتر سەردەکەوتین ژمارەی بازگەکان زیاتر دەبوو. پاش ئەوەی دوو سەد مەترێک ڕۆیشتین لاندرۆڤەرەکە وێستا، شوفێرەکە پێویستی بە نزمترین گێر بوو تا بەردەوام بێ لە سەرکەوتن. لەپڕ دیمەنێکی ترمان هاتە پێش: لە سەر لوتکەی شاخەکەدا پانایییەک هەبوو چوار دەوری چیای بەرزی ۲-۳ هەزار مەتری بوو. ئەوە ئەو ئۆردوگایە بوو کە بۆی دەچووین. یەکێک بوو لە سەربازخانە زۆرو زەبەندەکانی کوردستانی ئەو سەرو بەندە. ئوردوگاکە ڕێک لە بەردەمماندا بوو. نزیکەی ٥٠٠-٦٠٠ سەرباز لە ئۆردوگاکەدا بوون و خەریکی مەشقی نیزامی بوون. کە سەرنجمان دا نزیکەی سەد کەسێکیان، مەشقیان بەوانی دی دەکردو وەکو دەرەجەداری ئێو هەر سوپایەکی جیهان کرد بوویان بە هەرا: (..چەپ.. ڕاست.. هەموو.. بوەستن!..) هەر چەند ئێمە لە ووشەکان حاڵی نەدەبووین، بەڵام دەمانزانی فەرمان و ئەمری لەو بابەتە بوون.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاین، جل و بەرگی چونیەکی زەیتونی سوپاییان لەبەردا بوو. هەمان ئەو جلە بوو کە سوپای عێراقی بەکاریان دێنا.. لە لایەکی ترەوە چەند سەد کەسێک جل و بەرگی کوردی ئاسایی پێشمەرگەیان لەبەر بوو: جل و بەرگی خاکی و شاشک. جەماعەتێک مەشقیان لە سەر قورسترین جۆری ڕۆیشتن بە سەر عاردیدا دەکرد: سکە خشکێ، چەند مەفرەزەیەکیش دەرسی چۆنیەتی بە کار هێنانی تۆپی قورسی فرۆکە شکێنیان دەخوێند کە لە سەر سێ پایە دانرابوون، یان دەرسی بەکار هێنانی ڕەشاشی ناوەندی و قورس و تۆپی تانک شکێنیان دەخوێند. کۆمەڵێک فەرماندەی سوپایش لە سوچێکەوە دەرسی تاکتیکیان دەخوێندو ئەفسەرێک لە سەر تەختەیەک، نیشانەو ڕەمزی، ڕەسم دەکرد.

دیمەنی تفەنگەکان وایاندەنواند کە زۆر شەڕیان دیتبێ، چونکە لە زۆر شوێنەوە ئاسنەکانیان بە دەرەوە بوو، دیار بوو پەڵەیان لێ ڕنرا بوو. قایشی زۆربەیان گۆڕاو

بوو بە قایشی چەرمی دەستکردی خۆماڵی، یان لە جیاتی قایشی پەتیان پێوە بەسترا بوو. ئەو کلاشنکۆف و دەمانچانەی کە هەندێ پێشمەرگە لە کیف دا بۆیان دەرهێنایین، دەستکردی سۆڤیەت و چین بوون.

ئامیر بەتالیونێکی گەنجی کەپوو بەرانی، نیگاگەشی چاو کەوەیی، کە تەمەنی لە ٣٠ ساڵ تینەدەپەڕی، پێشوازی من و فولکرهانس-ی وێنەگری کردو لەگەڵماندا هات بۆ سەردانی گروپە جیاوازەکان. بۆی باسکردین کە بەتالیۆنەکە پێک هاتووە لەو سەربازانەی کە هەستی نەتەوەیی هانی داون لە سوپای عێراقی هەڵێن و بەشداری ئەو روداوە گەورانە بکەن کە هەموو کەسێک پێ ی وایە بەم نزیکانە روو دەدەن.. ئەوجا لە سەری رۆیی: "ژمارەیان زۆر زۆرە. لەوە زۆرترن بتوانین بیانگرینە خۆ ئەگەر پارە و چەکمان هەبوایە دەمانتوانی زۆر بە ئاسانی سوپایەکی سەد هەزار کەسییان لێ دروستبکەین". کە سەردانی ئەو یەکە سەربازیانەمان کرد، بۆمان دەرکەوت کە زۆر بە چاکی تەیارو ئامادە کراون. کە بە سەر گروپەکاندا دەگەڕاین، داوام کرد رێگەمان بدەن بە بێ هەڵبژاردنی ئەوان، دیمانە لەگەڵ چەند سەربازێک دا بکەین. بەڵام یەکەم سەرباز کە دیمانەمان لەگەڵ کرد، گەنجێکی تەمەن بیست و چوار ساڵە بوو. ژنی هێنابوو. دوو منداڵی هەبوو؛ کە ئەوەی بۆ دەگێڕاینەوە چاوەکانی پرشنگیان دەدا . خێزان و کەسوکاری خەڵکی نزیکی شاری هەولێر بوون، و دەرفەتی زۆرکەم بوو بۆ سەردانیان. کە لێم پرسی لەبەر چی بووە بە پێشمەرگە، هەردوک دەستی لە گیرفانی شەرواڵەکەی ناو کوتی : "چونکە من رۆڵەیەکی گەلی کوردم و حکومەتی عێراق قایل نابێت گەلەکەمان بە مافی خۆی بگات، بۆیە لە سەرمانە هەموو چەک هەڵبگرین و لەو پێناوەدا بخەبتین".

سەربازەکەی دی کە چاومان پێکەوت، پیاوێکی باڵا بەرزی رێک بوو؛ دەرکەوت عەرەبە. کابرای فەرماندە زۆر خۆشحاڵ بوو کە ئەو سەربازە عەرەبەمان هەڵبژارد. بۆی گێڕاینەوە کە خەڵکی بەغدایە و هەر لەوێندەر لە دایک بوەو گەورە بوەو... بەرلە چەند هەفتەیەک پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی لەشکری کوردستانەوە کرد بوو... لە سەری رۆیی کە مەسیحی یەو سەر بە یەکێک لە کەنیسە مەسیحی یەکانی عێراقە و چونکە رێ نادرێین بە ئازادی سرووتە (طقوس) ئاینی یەکانمان ئەنجام بدەین، بۆیە لێبڕام روو بکەمە دەڤەرێک کە دەسەلاتی رژێمی بەعسی لێنەبێت. ئەویش ئەو ناوچەیەبوو کە کورد تێیدا دەسەڵاتدارە؛ چونکە دەتوانم لێرە بە ئارەزووی خۆم و چۆنم بوێ ئاوها بژیم، بە تایبەتی کورد مامەڵەیەکی زۆر باشم لەگەڵ دەکەن و رێمەدەدەن سرووتە ئاینی یەکانی خۆم ئەنجامبدەم. ئەگەر شەڕ هەڵگیرسێتەوە منیش بەشداری دەکەم. رەنگە لە پێناوی کوردا شەڕ نەکەم، بەڵام بەشداری شەڕ دەکەم دژی ئەلبەکرو دکتاتوریەتی ئەلبەکر.

له فەرماندەی ئەو گروپانەم پرسی، بەر لەوەی هەمان پرسیار لە خودی جەنەڕاڵ بارزانی بکەم، ئەگەر شەڕ هەڵگیرسێتەوە چ دەقەومێ؟ کابرای فەرماندە ماوەیەکی باش لەفکران ڕا چوو، ئەوجا چاوی هەڵبڕی و بە دەست ئاماژەی بۆ دوور کرد، ئاماژەی بۆ لای پێشمەرگەکانی کردو گوتی: "ئەوانە شەڕ دەکەن، هەموومان شەڕ دەکەین". هەر چەندە ئەم وەڵامە زۆری کار تێکردم، بەڵام من لە سەری ڕۆیشتم و پرسیم: "تا کەنگی دەتوانن بەردەوام بن لە شەڕ؟" ئەوجا نیگایەکی تیژی تێ کردم و بە دەنگی نزم وەڵامی دایەوە: "هەمیشە پێشمەرگە دەبن کە جێمان بگرنەوەو بەردەوامی بە شەڕ بدەن". ئەوسا تەرجومانەکەمان بە چپە بۆی شرۆڤە کردین کە ووشەی (پێشمەرگە) لە باری زمانەوانی یەوە واتا: ئەوانەی ئامادەو لە سەر پێن بۆ ڕووبە ڕوو بوونەوەی مەرگ.

## هەوسەنگی یەکی لەق

کەش و هەوای ئەم ئوردوگایە وای لێکردین هەست بەوە بکەین کە کورد دەستیان لەو ئاشتی یە بەردەوامە شتوە کە لە ماوەی ئاگر بەست و هودنەی ئازاری ١٩٧٠ وە لە لایان دروست بوو. کە لە مانگی ئوکتوبەری ساڵی ١٩٧٣دا دیمانەیەکە لەگەڵ سەرۆکی کورد، بارزانی دا سازدا و لێم پرسی کە تا چەند دەرفەتی جێبەجێکردنی نێوەڕۆکی بەیانی یازدەی ئازار لە گۆڕێ یە؟ وەڵامی دایەوە: "من پێم وانی یە بە ئاشتی بگەینە ئوتونومی، لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، ئەویش ئەوەیەکە حکومەتی عێراقی لە خەونیشی دا بیر لەوە ناکاتەوە ئوتونومی ڕاستەقینەو تەواومان بداتێ. کە حکومەت ناچار دەبێت گفتوگۆمان لەگەڵ بکات، مەبەستی ئەوەیە لەم ناوچە تەسکەدا گەمارۆمان بدات، کە ئێستا بەزەبری چەک بەرگری لێدەکەین، بەڵام ئەم ناوچەیە تەنیا بەشێکی بچوکی کوردستانە؛ چونکە کوردستان خانەقین و کەرکوک و دەوروبەری (موسڵ)ش دەگرێتەوەو ئێمە دەست لەو ناوچانە هەڵناگرین هەر چی یەک ڕووبدات، چونکە خۆمان بە بەرپرس دەزانین بەرانبەر بەو کوردانەی لەو ناوچانەدا دەژین، بە هەمان ئەندازەی کە لە بەردەم مێژووی گەلەکەمان هەست بە پرسیاریەتی دەکەین".

ئەگەر ڕووداوەکانی ساڵانی پاش ڕێکەوتننامەی ساڵی ١٩٧٠ بێنینەوە بەرچاوی خۆمان، ڕەنگە تا ڕادەیەک هۆی ئەو ڕەشبینی یەی بارزانی مان بۆ بە دیار بکەوێ. ڕێکەوتننامەی ئازار لە سەر ئەو بنەمایە دارێژرا کە ئیعترافی تەواو بە کەسایەتی نەتەوەیی و ڕۆشنبیریی کورد بکات. بە پێ ی ڕێکەوتننامەکە دەبوایە: ناوچەی ئوتونومی، ناوچەیەکی خود گەردان بوایە و ڕێ بە دەرکردنی چاپەمەنی کوردی بدرێ، و ئیعتراف بەرەسمیەتی زمانی کوردی بکرێ چ لە کاروباری بەڕێوەبردنی

ناوچەکەو و چ وەکو زمانی ناخافتنی رۆژانەی خەڵکی، هەروەها ئیعتراف بە پارتی دیموکراتی کوردستان بکرێ وەکو لایەنێکی گفتوگۆیەکە. کورد بەگوێرەی رێژەی خۆیان لە چاو خەڵکی عێراقدا، ئەندامیان لەو پەرلەمانەدا هەبێ کە دەبوایە کار بۆ دامەزراندنی بکرێ. کورد، جێگری سەرکۆمارو ژمارەیەک وەزیریان لە نێو حکومەتی ناوەندی دا هەبێ، ئەمە جگە لە پەرە پێدانی ئابوری و کارگێری ناوچە کوردییەکان کە بە تەواوەتی پشتگوێ خرا بوو.

لە بەرانبەر ئەوەدا، کوردش لە سەری بوو دان بە سەروەری نیشتماندا بنێن و گوێرایەڵی یاساکانی عێراق بێ و هەموو ئەو چەکە قورسانە تەسلیم بکەنەوە کە لە کاتی شەڕدا کەوتبووە دەستیان. هەروەها لە سەر ئەوەش رێکەوتن کە کردەی دەرهێنانی سامانی سروشتی بە دەستی حکومەتی مەرکەزی بێت و دەستنیشانکردنی دوا سنوری ناوچەی ئوتونومی کوردستان لەو ناوچانەدا کە مشت و مڕیان لە سەر بوو، لە رێگەی ریفراندۆمی گشتی و سەرژمێری خەڵکەکەوە یەک لایی بکرێتەوەو ئیدی سنورێک بۆ ئەو حاڵەتە دابنرێ کە چەندین ساڵە هەڕەشە لە پارچەکردنی عێراق دەکات.

### هاوولاتی نمرە دوون؟

کەواتە هەردوک لا متمانەیان بە یەکدی نەبوو. کورد، کە سالانی شەڕ شنگی لەبەر بڕیبوون، هەموو هەوڵێکی خۆیان بۆ ئاوەدانکردنەوەی وولاتەکەیان کە شەڕ وێرانی کرد بوو، تەرخانکرد. هەر چەندە حکومەتی بەعس، پێنج کەسی لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستانی سەر بە بارزانی خستە نێو حکومەتەوەوە لیژنەی ئاشتی دامەزراند تا سەرپەرشتی وچاودێری جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکەو پاراستنی رێکەوتننامەکە بکات، بەلام لەولاشەوە هەندی لە توانایدا بوو هەوڵی دەدا کوردەکان دووربخاتەوەو بەشداری پراتیکی لە هیچ شێوەیەکی حکومەتایەتیدا نەکەن، هەر لە یەکەم رۆژانی پاش رێکەوتننامەکەوە هەموو کلیلەکانی دەسەلاتی راستەقینەی گرتە دەست خۆی. هەرچەندە نوێنەرانی کورد، لەوانە رۆشبیری پسپور لە کاروباری دەرەوە، سامی رەحمان (کە لە سالی ۱۹۸۰ وە بە سکرتێری پارت) لە پۆستی وەزارەتی دا دامەزرێنران وەکو وەزارەتی کشتوکاڵ و نیشتە جێکردن و کاروباری کۆمەلایەتی یان وەزیری بێ وەزارەتخانە (وەزیری دەوڵەت) بەلام مەڵبەندە گرینگەکانی وەکو وەزارەتی ناوخۆ و دەرەوەو بەرگری بە دەستی پیاوانی بەعسەوە مانەوە. نەک هەر یەکێک لە لایەنگرانی بارزانی، بگرە هیچ کوردێک لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا کە سەرچاوەی راستەقینەی دەسەلاتە، قبوڵ نەکرا. وەزیرێکی کورد لە سالی ۱۹۸۳ دا ئامادەی کۆنگرەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا دەبێت، زۆر بەوردی پایە و دەسەلاتی خۆی و هەڤاڵە

کوردەکانی لە وەزارەتخانە دا دەستنیشان کرد بوو و گوتبوی هەر چەندە وەزیرەو مانگانەیەکی باش وەردەگرێ و هەقی هەیە ئوتومبیلی حکومەت بەکار بهێنێ، بەلام هیچ دەسەلاتێکی نییە، تەنانەت ناتوانێ دەرگاوانێک یان پێشخزمەتێک دابمەزرێنێ. لە هەردوو کۆلیجی سوپایی و ئەرکانی بەغدا دا کە (٣٣٠) خوێندکاریان هەبوو، چەند خوێندکارێکی زۆر کەمی کورد وەرگیرا بوون، کە ئەگەر بە پێ ی ڕێژەی کورد لە چاو هەموو خەلکی عێراقدا وەربگیرایەن، دەبوایە نزیکەی (١١٠) خوێندکاری کورد لە هەردوک کۆلیجی نێوبراوا وەربگیرایەن. کە چی لە سالی ١٩٧١ دا تەنیا هەشت خوێندکاری کورد لەو دوو کۆلیجەدا هەبوون. هەرچەندە پارێزگاری کورد بۆ هەر سێ شارە کوردەکە دامەزرێنران، بەلام دەسەلاتی ڕاستەقینە لە وێندەرش هەر بە دەستی بەرێوەبەرانی ئاسایش بوو، کە ڕاستەوخۆ پەیوەست بوون بە حکومەتی ناوەندی بەغداوە پەیوەندییان بە پارێزگارەوە نەبوو.

تەنانەت کارگێری‌خۆیی (الادارە الذاتیە) کە لە بەیانی ئازاردا باسکراوە، تاکۆتایی سالی ١٩٧٠ هەر پشت گوێ دەخرا و دەست بە جێبەجێکردنی نەکرا، کە جێبەجێش کرا بەوجۆرە نەبوو کە کوردەکان دەیانویست: ئەوەبوو ئەندامی ئەنجومەنە پەیوەندارەکان وەکو قەرار بوو، بە هەلبژاردن دابنرێن، هەلنەبژێردران؛ و لە لایەن حکومەتی ناوەندییەوە دامەزرێنران، بۆیە ئەمانە لەو کوردانە نەبوون کە نوێنەری بزاڤی چەکداری کورد بن، بەلکو هەموویان کوردی شارو هەلپەرستی دامودەزگا کارگێری یە حکومەتی یەکان بوون، بەلکو هەندێکیان خەلکی قاچاغ و پاشاکێن بوون و لەوانە بوون کە کۆمەلگەی کوردەواری ترۆی کرد بوون. هەندێ لە پەیڤدارانی (ناطق) کورد ئەم کارانەیان شوبهاند بەو کارانەی کە مەلێک لویسی شازدەیەم، بەر لە هەلگیرسانی شۆرشی فەرەنسا، کردنی. سامی ڕەحمن لەم بارەیەوە دەلێ: "هەلگیرسانەوەی شۆرش سەر لە نێوارە دیارە".

سەبارەت بە ئایندەی ئابوری پارێزگا کوردی یەکان، زۆر بە ئالۆزی و نادیاری مایەوە، وێرای موناقەشەو چەندو چونی زۆر، بریاری بودجەیەکی تایبەتی بۆ ناوچەکە نەدرا. حکومەتی ناوەندی رایگەیاند کە هەر کاتێک پێویستی کرد ڕێ دەدات پارەی پێویست سەرف بکرێ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەتەمایە سیاسەتێک، لە مەسەلەی بوژاندنەوەی پرۆژەکانی ناوەدانکردنەوەو بیناکاری ناوچەکەدا، بە کار بێنێ کە لەگەل بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بگونجێ.

بەلام حکومەت ئامادە بوو بەزوترین کات داخوازییە ڕوشنبیرییەکانی کورد جێبەجێبکات؛ لە زۆر قوتابخانەی سەرەتایی داو تەنانەت لەو ناوچانەش کە لە ژێر دەسەلاتی هێزی بارزانی دا نەبوون، بەر لەوەی کتێب و پێداویستی یەکانی خوێندن ئامادە بکرێ، خوێندن بە زمانی کوردی دەستپێیکرد. بەلام ژمارەی خوێندکارانی

کورد لە ئەنستیتوو زانستگەکاندا هەر کەم بوو، لە ٣٪ تا ١٠٪ی خوێندکارانی ئەم ئەنستیتۆ و زانستگایانەیان پێکدەهێنا، هەڵبەتە ئەم ڕێژەیە لە پارێزگایەکەوە بۆ یەکێکی دی جیاواز بوو. ڕێگە درا بە ئازادییەکی زۆرەوە چالاکی روشنبیری ئەنجامبدرێ، ئەمەش بوە مایەی بوژانەوەی بزاڤێکی ئەدەبی ئەوتۆ کە ئاستی هوشیاری هەر سێ ملێون کوردەکەی عێراقی گەشاندەوە. هەروەها لە ساڵی ١٩٧٢ داو بەرەزامەندی حکومەتی ناوەندی زانستگەیەک لە شاری سلێمانیدا کرایەوە کە هەر لە کۆنەوە مەڵبەندی سەرەکی رۆشنبیری بوو لە کوردستاندا، بەڵام ئەو زانستگەیە هەر وەکو خۆی مایەوەو پەرەی نەسەند.

## ناکۆکی لەسەر دیاریکردنی سنوری نەتەوەیی ناوچەی ئوتونومی

لە پاڵ ئەم فاکتەرە نیجابی و سەلبیانەدا، بابەتێکی تریش هەبوو کە بەڵای کوردەوە مەحەکی سەرەکی هەموو پێشکەوتنێک بوو لە بواری جێبەجێکرنی رێکەوتننامەی ئازار، ئەویش مەسەلەی سەرژمێری بوو لەو ناوچانەدا کە لە سەری ناکۆک بوون. بە پێ ی رێکەوتننامەکە دەبوایە ئەم سەر ژمێری یە لە ساڵی یەکەمی ئەو چوار ساڵەدا ئەنجام بدرێ کە بۆ جیبەجێکردنی یەکجارەکی خاڵەکانی رێکەوتننامەی ئازار دانرا بوون. هەرچەندە لایەنە رەسمی یەکان دوپاتیان دەکردەوە کە بەو زووانە دەست بە سەر ژمێری یەکە دەکرێ، بەڵام ئەم سەرژمێری یە بە درێژایی ئەو چوارساڵە هەر نەکرا؛ هەر چەندە هەموو کەس ئەوەی دەزانی کە چارە نوسی رێکەوتننامەکە بەندە بەو سەرژمێری یەوەو هەر ئەویش رەوتی رێکەوتننامەکە دیاری دەکات کە ئاخۆ بەرەو ئاشتی دەچێت یان بەرەو شەڕ.

پێکهاتەی دانیشتوانی شاری هەولێرو سلێمانی و دهۆک ئاشکراو دیار بوو، بارزانی بە پێویستی نەدەزانی سەرژمێری لەو شارانەدا بکرێ. بەڵام مەسەلەکە لە شارانی وەکو خانەقین و کەرکوک و ژەنگار وا نەبوو، حکومەت بایەخێکی زۆری بەو ناوچانە دەدا چونکە کانگاو سەرچاوەی هەرە گەورەی نەوت بوون، حکومەت، لە ماوەی دە ساڵی شەڕدا زۆر گۆڕانکاری لەو ناوچانە دا کرد بوو. چەندین هەڵمەتی عەرەباندنی لەوێندەر ئەنجامدا بوو تا واقیعی نەتەوەیی ئەو شارانە بگۆرێ. هەرچەندە بە پێ ی رێکەوتننامەکە دەبوایە ئەو ماڵباتانەی راگوێزرا بوون، بگەرێنەوە سەر جێگاو ناو ماڵی خۆ، بەڵام حکومەتی ناوندی لە ساڵی ١٩٧٠ و ١٩٧١ دا خۆی لە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانە دزی یەوە، بەو هەنجەتەی کە ٢٠ گوند لە کۆی ٢٢ گوندی راگوێزراوی دەوروبەری کەرکوک بووە بە ناوچەی محەرەمەی سوپایی و تازە مەحاڵە خەڵکی ئەو گوندانە بگەرێنرێنەوە شوێنی خۆیان. حکومەت هەر بەوەندەوە نەوەستا بەڵکو کەوتە بەکار هێنانی سیاسەتێکی شۆڤینیانەی وەکو ئەوەی شۆڤینیانی پۆلۆنی لە ساڵی ١٩١٨ دا لە (کولیدور) و (راینهارد هایدرش)ی نازی لە ساڵی ١٩٤١

دا لە بوهیمیادا و زایونی یەکان دەرهەق بە فەلەستین بە کاریان هێنا: لە سەر داوای وەزارەتی ناوخۆ هەندێ کومپانیا هاتە دامەزراندن و لەژێر پەردەی جۆراوجۆرو یان بە ناوی وەهمی جیاوازەوە کەوتنە کرینی زەوی و زاری ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان. هەندێ کەس دەڵێن یەکێک لەو وەکیلانە عەلی دەحامی عەرەب بوو کە توانی بەو فێڵە زەوی و زاری یازدە گوندی کورد لە یەکێک لە دەرەبەگە کوردەکان بکڕێ، پاشان ئەو کرێنامانەی (عقدایجار) کە جوتیارانی کورد لەگەڵ دەرەبەگی ناوبراودا مۆریان کردبوو، هەڵیوەشاندنەوەو داوای لە دانیشتوە کوردەکان کرد کە ناوچەکە بە جێ بێڵن و هەر کە ناوچەکە چۆڵکرا کۆمەڵێک ماڵباتی عەرەب لە باشورەوە هێنران و لەوێندەر ئاکنجی کران.

بەعسی یەکان، چەکی کارگێریشیان (اداری) بەکار هێنا: حکومەت هەر لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷۰ وەو زۆر بە شێنەیی و دوور لە چاوی رای گشتی، کەوتە تەقسیمبەندییەکی ئیداری تازەی ئەوتۆ کە لەگەڵ سیاسەتی عەرەباندا بگونجێت.. پەیامنێری رۆژنامەی (نویەتسوریخەتسا یتونگ)ی سویسری، لە رۆژهەڵاتی ناڤین دا یەکەم کەس بوو کە ئەم کارە خەتەرناکەی حکومەتی عێراقی بەرانبەر بە کورد دەیکرد، لە قاوداو لەو بارەیەوە بڵاوی کردەوە کە: "وای لێهات بشێت ناسنامەی نەتەوەیی چەندین یەکەی ئیداری کوردنشین بگۆڕدرێ، ئەویش لە رێگەی پەیوەستکرنی یەکەی ئیداری عەرەبنشین پێیانەوە، بە شێوەیەک کە لەیەکە ئیداری یە تازەکەدا عەرەب بێن بە زۆرینەو کورد بێن بە کەمینە".

لە سەرەتای هاوینی ساڵی ۱۹۷۱وە ئیدارەی کومپانیای نەوت لە ژێر گوشاری حکومەت دا، کەوتە جێبەجێکردنی ئەو کارانەی کە پێشتر دژی کورد کردبوونی، ئەوە بوو چوارسەد کرێکاری کۆمپانیای نەوتی کەرکوک بە خۆو خاوخێزانەوە نەقڵ کردن "کە ئەمە دەکاتە گوێزانەوەی پتر لە دوو هەزار کەس" بۆ ناوچەکانی باشور لە ناوجەرگەی ناوچە عەرەبی یەکاندا، بە فەرمانی خودی وەزیری نەوت و کانەکان. لە هەمان کاتدا کۆمەڵێک کرێکاری تریش لەکار دەکران و لە بەر بێکاری ناچار بوون وڵاتی خۆ بە جێ بهێڵن و هیجرەت بکەن بۆ شار یان باشور. هەر دەمودەست سەدان کرێکاری عەرەب لە جێیان دامەزرێنران پاش ئەوەی داوایان لێکرا بە ماڵ و منداڵەوە بێن بۆ ئەوێ. سەرچاوە کوردییەکان دەڵێن لە نێوان ساڵانی ۹۶۱-۱۹۷۱دا پتر لە ۲۰ هەزار کورد لەم ناوچانە راگوێزراون و پتر لە ۳۰ هەزار عەرەب لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی عێراقەوە هێنراون و لە جێ ی ئەوان ئاکنجی کراون. نوێنەری یەکێک لە رێکخراوە کوردییەکان لە هەندران بۆ (هانزهاوزر)ی نوسەری ئەڵمانی باسکردوە کە کوردەکان پێیان وایە حکومەت بە ئانقەست مەسەلەی سەرژمێرییەکەی دوا خستوەو خۆی لێدزیوەتەوە، بە تایبەتی کە کۆمەڵە کادرێکی خۆی راسپاردبوو

شناسایییەکی نهێنی واقیعی نەتەوەیی ئەو ناوچانە بکەن، ئەوە بوو چەند لیژنەیەکی وەهمی لە ژێر پەردەی خۆ سازدان بۆ پرۆسەی سەرژمێری، پێکهات و هەر چی زانیاری پێویست هەبوو کۆیانکردەوە، وەختێ ئەم لیژنە وەهمیانە لە کارەکانیان بوونەوەو حکومەت سەیری ئەنجامەکانی کرد، ئیدی ئەم لیژانە هەڵوەشێنرانەوەو سەرژمێرییەکەش نەکرا.

هەرچەندە مصطفی بارزانی سەرکردەی کورد بەوە بەناوبانگە کە مرۆڤێکی هێمن و بە سەبرو حەوسەڵە ورد وەڵامە، کەچی لەو دیمانەیەمدا کە لە ساڵی ١٩٧٣ لە گەڵیم سازدا، وەختێ هاتە سەر باسی ئەو خاڵە خۆی پێنەگیراو هەندێ ووتەو رستەی توندی ئەوتۆی بەزاردا هاتن کە تەرجومانەکە زۆر بەزەحمەت دەرەقەتیان دەهات و پێیاندا رادەگەیی. بارزانی گوتی: "هەر مەکتەبلی یەک بگری لە هەر سوچێکی سەرزەمین دا زۆر شت دەزانێ دەربارەی قەسابخانەکانی تورک دژی ئەرمەن، دەربارەی قڕکردنی جوو بە دەست نەڵمان، کەچی بەغدا بەکامی دل، هەرچی یەکی بوێ دەیکات و تاقەکەسێک لەم جیهانە ئەو ئەزیەتە وەبەر خۆی ناخات ئاماژەیەک بۆ ئەم رەفتارە بکات یان کارێکی وەها بکەن کە سنورێک بۆ ئەم رەفتارانە دابنرێ.. مادامێکی نەوت هەبێ و بگاتە کۆمەڵگە پیشە سازییەکان، ئەوا هیچ کەسێک رۆژێ لە رۆژان بیر لەم حەقیقەتە ناکاتەوە کە ئەم نەوتە تێکەڵ بە خوێنی رۆڵەکانی گەلەکەمە، ئەو خوێنەی حوکمڕانانی بەغدا رشتویانە. ئەم خوێنەش، لەگەڵ نەوتەکەدا بۆ هەر کوێ یە ببرێ. دەروات"، "نیازێکی گڵاوو ناکامێکی سامناک" بارزانی بەو رستەیە پوختەی رای خۆی لەمەڕ سیاسەتی رژێمی بەعس دەرهەق بەگەلەکەی لەو ساڵەدا دەربڕی.

رژێمی بەغدا هەر لە ساڵی ١٩٧٠ وە کەوتە ئەوەی کەشو هەوایەکی بێباوەڕی و بێ متمانەیی لە نێوان هەردوو لادا دروستبکات. رەنگە رژێم بەو مەبەستە ئەوەی کردبێ کەناکۆکی لاوەکی و دووبەرەکی تازە بخاتە نێو ریزەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی یەوە، وەکو چۆن پێشترش ئەمەی دەکرد، واتا دووبەرەکی نانەوە لە ریزی کورداندا لەرێگەی خۆ دزینەوەی حکومەت لە گفت و بەڵێنەکانی و دۆزینەوەی ئەوزاری تازە بۆ گوشار خستنە سەر کورد کە لە بنەڕەتدا رقی لێیان بوو، و ئەیدەحویاندن.. جاوەکو زەمینە خۆشکردنێک بۆ خولقاندنی کەشوهەوای بێ باوەڕی قەراری زۆر زاڵمانە دەرچوون سەبارەت بە داخستنی دەزگا رۆشنبیری یە کوردییەکان بۆ ماوەیەک و پاشان کردنەوەیان یان هێشتنەوەیان بە داخراوی. هەروەها حکومەت لەو بودجەیەش ژێوان بوەوە کە قەرار بوو بۆ رێکخراوەکانی لاوان و قوتابیان و ئافرەتانی کوردستان تەرخانبکرێ، بە پێچەوانەوە پارەیەکی یەکجار مۆڵ بۆ نۆکەران و هاوکارانی رژێم سەرفکرا.

## هەوڵەکانی تیرۆرو قەڵبە مەلایان

دەزگای ئەمنی عێراقی کەوتە ئەخشەدانان و هەوڵدان بۆ تیرۆرو کوشتنی سەرۆکی کورد و فەرماندەکانی تری کورد. لە هاوینی ساڵی ١٩٧١ دا لە کاتێکدا شاندێکی کورد بە مەبەستی گفتوگۆ لە بەغدایە بوون، بە ئارنجۆکی دەستی هێرشێک کرایە سەر ئوتومبیلەکەیان و ئەم هێرشە بووە مایەی کوشتنی شۆفێری ئوتومبیلەکەو بریندار بوونی ئەو دوو سیاسەتوانەی دەنێو ئوتومبیلەکەدا بوون. هەرچەندە گاردە کوردەکان توانیان کابرای تاوانکار بگرن و تەسلیم بە دادگای عێراقی بکەن، کەچی تەنیا بۆ ماوەی شەش مانگان حەپس کراو پاشان بەپەلە ئازاد کراو لە شاری بەسرە دامەزراو پۆستێکی بەرزیان دایێ.

رووداوەکانی پاشترش بە ئاشکرا ئەوەیان سەلماند کە حکومەتی عێراقی ئەم جۆرە هەوڵانەی بە شێوازێکی ئاسایی دەزانی بۆ بەربەرەکانی کەمینەی کوردی و سەردارەکانی. لە ساڵی ١٩٧٧دا دەزگا ئەمنی یە تایبەتی یەکانی وەزارەتی ناوخۆی ئەمسا، دەزگا تایبەتی یەکانی ئەڵمانیای فیدراڵی ئاگادار کردەوە کە (٥) کەس لە نۆکەرانی ئەمنی عێراقی لە رێگەی ئەمساوە خۆیان بە خاکی ئەڵمانیادا کردووەو بە مەبەستی کوشتنی ئەو سەرکردە کوردانە نێردراون کە لە ئەڵمانیای رۆژاوادا دەژین. بەراستی لە ساڵانی پاشتردا ئەڵمان توانیان تەحقیق لە چەندین هەوڵی تری لەو بابەتە بکەن کە نۆکەرانی ئەمنی عێراقی لە ژێر پەردەی حەسانەی دبلوماسیدا، راسپێردرابوون کاری تیرۆریستی دژی ئەو هاوولاتی یە کوردە عێراقییانە ئەنجامبدەن کە لە ئەڵمانیای فیدراڵی دەژیان.

یەکێک لە نزیکانی بارزانی باسی هەوڵێکی تیرور کردنی بارزانی بۆ گێرامەوە، ئەم پیاوەی کە قسەی بۆ دەکردم لاقێکی لە دەست دابوو. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١ دا تاقمە ئاخوندێکی شیعەی عێراقی داوایان کرد رێیان بدرێ بارزانی بدیێن و باسی ئەوەی لەگەڵدا بکەن کە داخوا بارزانی دەتوانێ دەسەلاتی خۆی و پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ رژێمی بەغدا دا کە هێشتا تێک نەچووبوو، بەکار بێنێ.. بەلام ئەوە بوو کاتێ شاندی نێوبراو لە رۆژی ١٩٧١/٦/٢٩ دا گەیبە بارەگای بارزانی لە حاجی ئۆمەران، تەنیا ئەو چوار ئاخوندە شیعەیە نەبوون کە دیاریکرا بوون، بەڵکو هەشت مەلا بوون، یان راستتر هەشت پیاو بوون و جلی مەلایان لەبەر کرا بوو. لێکوڵینەوەکانی دواتر سەلماندیان کە دەزگای استخباراتی عێراقی سور بووە لە سەر ئەوەی کە چوار کەس لە نۆکەرانی راگەیاندوە کە ریکۆردەر لە ژێر جبەکانیانەوە قایم کراوە، پێویستە هەر کە دەست بە قسان کرا لەگەڵ سەرداری کوردا، رێکۆردەرەکان بخەنەکار تا هەرچی یەک دژی دەوڵەت و حکومەت دەڵێ تۆماری بکەن.

هەڵبەتە کورد میللەتێکە ڕێزی ئاین و حورمەتی پیاوانی ئاینی دەگرن، بۆیە گاردەکان شاندی نێو براویان نەپشکنی و ڕێگەیان دا بڕوات. وەختێ بارزانی وە ژوورکەوت چ گومانێکی لەوە نەبوو کە دەزگای استخباراتی عێراقی داوێکی وەهایان بۆ نابێتەوە. لە کاتێکدا کوڕێکی گەنج چای بۆ میوانەکان دادەنا؛ چای گوڵی مەجلیسە و کورد تا چای دانەنرێ دەست بە قسان ناکات. یەکێک لە نۆکەرەکانی استخباراتی عێراقی، وەکو لەسەری ڕێک کەوتبوون، دەستی بە ڕێکۆردەرەکەی ژێر جبەکەیدا نا، تا قسەکان، کە خەریک بوو دەستیپێدەکرد، تۆمار بکات.

بەڵام ئەم نۆکەرە هێندە نەژیا تا فریا بکەوێ و ببینێ ئەوانەی کە بەم کارەیان ڕاسپاردوە تەفرەیان داوە و لە خشتەیان بردووە، تومەز لە بری ڕیکۆردەر، بۆمبایان لە ژێر جبەکەیدا تاقەت کرد بوو تا هەر کە دەست بەدوگمەی ڕیکۆردەرەکەوە بنێ، یەکسەر بتەقێتەوە. ئەوە بوو تەقینەوەیەکی یەکجار گەورە جەستەی خۆی و کوڕە لاوە چایچی یەکەی پارچە پارچە کردو بردنی بە حەوادا، ئیدی بۆمبەکانی دیکەش تەقینەوەو هەموو ئاخوندە ڕاستەقینە وساختەکان پێکەوە مردن. تومەز بۆمبەکان بە جۆرێ لە ژێر جبەکانیاندا قایم کرا بوون، هەرکە یەکێکیان تەقی بەوە، ئەوانی تریش بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی بتەقنەوە. بەڵام بارزانی کە گوشاری تەقینەوەکە هەڵی دابووە سوچێکی ژوورەکەوە، ساغ و سەلامەت دەرچوو. تەنیا تۆزێ دەست و دەموچاوی ڕوشاو هیچی دی. کاتێ شوفێرانی ئوتومبیلە تویوتاکانی دەرەوە کە لە نزیکی بارەگاکەدا چاوە ڕوانیان دەکرد، گوێیان لە تەقینەوە زلەکەی ژوورەوە بوو، وەکو لە سەری ڕێک کەوتبوون، کەوتنە نارنجۆک بارانی دەوروبەریان تا ڕێگەی هەڵاتن بۆ خۆ بکەنەوە.

بەڵام گاردەکانی بارزانی دەستبەجێ هاتنە دەست و بە دەسترێژی کلاشنکوف هەموو ئەو ئوتومبیلانەیان دابێژت کە ویستیان هەڵێن. یەکێک لەو شۆفێرانە بۆ چەند سەعاتێک ژیا، لەو چەند سەعاتەدا ئەوەندەیان زانیاری لێوەرگرت کە بچنە بنج و بناوانی پرۆسەکە و بزانن کێ نەخشە و پیلانەکەی داڕشتووە. هەر چەندە جێگری سەرکۆماری عێراق سەدام حوسێن، کە دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی عێراق بوو، یەکسەر لە ڕۆژی ٢/ ١٠/ ١٩٧١دا بروسکەیەکی بۆ بارزانی نارد، خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە بۆنەی ڕزگار بونی بارزانی لەو ڕوداوەو پیرۆزبایی شۆڕش و حکومەتی پێراگەیاند، بەڵام کوردەکان ئەو بروسکەیەیان بە کاغەزێکی سپی بێبایەخ زانی.

زۆربەی کورد، بە خودی (بارزانی)شەوە کە هەمیشە بە چاوی گومانەوە دەیڕوانی بە حکومەتی بەغدا، وێڕای هەموو ڕواڵەت و قۆناغەکانی ئاشتی و دۆستایەتی کە حکومەت دەری دەبڕی، وا سەیری ئەو ڕووداوەیان کرد "ڕوداوی تەقینەوەی مەلاکان لە حاجی ئومەران" کە ئەو هەوڵانەی ئاشتی کە بە هۆی ڕێکەوتننامەی ئازارەوە

هاتبوونە ئاراوە، گەیبوونەتە کوێرە کوڵان و چ هیوایەک لە گۆڕێ نەماوەو کاتی خۆ ئامادە کردن بۆ قۆناغێکی تری شەڕ هاتووە. ئەم روداوەش بەڵگەی سور بوونی حکومەتە لەسەر دەستپێکردنی ئەو شەڕە، ئیدی ئەنجامەکەی هەرچی یەک بێت.

ئەمجارەش دەرکەوت کە خۆ پەسندی و عوجبزلی عەرەبی و هاوسەنگی هێز لە نێو حکومەتی عێراقیدا، رێنادات هیچ جۆرە داهێنانێکی (تنازل) راستەقینە بۆ گەورەترین کەمە نەتەوەیی ناعەرەب لە وڵاتدا بکرێ. دانی ئوتونومی بە کورد بەلای حیزبی بەعسەوە، کە حیزبی سوسیالستی عەرەبی یە، تەنیا لە چوار چێوەی عێراقی یەکگرتوودا قابیلی تەسەورە. باشترین بەڵگەی ئەو بۆ چونەش ئەو گوتارەیە کە رۆژنامەی (الجمهوریە)ی بەغدای نیمچە رەسمی لە ناوەراستی ساڵی ١٩٧١دا بڵاوی کردەوە: "ئەو کوردانەی ئەم هەستە نیشتمانی یەیان نەبێ، واتا هەستی پەیوەستەگی تەواو بە عێراقی یەکگرتووەوە. ئەوانە خەڵکانێکی بێگانەو غەوارەن بەم نیشتمانە".

## هنری کیسنجر، بونی کورد کەشف دەکات

لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکاری و شتەتازانەوە، سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کەوتە بیر کردنەوە لەوەی کە واز لەوە بێنێ هەموو قورسایییەکی خۆی بخاتە سەر حکومەتی عێراقی. هەر لەچوار چێوەی بیناکردنی سیلەتی ئایندەی خۆی، سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، سەر لە نوێ کەوتە گەڕان بە دووی دۆست و لایەنی دەرەکی دا تا یارمەتی بدات. جارێکی دی بیرەوەرییەکانی سەردەمی کۆماری مهاباد کە لە ساڵی ١٩٤٦ دا بە کۆمەک و پشتگیری سۆڤیەت دامەزرا، بوژایەوەو زندو بووەوە. هەرچەندە سۆڤیەت لە هەفتاکاندا دۆستی نزیکی حکومەتی عێراق بوون و لەبەرخاتری بەرژەوەندییەکانی خۆیان کۆمەکی بەردەوامی کوردی عێراقیان نەکرد، بەڵام بە بەردەوامی پەیوەندییان بە کوردەوە هەبوو، هەڵویستی بێ لایەنانەیان دەرەق بە کورد هەبوو. بەڵام پاش شۆڕشی عێراق، گۆڕانکارییەکی ریشەیی بە سەر ئەم هەڵویستە دا هات. هەر لە کودەتای ساڵی ١٩٥٨ی قاسمەوە، ئیدی حکومەتە عێراقی یە یەک لە دوای یەکەکان هەوڵیان داوە میانەیان لەگەڵ سۆڤیەتدا دۆستانەو خۆش بێ. چونکە پێیان وا بوو پشتگیری سۆڤیەت فاکتەرێکی زۆر گرینگ بوو بۆ وەدیهاتنی ئامانجە تایبەتی یەکانیان: دەرچوون لە پەیمانی بەغدا، خۆماڵی کردنی کۆمپانیاکانی نەوت، هەڵویستی بیلایەنی ئیجابی.

پاش کشانەوەی بەریتانیا لە ناوچەی کەنداو، کە لە ساڵی ١٩٦٧دا دەستپێکردو لە ساڵی ١٩٧١دا تەواو بوو، عێراق بایەخێکی تایبەتی و ستراتیژی لە لای سۆڤیەت و بۆ سۆڤیەت پەیدا کرد. چونکە بە بێ عێراق نەیاندەتوانی چاودێری گۆڕانکاریەکانی

ناوچەی کەنداو بکەن و کاری لێ بکەن. سۆڤیەتەکان، بەرەبەرە قەناعەتیان هێنا کە عێراق واقیعێکی سوپایی و سیاسییە لە بەرانبەر ئێران دا؛ کە رۆژ بە رۆژ پەیوەندەی و هاوئاهەنگی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زیادی دەکرد.. لەبەر ئەم هۆیە سۆڤیەت لە ناوەندی ساڵانی هەفتاکاندا ئامادە بوو فرۆکەی میگی (٢١) بە عێراق بفرۆشێت، بەمەش عێراق بوو بە یەکەمین دەوڵەتی ناوچەی کەنداو کە فرۆکەی لە زتر لە خێرایی دەنگی هەبێ. (شارام جوبین)ی پسپۆری رۆژهەڵاتی ناڤین لە لێکۆڵینەوەیەکیدا کە لە ساڵی ١٩٨٠ بڵاوبوەتەوە، دەڵێ رادەی چەکداری عێراق لە هی ئێران زیاتر بوو، ئەگەر ژمارەی خەڵک و بەر هەمهێنانی نیشتمانی هەردوک وڵات بەراورد بکەین. لە نیسانی ساڵی ١٩٧٢دا پەیمانی دۆستایەتی درێژخایەن لە نێوان سۆڤیەت و عێراق مۆرکرا، بەمەش ئاستی هاریکاری نێوان هەردووک وڵات بەرز بوەوە، ئەمەش رەوتی گشتی سیاسەتی دەرەوەی عێراقی بتەوتر کرد.

تاران و (واشنتون)ش لە لای خۆیانەوە بە گومان و دوو دڵی یەوە دەیانڕوانی یە پەرەسەندنی ئەم میانەیە. چوار هەفتە بە سەر ئیمزا کردنی پەیماننامەی نێو براوا نەبوری، کە ئەوە بە ئاشکرا دەرکەوت کە گەڕانی کورد بە دووی هاوپەیماندا، لەگەڵ بەرژەوەندی ئێرانی ئەمریکی دا، کە بریتی بوو لە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا، لە زۆر خاڵی هاوبەش دا یەکانگیر دەبن.

(ریچارد نیکسون)ی سەرۆکی ئەو دەمی ئەمریکا، لە ١٩٧٢/٥/٣٠ دا سەردانێکی کورتی بیست و چوار سەعاتی تیهرانی کرد. لەو سەردانەدا بە خۆی مەسەلەی کوردی هێنایە گۆڕێ. نیکسون لە دانیشتنێکی تایبەتی دا لەگەڵ شای خانەخوێ و هاوپەیمانی دا، کە هنری کیسنجری راوێژکاری ئەمنی نەتەوەیی ئەمریکی-ش ئامادەی دانیشتنەکە بوو، نیگەرانی خۆی دەربارەی زیاد بوونی کارە رادیکالی یەکانی عێراقی دراوسێ ی ئێران دەربڕی.

سیاسەتی سوسیالستی رادیکالی و عەرەبی و ناسیونالستی حکومەتی بەعسی بەغدا کە بەند بوو بە ئارامی و عەرەباندنی عێراقی فرە نەتەوەو پەیمان بەستنی پتر لەگەڵ سۆڤیەتدا، ئەمە کۆسپ و تەگەرە بوو لەرێ ی وەدیهاتنی ئارەزووەکانی شاهنشاو روناهی ئاریان، کە بریتی بوو لە وەدەست هێنانی هێزو دەسەڵاتی پتر. هەروەها کە بەعسی یەکان لە ساڵی ١٩٦٨دا هاتنە سەر حوکم، ئەمە خۆی لە خۆیدا بوو بە سەرچاوەیەکی خەتەری راستەوخۆی لە گوێ بۆ شا، نەک هەر لە رێگەی پشتیوانی کردنی راستەوخۆی ئەو موهاجیرانەوە کە نەیاری شابوون، بەڵکو، ئەگەری ئەوەش هەبوو بێ بەخەتەرێک کە هەڕەشە لە ئارامی میرنشینە عەرەبی یەکانی وەکو کوێت و قەتەرش بکەن. هەر وەها نیکسون بایەخ و گرینگی کانگا نەوتەکانی ناوچەکەو ئەگەری هەڕەشەکردن لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکای لەم رووە باسکرد. بەڵام کیسنجر

هەموو هێزو بیری خۆی بۆ ئەوە تەرخان کرد کە چۆن دەسەلاتی سۆڤیەتی کەمبکرێتەوە.

پێدەچێت هەردوکیان رای شایان پرسیبێ کە چ بکرێ تا گوشار بخرێتە سەر کۆماری عێراقی هەمیزی دۆلی دوو روبارو ئاژاوەو بشێوێنی تێ بخرێ، بەو مەبەستەی زەمینە بۆ ئەو رۆژە خۆشبکرێ کە بتوانرێ جارێکی دی عێراق بە بەرژەوەندییەکانی ئێران- ئەمریکاو تەنانەت رۆژاواوە ببەسترێتەوە، وەلامی شا ئاشکراو روون بوو: لە کاتێکا هەموو قورساییەکی ئەمریکا بۆ ڤێتنام تەرخانکرا بوو، هێزی پێشمەرگەی بارزانی لە سالی ١٩٦١ وە توانی سێ جاران زەرەری گەورە لە هێزی ئیزامی عێراق بدات و بێگەیەنێتە کەناری داروخان و حکومەتی عێراق ناچار بکات داوای ئاگر بەست و شەر راگرتن بکات. (تاران)ش ئاگادار بوو کە ئەم ئاگر بەستەی دواییەش کە بە هۆی مۆر کردنی رێکەوتننامەی ئازارەوە هاتبووە گۆرێ، زۆر لەقەو هەر سالێ بروخێ دەروخێ و مرۆڤ دەتوانێ بەبێ ماندوو بوون، پێشمەرگەکانی بارزانی بگەرێنێتەوە بۆ سەنگەرەکانی شەر. نیکسون وکیسنجر، بیریان کردەوە کە زامنکردنی کۆمەکی ئێرانی و بەلێنێکی ئەمریکی کە کۆمەکی کورد بکەن، بەسە بۆ ئەوەی هێزی ئەنتی کومونیستەکانی بارزانی، لە جیاتی خۆیان، واتا لە جیاتی ئێران و ئەمریکا بخەنە شەرەوە دژی حکومەتی بەعس و سۆڤیەتی هاوپەیمانی حکومەتی بەعس. بەلام شا، زۆر دلی پێوە ئەبوو بەشداری ئەم پرۆژەیە بکات؛ بە تایبەتی کە هێشتا ئەو زەرەرو زیانە سوپاییە گەورانەی بیرمابوو کە لە سالی ١٩٧٠دا لە ئەنجامی شەری پاکستانی هاوپەیمانی ئێران دژ بە هند، پێ ی کەوتبوو. لە لایەکی ترەوە شا، سەرگەرمی ئەوە بوو میانەی خۆی لەگەل وولاتانی عەرەبی و هەموو وولاتانی ئیسلامی داکۆک و خۆش بکات. بۆیە وای بەچاک دەزانی خۆی لە کاروباری ناوخۆی عێراقی دراوسێ و موسولمانی هەلنەقورتێنێ، بە تایبەتی لە رووی سیاسی و سوپاییەوە.

## چەکی سۆڤیەتی، لە ئەمریکاوە دەنێردرێ

لەبەر ئەم وەزع و حالە تایبەتی یەی شا، دەبوایە زۆر بە جوانی هەموو هەنگاوەکانی ئایندەی ئەم پرۆسەیە تاوتوێ بکرێ و زۆر بە ئهێنی بمێنێتەوە. هەر بەمەبەستی پاراستنی ئەم رازو ونهێنی کاری یە، شا چەند پرسیارێکی خستە روو: ئایا ئەمە راستە، لە پرو راستەوخۆهەمان چەکی ئەمریکی کە دراوە بە سوپای ئێرانی، بدرێ بە پێشمەرگە؟ ئایا واشنتۆن ناتوانێ ئەو چەکە سوڤیەتی و چینیانە بدات بە کورد کە لە شەرەکانی ڤیتنام و کەمبودیا گرتوونی؟ خۆ ئەگەر ئەو چەکانە بەش ئەکات ئایا ئەمریکی یەکان ناتوانن داوا لە جولەکە بکەن ئەو چەک و تفاقە سۆڤی یەتیانە بۆ کورد بنێرن کە لە جەنگی شەش رۆژەی سالی ١٩٦٧ دا گرتویانە؟! چونکە گومان لەوەدا نی یە دەبێ ئیسرائیل پشتیوانی لە هەر پرۆژەیەک بکات کە لە ئەنجامدا

دەبێتە مایەی لاواز بوونی عێراق کە ئاشکراو لە هەر بونەیەکداو زیا لە هەر دەوڵەتێکی تری عەرەبی، دژمنایەتی خۆی بەرانبەر زایونیزم و ئیسرائیل رادەگەیەنێ.

نیکسون، کە بە خۆی زۆری حەز لە کاری نهێنی دەکرد، مالاوایی لە شا کردو بەڵێنێکی زۆری داێ هەر کە گەیشتەوە واشنتون هەموو لایەنەکانی ئەم کردەیە بەزوترین کات تاوتوێ دەکات. بەلام وەختێ نیکسون گەرایەوەو ئەم مەسەلەیەی لە راوێژکارانی خۆی گەیاند، بە تایبەتی راوێژکارانی کاروباری دەرەوەو ئەمنی نەتەوەیی، نەک هەر دڵیان پێوەنەبوو، بگرە هەوڵیاندا ئامۆژگاری بکەن کە واز لەم سەرکێشی یە بێنێ، بە تایبەتی (ولیم روجرز)ی وەزیری دەرەوەو (ریچارهیلمز)ی سەرۆکی ئاژانسی موخابەراتی ئاوەندی زۆریان هەوڵ دا ژێوانی بکەنەوە، هەنجەتیشیان ئەمە بوو، کە ئەمریکا بەشی خۆی و زیاتر گیروگرفتی لە باشوری رۆژهەلاتی ئاسیادا هەیە، ئەمە جگە لەو هەموو زیانەی کە لە ڤیێتنام لێیکەوت، هەروەها کۆمەڵێک پرۆژەی نهێنی ی دیکەش لە کەمبودیا و لاوس هەبوون.

جگە لەم هۆکارە دەرەکیانە، ئاڵۆزکانی سیاسەتی ناوخۆش لە زیاد بووندا بوو، ئەوە بوو دەست بە جێبەجێکردنی پرۆسەی واتەرگێت کرا لە ١٩٧٢/٦/١٧دا. بەلام نیکسون نەک هەر بە گوێ ی راوێژکارەکانی خۆی نەکرد، بگرە هەموو توانایەکی خۆی وەگەڕ خست تا زەمینە بۆ ئەم پرۆژە تازەیە خۆشبکات و بەزوترین کات جێبەجێ ی بکات. چونکە ولیم روجرز و ریچارد هیلمز ئەندام بوون لە لیژنەی چوار قوڵی ئەنهێنی دا، کە ئەم لیژنەیە بۆ خۆی بەشێکە لە ئەنجومەنی ئەمنی نەتەوەیی و دەبێت هەموو پرۆژەو کردە نهێنی یەکان بچێتە بەردەستی، بۆیە نیکسون خۆی لە لیژنەی گۆرین بواردو داوای لە کسینجری راوێژکاری کاروباری ئەمنی نەتەوەیی کرد کە بە خۆی سەر پەرشتی جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە بکات. لە حوزەیرانی سالی ١٩٧٢ دا جون کونالی "کە جاران وەزیری دەوڵەت بوو لە دارایی و هەنووکە سەفیری گەرۆک بوو" و یەکێک بوو لە نزیکانی سەرۆک، خۆی گەیاندە تاران تا بە شاو نوێنەرانی بارزانی بڵێ کە ئەو چەکانەی بۆ کورد تەرخانکراون، ئامادەن و هەندێکی بەرێوەیە بۆ ئێرە.

دیارە ئەم رێکەوتنەی نێوان ئەمریکاو ئێران کارێکی زۆر گەورەو ناراستەوخۆی کردە سەر هەڵویستی کورد لە قوناغەکانی دواتری گفتوگۆیان لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا. هەروەها وەکو پاشتر بۆمان روون دەبێتەوە، کارێکی کوشندەشی کردنە سەر. پارتی دیموکراتی کوردستان بەرادەیەک هەستی بە بەهێزی خۆی کرد کە لە ١٩٧٢/٨/١٣، واتا پاش سێ هەفتە لە سەفەرەکەی کوتای بۆ تاران، هەرەشەی هەڵگیرسانەوەی شەڕی کرد، ئەگەر عێراق بە پیر داواکانی کوردەوە نەیەت و لەزێ لە جێبەجێکردنیان نەکات.

هەر لەو ماوەیەدا، میانەی نێوان (ئێران-کورد)ش پەرەی سەندو خۆش بوو. بەهاری هەمان ساڵ بارزانی، ئەفسەرانی پەیوەندی خۆی لە رەزاییە دانان. لە تارانیش دا دۆستانە مامەڵە لەگەڵ نوێنەرانی پێشمەرگەدا دەکرا. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، بارزانی زۆر واقیع بینانە دەیڕوانی یە شتەکان، چونکە لە ئەنجامی ئەزمونی خەباتی درێژخایەنی پتر لە سی ساڵەی خۆیەوە شارەزای سروشتی سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناڤین بوو، و دەیزانی ئەگەری گۆڕانکاری کوت و پڕو گۆڕانی بەرژەوەندییە دوو لایەنی و چەند لایەنی یەکان لەوێندەردا زۆرە. بارزانی حساوی بۆ هەموو ئەو پەرەسەندن و گۆڕانکاریانە دەکرد کە لە ماوەی ساڵانی رابردوودا بە سەر بزاڤی رزگاریخوازی کوردیدا هاتبوون: رێکەوتننامەی ئازار، کە بارزانی لە ساڵی ١٩٧٠ دا لەگەڵ حکومەتی بەعسی بەغدا دا مۆری کرد، دانی بە جۆرە ئوتونومی یەکی کوردا دەنا کە نە لە قۆناغەکانی پێشوتری خەباتی کوردی عێراقاو نە لە وڵاتەکانی دراوسێ ی عێراق دا شتی وەها هەبوو.

بڕیار بوو لە ساڵی ١٩٧٤دا، واتا پاش تەواو بوونی ماوە رەوتەنی یە چوار ساڵی یەکە، دەست بە جێبەجێکردنی ئەو ئوتونومی یە بکرێ. لە لایەکی ترەوە، لە ماوەی ئەوساڵانەدا کە بەسەر مۆر کردنی رێکەوتننامەکەدا بوری، حکومەت چەندین گفت و بەڵێنی دا، کە یان جێبەجێ ی نەکردن یان لێیان ژێوان بوەوە. هەروەها بارزانی-ش ئەو هەموو هەوڵانەی تیرور کردنی لە بیر نەکرد کە حکومەت بۆ لە نێو بردنی ئەو، دانی. هەر چەندە ئەم هەوڵانە سەریان نەگرت، بەڵام بارزانییان والێکرد کە بەعسی یەکان نێو بنێ: (بەعسییانی غەدداروگڵاو) بۆیە هەموو ئەم لایەنە سەلبیانەی میانەی کورد و عێراق کردیانە کارێک لایەنی بێباوەڕی و بێ متمانەیی بە عێراق، زاڵ ببێ و باوەڕ نەکرێ کە حکومەت نێوەرۆکی رێکەوتننامەی ئازار جێ بە جێدەکات. هەر چەندە لە ئەنجامدا تای تەرازووی کۆمەکی ئێرانی -ئەمریکی قورس بوو، و هاتە هەڵبژاردن، بەڵام بارزانی ئامادە نەبوو ئەم کۆمەکانە بی چەندو چوون و بێ تاقیکردنەوە وەربگرێ.

بارزانی هەر لە سەرەتاوە هەستی دەکرد شا، زۆر جدی نی یە لە پشتگیری دۆزی کوردا، (شا)ش زۆر چاک دەیزانی کە ئەگەر شۆڕشی کوردی عێراق، کە ژمارەیان سێ ملێون کەسە، سەربکەوێ چ ناکامێکی خەتەری دەبێت، بێگومان ئەمە کاریگەرییەکی ئەفسوناوی دەبێت و چوار ملیون کوردی ئێران و هەشت ملیون کوردی تورکیا بۆ لای خۆی رادەکێشێت و بێداریان دەکاتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر سەرکەوتنێکی کوردی عێراقی دەبێتە مایەی تەقاندنەوەی بارودۆخی گرژی رۆژهەڵاتی ناڤین و زەمینە بۆ سەرهەڵدانی چەندین بزاڤی نەتەوەیی لە ناوچەکەدا خۆش دەکات. بارزانی و ژمارەیەک لە نزیکانی بارزانی، بە تایبەتی

لەوانەی کە بە چاوی خۆیان روخاندنی کۆماری مهابادیان، لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە، بینی بوو؛ بەگومان بوون لەوەی کە ئاخۆ شا کورد (وەکو تاژی راوێ) بۆ مەرام و لە پێناوی بەرژەوەندییە خوردییەکانی خۆیدا بە کار ناهێنێ. ئایا ئەگەرێکی زۆری ئەوە لە گۆڕێ نی یە کە هەر کە شا بە مەرامەکانی خۆی گەیی، پشت ناکاتە کوردو دەستبەرداریان نابێت؟. هەمان ئەو مەبەستانەی وایان لێکرد ئەم هەموو دۆستایەتی یە بۆ کورد بنوێنێ.

بارزانی دواتر پێ ی گوتم: "ئەو پرسیارو گومانانە سەنگی مەحەکی بابەتەکە بوون، بەڵام ئەوەی هەڵوێستەکەی لێ دەناڵۆزاندم، ئەوە بوو نەمدەتوانی بگەمە وەڵامی بنجبرو دروست" هەر لە پێوداێگی ئەم گومان و دوو دڵی یە، بارزانی سوور بوو لە سەر ئەوەی هەموو گفتوگۆکانی نێوان ئێران و کورد، بە ئامادەبوونی نوێنەرانی باڵای تاقە دەوڵەتی دنیا بێ کە متمانەی پێ ی مابوو، کە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ئەنجامبدرێ. کۆمەڵێک تێبینی و باری سەرنج لەمەڕ ئەم هەڵوێستەی بارزانی، لە بروسکەیەکی دورو درێژ دا هاتووە کە مەڵبەندی ئاژانسی استخباراتی ناوەندی لە تارانەوە بۆ واشنتونی ناردوەو مەڵبەند ئاماژەی کردووە کە: "بارزانی لە چەندین بۆنەدا گوزارشتی لە گومانی خۆی بەرانبەر بە نیازەکانی ئێرانی هاوپەیمان کردوە. بەڵام وەکو لە زۆر قسەیدا دەردەکەوێ بەرادەیەک متمانەی بە وڵاتە یەکگرتووەکان هەیە کە ئەو متمانەیەی بە هیچ زلهێزێکی دی نییە. رایگەیاندوە کە ئەگەر دۆزەکەی سەر بکەوێ ئەوا کوردستان دەبێت بە پەنجاویەکەمین وڵاتی، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا".

پێدەچێت بارزانی هەر لە رۆژی خۆیدا ئاگای لەوە هەبووبێ کە سەرەک نیکسون هەموو دەزگا ئەمریکی یە تایبەتی یەکانی بوارد بوو، و هنری کیسنجری راسپارد بوو بە خۆی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی پرۆژەکە بکات. بارزانی پتر لە جارێک ئیعجابی خۆی سەبارەت بەم پیاوە دەربڕیوەو بە (متریخ)ی سەدەی بیستی زانیوە. بارزانی دیاری شەخسی پێشکەش کردووە: جارێکیان سێ پارچە پیشەسازی دەستی ی خۆماڵی بۆ نارد و جارێکیان بەبۆنەی ژن هێنانی کسینجرەوە بارزانی ملوانکەیەکی مرواری بۆ بوکێ نارد. بەڵام بارزانی هێندە ژیا کە کۆمەڵێک بەڵگەنامەی لیژنەیەکی سەربە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی بدینێ، کە پاشان ئەو لیژنەیە بۆ ئەوە دانرا کە لەم پرۆژەیە بکۆڵێتەوەو تاوتوێ ی بکات. ئەو دەمە رووی راستەقینەی سیاسەتی ئەمریکی و مەرامی لەم سەرکێشی یە، بۆ بارزانی روون بوەوە: رەزامەندی ئەمریکا لەسەر یارمەتی دانی کورد، لە راستیدا رەزامەندییەکی رەمزی بوو، وڵاتە یەکگرتوەکان بۆیە لە دۆزی کورد هاتە پێشەوە تا لایەکەوە هەڵوێستی هاریکاری خۆی بۆ کەمینەی کورد رابگەیەنێ و لە لایەکی دی یەوە، هاندەرێک بێ کە شا دەسبەرداریان نەبێ.

## ئەو ساعاتی رزگاربوونەی کە لە باربرا

ئێمە تاکو رۆژگاری ئەمرۆش نازانین ئەو پەیمان و بەڵێنانەی کە ئەمریکا بە کوردی دابوون تا چ رادەیەک و بە چ شێوەیەک لە بواری پراتیکی دا جێ بەجێ کران. بارزانی تا دوا رۆژانی ژیانی هەر دەیگوت پەیمان و بەڵێنەکانی ئەمریکا زۆر جدی بوون، من شەش مانگێک بەر لە هەڵگیرسانەوەی شەڕی عێراق وکورد، لە مانگی ت١و ت٢/١٩٧٣ دا لە حاجی ئومەران دیمانەیەکی رۆژنامەوانیم لەگەڵ بارزانی داکرد، لە قسەکانیا هەستی دەکرد باوەڕو متمانەی تەواوی بەسەرکەوتن هەیە. چونکە لەو سەرو بەندەدا بەکۆمەڵێک راسپاردەوە چووم بۆ لای، دەرفەتم بۆ رەخسا دیمانەیەکی دورو درێژی لەگەڵ ساز بدەم، بە تایبەتی وەختێ کە بۆی باسکردم کە لە لایەن دۆستانەوە زەمانەتی دراوەتێ.. زەمانەتێکی وەها کە ئەمجارەیان دەبێتە مایەی دیار خستنی دۆزی کوردو یارمەتی دانی بۆ وەدیهاتنی ئەو بازرەقەیەی لێ ی چاوەڕوان دەکرێ. "ئێمە پشت بە وولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا دەبەستین و متمانەمان پێ ی هەیە".

بەلام هینری کیسنجر، لەو ئیفادەیەدا کە لە بەردەم لیژنەیەکی سەر بە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا داویەتی، لە بەردەم ئەو لیژنەیەی کە تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوە لەم پرۆژەیە، ئەو لیژنەیە لە سالی ١٩٧٦دا دامەزرا، کیسنجر لە بەردەم ئەو لیژنەیەدا حاشای لەوە کردوە کە پەیمان و بەڵێنی لەو بابەتە هەبور بێ.. هەرچەند پروتوکۆلی لیژنەی ئێوبراو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئیفادەکەی کیسنجر مەنتیقی و واقیعی نەبووە.. هەروەها یاداشتنامەکانی کیسنجرش چ ئیشارەت و ئاماژەیەکیان تێدا نی یە کە ئەم مەسەلەیە پتر روونبکاتەوە، یان ئاماژە بۆ وەلامێکی بنجیری ئەم پرسیارە بکات.

بەهەر حاڵ، یەکەم وەجبەی ئەو چەکانەی کە نیکسون لە شەرگەکانی باشوری رۆژهەلاتی ئاسیا کۆی کرد بوونەوە، بە چەند کاروانێکی جیاجیا گەیینە بارەگا خەلفی یەکانی کورد لە باکوری رۆژهەلاتی ناوچە شاخاوی یە سەختەکانی عێراق. دەیان هەزار کلاشنکۆفی ئۆتوماتیکی سۆڤیەتی، کە بەشێکی زۆری مۆنتاژی کارخانەکانی چین بوو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە دۆشکای فرۆکەشکێن، لە رێگای ئێرانەوە بە قافڵەی ترومبێلان، یان بە کاروانی وولاخان گەیەنرایە ناوچەکە. لە هاوینی ١٩٧٣دا نزیکەی شەست هەزار پێشمەرگەی سازو تەیارو ئامادە هەبوو، کە لەسەر پێ بوون بۆ گەرێکی (جولە) تازەی شەڕ. ئەم هێزە نەک هەر لە توانایدا هەبوو خزمەتی دۆزی کورد بکات، بگرە دەیتوانی بەرژەوەندییەکانی ئێران و ئەمریکای زلهێزش وەدی بێنێ و بپارێزێ. تاقە مەسەلەیەک کە هێشتا نەبڕێنرابووەوە، دیاریکردنی سەعاتی سفر بوو بۆ دەستپێکردنی هێرش. هەلومەرجی زاتی لەبار بوو،

چەک زۆر بوو. تاقە پرسیار ئەوە بوو کە: ئاخۆ کەنگێ هەلومەرجی بابەتی ش لەبار دەبێت بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ؟ بەیانی ڕۆژی ٦/ ١٠/١٩٧٣ گوێگرانی ئێزگەی ڕادیوی بەغدا، پاش لێدانی چەندین سرودو مارشی عەسکەری و هورا و دروشمی سەرکەوتن و ستایش و شانازی؛ ڕایگەیاند کە هێزەکانی میسری هاوپەیمانی بەعسییان، لە چەند قۆڵێکەوە لە کەناڵی سویس پەڕیونەتەوەو کەوتونەتە پاک کردنەوەی سینا لە ئیسرائیلی یەکان ئەمە لەوە دەچوو.

کە ئەو سەعات و دەرفەتە زێڕینە بێ کە گەلی کورد لە سەرەتای سەرهەڵدانی بیری نەتەوەییانەوە چاوەڕێی بوون؛ لەشکری کورد لە هیچ کاتێکدا ئەوەندە پڕ چەک و چەکدار نەبوو، دۆستی بە هێزیان هەبوو، بەڵێنیان داهوونێ کە چاویان لێیان بێ و بە بەردەوامی چەکیان بۆ بنێرن و چەکی قورسیانش بدەنێ. دوژمنەکەیان، کە سوپای عێراقی بوو، ڕاستە زۆر لە کورد تەیارترو پڕ چەک ترو هاوچەرخانەتر بوو، بەڵام بەشێکی زۆری هێزی سوپای عێراقی، بە تایبەتی هێزی زرێپۆشی سێ و چوار لە سوریا بوو و لەبەرەی شەڕی عەرەب- ئیسرائیل دا بوون.(*)

(ئیسرائیل)ش، کە لە ساڵی ١٩٦٥وە ئەفسەرانی پەیوەندی لەگەڵ کوردا هەبوو؛ مەبەستی بوو هێزی تایبەتی عێراقی لە سنورەکای خۆی دووربخاتەوەو بە شۆڕشێکی نوێ ی کوردی یەوە سەرقاڵ و گیرۆدەی بکات. ئیسرائیل بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی ڕۆژی کیپور کەوتە ناردنی چەک و ڕاوێژکارانی نیزامی بۆ کوردستان. هەروەها لە سەر داوای وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، کەوتە هەناردنی هەندێ لەو چەکە سوڤیەتی و چینی یانەی کە لە عەرەبی گرتبوون و لە حەیفادا عەمار کرا بوون، بۆ کوردستان. بەڵام کاتێ هێزی بروسکەی ئیسرائیلی زاڵ بوون بە سەر وەزعەکەدا، ئیدی گۆڕانێکی ڕیشەیی بە سەر ڕەوتی شەڕی سینادا هات. ئیسرائیلی یەکان توانیان بە حیکمەتی سەرکردایەتییەکی زیرەک و نەخشەیەکی تۆکمە و بەزەبری باڵا دەستی چەک وتفاقی جەنگی، سوپای سێ ی میسر لە ناوچەیەکی بیاباندا بە جۆرێ گەمارۆ بدەن کە مەحاڵ بێ لە ڕەخی ڕۆژهەڵاتی کەناڵی سویسەوە بەرگری لێبکرێ و ئیدی قۆشەن و هێزە میسری یەکان بە جارێ شنگیان لەبەر بڕاو کەوتنە بەر هەڕەشەی قڕکردنی تەواوەوە. جارێکی دی کیسنجر، کە هەڵوێستی ئەو دەورێکی بنجبڕی لە دیاریکردنی چارەنوسی کێشەی کوردی- عێراقی دا هەبوو، بە پێ ی ویستی خۆی کەوتەوە گەمەکردن بە پیادەکانی شەترەنجەکە، سەر لە نوێ و بەو جۆرەی کە خۆی پێ ی ڕاست بوو، پیادەکانی لە سەر تەختەی شەترەنجەکە ڕیزکردەوە. سۆڤیەت چەند هێزێکی چەتر بازی خۆی خستە ئامادە باشی یەوەو ئەمریکای ئاگادار کردەوە کە

(*) ئەوەی نووسەر باسی دەکات تەنیا لە ڕوانگەیەکی ڕۆژنامەوانی بەرەیەو بۆچونی خۆیەتی بۆ تێکرای مەسەلەکە وەکو ئەورویی یەک- وەرگێڕی عەرەبی.

ئەگەر رێگەی ئیسرائیل بدرێ سوپای سێ ی میسر قڕ بکات، ئەوا تەدەخولی سوپایی راستەوخۆ دەکەن لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناڤین دا. کیسنجر ترسا لەوەی لەم سات و وەختەدا پیادە کوردی یەکان (گەمەی شەترەنجەکە) بجولێن، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیسرائیلی یەکانی هان دەدا و چمشەی دەکردن تا درێژە بە شەڕی میسری یەکان بدەن کە بەخۆیان شەڕەکەیان هەلگیرساند، ئەمە یەکێک بوو لەو خالانەی کە کیسنجر هەستیدەکرد لە سەرێتی رێ ی لێبگرێ و نەیەلێ رووبدات.

لەلایەکی ترەوە شا ئامادە نەبوو رێ بە کورد بدرێ کە ئەم لاوازی یە کاتی یەی عەرەب بقۆزنەوە و سور بوو لەسەر ئەوەی ئەم دەرفەتەیان لە کیس بدات و نەیەلێ سەرکەرتنی یەکجارەکی و پنجەر بە سەر حکومەتی عێراقدا بێنن، چونکە ئەگەر شا بەوە قایل بوایە ماتای وابوو یارمەتی کورد دەدا تا لەوگەمەی شەترەنجەدا، لە پیادەیەکی سادەی گەمەکەوە بێن بە وەزیرێک کە کەس نەتوانێ رەفتارو هەلوێستی ئایندەیان بخوێنێتەوە یان پێشبینی بکات. لەبەر ئەمە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و ئێران وایاندەخواست کە چ گۆرانکاری یەک لەو کاتانەدا لە بەرەی کوردی- عێراقی رووبدا. جارێکی دی بۆمان هەیە تەسەوری "هەلبەتە لەروانگەی بیرکردنەوەیەکی رۆژاواییەوە- وەرگێری عەرەبی" ئەوە بکەین کە ئەو روداوانە دەرفەتێکی زێرینی لەبار بوو بۆ کورد کە ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان بە دەست بێنن، دەرفەتێک بوو رەنگە مەحاڵ بێ دەرفەتی وەها دووبارە ببێتەوە، چونکە خەلکانێک هەبوون خۆیان بە دۆستی ئەم گەلە دەزانی و هەولیان دا ئەم دەرفەتە لە بێشکەدا خەفە بکەن و لە گۆڕی بنەن.

بەلام کورد بە خۆیان، ئەگەر بکرایە بابەتەکەیان لەم گۆشەنیگایەوە بدیتبایە، هەولیان دەدا خۆ بە بڕاڤێکی وەهاوە ببەستنەوە کە ناکۆک نەبێ لەگەڵ ئەو تەسەوراتانەی لە هزرو بیری ئێرانی یەکان و هنری کسنجردا دروست بوو بوو. چونکە ئێران تاقە پەنجەرەیەک بوو کە کورد هەناسەی لێوە دەدا و لەوێوە گرینگترین کۆمەکی چەک و تفاقیان بۆ دەهات؛ ئەگەر ئێران ئەم رەگی حەیاتەیان ببڕێ و ئەمریکا چیدی چەکیان بۆ نەنێرێ، ئەوا لەم حالەتەدا هەر هێرشێکی کورد بۆ سەر سوپای عێراقی، دەیکردە رەفتارێکی نابەجێ و لە گوین بوو کارەساتی گەورە بە سەر کوردا بێنێ.. یەکێک لەرەخنەگرەکانی ئەمریکا دەربارەی ئەو بارودۆخە، ئەخت و پوخت دەلێ: "رەنگە هەر لە سەرەتاوە سەرکردەی پسپۆرو شارەزای جەنگی پارتیزانی، ئەوەی زانیبێ کە ئەم دەرفەتەی لە ئەنجامی هەلگیرسانی شەڕی رۆژی کیپوورەوە رەخساوە، دووبارە نەبێتەوە، بەلام گفت و بەلێنی لەگەڵ ئەمریکی یەکاندا هەبوو. هەر چەندە بێزار بوو، و تووڕەیی خۆی دەربڕی، بەلام هەر نەجولا. ئا بەمجۆرە ئەو دەرفەتە مێژووییە لە دەست چوو بێ ئەوەی سوودی لێ ببینرێ".

لەلایەکی دیکەوە تازە کار لەکار ترازا بوو، و وەختێ ئەوە نەمابوو هەوڵێکی دی لەگەڵ بەغدا بدرێ لەسەر بناغەی جێبەجێکردنی بەندەکانی ڕێکەوتننامەی ئازار، ئەو شەڕە قسانەی کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٢ دا لە نێوان ڕۆژنامەی التآخی (زمانی حاڵی پارتی) و ڕۆژنامەی الثورە (زمان حاڵی بەعس)دا ڕوویدا و زۆریان تاوان و تۆمەت لێکدی بارکرد، هێندە بەزمانێکی ئاشکراو زەق بوو، ئەوەیان بەدیار خست کە بواری هیچ جۆرە سازشێک نەماوەو و کاروبارەکان گەییونەتە کوێرە کۆڵان. بەعسی یەکان دەیانگوت پێشمەرگە تەقەیان لە هێزەکانی عێراق کردووەو لەم لاشەوە پارتی دیموکراتی کوردستان، عێراقی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە چەندین زیندەگاڤی و پێشێلکاری کردووە: دەیان هەزار کوردی ڕەوەند بۆ ئێران و تورکیا دەرکراون بە هەنجەتی ئەوەی گوایە جنسی یەی عێراقیان نی یە. فڕۆکەکانی عێراق گوندەکانی ناوچەی بارزان و ژەنگاریان لە سایەی قۆناغی ئاشتیدا بۆردومان کردووە. ئەمە جگە لەوەی کە حکومەتی عێراقی چەندین گوندی کوردی لە ناوچەی خانەقین دا بەر بلدۆزەران داوەو تەختی کردوون. ئەمە جگە لەوەی بۆمبی وێرانکەر بۆ بارەگاکانی حیزب و ڕێکخراوە پیشەییەکانی حیزب نێردراوە بە مەبەستی تەقینەوە. هەروەها هەوڵی تیرۆر کردنی بارزانی جارێکی دی هێنرایەوە گۆڕێ و وەبیر خەڵکی هێنرایەوە.

ئەوەی کەپتر ڕەوشەکەی ئاڵۆزاندو پەیوەندییەکانی خراتر کرد ئەوە بوو، ئەو کاروانە کۆمەکانەی لە ڕێگەی ئێرانەوە بۆ کورد دەهات، لە حکومەتی عێراقی شاراوە نەبوو. بە تایبەتی ئێران دوژمنی عێراق بوو، بۆیە کاریگەری ئەمە بۆ یەکێکی وەکو (سەدام) وەکو کاریگەری پارچە پەڕۆی سوور بوو بۆ گا. کاتێ بارزانی لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیدا لەگەڵ (جیم هواگلاندی) پەیامنێری ڕۆژنامەی (واشنتون پوست) دا، هەموو وەرەقەکانی خستنەڕوو، بەغدا ووتەکانی بارزانی لەبەر گران بوو، و بە ئینکەبەرایەتییەکی ئاشکراو زەقی لە قەڵەم دا بە تایبەتی کە ووتەکانی بارزانی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوون و ئومێدی ئەوەیان نەهێشت کە پەیوەندییەکان لەگەڵ ڕژێم دا، جارێکی دی ئاسایی ببنەوە، بە تایبەتی گوتەی وەک: ". .ئێمە فاکتەرێکی گرینگین لە ڕۆژهەلاتی ناڤین دا کە لە بەردەم دەسەلاتی سۆڤیەتی دەوستین و سوپای عێراقی ی دۆست و هاوپەیمانی سۆڤیەت مژول دەکەین. ئێمە ئامادەین هەر کارێک کە لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا لەم ناوچەیەدا بگونجێت، بیکەین ئەگەر ئەمریکا لە گورگان بمانپارێزێت، خۆ ئەگەر کۆمەکی پێویست و کاریگەر بکرێین ئەوا دەتوانین کانگاکانی نەوتی کەرکوک بگرین و تەسلیم بە یەکێک لە کومپانیاکانی نەوتی ئەمریکای بکەین، خۆ خۆماڵی کردنی نەوت لە لایەن عێراقەوە کارێک بوو دژی کورد".

هەر چەندە ئەم گوتانە خۆی لەخۆیدا ڕاگەیاندنی شەڕ بوو دژ بە یەکێتی سۆڤیەتی دۆست و هاوپەیمانی عێراق، بەلام دبلوماسییەتی سۆڤیەتی لە دوا ساتەکاندا فریاکەوت و نەیهێشت قۆناغێکی تازەی شەڕی عێراق و کورد هەلگیرسێتەوە. هەندێ نێردراوی سۆڤیەت هەر لە کۆتایی سالی ١٩٧٢وە هەولیاندا بکەونە بەینی بەغداو بارزانی یەوە، ئەوەتا وا جارێکی دیکەش کەوتنەوە خۆ تا شەڕی چەکداری لە نێوانیاندا هەلنەگیرسێتەوە. هەلبەتە هۆی ئەم ناوبژیەی سۆڤیەت روون و ئاشکرا بوو: چونکە سەدام حوسەینی بە نزیکترین هاوپەیمانی خۆی دەزانی لە نێو عەرەبەکاندا.. موسکۆ مەبەستی بوو ئارامی ناوخۆ لە عێراقدا بەرقەرار بێ؛ چونکە هەلگیرسانەوەی شەڕ لەگەل کوردا، ڕژێمی بەعسی بەغدای لە زرزک دەکرد و بەرەو ڕوخانی مسۆگەری دەبرد. ئەو حەقیقەتەیان لەبەر چاو بوو کە هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی لە لوتکەی ڕژێمانی عێراقدا روویانداوەو هەموو ئەو کودەتا نیزامیانەی لە سالی ١٩٦٠وە لە عێراقدا بەرپا بوون، ئەنجامی ڕاستەوخۆی لاوازی سوپای عێراق بووە کە لەگەل کوردا گیرۆدەی شەڕ بووە.. بۆیە سۆڤیەت پێیان وابوو ئەگەر کارێکی وەها بکەن سەدام نەکەوێتە شەڕێکی عەسکەری تازەوە لەگەل کوردا، ئەوا ئامانجەکەیان دێتە دی و سەدامی دۆستیان لەسەر حوکم دەمێنێتەوە؛ ئەگینا ناچار دەبن لە رووی مادی و لەشکری یەوە پشتگیری و پشتیوانی یەکی زۆری بکەن دژی کورد، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەلوێستێک بوو سۆڤیەتەکان بە خۆیان پێ ی خۆشحال نەبوون و دژ بە شێوازی خۆیان بوو. هەر چەندە لە ئەنجامدا هەر ناچار بوون بەکردەوە ئەم هەلوێستە وەربگرن. ڕۆژنامەی (نویە تسویریخەتساتیونگ)ی بناف و دەنگ، بلاوی کردەوە کە گوایە لەسەر چاوەیەکی باوەر پێکراوەوە زانیویەتی کە سۆڤیەت لە کۆتایی سالی ١٩٧٣دا بارزانی دەعوت کردوە بۆ موسکۆ تا قەناعەتی پێبکەن کە هەلوێستی خۆی بگۆڕێ.

پاییزی ١٩٧٣ هات. گەلێک لەو مەسەلە گرینگانەی کە کاریگەری گەورەیان لە سەر دیاریکردنی رەوتی کاروبارەکاندا، لە سالی ئایندەدا دەبوو، پێشوەختە دیاریکران، بەلام دوا ڕیزبەندی هەمووفاکتەرەکان هێشتا تەواو نەبوو بوو. هەلبەتە دەبوایە دوا بڕیار دوابخرێ بۆ بەهاری ئاینده، چونکە زستان بەر دەرکەی بە هەموو لایەک گرتبوو. کاتێ کە لە کوردستان گەڕامەوە لە ڕۆژنامەی (Die welt) دا بلاومکردەوە کە: "لە ئازاردا شەڕ دەست پێدەکاتەوە" پڕ بەدل حەزم دەکرد پێچەوانەی ئەو پێشبینی یەی من رووبدات و دلنیا نەبووم لەوەی کە هەموو دەرگاکان داخراون لەبەردەم رەوتی کاروبارەکاندا و بە چ ئاراستەیەکی دی دا ناڕوات.

بەهار، بەرە بەرە دەهاتە پێشێ، ڕۆژاوا پتر بایەخی بە دۆزی کورد دەدا. سیاسەتوانانی ئەمریکی و ئێرانی ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ قایل بوون بە بۆچونی

کورد، کەچی ئەوان لە ساڵی رابردوا سور بوون لە سەر ئەوەی بارزانی ئەچێتە شەڕێکەوە کە خۆی لە خۆیدا دەرفەتێکی زێرین بوو بۆ کورد. لە لایەکی دی پەوە پەیوەندی و میانەی ئێران- عێراقی، کە لە بنەڕەتدا دۆستانە نەبوو. رووی کردە گرژی و ناخۆشبوون. دەزگای (ساواک)ی ئێرانی ئەوەیان کەشف کرد کە نۆکەرانی دەزگای موخابەراتی عێراق بە قاچاغ چەک و تفاق بۆ عەشایەری بلوجی نیشتەجێ ی باشوری ئێران دەنێرن؛ بلوجەکان لە شەڕدا بوون دژی رژێمی ئێران و داوای جیابوونەوەیان لە ئێران دەکرد.

هەروەها عێراق کۆمەکی زۆری بۆ شۆڕشگێرانی زەفار دەنارد کە لە لایەن یەمەنی باشورەوە پشتیوانی دەکران و، ئەم شۆڕشگێرانە دژی ئەو سوپا ئێرانی یە دەجەنگین کە (قابوس بن سعید)ی سوڵتانی عەمان داوای لە ئێران کرد بوو بینێرێ بۆ عەمان تا یارمەتی بدەن لە دامرکاندنەوەو سەرکوتکردنی شۆڕشەکە دا؛ هەروەها بەغدا بوو بە دالدە و پەناگەی کومونیستە ئێرانی یەکان و پاشماوەی لایەنگرانی بەرەی نیشتمانی ئێرانی سەردەمی سەرەک وەزیرانی پێشوو (مصدق). هەروەها دەرکەوت هەندێ مەفرەزی کۆمونیستی فیدایییانی ناو شار، کە لەلایەن حیزبی بەعسی بەغداوە لە هەردوو رووی ئایدولۆژی و نیزامی یەوە پشتیوانی دەکران، چەند کردەوەیەکیان دژی مەخفەرە ئیرانی یەکان و دامو دەزگاکانی سوپای ئەمریکی ئەنجام داوە.

دیارە ئەمە پێچەوانەی حەزو ئارەزووەکانی شا بوو. کە دەیویست ئێران بکات بە هێزێکی گەورەی ئارام و پەرەسەندوو؛ ئەمەش بەوە دەهاتە دی کە میانەی عەرەبی و ئێرانی خۆش و دۆستانە بێت. لەم لاشەوە احمد حسن البکر و صدام حسین، دژایەتی ئەم سیاسەتەیان دەکرد و هەوڵیان دەدا نەیەتە دی. شا، سەبری سواو تورە بوو، بۆیە هەستیکرد وەختی جوڵاندنی پیادە کوردییەکان هاتووەو پێویستە بە قازانجی خۆی وەگەڕیان بخات. لەو لاشەوە بارزانی چ رێگەیەکی لەبەردەم دا نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە پشت بە کارتی ئێرانی- ئەمریکی ببەستێ. ئا بەوجۆرە لە ئازاری ساڵی ١٩٧٤ دا گەورەترین شەڕی کوردی عێراق هەڵایسایەوە، شەڕێکی کە تا ئێستا بە خۆیانەوە نەدیتووە.

## ناتوانین عێراق لە بەڵێنەکانی ببەخشین

ئەو هەنگاوەی کە تەنگژەکەی تەقاندەوە لە لایەن بارزانی یەوە نەنرا، بەڵکو لە لایەن بەغداوە نرا. هەر چەندە هەردوو حیزب، سەبارەت بە چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئوتونومی و ناکوکی یە ریشەییەکان نەگەیینە رێکەوتنێکی یەکجارەکی وەکو ئەوەی ساڵی ١٩٧٠، کەچی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی بەعس یەک لایەنەو بە بریاری ژمارە ٢٤٨ یاسای ئوتونومی دەرکرد. لە هەمان کاتدا رژێم داوای لە شۆڕشی

کورد بە سەرۆکایەتی بارزانی دەکرد کە چەکە قورسەکان و رادیۆیەکەیان تەسلیم بە حکومەت بکەن.

ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، بە خۆی چوو بۆ ئێزگەی رادیۆو تەلەفزیونی بەغداو هەواڵی دا بە هەموو شێوەیەک، و بە ئامادەبوونی نوێنەرانی رۆژنامە رەسمی یەکان، ئەم بڕیارە بڵاوکردەوە، یان وەکو دەڵێن هەنجەت و بیانووان بۆ هۆیەکانی ناکامی گفتوگۆ لەگەڵ کوردا بێنێتەوە. احمد حسن البکر، کە سەرۆکی تێکۆشەریان پێدەگوت، رووی کردە جەماوەری گەلی عێراق و گوتی: "ئەی گەلی عێراقی مەزن، جەماوەری شۆڕشە سەرکەوتوەکەمان" ئەوجا لە سەری رۆیی و هەڵیدایێ: "لە پێناوی بە هێز کردنی پەیوەندییە نیشتمانی یەکان و برایەتی مێژوویی رۆڵەکانی عێراق بەعەرەب و کورد و کەمینەکانی ترەوە، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لێبڕا ئوتونومی لە کوردستاندا جێبەجێ بکات". و لە سەری رۆیی: "ئەم ئوتونومی یە تەنیا چوار چێوەیەک نییە بۆ دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی عێراق لە سنوری وولات و نیشتمانێکی یەکگرتودا، بەڵکو خۆی لە خۆیدا گۆڕانێکی ریشەیی یە لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ مەسەلەی کوردا، لە چاو ئەو سیاسەتە نادروستانەدا کە حکومەتە دکتاتۆرە کۆنەپەرستەکانی پێشوو پەیڕەویان دەکرد". ئەلبەکر، گوتارەکەی بەوە کۆتایی هێنا کە: "ئوتونومی ئاسۆیەکی بەرینتر لە بەردەم رۆڵەکانی کوردا دەکاتەوەو یارمەتییان دەدات کە بە دڵنیاییەوە بکەونە سەر رێگەی گۆڕانی دیموکراتیانە بەرەو سوسیالزم".

بەڵام کورد، لە روانگەیەکی دیبەوە دەیانڕوانی یە سەراپای مەسەلەکە. چوار ساڵ بەسەر مۆر کرنی رێکەوتننامەی ئازاردا بوری و هەڵوێستی عێراق بەرانبەر بەکورد هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی بە سەردا نەهات. بۆیە ئەو (برایەتی یە مێژووییە)ی کە ئەلبەکر لە گوتارەکەیدا ئاماژەی بۆ کرد تەنیا قسەی رووت بوو. هەرچەندە بەندی دووەمی رێکەوتنی ئازار، تاکید لەسەر ئەوە دەکات کە بێ جیاوازی و بە رێژەیەکی دادوەرانە، خەڵکی کورد و ناکورد لە وەزیفە حکومەتی و خزمەتگوزارییەکان بێنە دامەزراندن، بەڵام کورد لە ئازاری ساڵی ١٩٧٤ دا ئەم وێنەیەیان لە بەردەم خۆیاندا دەبینی:

- لەکۆی دوانزە ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش تاقە یەک کوردی تێدا نەبوو، هەرچەندە ئەم ئەنجومەنە سەرچاوەی سەرەکی دەسەڵات بوو لە عێراقدا.
- لە سەرکردایەتی سوپادا، لەوەزیری بەرگرییەوە تا دەگاتە ئاستی ئامیرفەوجەکان تەنیا دوو کورد هەبوون.
- رێژەی خوێندکارانی کورد، لە زانستگەی سوپاییدا پتر لە ٢-٥ ٪ی کۆی خوێندکارانی، زانستگەی نێوبراو نەبوو.

- رێژەی خوێندکارانی کورد لە زانکۆی فرۆکەوانیدا هیچ نەبوو.

- لە کۆی (٥٠٠) دبلوماتی عێراقی دا تەنیا یەک کورد هەبوو. لە کۆی هەشتا سەفیری عێراقی، تاقە یەک سەفیری کورد هەبوو، ئەویش سەفیری عێراق بوو لە رۆما.

- وەزارەتخانەی عێراقی کە پێکهاتبوو لە ٢٣ وەزیر، تەنیا پێنجیان کورد بوون، لەو پێنجە سیانییان وەزیری بێ وەزارەت بوون و دوانەکەی تریانش وەزارەتخانەیان گرینگ نەبوو.

- تاقە یەک کورد لە نێو هێزی ئەمن و استخباراتدا نەبوو.

- لە هەموو ئەمانەش گرینگتر ئەوە بوو کە مەسەلە بنجبڕو گرینگەکانی ئوتونومی بە ئاڵۆزی و بێ چارەسەری ریشەیی هێڵرانەوە، وەک دیاریکردنی سنوری نەتەوەیی و دانانی نەخشەی پێویست بۆ پەرەسەندنی ئابوری.

بۆیە. حیزبەکەی بارزانی پاش ٢٤ سەعات، لە دوای راگەیاندنی پلسای ئوتونومی لەلایەن حکومەتەوە، وەلامی دایەوەو پلسای نێوبراوی رەفز کردو بە پلسایەکی ناتەواور پچڕاوی لە قەڵەمدا. حکومەت، پارتی ئاگادار کردەوە کە بچێتە بەرەی نەتەوەیی پێشکەوتنخوازەوە، کە بریتی بوو لە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی ی لایەنگری سۆڤیەت: هەڵبەتە پارتی ئەم هۆشدارییەی حکومەتی رەفز کرد.

بارزانی، ئەوشتانەی کە رژێم بۆ کوردی تەرخان کرد بوو، بەسەدەقەیەکی مایەی بەزەیی زانی، بۆیە هەڵگیرسانەوەی شەڕی هەزار جار پێ چاتر بوو لەوەی کە قایبل بێ حکومەت هیواو ئاواتەکانی گەلەکەی زیندە بە چاڵ بکات.

بارزانی بۆی روونکردمەوەو گوتی: "ناچار بووین دە ساڵان شەڕ بکەین و داوا لە رۆڵەکانی گەلەکەمان بکەین، کە مەینەتی دنیای بە سەردا هات، بە هەموو قوربانییەک رازی بن تا بتوانین حکومەت ناچار بکەین، ئەم رێکەوتننامەیە مۆر بکات، بۆیە ناتوانین چاوپۆشی لە حکومەت بکەین کە لەو بەڵێن و گفتانەی پاشگەز ببێتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٠ دا پەیانی دا جێ بەجێیان بکات و بۆ خۆی ئاشتی پێ کری".

## هێرشی گەورە

هەر بارزانی بە تەنێ لەم روانگەیەوە مەسەلەکەی نەدەبینی، بەڵکو گەلێک لەو چاودێرە بێگانانەش کە چاودێری رووداوەکانی عێراقیان دەکرد، هەمان روانگەو بۆچوونی ئەویان هەبوو. میر بەدرخان لە تاراوگەوە: لە پاریسەوە دەربارەی ئەم

مەسەلەیە دەڵێ: "حکومەتی عێراق کە لە رابردوا بۆتاقە جارێکیش دوژمنایەتی خۆی دەهەق بە کورد نەشاردۆتەوە، ئەمجاریان رەفتارێکی زیرەکانەو رباکارانەی ئاشکرای بەکار هێنا، ئەوە بو یاسای بەناو ئوتونومی بۆ کوردستانی عێراق دەرکرد؛ کە لە راستیدا بریتی یە لەوەی هەموو ناوچەکانی کوردستانی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی سیاسی و عەسکەری حیزبی بەعسەوە. دیارە بەم هەڵوێستە ویستویەتی رای گشتی جیهانی هەندێ هێور بکاتەوە، پاش ئەوەی دژی هەستا دوای ئەو هەموو هێرشی قڕ کردنەی کە بە درێژایی دەیان ساڵ کردی یە سەر کورد".

هەروها پسپۆری رۆژهەڵاتی ئاڤین لە رۆژنامەی (نویەتسوریخە تسایتونک) زۆر بە دروستی گوزارشتی لەم مەسەلەیە کردووەو ئاماژەی بۆ ئەوەی کردوە کە سیاسەتی رەسمی بەغدا ئەوەیە کە "حیزبی بەعس دەیەوێ ئوتونومی یەکی رواڵەتی بە کوردان بدات و لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندی بەعسەوە ئاراستە بکرێ. ئەو ئوتونومی یەی کە لە بەیانی ئازاری ١٩٧٤ دا خرایە سەر کاغەز، رێک و دەقاو دەق وەکو ئەو ئوتونومی یەیە کە دەسەڵاتی مەرکەزی سۆڤیەتی داویەتی بە کۆمارە بەناو سەر بەخۆکانی خۆی. ئەمەش. لاسایی کردنەوەی حیزبی بەعسە بۆ حیزبی شیوعی سۆڤیەتی، واتا بەعس ببێت بە حیزبی حوکمران و تاقە سەرچاوەی دەسەڵات و هەموو کاروبارەکان".
رۆژنامەی (لوموند)ی (فەرەنسی)ش لەم بارەیەوە دەڵێ: "راگەیاندنی یاسای ئوتونومی لە یەک لایەنەوەو بێ رەچاوکردنی بەرژەوەندییە ریشەییەکانی کورد، زەمینە بۆ باروددۆخێکی خەتەر لە باکوری وولاتدا خۆشدەکات". بەڵام رۆژنامەنوسی ئەڵمانی (ئیمانویل گایس)ی زانای چالاک و چەلەنگ لە بزاڤی مافی مەدەنی گەلانی بن دەستی روو لە ئەمان، زۆر بەتوندی رەخنەی لەو رەفتارەی عێراق گرتوو گوتی ئەم ئوتونومی یە "تەنیا پەردەیەکە بۆ داپۆشینی دەست پێکردنەوەی پرۆسەیەکی نوێ ی نیزامی، کە ئەم رەفتارە پێشتر لە ڤێتنام دا بە کار هێنراو بووە هۆی هێرشێکی بەرفراوانی ئارەزایی".

حکومەت، ماوەی دوو هەفتەی بۆ بارزانی دانا تا خۆی ساغ بکاتەوەو هوشداری یەکەی حکومەت جێبەجێ بکات، بەڵام بارزانی کە هەستی کرد حکومەت ئەوی وەکو لایەنێکی گفتوگۆکە فرامۆش کردووە، ئەویش لای خۆیەوە حکومەتی ئاگادار کردەوەو ماوەی دوو هەفتەی بۆ دانا تا ئوتونومی یەک جێبەجێ بکات کە لەگەڵ نێوەڕۆکی رێکەوتننامەی ئازاردا بگونجێت. هەروەها داوای لە حکومەت کرد رێژەیەکی زۆر لە دەرامەتی ئەوتی عێراق بۆ ناوچەی ئوتونومی تەرخان بکات. لە هەمان کاتدا هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر حکومەت داواکان جێبەجێ نەکات ئەوا لە دام و دەزگاکانی کومپانیای ئەوتی کەرکوک دەدەن. لەم ماوەیەدا هەندێ سووکە پێکدادانی پەراگەندە لە ناوچە سنوورییەکانی نزیکی تورکیا وئێران روویدا. پێشمەرگە مەخفەرە

سنوری یەکانی عێراقیان گرت: چ پۆلیس و سەربازێکیان تێدا بوو گرتیانن، تا ڕێگا سنوری یەکان بۆ خۆیان دابین بکەن. رادیۆی (دەنگی کوردستان» کەوتەوەکار، بانگەوازی بۆ پێشمەرگەی کوردستان دەرکرد کە چەک هەڵگرنەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا نەفیر عام بوو.

سەرکردایەتی عسکەری (عێراق)ش چوار لەشکری نیزامی تەیارو ئامادە کرد. یەکێک لەوانە هێزی هەشت بوو کە هەلیکۆپتەری (ئیلیوت)ی فەرەنسییان بەکار دێنا؛ ئەم هێزە، هێزی مغاویرو چەتر بازان بوو. ئەم چوار لەشکرە لە لایەن دوو قوەتی هێزی زرێپۆشی سێ یەم و هێزی زرێپۆشی دەیەممەوە پشتیوانی دەکران. بەمەش ژمارەی ئەو تانکانەی بۆ شەڕی کورد تەرخان کرا بوون گەییە (٣٥٠) تانک، ئەمە جگە لە هێزەکانی فرۆکەوانی کە پتر لە (٢٠٠) فرۆکەی هەبوو، و هەر هەموو فرۆکەکانیش سۆڤیەتی بوون. هەر چەندە فرۆکەی مێکی ١٧و ١٩ لە روی سوپاییەوە کۆن بوون، بەڵام بۆ لێدانی کورد، کە چەکی فرۆکە شکێنیان نەبوو، زۆر کاریگەر بوو. سۆڤیەت جگە لەم دوو مۆدێلە فرۆکەیە، مێکی ٢١و سوخوی ٧و توپولیفی ١٦ شیان بە عێراق دا. زوو زوو پێکادان لە نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراقی دا روویدەدا. بەڵام لە سنوری پێکادانی پەراگەندە تێنەدەپەڕی. پێدەچێ باران و تەڕوتوشی کە تا مانگی چوار بەردەوام بوو، هۆیەک بووبێ بۆ هەڵنەگیرسانی شەڕ و هێرشی بەربڵاو. سەرکردایەتی هەردوو لایەن هەوڵیان دەدا ئەو سەعاتی سفرە دوا بخەن کە بە هەموو تواناپانەوە خۆیان بۆ ئامادە کرد بووە. بەغدا لەلای خۆیەوە رایگەیاند کە روداوەکانی ئەم دواییانە بە ئاماژە نازانێ بۆ هەرەسهێنانی ئەو ئاگر بەستەی کە لە ساڵی ١٩٧٠وە بەردەوامە.

هەروەها لە بەغدا پێشوازی شاندێکی دیکەی کوردی کرا کە بەسەرۆکایەتی رۆژنامەنووس (دارا تۆفیق)ی باوەڕپێکراوی بارزانی بوو. زۆر هەوڵدرا دەست بە گەڕێکی (جولە) تری گفتوگۆ بکرێتەوە، بەڵام بێهودە بوو. هەر چی یەک هەبوو گوترا. بەڵگەو دژەبەڵگە خرانە روو. دیار بوو سیاسەتی بەغدا ئەوە بوو کە دووبەرەکی بخاتە ریزەکانی کوردەوە بەوەی سووکە پەیوەندییەک لەگەڵ باڵێکی حیزبدا بهێڵێتەوە و هەوڵبدا بزاڤی رزگاریخوازی کورد بکات بە دوو کەرتەوە؛ باڵێکی رادیکالی و باڵێکی واقیعی و کەناڵەکانی راگەیاندنی عێراقی سیفەتی (کونەپەرست) و (نۆکەری ئیمپریالیزم) و (جوداخوازی) بداتە پاڵ باڵە رادیکالی یەکە.

## (کریچکو)ی وەزیری سۆڤیەتی

رژێمی عێراقی لە سەر داوای سۆڤیەت ئەم دوا هەنگاوەی نا تا شەڕ هەڵنەگیرسێتەوە.

کریچکۆی وەزیری بەرگری سۆڤیەتی، بەر لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ، بەخۆی سەردانی احمد حسن البکر و (صدام حسین )ی کرد، لە ٣/٢٣ تا ٣/٢٦ دا گفتوگۆیەکی چڕوپڕی لەگەڵ هەردوو پیاوی دەسەڵاتداری عێراقیدا کرد. بێگومان بابەتی لایەنە پراتیکی یەکانی پەیمانی دۆستایەتی عێراق- سۆڤیەت، تاقە بابەتی ئەو هەموو دیدارو موناقەشانە نەبووە. بەڵکو ئەو سەرکێشی یە چاوەڕوانکراوەی کە سەدام بەتەمابوو دەرهەق بە کوردی بکات، یەکێک بووە لە بابەتەکانی ریزی پێشەوەی خشتەی کاری ئەو دیدارەو گفتوگۆیانە.

سۆڤیەت، پێشنیاریان کرد دەست بە شەڕو هێرشی راگەیاندن بکرێ، کە کومونیستەکان دەوری بالایان بدرێتێ و لەم هێرشی راگەیاندنە، بارزانی وەکو دەرەبەگ و فیوداڵ بخرێتە بەرچاو بەو مەبەستەی لە خوردە جوتیارانی کوردی دابڕن و لە رێگەی دبلوماسییەوە لە پایەو دەسەڵاتی بدرێ نەک پەناوەبەر رێگەی عەسکەری ببرێ. کە سۆڤیەت سور بوون لەسەر ئەوەی بەعس خۆی لە شێوازی نیزامی بپوێرێ، ئەمە تەنیا لەبەر هۆی سیاسی نەبوو، بەڵکو گەلێک فاکتەرو هۆکاری نیزامی و (سایکولوژی)ش هانیدان ئەم دوا هەوڵە بدەن.. دەترسان کردە سوپاییەکان ناکام و ئەنجامی خراپیان بیێ بە تایبەتی کە تانکی مۆدیلی ( ت-٥٤) و (ت-٥٥) و فرۆکەی تازە بابەتیان بە عێراق دابوو، و بێگومان لەم شەڕەدا بۆ لێدانی خەڵکی مەدەنی باکوری عێراق بەکار دەهێنران، دیارە لەبەر پایەوسەنگی دەولی خۆیان ئەمەیان پێ خۆش نەبوو.

کرملن، لەوە دڵنیا نەبوو کە ئەو رای گشتی جیهانی یەی بە درێژایی ساڵانێکی زۆر نارەزایی سەبارەت بەرەفتاری ئەمریکی لە ڤیتنام دا دەربڕی، قوڕو قەپ و دەستەو ئەژنۆ دانیشێ و چاودێری فرۆکە سۆڤییەتییەکان بکەن و بە بەرچاوی هەموو دنیاوە گوندو شارو خەڵکی مەدەنی بۆردومان بکەن. بە تایبەتی کە خۆیان زۆر چاک ئاگایان لە دڕندەیی و رەفتاری نامسولانەی عێراقی یەکان بوو کە چۆن لە شەڕەکانی پێشوودا هێزی ئاسمانییان بۆ لێدانی خەڵکی مەدەنی بەکار هێنا بوو. هەروەها سۆڤیەت، حەزیان دەکرد هەڵوێستی کوردەکانیش لەبەر چاو بگرن و هەڵبدەن لێیان نزیک ببنەوە. کێ دەزانی، رەنگە رۆژێک لە رۆژان سۆڤیەت پێویستی بەم گەلە ببێ کە ژمارەی لە (١٥) ملیۆن کەس پتر دەبێت، وەکو چۆن ئەمە لە دوای دووەم جەنگی جیهانیدا روویدا؛ تا لە بواری جم و جۆڵی خۆیدا لە ناوچەی کەنداو بەکاریان بێنێ.

بەلام احمد حسن البکرو صدام حسین، هەموو ئامۆژگاری و پێشنیازەکانی سۆڤیەتیان پشتگوێ خست؛ چونکە نەیاندەویست دەرفەت بۆ گەلالە بوونی بزوتنەوەیەکی چەپەوانەی جەماوەری برەخسێت کە کۆنترۆڵ کردن و دامرکاندنەوەی زۆر زەحمەت تر بێت لە دامرکاندنەوەی بزوتنەوەیەکی میللی بە سەرۆکایەتی بارزانی. ئالێرەوە

سەرەتاکانی گرژی لە پەیوەندییەکانی عێراق و سۆڤیەت دا سەری هەڵداو دەستیپێکرد و ئەمەش کاری کردە سەر تێکڕای رووداوەکانی ئاینده. لە کاتێکدا بەغدا پێویستی بە سۆڤیەت بوو، وسەرچاوەی چەک و تفاقی جەنگی بەغدا هەر ئەوێندەر بوو، خۆ عێراق زۆر زۆر پێویستی بەو چەک و تفاقە دەبوو لە حاڵی هەڵگیرسانەوەی شەڕدا. سۆڤیەتش، لە لای خۆیانەوە حەزیاندەکرد یارمەتی بەعس یەکان بدەن تا شەڕەکەیان لەگەڵ کوردا یەک لایی بکەنەوە، ئەو شەڕەی کە سۆڤیەتەکان لە بنەڕەتەوە حەزیان بە هەڵگیرسانی نەدەکرد، بەڵام ئامادەش بوون کارێک بکەن کە بەزوترین کات کۆتایی پێ بێت و دەستی خۆیانی لێ بشۆن. گریچکو، دوو رۆژ بەر لە تەواو بونی ماوەی سەردانەکەی، لە بەغداوە بۆ سۆڤیەت گەڕایەوە. دەمگۆو واتەوات بڵاو بووەوە کە هۆی زووگەڕانەوەی وەزیری ناوبراو، ئەوە بووە کە لە هەڵویستی توندڕەوانەی سیاسەتوانی بەعسی بێ تاقەت بووە توڕاوە. بەهەر حاڵ، لەبەر هەر هۆیەک بوو بێ، ئیدی بۆ رۆژی دوایی احمد حسن البکر لە رادیۆو تەلەفزیونەوە رایگەیاند کە گفتوگۆ لەگەڵ کوردەکاندا هیچ ئەنجامێکی نەبووەوە ئەوجا لە سەری رۆیی کە گوایە حکومەت پابەندە بەوەی کە یەک لایەنە، ئەو یاسای ئوتونومی یەی کە رایگەیاندووە ، جێبەجێ بکات.

شاندی کوردی، بە سەرۆکایەتی دارا تۆفیق لەو ماوەیەدا گفتوگۆکەی بڕی و لە بەغداوە بەرەو چیا گەڕایەوە. هەروەها وەزیری کوردەکانی نێو وەزارەتخانەی عێراقیش دەستیان لە پۆستەکانیان هەڵگرت و بە ماڵ و منداڵەوە روویان کردە ناوچە رزگار کراوەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی و پێشمەرگەی کوردستان. پاش ئەوەی چەند هێزێکی سوپای عێراقی بەرەو سلێمانی و هەولێر کەوتنە پێشڕەوی، پارێزگاری هەردوو شارەکە پەیوەندییان بە شۆڕشگێڕانەوە کردو کوردی سەر بە حکومەتیان لە شوێن دانرا.. هەروەها سەبارەت بە وەزیرەکانیش هەمان کارکرا. یەکێک لەو وەزیرە کوردانەی کە سەر بە حکومەتی عێراق بوون، عبیدالله مصطفی بارزانی ی کوردی بارزانی سەرۆکی کورد بوو، کە زۆر لەوە پێشتر خۆی تەسلیم بە حکومەت کرد بوو؛ چونکە دووساڵان بوو لەگەڵ بابی ناکۆک بوو. ئەوە بوو حکومەتی عێراقی لە دەرێ ی وڵاتدا سوودیان لێوەرگرت و کردیان بە زوڕنای بانگەشەو، حکومەت چەندین سەفەری وڵاتانی ئەورووپای بۆ رێکخست و لەو سەفەرانەدا چالاکی یەکی زۆری راگەیاندنی دژی بابی خۆی کردو بەوە تاوانباری دەکرد کە (کۆنەپەرستە) و (فیودالی یە) و (فاشی یە). هەروەها عبیدالله، سەبارەت بە خۆیشی ئەوەی روونکردەوە کە ئەو لەگەڵ رەتی پێشکەوتوخوازی بەعسیاندایەو ئەمە تاقە رێگەیە کە خۆشگوزەرانی و پێشکەوتن بۆ کورد دابیندەکات. پاش ماوەیەکی کورت پۆستی جێگری سەر کۆمارش پڕکرایەوەو طه محی الدین لەو شوێنەدا دامەزرێنرا. ئەم پیاوە کوردە. تەمەنی پەنجا و یەک ساڵە. بەزەبری هەڵپەرستی ی خۆی توانی

سەرکەوتنێکی وەزیفی دیار بەدەستبێنێ. دوا پۆستی ئەم پیاوە، سەفیر بوو لە رۆما.

رۆژنامەی (نویەتسویریخەتسایتونگ) لەم بارەیەوە دەڵێ بەغدا "کۆمەڵێکی زۆر چکۆلە لە کوردانی خایەن لە نامێز دەگرێ". چونکە هەڵوێستی راستەقینەی تێکرای گەلی کورد بەرانبەر بە حکومەت هەڵوێستێکی روون و پێچەوانەی هەڵوێستی ئەوان بوو. لە سەرەتاکانی نیساندا پرۆسەی (ریفراندومێکی میللی بە پێیان) بە هەموو مانای ووشەی ریفراندۆم دەستیپێکرد؛ ئەویش دوای ئەوەی هەموو هیوا ئاواتەکانی کورد، کە بە گفتوگۆکەوە پەیوەست بوون، زیندە بە چاڵکران: ئەوە بوو لێشاوێکی دەستەجەمی کورد لە شاروگوندەکانی ناوچە دەشتانی یەکانەوە بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی بارزانی، دەستیپێکرد.

## ئەمجارە بە ئامانجەکانمان دەگەین

پرۆسەی پەیوەندی کردنی بە کۆمەڵ، دیاردەیەک بوو کە پێشتر وێنەی نەبووە. تەنیا لە مانگی نیساندا پتر لە (١٣٠) هەزار کورد چوونە چیا. لە مانگی مایس دا هەفتا هەزار کەسی دی پەیوەندییان کرد، من ئەوەدەمە لە ناوچە رزگارکراوەکانی ژێر دەستی بارزانی دا بووم. دەرفەتم بۆ هەڵکەوت خەڵکانێک بدیتم کە بە خۆو ماڵ و منداڵەوە لە هەر چوارنکالی عێراقەوە هاتبوون، هەندێک لە شاری کەرکوکەوە، کە حکومەتی نیزامی تێدا بەرقەرار بوو، هاتبوون. هەندێک لە هەولێرو سلێمانی یەوە هاتبوون. هەندێکی دی لە شارانی زۆربە عەرەبی وەکو موسڵ و بەسرەو تەنانەت بەغداوە هاتبوون. زۆربەی ئەو خەڵکانە بە چوار هەفتە رێ گەیی بوونە ناوچە رزگارکراوەکان، زۆرجار ناچار بوو بوون بە پێیان یان بە سواری وولاخ برۆن.

بارەگاکانی پارتی لە حاجی ئۆمەران و چۆمان جمەیان دەهات لە خەڵکی گەنجی خوێن گەرمی تینوی پێشمەرگایەتی و چاویان لە پێشمەرگە کۆنەکان دەکرد و هێندە بە تاسەوە بوون دەشیا کاری قارەمانانەی وەها ئەنجام بدەن کە شان لە شانی کاری ئەوانە بدات کە قاڵ بوو بوونەوەو شەڕو هونەرەکانی شەڕیان جەرباند بوو، هەر چەندە ئەم گەنجانە هێشتا فێری بە کار هێنانی کلاشینکوف نەبوو بوون، بەڵام رواڵەتی پەسندی جەنگاوەرییان هەبوو. هەر لەو بارەگایانەدا کۆمەڵێک سیمای گەش و پری ئەکادیمیانی تەمەن نزیکی پەنجا ساڵ دەبینران کە لە بەغداوە هاتبوون، دەستیان لە ماڵی خۆش و گوزەرانی باش هەڵگرتبوو، و ژیانی نێو کوخ و ئەشکەفتانیان هەڵبژاردبوو تەنیا لەبەر ئەوەی (بەشداری شۆڕش)ی میللەتی خۆ بکەن.

دکتور محمود عوسمانی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و پزیشکی تایبەتی بارزانی، لە دیمانەیەک دا کە لە پەناگاکەی خۆیدا لەگەڵیم سازدا، پەناگاکەی ژوورێک بوو لە زەوی دا هەڵکەنرا بوو، هەر چوار لای بە بەرد هەڵچنرابوو،

خێودتێکی بە سەردا درا بوو تا دیار نەبێ، جا دکتۆر محمود عوسمان ئەم پەناگەیەی کرد بوو بە بارەگاش. ئالەم شوێنەداو لەو دیمانەیەدا کە لەگەڵیم کرد سەرنجی بۆ لایەنێکی زۆر گرینک راکێشام. دکتور محمود پێ ی گوتم: "کە لە ساڵی ١٩٦٦دا، ناوچەیەکی بەرینی خاکی کوردستانمان رزگار کرد، ژمارەی خەڵکی ئەو ناوچەیە ملیونێک دەبو، تاقە دکتۆری هەموو ناوچەکە من بووم.. لە ساڵی ١٩٦٩ دا ژمارەی دکتۆرانی ناوچە رزگارکراوەکان لە ژمارەی پەنجەی یەک دەست تێنەدەپەڕین. باسی کەمی و نەبوونی دەرمان و کەرستەو تفاقی پزیشکی هەر مەکە. بەڵام ئەمڕۆ کە (٦٠) دکتۆری پسپۆڕمان هەن لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا. هەموو عەیادەو موشتەری یە دەوڵەمەندەکانیان لە شاردا بە جێهێشتوەو لە ژێر خێوەت و خەستەخانە مەیدانی یەکاندا دکتۆری خۆیان دەکەن".. من وەکو رۆژنامەوان دەرفەتم بۆ رەخسا هەندێ لەو دکتۆرانە بدینم و بناسم.

یەکێکیان کە پیاوێکی باڵا بەرزی میانە ساڵی قژ زەردی ئامال سور بوو، بە ئەڵمانی یەکی رەوانی باوی نێو چاخانەکانی ڤێنا قسەی دەکرد، پێ ی گوتم لە ڤێنا کاری رادیولوگی کردووە "واتە دکتۆری پسپۆڕ لە ئامێری تیشک"، لە بواری کاری خۆیدا دیار بوو، و لە سەری رۆیی: "بیرم لەوە کردەوە کە ئەم قۆناغە، شەڕی توند بە خۆوە دەبینێ و ژمارەی بریندارا‌ن زۆر دەبن؛ بە هۆی تەبیعەتی شەڕی شاخەوە کە خەڵکی زۆر، پارچەیان بەردەکەوێ. ئیدی مەحاڵە ژیانی ئەو جۆرە بریندارانە یان دەست نیشانکردنی پێکرانەکانیان بە بێ ئامێری ئەشعەو تیشک رزگار بکرێ و ئەنجامبدرێ. بۆیە لێبڕام پەیوەندی بە شۆڕشەوە بکەم". بەڵام تاقە گرفتی ئەو پیاوە ئەوە بوو کە بە درێژایی ماوەی شەڕ تاقە ئامێرێکی تیشکی بە دەستنەکەوت.

جگە لە دکتۆران، ١٠٠ ئەوقات و ٣٠٠ ئەندازیارو ٦٠٠ مامۆستای ئامادەیی و ٥ هەزار مامۆستای سەرەتایی و هەزار فەرمانبەرو چوار هەزار سەرباز و پولیسی کوردی عێراقی پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو. هەروەها هەموو خوێندکارانی زانستگەی سلێمانی، کە ساڵێ پێشتر دامەزرابوو، لەگەڵ ستافی مامۆستایانی زانستگەی نێوبراودا کە ژمارەیان (٤٥) مامۆستای زانکو بوو، هەر هەموو بە شێوەیەکی رێک و پێک پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کرد بوو، ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی کورد لە هەندەران و یان لە شوێنە ناکوردییەکانەوە گەڕانەوە بۆ ناوچە رزگار کراوەکان. چەندین دکتۆرم بینی کە کارەکانیان لە خەستەخانەکانی ئەڵمانیادا بە جێ هێشتبوو. هەروەها ئەندازیارێکم بینی تاقیکردنەوەی کۆتایی لە ئەمستردام بەجێ هێشتبوو: لە نێو ئەوانەدا کە ناسیمن، پسپۆری قانونی دەستوری، دکتۆر شەفیق قەزاز بوو. ئەم لە زانستگەی هارڤارددا کورسی مامۆستایەتی هەبوو، و سەرۆکی بەش بوو، کە چی وازی لەو هەموو ئازونیعمەتە هێنابوو، و هاتبووەوە تا لێرە و لەگەڵ بارزانی دا کار بکات. بە پیاوێکی خوێندەوارو رۆشنبیرم هاتە بەرچاو، بەهرەیەکی تایبەتی هەبوو لە

زمانپاراوی و قسه کردندا.

هەر هەموو ئەوانە پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کرد بوو، و لێبڕابوون بە کردەوە بەشداری دۆزی کورد بکەن. مرۆڤ وای هەست دەکردو دەبینی کە کوردی عێراق بە هەموو توێژ و چینەکانیانەوە بە جۆرێ لە سایەی یەک ئالادا یەکیانگرتووە، کە پێشتر ئەمەیان بە خۆوە نەبینیوە.. (لورد کلبراکن)ی رۆژنامەوانی ئیرلەندی، لە لێکۆڵینەوەیەکی رۆژنامەوانی تایبەت بە هەڵسەنگاندن و توێژینەوەی ئەم راپەڕینە مەزنە، دەڵێ: "پێدەچێت کورد بە شێوەیەکی گشتی گەیبێتە قەناعەتی تەواو کە شۆڕش لە هەموو کاتێکی پێشتر بە هێزتر بوەو پێویستی بە خزمەتی هەموو کەسێک هەیە لە هەر بوارێک دا کار بکات، و دەتوانن لە قۆناغی شەڕدا سەر بکەون و خاکی خۆیان رزگار بکەن".

هەروەها دکتۆر محمود عوسمان لە کۆتاییدا گوتی: "گۆڕانێکی ریشەیی ئاشکرا روویدا. تەنانەت ئێمە لە سەرکردایەتی دا ئەم کاردانەوە ئیجابی یەی رۆڵەکانی گەلەکەمان پێ شتێکی کوتوپڕ بوو.. ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە و جەنگاوەری بێ چەکمان هەیە و چەکمان نی یە پیاندەینێ. ئەگەر عێراقی یەکان شەڕ بکەنەوە، ئەمجارە دەتوانین سەرکەوتنی چاوەڕوانکراو بە دەست بێنین".

# فەسڵی دوانزەیەم

*"گەورەترین هەڵەی ژیانم ئەوە بوو کە باوەڕی تەواوم بە ئەمریکا کرد"*

**هنری کیسنجر دەستبەرداری کورد دەبێت**

(صفاء شلال)ی ئەقیبی فڕۆکەوانی عێراقی، بەختی یار نەبوو کاتێک بەیانی ڕۆژی ١٩٧٤/٨/٢٣ بە فڕۆکەی میگی (٢) لە بنکەی هەوایی موسڵەوە هەستا، تا ئەو ئەرکە جێ بەجێ بکات کە بۆی دیاری کرا بوو؛ کە بریتی بوو لە بوردومانی نیشانە جێگیرو جوڵاوەکان بە هەموو جۆرێکیانەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەیکردە دەست ئەپاراستن و بۆردومانکرنی گوندو سەنگەرو پەناگەی خەڵکی مەدەنی و سەنگەرەکانی هێزی لەشکری کوردستان.

لە کاتێکدا زۆر بەنزمی بەسەر دۆڵی باڵەکدا دەسوڕایەوە، تا ئوتومبیل و کامیونەکانی سەر جادەی هاملیون، کە لە ڕووی لوجستی یەوە ڕەگی ژیانی کورد بوو، بەر بۆمباو موشەکان بدات، ڕێک لەو کاتەدا بەر دەسترێژی چەکی زەمینی کورد دراو، ئەوە بوو هاوسەنگی فڕۆکەکەی تێک چوو، مەکینەکەی بەرکەوت، ئەمەش وایکرد کە ئەتوانێ لەو ئاستە نزمەی خۆی بەرزتر بپێتەوە، بۆیە صفاء شلال، بە ناچاری کورسی ئەجاتی بەکار هێناو خۆی لە فڕۆکەکەیەوە هەڵدا. بەڵام لە لایەکی دی یەوە بەختەوەر بوو. چونکە بە پێ ی ئاماری کوردان، فڕۆکەکەی ئەو سی وشەشەمین فڕۆکە بوو کە لە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شەڕەوە خرابوە خوارێ. صفاء شلال،تاقە فڕۆکەوانێک بوو لە کۆی ئەو هەموو فڕۆکەوانە، بەزیندوییەتی مایەوەو دەستگیر کرا. هەندێ شوان دۆزیبویانەوەو ناچاریان کردبوو خۆی تەسلیم بکات، هەرچەندە تاقە چەکی دەستی شوانەکان تەنیا بەرد بوو؛ پاشان تەسلیمی هێزی پێشمەرگەیان کرد بوو. فڕۆکەکەی صفاء شلال، لە دوری پەنجا مەتری پردێکی سەر چۆمی باڵەک کەوتە خوارەوەو سوتا. دوای چەند سەعاتێک لە کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی، بەرێکەوت من بە وێنەدرا ڕەت بووم. هێشتا دوکەڵ لە لاشەی فڕۆکەکە هەڵدەستا. دوو پێشمەرگە ئێشکیان دەگرت تا نەیەڵن ئەو خەڵکەی لەوێندەر خڕ بوو بوونەوە، لێ ی نزیک ببنەوەو پارچەکانی بەرن.

من نوسراوی تایبەتی بارەگای بارزانیم پێ بوو. نووسراوەکەم بە جامی لاندرۆڤەرەکەوە چەسپاند بوو؛ گاردێک و تەرجومانێکم لەگەڵ بوون، بە هۆی ئەم نوسراوەوە ڕێگەیان داین کە بچینە دیار فڕۆکەکە.

پێشمەرگەیەک، پارچەیەکی بچوکی لە باڵی فڕۆکەکە بڕی یەوەو دایێ، وەکو بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی دروستی خستنە خوارەوەی فڕۆکەکە و وەکو دیاری یەکیش

که لەگەڵ خۆمدا بۆ ئەڵمانیای بەرمەوە. ئەو پارچەیەی درا بە من، قەپاغی مەخزەنی فیشەکی یەکێک لە رەشاشەکانی فرۆکەکە بوو. زۆر بە ئاسانی پیتە روسی یەکانی سەری دەخوێنرانەوە. تەرجومانەکە، کە پارچە فرۆکەکەی دامێ، بە سوعبەت و شۆخی یەوە گوتی: "لەگەڵ خۆتدا بیبەوە بۆ بۆن و لەوێ بیدەوە بە سەفارەتخانەی سۆڤیەتی تا بینێرنەوە بۆ ئەو شوێنەی فرۆکەکەی لێوە هاتووە". من، ئەو کارەم نەکرد، بەلام وام پێ چاکتر بوو ئەم پارچەیە لە مالی خۆمدا هەڵبگرم، وەکو بیرەوەری یەکی ئەم رووداوانە دوای دوو هەفتە ئیزن نامەم وەرگرت کە دیمانەیەک لەگەڵ یارۆی فرۆکەوانی یەخسیردا بکەم. صفاء شلال، بە تەنیاو لە خانویەکی بەردین دا دانرا بوو. زۆر بە توندی ئێشکیان دەگرت. چووم بۆ ئەوێ، کە ئیزن نامەکەم پیشانی مەسولی زیندانەکە دا، قابیل نەبوو، پێ ی راگەیاندین کە چ کەسێک بۆی نییە فرۆکەوانەکە بدینێ. بەلام من سور بووم لەسەر دیتنی، ئیدی پێشمەرگەیەکی تایبەتییان بۆ بارەگای گشتی نارد. پاش سێ سەعاتان گەرایەوەو وەلامی هێنایەوە ئەوجا مەسولی نۆبەدارەکان رێ ی دام فرۆکەوانە یەخسیرەکە بدینم. کە فرۆکەوانەکە زانی من ئەڵمانیم، بەلەز لەسەر جێگاکەی هەستا و بەرەو پیرم هات، هیواو هێڤی لە چاوانی یەوە پرشنگی دەداو گوتی: "راستە تۆ لە ئەڵمانیاوە هاتووی؟ لە ئەڵمانیای دیموکراتی یەوە؟" کەتێم گەیاند بەڵێ من لە ئەڵمانیای دیموکراتی یەوە، لە خودی (بون)ەوە هاتووم، جارێکی دی برۆکانی وێک هێنانەیەوەو گومان و دوو دلی کەوتە سەر سیمای و شانەکانی هەلتەکاندن و پێ ی راگەیاندم کە ئامادە نی یە قسەم لەگەل بکات "چونکە بۆن، مەخابن لە بەرەکەی تردایە" لە بەرەی "ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستیدا"یە. ماوەیەکی زۆر بوری، ئەوجا کەمێ هێوری و زمانی کرایەوە، کەچی لەبەر هۆیەکی زۆر ئاشکرا، خۆی لەوە دوور دەگرت، کە لەگەلم دا بکەوێتە هەر جۆرە موناقەشەیەکی سیاسی یەوە.

## ئایا کوردستان بوو بە مەیدانی مەشقی نیزامی سۆڤیەت؟!

کابرای ئەفسەری یەخسیری عێراقی، لە رۆژانی هەوەلی پاش کەوتنی فرۆکەکەی، نەیدەتوانی خۆی لەبلبی کلوباری سیاسی بیوێرێ. رادیۆی دەنگی کوردستان، هەر ئەو رۆژە، هەوالی خستنی فرۆکەکەو یەخسیر کردنی فرۆکەوانەکەی وەکو هەوالێکی سەرەکی بە هەر سێ زمانی کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی بلاو کردەوە. هەلبەتە رادیۆکە ئاماژەی بۆ ئەوە نەکرد کە فرۆکەوانی کلۆل، پاش ئەوەی یەخسیرکرا، بۆ ماوەی چەند رۆژێکی دوا بە دوای یەک خرایە بەردەم لێکۆلینەوەی چڕوپڕەوە لە لایەن دەزگای (پاراستن )ـەوەو دکتۆرێکیش لەم لێکۆلینەوەیەدا بەشداری کردو چەند شرینقەیەکی لە فرۆکەوانەکەدا تا زمانی بکرێتەوە؛ چونکە لێبڕا بوو چ قسەیەک نەکات.

ئەم یەخسیرە بۆ کورد، هەر بەڵگەی زندوی ئەو حەقیقەتە نەبوو کە فڕۆکە جەنگی یەکانی عێراق خەڵکی مەدەنی کورد و ژن منداڵیان لە گوند و شاران بۆردومان دەکرد. بەڵکو ئیفادەکانی ناوەرۆکێکی سیاسی گرینگی ئاشکرا دەکرد. لە درێژەی ئیفادەکانیدا، راستی و دروستی ئەو زانیاریانە، هاتنە سەلماندن کە پیاوانی پاراستن گەیاندبویانە سەرکردایەتی خۆیان و بریتی بوون لەوەی کە هێرشە ئاسمانی یەکانی عێراق بۆ سەر کوردستان تەنیا لەلایەن فڕۆکەوانانی عێراقی یەوە ئەنجام نەدەدران؛ بەڵکو لە ژێر دەستی کۆمەڵێک راوێژکاری سۆڤیەتیدا کاریان دەکرد، کە پرۆسە ئاسمانی یەکانی عێراقیان ئاراستە دەکرد؛ تەنانەت هەندێ لەو راوێژکارە سۆڤیەتیانە بە خۆیان بەشداری هاژۆتن و بە کار هێنانی فڕۆکەکانیان دەکرد. بەتایبەتی هی هەندێ لە فڕۆکەی تۆپولیفی (٢٢) کە تازەترین فڕۆکەی بۆمبا هاوێژی سۆڤیەتی بوو، و ڕۆژانە لە بەرزایی ١١-١٨ هەزار مەتری یەوە، ئاگرو ئاسنی بۆمبایان بە سەر گوندانی کوردا هەڵدەرشت. ئەم فڕۆکانە تازە بۆ عێراق نێردرا بوون و لە چوار چێوەی پەیمانی دۆستایەتی درێژخایەنی دوولایەنەدا نێردرا بوون.. هەڵبەتە نەدەکرا هەروا زوو بەزوو و لەو ماوە کەمەدا فڕۆکەوان و تاقمی عێراقییان بۆ پێ بگەیەنرێ و مەشق دابدرێن، بۆیە راوێژکارە سۆڤیەتی یەکان، کە بە قسەی شەلال (٣٠٠) کەس بوون، بە شێوەیەکی کاتی، خۆیان کەوتنە بەکار هێنانی ئەم فڕۆکە بۆمبا هاوێژانە.

لەوتو وێژێک دا کە لەگەڵ بەرپرسی دەزگای (پاراستن)دا، مەسعود بارزانی، سازم دا، بۆی باسکردم کە قسەی فڕۆکەوانەکانیان وەرگرتوە و بەروسی قسەیان کردوە. پاشان چاودێرانی بێ لایەنیش دروستی ئەم حەقیقەتەیان سەلماند. بۆ وێنە رۆژنامەی هیرالدتریبیون، لە ئوکتوبەری ١٩٧٤دا، لە زمانی فەرمانبەرانی ئەمریکی یەوە بلاوی کردەوە، کە دەزگا دوور مەداکانی ئینساتی ئەمریکی، کە لە زۆر شوێنێدا دانرا بوون، یەکێک لەو شوێنانە چیای ئارارات بوو، توانیویانە هەندێ گفتوگۆ وەربگرن کە گومانی تێدا نی یە بە زمانی روسی بوەو فڕۆکەوانانی سۆڤیەتی فڕۆکەی عێراقییان هاژۆتوەو گوندەکانی کوردستانیان بۆردومان کردووە. هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد کە ئەم بەشداری یە پراتیکی یەی سۆڤیەتی لە رووی ئیزامی یەوە بایەخی خۆی هەیە. چاودێرانی ئەمریکی پێیان وایە سێ هۆ لە پشت ئەم هەڵوێستەی سۆڤیەتەوە هەیە: وەختێ ئەم فڕۆکە پێشکەوتوانە لە مەیدانی مەشقدا بەکاردێن، بۆ کۆکردنەوەی ئەزمونی زانستی پترە، بێ ئەوەی چ خەتەرێک لە گۆرێ بێ، کە لەلایەن کوردەکانەوە بخرێنە خوارەوە، چونکە چەکی وەهایان نەبوو دەرەقەتی ئەو فڕۆکانە بێت. حەزیش دەکەن پشتیوانی خۆیان بۆ عێراق بسەلمێنن. هەروەها سۆڤیەت ئەم هەڵوێستەی بە دەرفەت دەزانی بۆ بە هێزکردنی دەسەلاتی خۆی لە عێراقدا، کە سالانە بایی ٨٩ ملیار دۆلار نەوت بەرهەم دێنێ، ئەمە جگە لەوەی ووڵاتێکی دەوڵەمەندە و دەتوانێ پارەی چەکە پێشکەوتوەکانی سۆڤیەت بدات".

## یازده رۆژ شەڕ، گرتنی سەد کیلۆمەتر

هێزی عێراقی، بە بەردەوامی لە سۆڤیەتەوە چەکی بۆ دەهات و لەرووی چەندێتی و چۆنیەتی چەکەوە زۆر بالا دەست بوو. راوێژکاران و پسپۆڕانی نیزامی سۆڤیەت راستەوخۆ بەشداری کردە سوپاییەکانیان دەکرد، کەچی بەم بالادەستی یەشەوە، سەرکەوتنی هێزەکانی بەعس تا سەرەتای مانگی ئاب، لە چاو خۆیدا زۆر کەمبوو. شەڕو پێکدادانەکانی سەرەتای مانگی نیسان هێندە توند بوو کە سالانی ۱۹٦٤/ ۱۹٦٥ش کە قۆناغی شەڕی گەورە بوو، شەڕی وایان بە خۆوە نەبینی بوو. کورد، بەحوکمی ئەزموونی زۆرو زەبەندیان لە مەیدانی شەڕدا، هەر لە رۆژانی یەکەمی دەستپێکردنەوەی شەڕەوە، سنورەکانی مەرزیی ئێران و تورکیایان بۆ خۆ دابین کرد. هەروەها هێزەکانی سوپای عێراقی لە ناوچە شاخاوی یە سەختەکاندا گەمارۆدران.. یەک لیوای سوپای عێراقی لە شاری زاخۆی باکوری موسلی نزیکی تخوبی سوریا - تورکیا- عێراق کەوتە گەمارۆوە. هەروەها چەندین هێزی عێراقی بە درێژایی ناوچەکانی زاخۆ بۆ هەڵەبجە کەوتنە گەمارۆوە؛ واتە لەو پەڕی باکوری رۆژهەلاتەوە بۆ ئەو پەڕی باشوری رۆژهەلات؛ ئەمە ناوچەیەک بوو درێژییەکەی ۳٥۰ کیلۆ مەتر بوو، لە هەموو ئەم ناوچانەدا کورد بالا دەست بوون.. هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە شێوەیەکی کاتی یان هەمیشەیی دەستیان بە بێەڕێگەو جادەکاندا گرتبوو، و دەیانتوانی جم وجوڵی سەر بازانی ئەو سەربازخانە و سەنگەرە عێراقیانە کۆنترۆل بکەن کە لە نزیکی ئەو جادە و رێگاوبانە لۆجستیانە بوون؛ زۆرجار دژمن نەیدەتوانی سەر لە سەنگەرەکانی دەربێنێ. بۆیە سوپای بەعسییەکان دەبوایە بە هەوڵو تەقەلاو مەسروفێکی یەکجار زۆر ئەوجا نابلۆقەی سەر ئەو هێزانەیان لابەرن و لە باری لوجستی یەوە فریایان بکەون، تەنانەت دەبوایە بەفرۆکە لە ئاسمانەوە خواردن و ئازوقەش بۆ هەندێ لەو هێزە گەمارۆ دراوانە بەر بدرێتەوە.

لەکۆتایی نیسان و سەرەتایی مانگی مایس دا، حکومەتی عێراق ویستی خۆی لە کردەیەکی سوپایی دا تاقی بکاتەوە، ئەوە بوو سەرکردایەتی گشتی لە بەغدا دا بریاری دا، هەوڵبدات گەمارۆی سەر بازخانەی زاخۆ بشکێنێ و سەربازە گەمارۆدراوەکان کە هەزار سەربازێک دەبوون، رزگار بکات و سنووری نێوان عێراق و تورکیا بکاتەوە.. لەیەک کات دا چوار فەوجی پیادە دابەزێنرایە نێو سەربازخانە گەمارۆدراوەکە تا ورەی سەربازەکانی ناو سەربازخانەکە بەرز بکەنەوە، قوەتێکی دوو فەوجییش لە هێزی دەی زرێپۆش کەوتنە شەرێکی قورسەوە لەگەل هێزی پێشمەرگە دا لە دهۆکەوە تا زاخۆ.. ئەوە بوو هێزی پێشمەرگە پاش بەرەڤانییەکی کەم پاشەکشەی کرد؛ چونکە نە ناوچەکە بەکەڵکی شەڕ دەهات و نە چەکی قورس و نە چەکی دەبابەشکێنانش هەبوو. ئەمە جگە لەوەی کە قوەتە عێراقی یەکە بە تانکی

ت/٦٢و ت/٥٥ی پیشکەوتووی سۆڤیەتی هێرشی دەکرد. (ئیدریس بارزانی) بەرپرسی فەرماندیی لەشکری کوردستان، بۆی باسکردم کە ئەم بڕیاری پاشەکشەیە "هەم جێ ی داخ بوو، هەم دروست ش بوو".

بەلام شاری ئاکرێ ی نەوەت کیلۆمەتری باکوری رۆژهەلاتی موسل، تا مانگی مایس هێشتا لە لایەن کوردەوە گەمارۆ درابوو.. هەلبەتە هێزەکانی عێراق زۆر بە زەحمەت هاتوچۆو پەیوەندی نێوان شارانی سلێمانی و هەولێرو کەرکوکیان دابین دەکرد. سوپای عێراق هەر لە مانگی ئازاردا کەرکوکی گرت. خۆ ئەگەر سوپای عێراقی پێویستایە هاتوچۆی نێوان ئەوشارانە دابین بکات، ئەمەی بەبێ خەسارەتی زۆری گیانی و مالی بۆ نەدەهاتەدی.. قافلەیەکی زرێپۆشی عێراقی بە ١١ رۆژ شەڕی خوێناوی ئەوجا توانی جادەی نێوان سلێمانی و کرکوک، کە سەد کیلۆمەتر کەمترە، بگرێ و بکاتەوە.

زەرەرو زیانی هەردووک لا، لە هەفتەکانی هەوەلی شەڕدا زۆر زۆر بوو. بەغدا لە پاش تەواو بوونی شەڕ دانی بەوەدانا کە تا ئاخیری مانگی مایس پتر لە (١٠٧٠) کوژراو و زیاتر لە (٧) هەزار بریندار هەبووە.

هەروەها کوردیش دانیان بەوە دانا کە تا سەرەتای مانگی مایس (٣٣٧) کوژراو و (٤٨٥) برینداریان هەبووە، دیارە ئەمە بۆ کورد رێژەیەکی زۆرە لە چاو ئەزموونی شەڕی چیایان و شێوازی شەڕی گەرۆکیان کە هەمیشە کردویەتی کارێک کە خەسارەتیان کەم بێت.

## شەڕ لە یازدە قۆلەوە لەیەک کاتدا

کورد، بەرە بەرە بۆیان دەرکەوت کە هێزەکانی عێراق لە چاو سالاندا زۆرلێهاتوانە شەڕ دەکەن. تەنانەت ئەفسەران و سەربازانی عێراقی لە ئاستێکی هێندە بەرزدا دەجەنگێن کە بە ئاشکرا جێ دەستی پسپۆڕانی روسی، تەنانەت لە ئامادە کرنی هێزی زەمینی عێراقیشدا، دەبینرا. پێشمەرگەیەکی ئەندازیار بۆی باسکردم کە "هێزەکانی عێراق تا سالی ١٩٧٠، وێرای ئەزموونی دەسال شەڕیش، نەیاندەتوانی بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ ١٢ تۆپ پێکەوە بتەقێنن. کە چی ئێستا کێ هاوئاهەنگی یەکی تەواو لە نێوان هێزی پیادە و پشتیوانی هێزی ئاسمانی و تانک و تۆپخانەدا هەیە".

کورد، بۆ یەکەمجار کاریگەری پسپۆڕو راوێژکارانی سۆڤیەتیان لە شەڕی یازدە رۆژەی رێگای کەرکوک-سلیمانی دا بەدی کرد: تۆپەکان بە جۆرێ نیشانەکانیان دەپێکا مایەی سەرسامی بوو.. هەروەها ئەو هاوئاهەنگی یەی کە لە نێوان هێزی زرێپۆش و هێزی چەتر بازاندا، کە لە نزیکی زاخۆ دابەزین، هەر هەمووی بە هۆی پسپۆڕانی روسی یەوە ئەنجامدران.

لە یەکێک لە دیانە زۆرەکاندا لەگەڵ (ادریس بارزانی)دا، رای خۆی لەمەڕ شێوازی تازەی جەنگینی هێزەکانی عێراق، بۆ باسکردم و گوتی: "ئێمە هەستدەکەین هێزەکانی عێراق، تاکتیکی تازە لە شەڕەکانیاندا بەکار دێنن، لەبری هێرش و پەلاماری شپرزە، کە جاران هەمیشە شپرزە بوون، ئەمجارەیان لە شوێن و سەنگەری زۆر هەڵبژاردەو و بە پشتیوانی باڵا دەستی یەکی ئاشکرای مادی و بەشەرییەوە هیرش دێنن. پێم وایە ئەم تاکتیکە هی ئەڵمانەکان بوەو سۆڤیەتەکان لەکاتی دووەم جەنگی جیهانی دا، لەوانیان وەرگرتووە، کە بریتی یە لەوەی یەک بە دوو لەگەڵ هێزی دوژمندا بکرێ نەک سووکە شەڕو پێکادان و دورە تەقەی لەگەڵ بکرێ، هەروەها پراتیکی گشتی نەخشەکە جۆرە زیرەکی یەکی تێدایە کە پێشتر لە عێراقی یەکانمان نەبینی بوو. هاوئاهەنگی تەواو لە نێوان چەکە جیاوازەکاندا کە کێشەمان بۆ دروستدەکات، چونکە بە کار هێنانی تەواوی هێزی زرێپوش و تۆپخانە و فرۆکەی جەنگی و هێزی پیادەی بە هەلیکۆپتەر گوێزراوە، هێندەی دی باڵا دەستی عێراقی یەکان لە رووی چەکەوە پتر دەکات. قەناعەتمان وایە کە پسپۆڕانی سۆڤیەتی لە پشت ئەم تاکتیکە تازەیەی جەنگینی عێراقی یەکانەوەن و بێگومان ئەو پسپۆڕانەش لە مەیدانی کاری خۆیاندا کارامەو لێهاتوون".

لەگەڵ ئەمەشدا پێشڕەوی هێزەکانی عێراق خاو بوو، چونکە سروشتی جوگرافی تایبەتی کوردستان، رێ ی ئەوە نادات سوپایەکی نیزامی هاوچەرخ هەرچی یەک لە مەیدانی مەشقدا فێر بوو بێ بە شێوەی پراتیکی بەکار بێنێ کە بۆی دانراوە. ئیدی لە ئاخرو ئۆخری مانگی تەموزدا بۆ هەموان روون بوەوە کە سەرۆکی عێراقی زیاد لە پێویست گەشبین بووە، کاتێ لە رۆژی ٣/١٣داو پاش ئەو سەرکەوتنە سەرەتایيانەی کە هێزەکانی بە دەستیان هێنا، رایگەیاند کە "لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا خاکی پیرۆزی عێراق لە پیسی چەتەکانی بارزانی پاک دەکرێتەوە". ئەوە بوو ئەلبەکر دواتریش ماوەیەکی تری بۆ لەنێو بردنی (چەتەو رێگران) دانا، هەوەڵجار مانگی ئەیلولی دیاریکردو پاشان کردی بە مانگی کانونی یەکەم. بەڵام ئەو مانگانە بورین، بێ ئەوەی قسەکانی ئەلبەکر بێنەدی.

مانگی تەموز شەڕێکی زۆر قورسی بە خۆوە بینی. لە یازدە قوڵەوە شەڕ گەرم بوو. هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەو شەڕگانەیان کرد بوو بە دیواری عاسی لە بەردەم هێرشی عێراقی یەکاندا.. شەڕگەکان ئەمانە بوون: دەشتی هەولێر. زمناکۆی دەورووبەری سلێمانی. ناوچەی خانەقین، (باواجی)ی نزیکی کەرکوک. چیای کۆیە. شارانی دهۆک، شێخان و ئاکرێ ی باکوری رۆژهەڵاتی موسڵ. ناوچەی (حەریر) و (باڵەک) لە دۆڵی (گەلی عەلی بەگ) کە لە هەمان شوێنداو لە ساڵی ١٩٦٦ دا یەک لیوای سوپای عێراقی قرکرا. نزیکی قەرەداغ، سەفین نزیکی رەواندوز،

ناوچەکانی دەوروبەری (بەنداوی دوکان). هەروەها کورد تاکو ئەو دەمانەش زۆر شارو شارۆچکەی وەکو قەلادزە، هەڵەبجە، پنجوین، رانیە، رەواندز و شاری ئامێدی یان لە ژێر دەست دا بوو: ئەوئامێدی یەی بە هۆی (کارل مای)یەوە کە لە رۆمانەکەیدا ئاماژەی بۆ کرد بوو، شۆرەتی پەیدا کرد بوو. تەنیا شارە گەورەکان بە دەست حکومەتەوە بوون. لەلایەکی دی یەوە شەڕگەکان بە جۆرێ چوو بوونە ناو یەکترەوە کە بە ئاسانی هێڵی شەڕگەکان دیاری نەدەکرا. هەڵبەتە ئەو نەخشە بەیانیانەی رۆژنامە ئەوروپی یەکان لەگەڵ لێکۆڵینەوە رۆژنامەوانی یەکاندا بلاویان دەکردەوە، سەنگەرو شوێنە گیراوەکانیان لەلایەن ئەم لایەن یان ئەو لایەنەوە دیاریدەکرد، ئەو دەست نیشانکردنانە بە پێ ی پێوانە ئلساییە سوپاییەکان زۆر واقیعی نەبوون. دەست نیشانێک بوو بە دەگمەن لەگەڵ دابەش بوونی هێزەکانی ئەم شەڕە سەیرەدا دەگونجاو دەهاتەوە. بۆ وێنە جاری وا دەبوو جادەیەک بە رۆژ بەدەستی هێزی حکومەتی یەوە دەبوو، بەلام بە شەوان بە دەست پێشمەرگەوە دەبوو. یان هێزەکانی حکومەت لەوەرزێک دا رێگەیەکیان بۆ گواستنەوەی سەربازو تانک و پێداویستی لوجستی یەکان بە کار دێناو بایەخی هەبوو، کە چی هەر هەمان رێگە، لە کاتێکی دیداو لە وەرزی باراندا یان لە زستاندا خۆ بەخۆ لەکەلک دەکەوت و ئەو بایەخەی نەدەما.. تەنانەت شارێک کە بارەگای سەربازی عێراقی تێدا دەبوو، و بە رواڵەت لە ژێر دەسەلاتی حکومەتدا دەبوو، بەلام لە هەموو رووەکانی ترەوە لە ژێر دەسەلاتی هێزەکانی کوردا دەبوو.

سەیتەرەی هەمیشەیی یان کاتی بە سەر شوێنانی دیاریکراودا بەلای پێشمەرگەوە زۆر گرینگ و مەبەست نەبوو. بەڵکو ئەوەیان مەبەست بوو ئەو رێگاوبانە ئەگرینگ و لوجستییانەی کە هێزەکانی عێراقی پێکەوە دەبەست، یان ئەو رێگایانەی کە عێراقی یەکان تازە گرتبوویان، بە بەردەوامی لە بوردی تۆپخانەی کوردی دا بوایە.. کوردەکان، بە بەردەوامی ئەو رێگایانەیان تۆپباران دەکرد تا رێگەی هاتوچۆ لە هێزەکانی عێراق ببرن و نەیەڵن ئازوقەو پێداویستی سوپاییان بگاتێ و زیانی تازە لە دوژمن بدەن. کوردەکان، بە پێ ی ئامارێکی نیزامی، لە نیوەی دووەمی ساڵی ۱۹۷٤دا توانیان دەست بە سەر ٤٣ ئوتومبیلی حکومەتدا بگرن یان تێکیان بشکێنن و بەمەش کۆی زیانەکانی حکومەت لە سەرەتای شەرەوە، لە بەهاری ۱۹۷٤دا، گەیبە (۳۰۰) ئوتومبیل. لەو ئامارەوە بایەخی ئەم شەڕی نیستنزافە بەردەوامەمان بۆ دەردەکەوێ و چۆن سەرچاوەیەکی گرینگش بووە بۆ پێداویستی یە لوجستی یەکانی هێزی لەشکری کوردستان.. هەر لەو ئامارەدا خانەیەکی تایبەتی لەم رووەوە دیاری کراوە بە ناوی (دەستکەوتەکانمان).. دیارە تەنیا ئاماژە بۆ دەستکەوتە جەنگی یەکانی کورد، کە لە هێزەکانی عێراقیان گرتبوو، وەکو تفەنگ و رەشاش و تەقەمەنی و تۆپی هاوەن و موشەکی دژە تانک نەکرا بوو، بەڵکو برێکی زۆر لە ئازوقە

و کەلو پەلی دی بە هەمان بایەخی دستکەوتە جەنگی یەکانەوە، لە خانەی نێو براودا تۆمار کرا بوون، لەوانە (٤٠٠) تەنەکە رۆنی چێشت، ٢٥٠ دوو سەدو پەنجا کارتۆن سابون، هەزار پەتۆ و سەد بێڵ.

## هەڵبەتە سفرەکە ئێمەین

هەرچەندە چەکی دژە فرۆکەی کوردان، لە چاو هێزی ئاسمانی عێراقی دا، چ نەبوو، کەچی هێزی پێشمەرگە لە هەردوو مانگی تەموزو ئاب دا، سەرکەوتنی یەکجار سەیریان بە سەر هێزی ئاسمانی عێراقیدا بە دستهێنا؛ ئەگەر چی لە چەند توپێکی فرۆکە شکێن و چەند رەشاشێکی کەم زیاتر چیدییان نەبوو. یەکێک لە فەرماندە کورددکانی شەرگەی رەواندوز، لە وەڵامی پرسیارێکی مندا دەربارەی هاوسەنگی هێزی هەردووک لا لە نێوچەکەدا، بە تەوسەوە گوتی: "باڵا دستی هێزی ئاسمانی عێراقی؟ واقیعی پراتیکی شەرگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم جۆرە پرسیارە بێ مانا بێنە بەرچاو؛ لەبەر هیچ نا تەنیا لەبەر ئەوەی ناشێت و ناکرێ هێزی ئاسمانی هەردووک لا بەراورد بکرێ. بۆیە ئێمە لە روانگەیەکی ترەوە دەڕوانینە ئەم مەسەلەیە و هاوکێشەکەش زۆر سادەیە: بەعس چەکی ئاسمانییان هەیە، ئێمە نیمانە.

هێزەکانی حکومەت، تانک و موشەکی جۆری فروگی سۆڤیەتی زەوی بە زەوییان هەیە و ئێمە نیمانە. بەم پێ یە رێژەکان وەها دەردەچن، ٢٠٠ بەرانبەر بە سفر، ٥٠٠ بەرانبەر بە سفر، هەزار بەرانبەر بەسفر، لە هەموو هاوکێشەکاندا ئێمە سفرەکەین. حاڵی عەرزم هەیت؟". ئەوسا پێیم گوت: "کەواتە بەرانبەر بەم واقیعە، دەبێ پێشمەرگەکانتان هێندە لێهاتوو بەهرەدار بن کە بزانن چۆن شتێک لەم سفرە دروستبکەن". فڕۆکەکەی صفاء شلال، کە پێشمەرگە خستیان، تاقە فرۆکەی عێراقی نەبووکە بە چاوی خۆم بیدینم. بەڵکو پارچە و پاشماوەی چەندین فڕۆکەی میکی تری عێراقیم بینی کە لە ناوچەی رەواندز خرانە خوارەوە. هێزی پێشمەرگە لە ١٩٧٤/٧/٢١دا، لە نزیکی (کەرەڤان)، فڕۆکەیەکی سۆخۆی (٧)یان خستە خوارەوە. پاش هەفتەیەک پارچەی فرۆکەیەکی تری سۆخۆی کەوتە نێو ماڵەکانی هەمان ناوچەوە. هێزی پێشمەرگە لە ٣/٢٩دا، لە بەینی رەواندزو جوندیاندا فرۆکەیەکی میکی (١٩)یان پێکاو فرۆکەوانەکەیان (هشام قدو)، کە لە نێو پارچەی فرۆکەکەیدا مرد، لەگوندی (ناوپردان) بە خاک سپارد.

لە نزیکەوە ئەوەم بینی کە پیاوانی هێزی بەرەڤانی ئاسمانی کورد، گوێ بە فرۆکە عێراقی یەکان نادەن و بە هەندی ناگرن. ئەوەم بە سەردانێک بۆ تۆپخانەی کوردی بۆ دەرکەوت. ئەم تۆپخانەیە لە نێوان حاجی ئومەران و سنوری ئێراندا بوو. پێیان دەگوت قوتابخانەی تۆپخانەی شۆڕش. قوتابخانەی چی! ناوێکی ناسک بوو، لەو ساکە

دەشت و چەند خێوەتە پەراگەندەیەی نەوێنندریان، نابوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بێباکانەو پەیتا، پەیتا، بێگوێدان بە ئەگەری هێرشی ئاسمانی عێراقی، مەشقی سوپایی ئەنجام دەدرا.

شاخ و گردەکانی دەوروبەری ئەم (قوتابخانەیە) بە دۆشکا تەنرا بوو؛ ئەم چەکە بریتی بوو لە رەشاشێکی سووکی مۆدکۆنی روسی و مونتاژی چینی، کە ئەمریکا بۆ کوردی ناردبوو. هەموو رۆژێک فرۆکەیەکی تۆپولیفی (١٦)ی زەلام، لە بەرزاییەکی زۆر بەرزەوە، لە مەدای دۆشکا بەدەر، بەسەر ئەم شوێنە دا دەسوڕایەوە. هەمیشە دوو فرۆکەی میک وەکو جووجەڵەی دووی مریشک، بە دوویەوە بوون.. ئەم سوڕانەوەیە تەنیا بە مەبەستی شناسایی بوو.

زۆربەی قوتابیانی (قوتابخانەی تۆپخانە)ی نێوبراو خوێندکاری زانکۆکان بوون. مامۆستاکانیان لەو ئەفسەرانە بوون کە بە هاری ١٩٧٤ سوپای عێراقیان بە جێ هێشتبوو، و پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کرد بوو؛ هەر بە سیماو قەڵافات وجل وبەرگی رێک و پێک و دەرسۆکە حەریرە سپی یەکانی ملیاندا دەناسرانەوە. بۆم دەرکەوت کە ئەم ئەفسەرانە لە کاتێکا کە لە ریزی سوپای عێراقیدا خزمەتیان دەکرد وەزع و حاڵیان هێندە باش بوو، بو بوون بە بەشێک لە توێژ و چینی (هەڵبژاردەی) کۆمەڵگەی عێراقی، کە جگەرەیان بە نێممانان دەدا لە قوتوی زیوینی تایبەتیان دەردێنا. کەچی لەگەڵ ئەوەشا زۆر بەرەزامەندی و شادی یەوە لەم کەشوهەوا سەرەتاییەداو، لە رووی سوپاییەوە، لەم ناوچە شاخاوی یە پاشکەوتووەدا، سەرقاڵی ئەنجام دانی کاری خۆیان بوون.

یەکێک لە قوتابیانی، قوتابخانەی تۆپخانە، خوێندکاری زانکۆی کشتوکاڵ بوو، دەیویست ببێ بە پسپۆر لە بواری ناودێریدا، ئەم قوتابی یە مەشقی لە سەر بەکارهێنانی هەر هەموو ئەو تۆپانە تەواو کرد بوو کە کورد هەیبوون. یەکێک لەو تۆپانە، تۆپێکی مەیدانی ٢٥ رەتڵ بوو، کە هێزی پێشمەرگە چەند ژمارەیەکیان لەو تۆپە هەبوو. کە چی بوو بە پسپۆر لە دۆشکادا. مامۆستاکەی، کە کۆنە ئەفسەر بوو، چاویلکەیەکی رەشی لە چاودا بوو، و بە ئەباوەڕی یەوە سەری دەلەقاندو بۆی دەگێڕامەوە کە چۆن پیاو لە سوپای عێراقداو لە هەلو مەرجێکی زۆر لە بارتردا، بە لای کەمەوە پێویستی بە سێ هەیڤان هەیە تا تۆپچی یەکی باش پێ بگەیەنێ، کە چی ئەم قوتابی یەی تەنیا بە سێ هەفتە فێر بووە. ئەم کورە تاقە تۆپچی دەرچووی قوتابخانەی نێوبراو نەبوو، بەڵکو هەم لێرە و هەم لە شەڕگەکاندا زۆری تری وەکو ئەو هەبوون. زۆر جار مەفرەزەیەکی ئەم قوتابخانەیە وەکو مەفرەزەی فریاد رەس، بە تایبەتی لەکاتی پێویست دا، بۆ شەڕگە جۆراو جۆرەکان دەنێردران. ئەفسەرەگەنجەکە بە دەم زەردەخەنەوە حیکمەتی ئەو کارەی بۆ شەرح دەکردم: "تابە کردمەوە فێر بێ".

قوتابیانی مەدرەسەی تۆپخانەی کوردی، دەرفەتی زۆریان بۆ رەخسا تا مومارەسەی "سەرەتای- مبدأ- فێربوون لە مەیدانی عەمەلی دا" بکەن. لەوە دەچوو جێگری سوپا سالاری سوپای عێراقی لیوا (اسماعیل النعیمی) بڕیاری دابێ کە مل بۆ ئەو جەنگی استنزافە نەدات، کە هێزی پێشمەرگە تیایدا قاڵ بوو بوونەوە و لەگەڵ سروشتی جوگرافی ناوچە شاخاوییەکاندا دەگونجا.

سەرکردایەتی عێراقی، لە بری مل دان بۆ ئەم واقیعە، لە کۆتایی مانگی ئاب دا بڕیاریدا ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی بکات بە دوو بەشەوە، ئەویش بە پەلاماردانی ئەو تەوەرەی گرینگەی بەرەو ئێران دەچوو.

هێزەکانی بارزانی لە ناوچەیەکدا بوون، درێژییەکی ۲۵۰-۳۰۰ کیلومەتر و پانی یەکەی پتر لە پەنجا کیلومەتر دەبوو، هەڵبەتە رێگەی هاملتون، لە رووی ئەو کۆمەکە لوجستیانەوە کە لە ئێرانەوە دەهاتن، بۆ کورد زۆر گرینگ بوو. عێراقی یەکان لێبڕا بوون هەرچی هێزیان هەیە کۆی بکەنەوە و پەلاماری ئەم رێگەیە بدەن و بیگرن. ژێدەرە کوردییەکان رایانگەیاند کە دوو لیوای زرێپۆش لە بەغداوە بۆ ئەو مەبەستە هێنران، ئەم دوو لیوایە دوا هێزی عێراقی بوون کە تا ئەو دەمە بەشداریان لەم شەڕەدا نەکرد بوو. ئەم هێزە زرێپۆشانە توانیان لە کۆتایی مانگی ئاب دا لە باشورەوە بگەنە قەڵادزە و لە ناوەڕاستەوە بگەنە رەواندز، هەڵبەتە پاش شەڕێکی زۆر توندو بەرگرییەکی قارەمانانە لە لایەن هێزی کوردەوە، کە مانگێک بەر لە دەست پێکردنی ئەو هێرشە، لەبەر بۆردومانی فڕۆکە، رەواندزیان چۆڵکرد.

پێدەچوو، سەرکردایەتی عەسکەری عێراق، پەندو دەرسیان لە شکستەکانی ساڵی ۱۹٦٦ی خۆیان، لەم ناوچەیە، وەرگرتبێ؛ بۆیە بە پێچەوانەی پێشبینی کوردەوە، ئەو هێزە عێراقیانەی کە لە هەولێرەوە هاتن، لەبری لە قۆڵی رۆژاواوە بەرەو حەوزی رەواندوز هێرش بێنن، لە باکورەوە دەستیان بە هێرش و پێشرەوی کرد. چونکە سەرکردایەتی کورد، پێیان وابوو دۆڵی گەلی عەلی بەگ، کە دوو هەزار مەتر لەروی دەریاوە بەرزە، تەنیا بە هێزی پیادە دێتە گرتن بۆیە سەرکردایەتی شۆرش، موشەکە دەبابەشکێنەکانیان لە قۆڵی رۆژاوادا دامەزراند، و پێیان وا بوو هێزی حکومەت لەوێندەرەوە هێرش دێنن. بەڵام هێزەکانی عێراق، بە سەرکردایەتی لیوا ئەلنەعیمی ی جێگری سوپا سالاری عێراق و سەرپەرشتی راستەوخۆی عەقید الکسندر (فاسیلیف)ی راوێژکاری سۆڤیەتی، توانیان کەتیبەیەکی تانکی ت-٦۲ بگەیەننە گەلی، بەڵام چۆن گەیاندنێک! بەزەبری بۆردومانی فڕۆکەو تۆپبارانی تۆپخانە، کە لەیەک کاتدا (٥٠٠) تۆپ بە بەردەوامی بەشداری دەکرد، هێزی پێشمەرگەیان ناچار کرد نەتوانن لە سەنگەرەکانی خۆیان سەر دەربێنن. تا بەوجۆرە تانکەکانی

عێراق گەیشتنە دەوروبەری رەواندز. بەڵام مەبەستی ئەلنەعیمی لەمە زیاتر بوو؛ دەیویست هەموو حەوزی رەواندز کۆنترۆڵ بکات، تا هێزەکانی عێراق لەوێندەردوە بە دوو قۆڵدا پێشرەوی بکەن: قۆڵی رۆژهەلات روەو سنوری ئێران و قۆڵی باکور، بەمەبەستی برینی رێگەی (مێرگەسور) کە کوردەکان بە خۆیان ئەو جادەیەیان لێدابوو. ئەمەش لە رووی پراتیکی یەوە دەیکردە کۆتایی هێنانی یەکجارەکی بە شەری باکوری شەرگەکان، واتا کۆتایی هێنان بە شەری ناوچەی بادینان، کە حکومەت ئابلوقەیەکی ئابوری مکومی خستبووە سەر.

حکومەتی بەعس، لە مانگی نیسانەوە گەمارۆی ئابوری خستبووە سەر هەموو ناوچەی ئوتونومی کوردستان. هەروەها حکومەت لەگەڵ تورکیش دا رێک کەوت کە سنوری تورکی-عێراقی لە هەر کۆمەکێکی عەسکەری یان ئینسانی دابخات. هەڵبەتە حکومەتی تورکیاش، کە لە بنەرەت دا سیاسەتی دژایەتی کوردی پەیرەو کردوە، ئامادە بوو لەم رووەوە هاریکاری تەواوی عێراقی یەکان بکات. هاریکاری تورک لەگەڵ حکومەتی عێراق دا کارێکی وەهای کرد کە گەمارۆی سەر ناوچەی باکور، یەکجار توندو مکوم بێ، رێگەی مێرگەسوور، تاقە دەرویەک بوو کۆمەکی سوپایی و ئازوقە و خۆراکی، بە هەر شەرە شەقێک بوایە، لێوە بگەیەنرێتە ئەو ناوچەیە.

برینی ئەم جادەیە لە رووی پراتیکی یەوە دەیکردە دابرینی ناوچەیەک کە پتر لە نیو ملیون خەڵکی تێدا دەژیان، ئەمە جگە لەو (١٥٠) هەزار کەسەی لە سەرەتای تەنگژەکەوە بە ناچاری پەنایان بۆ ئەو ناوچەیە برد بوو و زۆر بەشیان خەڵکی شارو دەشتانی یەکان بوون. هەندێ بەرعۆدەو مەسوولانی پارتی دیموکراتی کوردستان پێیان وابوو نزیکەی ٣٠ هەزار کەس لە ناوچەی بادینان دا برسێتی هەرەشەی مەرگی لێدە کردن.. ئەم حەقیقەتە لە زستانی پاش ئەم رووداوانە و پاش هەرەسهێنانی شۆرش لە بەهاری ساڵی ١٩٧٥دا دووپات کرایەوە.

کەواتە رێگەی مێرگەسوور، وەکو ئەو هەودا ئاوریشمە بوو کە روحی پتر لە نیو ملیۆن خەڵکی مەدەنی پێوە بەند بوو، هەروەها چارەنوسی نزیکەی دەهەزار پێشمەرگەشی پێوە بەند بوو. بارزانی، لە یەکێک لە دیمانەکانمدا لەگەڵی، بۆی باسکردم کە بەعسی یەکان: "زۆر چاک ئەم حەقیقەتە دەزانن، ئێمەش دەیزانین"..
لەبەر ئەوە بارزانی چەندی لە توانا دا بوو پێشمەرگەی خرکردەوەو بۆ ئەو شەرگەیەی ناردن تا بەرگری لە حەوزی رەواندز بکەن. هەروەها سەرکردایەتی شۆرش چەندین فەوجی لە هێزی یەدەک دامەزراند، تا حازر بێ بۆ ئەو شەرانەی کە پێشبینی دەکرا، لە ناوچە جیاوازەکانی ئەم شەرگەیەدا هەڵبگیرسێ؛ تا بتوانرێ هێزی جەنگاوەرەکان بگۆردرێن یان لە شەرگەیەکەوە بۆ شەرگەیەکی دی بگوازرێنەوە.

## پێشمەرگە گۆرانی خەمینیان دەچڕی

لە ئەیلولی ساڵی ١٩٧٤دا هەلم بۆ هەڵکەوت چەند رۆژێک لەگەڵ پێشمەرگەدا و لە ریزی پێشەوەی شەرگەی رەواندزدا بە سەر بەرم. ئێوارەیەکی فێنکی رۆژێک لە رۆژەکانی ئاخرو ئوخری هاوین بوو، دنیا نقومی تاریکی بوو. لە بانێژەی میوانخانەیەک رۆنیشتبوین و دەمانڕوانی یە شارۆچکەی چۆمان، تروسکەی تیا بەدی نەدەکرا، لەبەر هۆی ئەمنی روناکی قەدەغە بوو. لەوێ، وێنەگرێکی ئەڵمانی و دوو رۆژنامەوانی فەرەنسی و هۆڵەندی و چەند ئەفسەرێکی فەرماندەیی بارزانیم لەگەڵ بوون. تاقە بروسکەی باوەشی ئەم شەوزەنگە، بروسکەی جگەرەیی حەرەسەکانی نێو سەنگەرەکانی دەورو بەری میوانخانەکەو پێشمەرگەکانی سەر دۆشکاکان بوو، کە هەموو دەست لە سەر پەلەپێتکە لەسەر کورسی یە دەوارەکان دانیشتبوون.

تەنانەت قسەشمان بە دەنگی نزم دەکرد، هەر چەندە زۆریە، مات و بێدەنگ لە فکران را چووبوون و جڵەویان بۆ خەیاڵ شل کرد بوو.کوت و پڕ لە دۆڵەکەوە، دەنگێکی هێدی هاتەگوێ، بەرە بەرە بوو بەژاوەژاوێکی زۆرو لە ناوجەرگەی ئەم خامۆشی و کپی یە بە سامەوە هەڵقوڵی. پاشان دەنگی هاڕەهاڕی ترومبێل و ئاوازی گۆرانی یەکی دوور بەسەر ئەم هەراو هەنگامەیەدا زاڵ بوو. لە جێ ی خۆمان راپەرین، بەرەو دۆڵەکە، کە کەوتبووە خوار میوانخانەکەمانەوە، ئارماندا تا بزانین چی یە. ئیدی قافڵەی هێزێکی تایبەتی لەشکری کوردستانمان بینی کە پێک هاتبوو لە نزیکەی پەنجا ئوتومبیلی گواستنەوەی پڕ لە پێشمەرگەی گەنج، لەنێو ئوتومبیلەکاندا، ئوتومبیلی ئەڵمانی دەبینران، پێدەچوو ئێران دابێتی بە جەنگاوەرانی کورد. هەروەها جیپی لاندروڤەر و تراکتورو عەرەبانەی سەر بەتاڵ کە ریزە کورسییان لێ بەسترابوو، دەبینران. ئوتومبیلەکان گڵۆپیان پێنەکردبوو، تروسکەیان لێ بەدی نەدەکرا، تەنیا تروسکەی نزمی مەکینەکانیان نەبێ. پێشمەرگەکان هەموو شان بە شانی یەکدی لسەر کورسییەکان دانیشتبوون و تفەنگ و رەشاشەکانیان لەبەر پێیاندا دانا بوو، هەموو رەخت و فیشەکدانیان لە خۆدا بوو، گۆرانی حەماسی خەم وروژێنیان دەچری.. پاشان زانیمان کە ئەو پێشمەرگە گەنجانە قوەتێکی هێزی رزگاری بوون و دەبوایە هەر ئەو شەو دژە هێرشێک بکەنە سەر قوەتێکی عێراقی کە دوێنێ چیای (گۆرەز)ی بەرزو ستراتیژی باکوری رەواندزیان گرتبوو. سەرکردایەتی شۆرشی کورد، ئامادە بوو بەهەر نرخێ بووە ئەم بەرزاییانە و لوتکەکانی دەوروبەری رەواندز، بە تایبەتی لوتکەی هندرێن و زۆزک بپارێزێ و نەیەڵێ بکەونە دەستی دژمن، چونکە ئەگەر بکەوتنایەتە دەستی دژمن، ئیدی لەو لوتکانەوە تۆپخانەیان دادەبەست و بەردەوام رێگا ستراتیژی یەکانیان، کە بۆ کورد و شۆڕشەکەی، وەکو رەگی حەیات وابوون، تۆپباران دەکردو ئیدی کورد نەیاندەتوانی وەکو پێویست ئەو رێگا

ستراتیژیانه به کار بێنن. شتاقمان به درێژایی ئەو ماوەیەی کە وەستا بووین و تەمەشای تێپەڕ بوونی قافڵەی پێشمەرگەکانمان دەکرد، ورتەمان لێوە نەهات. مرۆڤ دەیتوانی بۆنی مەرگ بکات و گوێ لە هەناسەی مێژوو بگرێ. ئێمەی ئەڵەمانی، وێنەگرەکە و من، لەو ساتانەدا بیرمان لە جەنگی (لانگی مارک) و ئەوشەڕانەی دی دەکردەوە کە بەشدارییان لە نوسینەوەی مێژووی وولاتەکەماندا کرد.

## سەردانێکی شەڕگە

بۆ بەیانی چووین بۆ سەردانی عبداللە پشدەری فەرماندەی هێزی ڕەواندز، کە لە بارەگای ئەمامی خۆیدابوو. ڕێگەکە خاکی بوو، کورد بە خۆیان ئەم ڕێگەیەیان بەرەو چیای گۆرەز لێدابوو. ڕێگەکە هەر بیست کیلۆمەترێک دەبوو. بەهەر حاڵ سواری پیرە لاندرۆڤەر بووین و بڕۆ، بەیەک سەعات و نیو ئەوجا ئەو تۆزە ڕێگەیەمان بڕی. شوفێرەکە، هەموو دەرگاکانی لە لاندروڤەرەکە کرد بووەوە، تا ئەگەر توشی بۆردومانی عێراقی بوو، ئەفەرەکان بە ئاسانی بتوانن خۆ هەڵدەنە خوارێ و خۆ لە پەنا تاوێرانی ئەم بەرو ئەو بەری ڕێگەکە وەشێرن. ئەنجام شوفێرەکە، پیرە لاندرۆڤەری لە بناری چیایەکەدا و لە بن تاوێرێکی هەندێ دەریەڕیودا، ڕاگرت. زۆر چاک بوو، چونکە شوێنەکەی سێبەر بوو و فرۆکەکان فەرقیان پێنەدەکرد. ئیدی لێرەوە، بەپێ لەگەڵ تەرجومان و گاردەکەمدا، کە هەردوکیان کلاشنکوفیان پێ بوو، بە چیاکەدا هەڵگەڕاین. دوای سەعاتە ڕێ یەک هەستمان کرد بەراستی گوشاری هەوا کەم بووەوە، هەڵبەتە ئەمە سەیرنەبوو، چونکە ئێمە گەیی بووینە شوێنێک کە دوو هەزار مەتر لە رووی دەریاوە بەرز بوو. بە سەر هەڵدێرێکی هەزار بە هەزاردا پەڕینەوە، بە تەختەدارو گوریس پردێکی هەڵواسراویان لە سەر دروستکردبوو. لەوێدا خۆمان لە بەردەم بارەگای پێشەوەی عبداللە پشدەری دا بینی یەوە کە کەوتیوە پەنای کۆمەڵە تاوێرێکی سەختەوەو لە ئەدیوی دا بوو.

مەفرەزەیەکی بێتەل سەرقاڵی دانانی تەلی بێتەل بوو. پێشمەرگەکانی دی هەموو دەست لە سەر پەلەپیتکە لە سەنگەرەکاندا دامەزرابوون و ئێشکیان دەگرت. لە نێو ئەشکەوتە قوڵەکەدا، کە بەشی هەرەسەرەکی بارەگاکەی پێک دەهێنا، ژمارەیەک پێشمەرگەی نوستوم بینی کە شەڕی شەوی ڕابردوو شنگی لەبەر بڕیبوون. هەندێ پێشمەرگەی دی خەریکی دروونەودو چاککردنەوەی جل و بەرگەکانیان بوون. پیاو زۆر بە ئاسانی دەیتوانی پشدەری بناسێت، چونکە (دیفید هیرست)ی ڕۆژنامەوانی بەریتانی لە گاردیان دا ووتارێکی بلاو کرد بووەوە و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد بوو کە "لەکوردستاندا ج کەسێک لەو لاوازتر نی یە". ئا بەمجۆرەم بەدی کرد، کە بە نیشارەتی دەست گازی دەکردین کە بچینە نک وی و لەسەر پەتۆ سەربازییەکەی ژێری دانیشین. هەروەها سەرینێکی دایە من کە بەرگەکەی بە وێنەی گوڵ و مەلان چنرا

بوو، دەتگوت پێشتر قەولمان لە بەیندا بووە کە لە ماڵی وی چای بخۆینەوە.

لەکاتێکدا من بە تاسەوە بووم هەرچی زانیاری هەیە لە مەڕ ڕەوشی گشتی شەڕگەکە وەربیگرم و بۆم باس بکات، کەچی ئەویش هێدی و هێمن بە تەما بوو لەو چیاوچۆڵە ڕۆژنامەوانێکی ئەڵمانی بە چنگ کەوتووەو وەگیری بێنێ تا زانیاری زیاتری لەمەڕ فەرماندەی ئەڵمانی (رومل) بداتێ، کە لە لای کوردان وەکو ئەفسانەیەکی نیزامی لێهاتبوو. پشدەری زۆری حەز دەکرد ئەوە بزانێ کە ئایا ئەگەر مارشال رومل لە وەزع و حاڵێکی وەکو ئەمەدا بوایە چیدەکرد بۆ دەرکردنی عێراقی یەکان لە حەوزی ڕەواندز. بەم شێوەیە کەوتینە موناقەشەوە دەربارەی باڵا دەستی عێراق لە ڕووی چەک و تفاقی جەنگی یەوە. لە بلەی تانکەکانی عێراق دا، کە تەواو زاڵ بوو بە سەر دۆڵەکەو ناوچەکانی دەوربەری ڕەواندزداو جم و جوڵ و پەیوەندی نێوان بەرزایی و لوتکەکانی ئەم زنجیرە چیایەی تەواو نارەحەت و ناخۆش کرد بوو، پشدەری ی فەرماندە جڵەوی بۆ خەیاڵ بەردا، و زانیم بیستبوی کە موشەکی دەبابەشکێنی وەها هەن لە دوورەوە ئاراستە دەکرێن. بە تایبەتی موشەکە (سەرسورەکان) کە سوپای ئەڵمانی هەیەتی، پێ ی گوتم: "ئەگەر سەد دانەیەک، پەنجا...کورە تۆ بڵێ بیست دانەم لەو موشەکانە دەبوو، دەمتوانی لەم شەڕەدا چارەنوسی هەموو شەڕەکە دیاری بکەم". هەروەها حەزی دەکرد بزانێ کە بۆ چی "ڕۆژاوا چەک بۆ ئەو کوردانە ناێرن کە دژی سۆڤیەت دەجەنگن"، بۆچی کۆمەکی چەک لە لایەن ئێرانەوە کەمی کردوەو وەکو جاران نی یە.

ماوەیەکی زۆرمان پێ چوو تا ڕەوتی قسەکانمان گۆڕی و گەڕاینەوە سەر بابەتە هەنوکەییەکان، گەڕاینەوە سەر ئەو شەڕانەی کە لە ئارادا بوون و ئەوانەی لە گوێن بوو لە چیای گورەز بێنە ئاراوە؛ کە بەوەمەبەستە بوو گەلی عەلی بەگ و ڕێگەی مێرگەسوور بێنە گرتن، بە تایبەتی کە لە ساڵی ١٩٦٦ دا و هەر لەم ناوچەیەدا لیوای چواری عێراقی تەفروتونا کرد بوو، ئەمە جگە لەوەی کە باشترین کەس بوو کە ئەم شەڕگەیەی بەڕێوە دەبرد،

ئەوجا پشدەری دەعوەتی کردین کە سەردانێکی هێڵەکانی پێشەوەی شەڕگەکە بکەین. بەدەم و زمانێک ئەم دەعوەتەی کردین لە تۆ وایە یەکێکەو میوانەکانی بۆ ئێوارە پیاسەیەکی نێو باخێکی گشتی شارێک دەعوەت دەکات. دڵنیای کردین کە شەڕگەکە هەر سەعاتە ڕێ یەک لەم شوێنەی ئێستامانەوە دوورە، واتا بە چوون و هاتنەوە دوو سەعاتمان پێدەچێت، و بەڵێنی داینێ کە پاش گەڕانەوە سەروپێک ویسکیمان دەداتێ تا ببوژێینەوەو حاڵی حازر قاپە ویسکی یەکە لە نێو کانی ناو ئەشکەوتەکەدایە تا سارد بێ و کەسیش لەوێندەر نایبینێ. بەمجۆرە وەڕێکەوتین، مەفرەزەیەک پێشمەرگەشمان بەگەڵ کەوت. نیدی یەک ئەفەس بە چیا ڕژدو ڕکەکەدا هەڵگەڕاین. پێیان گوتم هیچ نی یە، هەمووی ئەم لوتکەیە دەبری، ئەوجا دۆڵێک

دەبری و پاشان هەورازێکی بچوک دێت و پێشمەرگە لەوێندەرو لە رەخی چیاکە سەنگەری خۆیان لێداوە. لە رێگە قافڵەیەک هێسترمان بینی کە بریندارو جەنازەی کوژراوی لە بەتانی پێچراویان لێ بارکرا بوو. سیمای ئەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵ قافڵەکەدا بوون، خەمین بوو. دوای دوو سەعات رێکردن، لە کاتێکدا خەریک بوو سیپەلاکم دەتەقین و هەناسەم لەبەر دەبرا، غیرەتم وەبەر خۆم ناو لە پێشمەرگەیەکم پرسی چەندمان ماوە بۆ هێڵەکانی پێشەوە، زۆرم پێ سەیر بوو، هەمان وەڵام درامەوە کە لە سەرەتای رێکرنەکەماندا پێیان گوتم: (یەک سەعات). ئیدی من و یاوەرە نەڵمانی یەکەم زاراوەیەکی تازەمان بۆ ئەم حاڵەتە داهێنا، ئەویش ئەوە بوو (یەک سەعات بە کاتی پێشمەرگە).. وەختێ گەیشتینە هێڵەکانی پێشەوە، من و یاوەرە نەڵمانی یەکەم شەکەت و ماندوو، شنگمان لە بەر برا بوو. لاقمان لە ماندویەتی دا دەلەرزین. چوینە سەنگەرێکەوە و ئیدی هەموو هەڵسوکەوتێکمان بە ئەمرو فەرمانی فەرمانەدەی ئەو شوێنە بوو.

هێزەکانی عێراق، دوێنێ ئێوارێ هێرشێکیان کردبوو، هەندێ لەو شوێنانەی خوار ئەم شوێنەی ئێستای ئێمەیان گرتبوو، بەڵام قوەتێکی گیان فیدای پێشمەرگەکانی هێزی رزگاری هەر دوێنێ شەو دژە هێرشێکیان بۆ کردبوون و ناوچەکانیان لێ سەند بوونەوە، جەنازەی چەندین کوژراو لە مەیدانی شەرەکەدا کەوتبوون. ئەمە جگە لەو جەنازە عێراقیانەی کە لە شەرەکانی رۆژانی پێشوتردا کوژرا بوون و هەر لەوێندەر مابوونەوە. ناوبەناو شنەبایەکی هێدی بە سەرماندا دەهات و بۆنێکی ناخۆشی لەگەڵ خۆیدا دێنا. هاورێکەم لە سەر تاوێرەکانەوە کەوتە وێنەگرتنی جەنازە پەرت و بڵاوەکانی دەورو بەرمان کە هەندێکیان رەنگیان گۆرا بوو، و دیمەنیان خەم و نیگەرانی دەهارۆژاند.

ئێمە جم و جوڵ و هاتوچۆی تانکەکانی عێراقمان لە بنکی دۆڵەکەدا دەبینی، هەر هەزار دوو هەزار مەترێک لێمانەوە دوور بوون. بە هۆی دووربینی مەیدانی یەوە بۆمان دەرکەوت کە تانکی ت-٥٥ و ت-٦٢ بوون. دیار بو ئەم تانکانە ئیشیان ئەوە بوو بە پێ ی توانا لە سەنگەرەکانی پێشمەرگە. بەتایبەتی سەنگەرەکانی بناری چیاکە نزیک ببنەوەو بە بەردەوامی مژولیان بکەن. دەنگی تۆپی تانکەکان لە نێو دۆڵەکەدا تێکەڵ بە دەنگی ئەو تۆپانە دەبوو کە لە پشتی ئێمەوە بە مەودایەکی دوور تێیان دەگیرا، ئەمە نیشانەی ئەوە بوو کە فەرماندەی هێزی پێشمەرگە داوای کۆمەکی تۆپخانەی لە سەنگەرەکانی پشتەوە کرد بوو. چونکە تۆپخانەیەکی شۆرش لە پشتەوە بوو و ئێمە لە هاتنماندا بۆ ئێرە دیتمان. لە شوێنی خۆمانەوە رەوتی زیکزاکی تانکە عێراقی یەکانمان بە دی دەکرد کە چۆن گەردە لولی تۆرو خۆڵیان لە دووی خۆ بە جێدەهێشت و لە چاو وون دەبوون.

دوای نیو سەعاتان چ شتێک لەو شوێنەدا نەما تەنیا کلکەی گەردەلولێک نەبێ کە

شوێنی ئەو تانکانە دەکەوت کە بەلەز بەرەو حامیە (سەربازخانەی) رەواندز پاشەکشەیان دەکرد. وا دیار بوو تۆپخانەی شۆرش نەک هەر کاری کردە سەرتانکەکانی عێراق، بگرە هێزی ئاسمانی عێراقیشی هاروژاند، ئەوە بوو پۆلێک فرۆکەی مێک بەسەر سەرماندا تێپەرین بەرەو ئەو شوێنەی دەنگی تۆپەکانی تۆپخانەی شۆرشی لێوە دەهات. هەروەها چەند ساتێکی پێنە چوو کە گرم و هوڕ لە وێندەر هەستا. ئەو پرسیارەی بە مێشکی هەر هەموماندا هات ئەوە بوو کە: ئاخۆ فرۆکەکان، مەبەستیان پێکا، تۆپخانەکەی شۆرشیان کپ کرد؟

هەمووبمان، بە درێژایی ئەم رووداوانە خۆمان لە سەنگەرەکەدا قایم کرد بوو، و جۆلەمان نەدەکرد، تەنیا وێنەگرەکەی لەمەڕ من نەبێ، کە بە درێژایی وختەکە هەر سەرگەرمی وێنەگرتنی ئەو دیمەن و روداوانە بوو کە بە شایستەی دەزانین، دەبوایە وابکات، چونکە تامەزرۆی ئەو دیمەنە گەرم و گوڕو تەڕو تازانە بوو کە لەم دەرفەتەدا هەلکەوتبوون و لەوە بوو جارێکی دی دووبارە نەبنەوە.

ئەو رۆژە بۆ ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینەوە بارەگای پشدەری، پاش ئەوەی بە چون و هاتنەوە پتر لە حەوت سەعاتمان پێچوو، پشدەری کە بەو حالەوە دیتینی، بەزەردەخەنەیەکەوە خێرهاتنەوەی کردین و گوتی: "کەشو هەوای هاوینەی لای ئێمەتان بە دڵ بوو؟! ئەو پێکە ویسکی یەی کە ئەو ئێوارەیە لە نێو ئەشکەوتێکی نیمچە تاریک دا خواردمەوە بە-لەزەت ترین ویسکی بوو کە لە هەموو ژیانما خواردبێتمەوە".

## دوا نەختیات

بەپێ ی ژێدەرە کوردی یەکان، حکومەتی عێراق تا پایزی سالی ۹۷٤ پتر لە سەد هەزار جەنگاوەری خستبووە شەڕەوە. چاودێرانی سوپایی لەمەوە گەیی بوونە ئەو ئەنجامگیری یەی کە ٤ لەسەر ٥ سوپای عێراقی، کە دەکاتە ٦٠-٧٠ هەزار کەس، لە شەرگەکاندا بوون و بە شێوەیەک لە شێوەکان دژی کورد دەجەنگین. حکومەتی عێراقی داوای هەر هەموو ئەو مەوالیدە یەدەکانەی کرد کە تەمەنیان لە خوار (٢٧) سالەوەیە، چونکە بەغدا وای دانا بوو بەر لە هاتنی وەرزی زستان کۆتایی بە شەڕ بێنێ: چونکە ئەگەر زستان بێت سێ چوار مەتر بەفر دەکەوێ و پلەی گەرما لە کوردستاندا دادەبەزێ بۆ (-٣٠) پلەو ئەمەش سوپاو جم وجۆلی سوپا تەواو سست دەکات، چەند ئەو سوپایە رێک وپێک و مودێرن بێ، بە تایبەتی ئەگەر پشت بە ئالیات ببەستێ. هەروەها لەشکری کوردش، لە حساواتی خۆیاندا شوێنێکی تایبەتیان بۆ زستان تەرخان کردو چالاکی یەکانی خۆیان زۆر زیاتر کرد. لە ماوەی هەر دوو مانگی ئەیلول و تشرینی یەکەمدا و بەزەبری زنجیرە کارێکی فیدائیانە چەندین شاخ و لوتکەیان لە سوپای عێراقی سەندنەوە و رێگەی لۆجستیپیان لە

چەندین قوەتی زرێپۆشی عێراقی بڕی و تەفرو تونایان کردن.

زیادکردنی چالاکی و چەلەنگی پارتیزانی و بە کار هێنانی مەفرەزەی گەرۆک و پارتیزان لە هەموو ناوچەکانی کوردستان دا، جم و جوڵی چەندین قوەتی عێراقی سست کردو کردی بە کارێک کە نەتوانن بەشداری عەمەلی و پراتیکی لە شەڕە گەورەکانی شەڕگەکاندا بکات.

مەفرەزە کوردی یەکان توانیان دزە بکەنە پشت هێڵەکانی سوپای عێراقی وچەند پرد بتەقێننەوە، رێگا تێک بدەن و پەلاماری عەماری چەک و ئازوقە و سەنگەری جۆراوجۆر بدەن، هەروەها توانیان چەندین سەربازخانە و بارەگای سوپای عێراقی بە تۆپی هاوەن تۆپباران بکەن. لە رۆژی ٩/١٦ دا بۆری نەوتی نێوان کەرکوک و بەغدا تەقێنرایەوە. دەزگای استخباراتی عێراقی زۆریان سەیر لە هێرشێکی تری جدی مەفرەزەیەکی تایبەتی پێشمەرگە ما کە کردیانە سەر تۆڕێکی گرینگی بۆری نەوت؛ ئەوە بوو چەندین بومبا بە کۆنترۆڵی ئەلکترۆنی و لە دورەوە تەقێنرانەوە، ئەم دەزگا ئەلەکترونیانە دەستکردی ئەڵمانیای فیدرالی بوون.

عێراقی یەکان، سەرگەرمی رێکخستنەوەی هێزەکانیان بوون و قوەت و چەکیان بۆ ئەو هێزانەیان دەنارد کە بەرکەوتبوون و زەرەرو زیانی گەورەیان لێکەوتبوو.. تەنیا لە پایزدا پتر لە ٣ هەزار کەسیان لێ کوژراو دەیان تانک و سەدان ئوتومبیل و زرێپۆشیان لە دەست دا. ئەمە جگە لەوەی کە چەندین یەکەو قوەتی عێراقی کە شەڕ برشتی لەبەر بڕی بوون و مرۆڤ بەزەیی بە حاڵیاندا دەهاتەوە. حکومەت هەوڵێکی زۆری دا کە رادەی زەرەرو زیانە زۆرەکانی بشارێتەوە، بەڵام بێهودە بوو. بۆ وێنە قەدەغەی کرد کە هەواڵی پرسەو تازی یە لە رۆژنامەکاندا بڵاوبکرێتەوەو کەسوکاری نەفسەرە کوژراوەکانی ناچارکرد کە لە سەرکێلی گۆڕەکانیان بنوسن "شەهیدی رێگەی رزگاری فەلەستین". هەروەها زۆری هەوڵدا لە کەناڵەکانی راگەیاندنی وەکو رادێو و تەلەفزیونەوە وا لە خەڵکی بگەیەنرێ کە چ شەڕێک لە باکوردا نی یەو شتەکە بریتی یە لەوەی کە هێزی چەکداری عێراقی کەوتونەتە راونانی کۆمەڵێک دزو چەتەو رێگرو هاکا هەموویانی دەستگیر کردو قڕی کردن، بەڵام ئەمەش دادی نەدا. (عەرەب)ش رۆژانە گوێیان لە رادێوی دەنگی کوردستان دەگرت، ئەم رادێوبە کە لە ناوچە رزگار کراوەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی یەوە بەرنامەکانی پەخش دەکردەوە، رۆژانە بەرنامەیەکی بە زمانی عەرەبی بڵاو دەکردەوە، لە بەرنامەکانیدا درۆو دەلەسەکانی حکومەتی عێراقی ریسوا دەکرد و گەلی عێراقی لە حەقیقەتی مەسەلەکان ئاگادار دەکردەوە. هەروەها رۆژانە لیستی ناوی کوژراوو بریندارو یەخسیرانی سوپای عێراقی بڵاو دەکردەوە. ئەمە جگە لەوەی کە رادێوکە بواری بە یەخسیرە عێراقی یەکان دەدا کە لەوێوە سڵاو بۆ کەسوکاریان بنێرن و باسی چۆنیەتی یەخسیر بوونی خۆیان بکەن.

هەروەها گەلێک لە میوان و رۆژنامەوانە بێگانەکانیش لە رادیۆکەوە دیانەیان لەگەڵ دەکراو لەوێندەردوە تیشکیان دەخستە سەر حەقیقەتی حاڵی شەڕگەکان و ئیدیعا نادروستە رەسمی یەکانی عێراقیان بەدرۆ دەخستەوە.

## تیرۆری ئاسمانی بۆردومانی قەڵادزێ

لە ناوەراستی مانگی تشرینی دووەمدا یەکەم بەفر لە کوردستاندا کەوت. بەمەش ئەو خەونەی عێراق پوچەڵ بوەوە کە دەیویست بەر لە وەرزی زستان شەڕەکە یەک لایی بکاتەوەو کۆتایی پێ بێنێ. تەجرەبەی شەڕەکانی ساڵانی پێشوو ئەوەیان ساغ کرد بوەوە کە هێزی پێشمەرگە هەمیشە لە زستاناو لە نێو بەفرو کەش و هەوای خراودا، سەرکەوتوترین دەستیان لە هێزی عێراقی لە بەفرا گیرۆدە، ومشاندەوە زیانیان لێداون. هەر چەندە هێزەکانی عێراق توانیان چەندین ناوچە لە دەستی پێشمەرگە دەربێنن و هەر چەندە کوردیش زەرەرو زیانی زۆریان لێکەوت، بەڵام کە دیتیان زستان بەرێوەیە، بافرەیەکیان هاتێ، بە تایبەتی کە ناوچەی مەرکەزی شەڕگەو زۆربەی ناوچە ستراتیژی یەکان هێشتا بە دەست خۆیانەوە بوو. هێشتا شاخ و لوتکەکانی دەوروبەری رەواندزی وەکو هندرێن و زۆزگ و (زاگروس)یان بە دەستەوە بوو.

هەروەها ئەو وەجبە چەکەی کە لە رێگەی ئێرانەوە گەیبە دەست هێزی پێشمەرگە، کردییە کارێک کە بتوانن شێوازی شەڕی شەڕگەی رەواندوز لە شەڕی پارتیزانی یەوە بگۆڕن بۆ شەڕی بەرەیی کە تۆپخانە دەوری گرینگی تێدا دەبینێ. دیارە ئەم کۆمەکانە کە بە شێوەیەکی گشتی بریتی بوون لە تەقەمەنی وچەند تۆپێکی قورس و کۆمەڵێک موشەکی دژە تانک و موشەکی (هەنتەر- هۆک)ی فڕۆکە شکێن، لە مانگی تشرینی دووەم دا گەیشتنە دەستی کورد، هەڵبەتە پاش گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوان ئەمریکا و شای ئێران دا. کورد لە سایەی موشەکی (هەنقەر-هوک)وە کەوتنە راونانی فڕۆکەی تویولیف، کە جاران لەبەر بەرزی، چەکی فڕۆکە شکێنی کورد نەیدەگەیشتنێ. رۆژی ١٤/١٢/١٩٧٤ یەکێک لەو فڕۆکانە لە نزیکی چۆمان خرایە خوارەوە. سۆڤیەت تەنیا شەش فڕۆکەی لەو جۆرەی بە عێراق دابوو. هەر لە هەمان رۆژداو لە ناوچەیەکی دیە دا، فڕۆکەیەکی سوخوی عێراقی بە موشەکی هەنتەر-هۆک پێکراو کەوتە خوارەوە.

لە هەمان مانگ دا پێشمەرگەی لەشکری کوردستان شاری ئامێدیان گرتەوە. بەڵام هێزی بارزانی کە شاریان رزگار کرد وەکو ئەوە بوو بچنە نێو شاری خێوانەوە، هێزی حکومەت هەموو خانوەکانی پاش بۆردومانیش تەقاندبوەوەو خەڵکەکەش هەموو شتێکیان بە جێ هێشتبوو، و دابویانە شاخ. حاڵی (گەلاڵە) و (رەواندز) و زۆر شاری تری کوردی لە حاڵی ئامێدی باشتر نەبوو. خەڵکی پتر لە دوو هەزار گوند ماڵ

و حاڵیان به جێ هێشتبوو، و هێزی حکومەت به بۆمبای ناپاڵم و تۆپخانەی قورس وێرانیان کرد بوون و لەگەڵ عاردیدا تەختیان کرد بوون. لە ئەنجامی تۆپباران و بۆردومان و زەبرو زەنگ و تیرۆرکاری حکومەتی بەعسیان دەرهەق بە کوردان بەو مەبەستەی ئەم هاووڵاتیانەی خۆی قڕ بکات کە داوای ماف و ئازادی خۆیان دەکرد، پتر لە نیو ملیون کورد بە ناچاری هەڵاتن و ماڵ و گوندکانیان بە جێ هێشت، کار گەییە رادەیەک کە بەشێکی گەورەی رووبەری خاکی کوردستانی عیراق لە خەڵک و ئاوەدانی چۆڵ بێ.. تۆپباران و بۆردومانی خەڵکی مەدەنی لە شارۆچکەی قەڵادزەوە دەستپێیکرد. سەعات ٩/٤٥ی بەیانی رۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤، دوو فرۆکەی سۆخۆی بە ئاسمانی شارەوە پەیدا بوون، ئەو شارەی کە لەکاتی ئاسایی دا ژمارەی دانیشتوانی لە دە هەزار کەس پتر نەدە بوون، بەڵام ئەو بەیانی یە بە هۆی هاتنی خەڵکێکی زۆری ئاوارەو دەربەدەرەوە، ژمارەی خەڵکی شار خۆی لە ١٥ هەزار کەس و پتر دەدا. تاقە چەکی بەرگری ئاسمانی دۆشکایەک بوو، هەڵبەتە کوردەکان بیریان لەوە نەدەکردەوە سیستەمێکی بەرگری ئاسمانی بۆ شارو گوندەکانیان دابنەن، چونکە تەنیا ژمارەیەکی یەکجار کەمیان لە تۆپی فرۆکە شکێن هەبوو، بۆیە فرۆکەوانانی عێراقی بە بێ ترس بەنزمی یەوە دەفرین و کاری خۆیان ئەنجام دەدا.

خەڵکانێک کە بە چاوی خۆیان دیتیویان، دەیانگێرایەوە کە ئەو دوو فرۆکەیەی کە قەڵادزەیان بۆردومان کردو، بە بەرزی ٦-٧ مەترێکەوە دەفرین. بەکاوە خۆ هەموو بۆمباو موشەکەکانی ژێر باڵیان، بەسەر ناوەندی شاریاندا هەڵرشت. ئاشکرایە کە فرۆکەی سوخوی، کە ئەو دەمانە پێشکەوتوترین فرۆکەی هێرشبەری بۆمباهاوێژی هێزی هەوایی (سۆڤیەتی)ش بوو، جگە لە موشەک، لە ژێر هەر باڵێکی دا دوو بۆمبا هەڵدەگرێ کە کێشی هەریەکێکیان (٧٥٠) کیلۆ گرامە، هەروەها دوو بومبای (٥٠٠) کیلۆگرامی دیکەش هەڵدەگرێ. بەم پێ یە دەتوانین بڵێین ئەو بەیانی یە پێنج تۆن ئاگرو ئاسن بەسەر ناوجەرگەی شاردا دابارێنرا. یەک گەڕەکی تەواو بەدوکان و ماڵ و قوتابخانەی منداڵان و هەندێ بەشی خەستەخانەیەکەوە بە تەواوەتی وێران و کاول بوو. پاش ئەوەی فرۆکەکان، موشەک و بۆمباکانیان خاڵی کرد، جارێکی دی گەڕانەوە سەر خەڵکە مەدەنی یە ترساوەکەو بەرەشاشی (٣٠) ملم دایان بێژتن و پتر لە (١٣٠) کەسیان کوشت کە ٨٠ کەسیان منداڵی قوتابخانەی سەرەتایی بوون و تازە چوو بوونە دوو پۆلەوەو لە سەر کورسی دەرسی خوێندن دانیشتبوون. تەنیا یەک پێشمەرگە لەم بۆردومانەدا کوژرا.

بۆردومانی قەڵادزە یەکەم قەسابخانەی بەشەری بوو کە هێزی ئاسمانی عێراقی لە زنجیرە هێرشێکی لەو بابەتەدا ئەنجامی دا. بارزانی هەقی بوو بڵێ: "ئەمە درندانەترین ئەڵقەی زنجیرەی شەری قڕکردنی گەلی کوردە کە دەیان ساڵە

دەکرێت. دوای چەند رۆژێکی دی، ئیدی نۆرەی شاری (گەلالە)ی دۆڵی چۆمان هات و بۆردومانی گەلالە بووە هۆی کوشتنی چل کەس و بریندار بوونی (٥١) کەسی دی. لە ٤/٢٦ دا، شاری هەڵەبجە، کە لە دووری هەشتا کیلۆمەتری شەرگەکاندا بوو، بۆردومان کراو (١٤٠) کەس کوژران و (١٠٠) کەسی دیکەش بریندار بوون. ئیدی خەڵکەکە لە ترسی هێرشی دی، شاریان چۆڵکردو روویان کردە شاخ و پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوەکرد. لە ماوەی نێوان ٤/٢٠و ٥/١٠ دا، شاری زاخۆ، کە ژمارەی خەڵکەکەی ٢٥ هەزار کەس دەبوو، بە بۆمبای ناپاڵم و هێشوبی بۆردومان کرا. بە درێژایی ئەو رۆژانە هەر دوکەڵ و ئاگر لە زۆربەی گەڕەکەکانی شارەوە هەڵدەستاو تا ئێستاش رادەی زیانی بەشەری ئەو تیرۆرە ئاسمانی یە بە تەواوەتی نەزانراوە، هەر لەو ماوەیەدا قوەتێکی سوپای عێراقی دزەی کردە ناو شارەوەو شەلم کوێرم نافرەت و مندالانی بەر دەسترێژی چەک داو ئەم کارەش بووە هۆی کوشتنی (٦٣) کەس.

## قوربانیی UN

شەپۆلی تیرۆرو رق و کەرب و کینەی بەردەوامی حیزبی بەعس، ئەو کوردە گیراوانەشی گرتەوە کە بە تۆمەتی پەیوەندییان دەگەڵ بزافی رزگاریخوازی کوردا دە زندانێ خرا بوون، ئیدی ئەو تۆمەتانە دروست بووبن یان نادروست. ئەوە بو لە رۆژی ١٩٧٤/٤/١٤دا بە ئاشکرا (١١) کورد، کە لە ساڵی ١٩٧٢وە گیرابوون، پاش ئەشکەنجەو ئازاردانێکی درندانەو هۆڤانە، ئیعدام کران. ئەمانە لە مەیدانێکی گشتی ناوشاری هەولێردا هەڵواسران، شوێنەواری ئەشکەنجە بە جەستەیانەوە دیار بوو، هەندێکیان دەستیان براباوەوە، هەندێکی تریان چاویان دەرهێنرا بوو. رێکخراوی ئەنتەرناشنال ئەمنیستی، لە راپۆرتێکی دا سەبارەت بە شێوازەکانی ئەشکەنجەدان، بە درێژی باسی ئەو شێوازانەی کردوە کە دەزگای ئەمن و استخباراتی عێراقی بەکاری دێنن. لە رۆژی ٤/٣٠/دا پێنج خوێندکاری کۆلیژی ئادابی زانستگەی بەغدا، دوای دادگاییەکی روالەتی، بە تۆمەتی بانگەشە بۆ "بزافی جوداخوازی وپشتگیری کردنی" ئیعدام کران، یەکێک لەو خوێندکارانە کیژەکوردێکی نۆزدە ساڵان بوو بە نێوی (لەیلا قاسم).

هەفتەیەک لەوە دواتر، شەش خوێندکاری کوردی دیکەی زانستگە ئیعدام کران. ئیدی هێرشی ئیعدام کردن بە درێژایی هەفتەکانی دواتر بەردەوام بوو. ئەوە بوو لە ماوەی یەک مانگدا، ژمارەی ئەو کوردانەی کە لە ژێر ئەشکەنجە دا مردن گەییە (٤٨) کەس و دیارە ئەم حالەتە لە مانگی ئەیلول دا گەییە (١٠٠) حالەت، زۆربەی کاتیش حکومەت جەنازەی کوژراوەکانی دەناردەوە بۆ گوندەکان و زێدی خۆیان و ئەمری دەکرد کە جەنازەکان بۆ چەند رۆژێک لە مەیدانێکی گشتی دا هەڵبواسرێن تا

جەماوەری خەڵکەکە چاوترسێن بین و ترس و لەرزیان بکەوێتە دڵ. تەنانەت تەلەفزیونی عێراقی لە رۆژی ۱٦/٦دا راستەوخۆ پرۆسەی ئیعدام کردنی سێ خۆێندکاری بە تۆمەتی (بەشداری لەکاری تێرۆریستی دا) لە شاشەوە نیشاندا. لە لایەکی ترەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان بێهودە کەوتە هەوڵدان بۆ سەرنج راکێشانی رای گشتی نێو دەوڵەتی بۆ ئەو کارەساتەی کە بە سەر خەڵکی مەدەنی کوردستاندا دەهێنراو داوای کۆمەکی پێویستی دەکرد. ئەوەبوو سکرتێری کاروباری راگەیاندنی پارت لە لەندەن، کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی سازدا، لەو کۆنگرەیەدا داوای کۆمەک و پیتاکی کرد بۆ "ئەو سەدان هەزار خەڵکەی کە لە ناوچە دەشتانی و شارەکانەوە هەڵاتبوون و رویان کردبووە ناوچە رزگارکراوەکان". بارزانی لە رۆژی ۱٥/٥دا یاداشتنامەیەکی بۆ (کورث ڤالدهایم)ی سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتوەکان ناردو داوای لێکرد کە تێبکەوێ و هێرشی ئاسمانی عێراقی بۆ سەر خەڵکی مەدەنی دانیشتوی گوندو شارەکان رابگرێ. دوای سێ هەفتە لە ناردنی یاداشنامەی ئێوبراو، شاندێکی پارتی کە دوو وەزیری جارانی وەزارتخانەی حکومەتی عێراقی تێدا بوو، لە ۸/٦دا نامەیەکی تری (بارزانی)یان دایە نەتەوەیەکگرتوەکان کە دەڵێ: "درێژترین شەڕی درندانە کە تا ئێستا جیهان بە خۆیەوەی بینی بێ، ئەو شەڕەیە کە دژی گەلی کورد، لە لایەن حکومەتی ئەو وڵاتەوە ئەنجام دەدرێ کە کوردی تێدا دەژی".

لە هەمان رۆژدا راپۆرتێکی دورو درێژ بە بەڵگەنامەو وێنەو نەخشەوە درا بە لیژنەی مافی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان، لە راپۆرەکەدا باسی ئەوە کرا بوو کە: "قڕ کردنی بە کۆمەڵی خەڵکی بێ چەک و روخاندنی خانوو بەرەو سوتاندنی دەغڵ ودان و بەروبومی کشتوکاڵی، بووە بە دیاردەو هەموو رۆژێک لە کوردستانی عێراقدا ئەنجامدەدرێ". بارزانی، بۆ جاری سێیەم هەوڵی دا کە سکرتـــێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان هانبدات و بیجوڵێنێ. بەڵام وەڵامی هیچ یەکێک لە نامەو یاداشتەکانی بارزانی بە تاقە وشەیەکیش نەدرایەوە. دبلوماتێک لە دەزگای راگەیاندنی ئەڵمانی دا، لە گوتارێکی دا دەربارەی ئەم مەسەلەیە نوسیویەتی: "ڤالد هایم، بۆیە بانگەوازەکانی بارزانی پشتگوێ خست، تا یەکێتی سۆڤیەت نەڕەنجێ، چونکە سۆڤیەت دەستێکی باڵای هەبوو لە هەڵبژاردنی دا بۆ سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان".

## من قەشەی (موسڵ)م

تەنیا کورد و لایەنگرانی بارزانی لە خەمی ئاراستە کردنی ئەم بابەتە گازی و بانگەوازانەدا نەبوون بۆ رای گشتی جیهانی. (گورگیس ملک چکو)ی بەتریاکی نەستوری یەکانی عێراق و سەرۆکی کۆمەڵەی کاروباری مەسیحیانی کوردستانی

(عێراق)ش بانگەوازێکی ئاڕاستە کرد بۆ پاپا پۆلس و کۆڕی کڵێسـای جیهانی و کۆڕی ئاوەدانکاری و لیژنەی مافی مرۆڤی سەر بە (UN) و خاچی سوری جیهانی لە کۆتایی مانگی ئاب دا. پەتریارک لە بانگەوازەکەیدا نوسیبوی: "لەوکاتەدا کە گەلانی دنیا مافی دیاری کردنی چارەنوسی خۆیان وەرگرتووە، گەلی ئاسوری و برا کوردەکانیان، لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە هەرەشەی کۆمەڵ کوژییان لێدەکرێ، چونکە داوای مافە سەرەتاییەکانیان دەکەن". هەروەها بانگەوازەکە باسی ئەوەشی کردوە کە چۆن بۆردومان وتۆپباران دەست لە خەڵکی مەدەنی بێ چەک و دێهات و ئاوەدانی ناپارێزن، کە سادەترین هۆو ئەوزاری بەرگریکرن لە خۆیان نی یە، چۆن مەڕو ماڵات قڕ دەکەن تا نانی خەڵکی ببڕن، هەروەها کڵێسـاو مزگەوت و قوتابخانە و خەستەخانە دەروخێنن.

بەتریاک لە بانگەوازەکەی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: "چارەنوسی ئەو کوردە ئاسوریانەی کە هێشتا لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتدا دەژین زۆر خەتەرترە، هەمیشە لە تەوهین و راوەدونان دەترسن حکومەت شێوازکانی ناوەراست بەکار دێنێ بۆ تۆقاندن و تیرۆر کردنیان.. لە نیوەشەودا هەڵدەکوتنە سەر ماڵەکانیان و بەزۆر خەڵکی ماڵەکە دەبەن، کە زۆربەیان منداڵ و ئافرەتن، دەخرێنە نێو ئوتومبیلی نیزامی یەوە و بۆ شوێنانی دوریان دەبەن و لەوێ ناچاریان دەکەن، بە نێو مین دا بڕۆن.. مەگەر ئەوانەی زۆر بەختیان یاربێ، لەرێگەدا توشی مەفرەزەی پێشمەرگەی لەشکری کوردستان بێن و لە مەرگ رزگار بن، دەنا زۆربەیان بەر لەوەی بگەنە ئاوەدانی لە برسان و لە تینوانددا دەمرن. هەروەها چەندین خێزان توڕ دراونەتە سەر جادەکان دوای ئەوەی مەفرەزەکانی ئەمن و استخباراتی عێراقی ماڵەکانیان تالان کردون و چی ئاو ماڵ و پارەو خشڵیان هەبوو بردویانە.. ئەوکارەی کە زۆر باوە، ئەوەیە کە حکومەت ئەو گەنج و ئافرەت و تەنانەت منداڵانەش دەگرێ کە خزمێک یان کەسێکیان پەیوەندی بە بزاڤی رزگاریخوازی کوردەوە هەبێ".

لە کۆتایی بانگەوازەکەدا، باسی زۆر حاڵەتی نیعدامکردنی مەسیحیانی عێراقی لەسەر دەستی پۆلیس و ئەمن و موخابەراتی رژێمی بەعس کردووەو ئەم سێ نمونەیەشی بۆ سەلماندنی دروستی ئەو حاڵەتە هێناوەتەوە:

١-توما چەچو، مامۆستای سەرەتاییەو خەڵکی بەغدایە، لە ماڵی خۆیدا دەستگیرکراوەو بۆ یەکێک لە حەپسخانەکان براوەو لەوێ لەژێرسوکایەتی پێکرن و ئەشکنجەداندا پسانویانەو مردووە.. شوێنی کارەبا بە زۆر شوێنی لەشی یەوە دیار بووە، دەستی براوەتەوە، چاویشی دەرهێنراوەو ماڵباتە کۆستکەوتوکەیان قەدەغە کردووە کە بە ئاشکرا کفن و دفنی بکەن و تازیەی بۆ دابنەن.

٢ - یوسف چەچو: قوتابی و برای چەچو بوو. مەفرەزەیەکی ئەمن گەنگردی تێپەربوون، گوێیان کەڕ کردو پاشان شێت بوو.

٣ - ئیسرائیل مروکیل: "لە زیندانیان هاویشت و پاش دوو ڕۆژ ئەشکەنجەی توند، ئەویش دین بوو".

بانگەوازەکەی بەم گوتانە کۆتایی پێهێنا: "ئەم هێرشی کۆمەڵ کوژی یەی کە دەکرێتە سەر گەلەکەمان، پێشێل کردنی ئاشکرای مافی مرۆڤە کە دەوڵەتان دانیان پێداناوە".

دوای ماوەیەکی کەم لە نوسینی ئەو بانگەوازە (ئایا پاولوس)ی ڕێبەری مەسیحیانی (کلدان-کاتولیک)ی کوردستانی عێراق، لە لای خۆیەوە بانگەوازێکی بۆ زۆربەی ڕۆژنامەکانی جیهان نارد. ئەم ڕێبەرەتەمەن (٧٤) ساڵەیە، نامەکەی بەم رستانە دەست پێکرد بوو: "ڕێزدار، جەنابی سەرنووسەر. منی قەشەی موسڵ کوردم". ئەویش هەموو ئەوکارەساتانەی شەرح کرد بوو کە موریدانی کلیساکەی لە سەردەستی بەعسیاتی حوکمڕانی بەغداوە دوچاری بوون. لە کۆتایی نامەکەیدا تکای لە ڕۆژنامەوانان کرد بوو کە کارێک بکەن "چیتر خوێن نەیەتە ڕشتن و بۆ خوێنەرانتانی ڕوون بکەنەوە کە چمان دەرهەق دەکرێت".

## ئەندریە زاخاروف لە مۆسکووە نارەزایی دەردەبڕێ

چ کەسێک گوێ ی لەو هەموو هاوارو قیڕین و بانگەوازە نەگرت. هەروەها ژمارەیەکی زۆرکەم لە ڕۆژنامەکانی جیهان ئامادە بوون ئەو بانگەوازە بڵاو بکەنەوە کە (ئەندریەزاخاروف) زانستکاری فیزیای سۆڤیەتی لە یەکێک لە خەستەخانەکانی موسکۆوە ناردبووی. ئەم بانگەوازە، ژنەکەی زاخاروف بە دزی یەوە گەیاندی یە دەرێ ی سۆڤیەت و بڵاوی کردەوە. زاخاروف، داوای لە UN کرد کە قوەتێکی ئاشتی بۆ عێراق بنێرێ، چونکە حکومەتی عێراق دەستی داوەتە شەڕێکی درندانە دژی کەمەنەتەوەیی کورد". هەروەها داوای کرد کە لەزێ بکرێ لە گرێدانی "کۆبونەوەیەکی نا ئاسایی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی و بڕیارێک بدرێ کە هێزەکانی عێراق کاری جەنگی دژی کورد رابگرن و داوا لە سۆڤیەت بکرێ کە چیتر چەک و تفاقی جەنگی بۆ عێراق نەنێرێ". زاخاروف لە سەری دەروات و دەڵێ نەتەوە یەکگرتووەکان کە تا نهو چ هەنگاوێکی نەناوە بۆ قەدەغەکردنی قڕکردنی گەلی کورد، لە سەریەتی نەیەڵێ کارەساتی بیافرا جارێکی دی دووبارە ببێتەوە.

هەروەها هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئەورووپی کە چەند ساڵێک بوو ڕێبەری بزوتنەوەیەکی نارەزاییان دەکرد، دژی تێوەگلانی ئەمریکی لە ڤێتنام دا، زۆربان چاوەڕوان کرد بەر لەوەی دەست بەوە بکەن کە بەشێک لەوەختی خۆیان بۆ بەرەڤانی لەگەلی کورد

تەرخان بکەن، ئەویش بە هاندانی رێکخراوی ئەنتەرناشنال ئەمنیستی و رێکخراوی بەرگری لەگەلانی بندەستی هەرەشە لێکراو بەنەمان. هەروەها کۆمەڵێک لە مامۆستایانی زانکۆی خەڵکی ئەڵمانیا، لەوانە نیمانویل گایس ئارنست بلوخ، نوسیب فلخت هایم، هلموت گولفتزر ، و هەندێ کەسایەتی بناڤ و دەنگی دیکەی وەک قەشە هاینرش ئەلبرش، ئەنگبورک دریفیتس، بانگەوازێکیان بە نێونیشانی "ئاوارە کوردەکان رزگاربکەن" نیمزا کردو لە هەندێ کاتی دیاریکراودا هەوڵ و کۆششی شەخسی خۆیان بۆ دۆزی کوردە ئاوارەکانی جەنگ تەرخانکرد.

هەروەها لە فەرەنسادا بەسەر پەرشتی رۆژنامەی لوموند، کۆمەڵێک رۆشنبیرو بەرەندەی خەلاتی نۆبڵ وە دەنگ هاتن و داوایان دەکرد دژایەتی ئەو پرۆسەی کۆمەڵکوژی یە بکرێ کە دەرهەق بە تێکرای کەمینەیەکی نەتەوەیی دەکرێ. سیمون دی بوڤوارو روجیەگارودی و جان پول سارتەر لە ریزی ئەو گروپەدا بوون. ژمارەیەک لەو کەسایەتیانەی ئەوروپای رۆژهەلات کە پەنایان بۆ رۆژئاوا بردبوو، پشتیوانی یان لە داخوازی یەکانی کورد کرد، لەوانە قارمانی شەترەنجزان لودڤیگ پاخمان و جیری پلیکان-ی نووسەر. لە بەریتانیاش دا (دیفید مارکهام)ی ئەکتەرو دەزگای ئاشتی برتراند رسل، هەوڵیاندا لەم بوارەدا دەوری ئاوبژیوانی ببینن.

## کەنگێ تاوانی شەڕ (مەسەلەی ناوخۆ) بوون؟

هیچ یەکێک لەو هەموو هەوڵە دادی نەداو چ ئاکام و ئەنجامێکیان بە قازانجی دۆزی کورد لێنەکەوتەوە. لیژنەی نێو دەوڵەتی خاچی سوور لە رۆژی ١٤/٨/١٩٧٤دا نامەیەکی بۆ جەنەراڵ بارزانی نارد، و بلسی ئەوەی کرد بوو کە حکومەتی نیزامی عێراق رێ ی نەداوە رێکخراوی خاچی سوور چ خزمەتگوزارییەک لەو کێشەیەی بەینی رژێمی بەغداو کوردا پێشکەش بکات.

هەر بەهەمان شێوە، رژێمی عێراق، رێ ی بە رێکخراوە خێرخوازە نێودەوڵەتی یەکانی دیکەش نەدا، کە کۆمەک بەکورد بکەن. بەعسییان وەکو جاران سور بون لە سەر ئەوەی کە لە (باکوری نیشتمانی خۆشەویستمان)دا چ جەنگێک نی یەو بۆیە پێویست بە چ کۆمەکێک ناکات. خاڵێکی زۆر گرینگی دیکە هەبوو کە کردییە کارێک، کورد چ جۆرە کۆمەکێکی شایستەی چنگ نەکەوێت، ئەویش ئەوە بوو: ئەو دەوڵەتە ئەورووپی یە رۆژاواییانەی کە ئامادە بوون بە هەق و بە ناهەق خۆلە کاروباری نێوخۆی وولاتانی دی هەڵقورتێنن، لە ئاستی کوردا هەموو بوون بە کەرەی شەریەت. بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەو شتە بوو کە لە بەریتانیادا روویدا، ئەوە بوو (جان سپراوت)ی نوێنەری حیزبی موحافەزەکاران لەگەڵ هەڤاڵەکانیان لە فراکسیونی نوێنەرانی حیزب دا (راس جونستن) و (سیربرنارد براین) لە کانونی دووەمی

١٩٧٥ دا بەناوی پەرلەمانەوە داوایەکیان بەرز کردەوە، کە داوا لە حکومەتی بەریتانی دەکەن کە لە بواری ئینسانی دا کاری پێویست بۆ کورد بکات و دەسەلاتی بەریتانی لە نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ قازانجی کورد وەگەڕ بخات.

پەرلەمان،موناقەشەیەکی توندو تا ئاسایی ئەم داوایەی کرد. ئەوە بوو پەیڤداری (ناطق) رەسمی حکومەت بە چەند رستەیەکی رۆتینی باو وەلامی دایەوە کە: "هەرکاتێک UN یان دەولەتێکی بێگانە داوایەکی وەها بکات، یەکسەر کۆمەکی بەریتانی پێشکەش دەکرێ" و "تاکو ئێستا هیچ داوایەکی لەو جۆرە نەکراوە". ئەوسا (جونستن)ی نوێنەری موحافەزەکار وەلامی دایەوەو گوتی: "تکام وایە جەنابی وەزیر لەوە حالی بێ کە ئێمە دەولەتی عێراقمان دامەزراندوە، بۆیە ئێمە مەسئولیەتێکی تایبەتیمان لەم شەڕی قڕکردنەدا دەکەوێتە ئەستۆ و ئێمە لە رووی ئەخلاقی یەوە لە سەرمانە کۆمەکی ئینسانی پێشکەش بکەین و یارمەتی ئاوارەکان بدەین و دەمودەست نارەزایی خۆمان دەرببڕین بەرانبەر بەوەی لەوێندەر ئەنجامدەدرێ و روودەدات".. کاتێ نوێنەرەکان، گوشاریان خستە سەر وەزیرەکەو داوایان لێکرد ئەوەیان بۆ روونبکاتەوە کە ئاخۆ بەریتانیاش وەکو یەکێتی سۆڤیەت تێوەگلاوەو چەکی بۆ عێراق ناردووە تا لە قەسابخانەکانیا دژی گەلی کورد، بەکاری بێنێ؟ وەزیرەکە بێدەنگ بوو و مەتەقی لێوە نەهات.

مەسەلەکە، لە ئەلمانیای (فیدرالی)ش دا رەوتێکی لە بابەتی ئەوەی بەریتانیای گرتە خۆ: شاندێکی سەرکردایەتی پارتی، کە سامی رەحمانی وەزیری جارانی وەزارەتخانەی عێراقیشی لەگەل بوو، بێهودە هەولیان دا دیدارێک لەگەل لایەنە رەسمی یە پەیوەند دارەکانی ئەلمانیای فیدرالی دا ساز بکەن، بەلام شاندی ناوبراو نەیتوانی چ مەسولێک لە وەزارەتی دەرەوە یان لە وەزارەتی کاروباری هاوکاری و ئابوری بدێنێ. هەروەها هەولێکی دیکەش بۆ سازدانی دیدارێک لەگەل سەرکردایەتی حیزبی سوسیال دیموکراتی حوکمران فەشەلی هێنا؛ ئەگەر چی پارتی خۆی بە حیزبێکی سوسیال دیموکرات حەساو دەکرد.

(ئەلیوس میرتس)ی نوێنەری حیزبی یەکێتی ی دیموکراتی- مەسیحی و پسپۆڕ لە کاروباری دەرەوە، تاکە سیاسەتوانی ئەلەمانی بوو کە گوێ ی لە راپۆرو داخوازی سیاسەتوانە کوردەکان گرت. هەروەها (فرانس یوزیف شتراوس) کۆبونەوەی کۆنگرەی حیزبەکەی خۆی، کە لەو رۆژەدا دەبەسترا، بۆ چەند سەعاتێک بە جێهێشت و چاوی بە شانوی کوردی کەوت. ئەم پیاوە کاتێ خۆی کە وەزیری دارایی بوو، یارمەتی کوردی دا بوو. (شتراوس) لەگەل شاندی کوردیدا باسی ئەو رێگایانەیان کرد بوو کە دەشێت لێوەی کۆمەکی ئینسانییان پێشکەش بکرێ. ئەوە بوو مەسەلەکە گەیەنرایە لیژنەی سیاسەتی دەرەوەی پەرلەمانی ئەلمانیای فیدرالی، بەلام (مویرش)ی وەزیری وەخت،

هەموو جارێ موناقەشەی مەسەلەکەی دوا دەخست. بە روونی دەرکەوت کە هەڵوێستی حکومەتی ئەڵمانیای فیدرالی بەرانبەر بە رەفتاری رژێمی عێراقی دژ بە کورد، لەسەر ئەو بناغەیە رۆنراود کە مەسەلەکە "مەسەلەیەکی ناوخۆییەو تەنیا پەیوەندی بە عێراقەوە هەیە". ئەو نامەیەی کە (هربرت ڤینر)ی سەرۆکی فراکسیونی حیزبی سوسیال- دیموکرات لە پەرلەماندا نووسی، بلشترین بەڵگەیە کە وڵاتانی ئەوروپای رۆژاوایی ئامادە نەبوون، تاوانەکانی جەنگ و قڕکردنی دەستەجەمی کەمینە نەتەوەییەکان بەپێشێلکرنی مافی مرۆڤ حساو بکەن. بەڵکو (تەنیا مەسەلەیەکی ناوخۆییە). (ڤینر) لە رۆژی ١٥/ ١٠/ ١٩٧٤ دا نوسیویەتی کە: "پێویستە بەر لە هەر شتێک ئەوەمان لە بیربێ کە مەسەلەکە بۆ حکومەتی عێراقی، مەسەلەی ژیان و مەرگە، چونکە ئەو ناوچەیەی کورد داوای دەکەن، دەوڵەمەندترین ناوچەی عێراقەلە رووی ئابوری یەوەو نزیکەی ٢ لەسەر ٣ی سادیراتی نەوتی عێراق لەم ناوچەیەدا دەردەهێنرێ".

سەرانی کورد، لە بارەگای بارزانی دا، بە زمانێکی پڕ لە بێ هیوایی و نائومێدی یەوە، لە وەڵامی ئەو هەڵوێستە دا دەیانگوت: "وادیارە هیچ دەوڵەتێک ئامادە نی یە پەیوەندی خۆی لەگەڵ وڵاتێکدا تێک بدات کە بتوانێ نەوت بفرۆشێت". (حەبیب کەریم)ی سکرتێری پارتی، کە لە هەموو بۆنەیەک دا ئەوەی دەوپات دەکردەوە کە گوایە حیزبەکەی نزیکە لە حیزبە سوسیال دیموکراتەکانەوە، لە تەعلقێکی دا دەربارەی ئەم هەڵوێستە گوتی: "حیزبی سوسیال دیوکرات لە ئەڵمانیادا حیزبی حوکمڕانە، کەواتە ئاساییە دەبێت هەوڵبدات پەیوەندی یەکانی خۆی لەگەڵ عێراقدا بپارێزێت، نەک بایەخ بە پەیوەندی لەگەڵ کەمینەیەکی نەتەوەیی عێراقی بدات".

## رێگا شاخاوی یە سەختەکان پڕدەبن لە سەدان هەزار ئاوارە

هیچ لایەنێکی رەسمی لە لەندەن یان لە بۆن ئامادە نەبوو باوەڕ بەو کارەساتە بکات کە لە کوردستاندا روویدەدا. وەزع و حاڵی ئاوارەکان زۆر لەوە خراتر بوو کە بە بیرو خەیاڵی ئەڵمان یان فەرەنسی یان خودی بەریتانی یەکاندا بێت کە بە خۆیان لەو روەوە خاوەنی ئەزمونی دوورودرێژ بوون. من وام بۆ رێکەوت کە لە نزیکەوە ئەم وەزعە بدینم و چەند گوتارێکی رۆژنامەوانیم دەربارەی دەیان هەزار کەس لەو خەڵکە هەژارو ماندوو بێ دەرەتانە گوناحە نووسی و بڵاوکردەوە، کە تروسکەی چ هیوایەکیان لە ئاسودا نەدەبینی تا دڵی پێ خۆشبکەن.

دوو فەرمانبەری سەفارەتخانەی ئەڵمانی لە تاران، بەکۆمەک و یارمەتی لایەنە رەسمی یەکانی ئێران، لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلیان لەمەڕ وەزع و حاڵی کوردە ئاوارەکان و چۆنیەتی یارمەتی دانیان ئامادە کرد. ئەوە بوو راپۆرتێک لەمەڕ

ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە درا بە هۆیەی (٣١١)ی وەزارەتی دەرەوە لە بۆن، لە ئوکتوبەری١٩٧٤دا. لە ساڵی ١٩٧٥دا کۆمەڵە بەندێکی دیکەش خرایە سەر ئەم راپۆرە.

راپورەکە، ئەوە دەگەیەنێ کە کوردەکان وەختێ پەنایان وەبەر ئێران برد کە سوپای عێراقی بۆردومان و تۆپبارانی گوندو ئاوەدانی یەکانی دەکرد. بەمەش هەموو ئەو راستیانە ساغ بونەوە کە پێشتر چەندین رۆژنامەنوس ئاماژەیان بۆ کرد بوون. سەفارەتخانە بۆ (بۆن)ی نووسی: "هەر چەندە وەزیری دەرەوەی عێراق لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی دا، کە لە لەندەن سازی داوە، وا باسی ئەم تۆپبارانەی کردوە کە گوایە تەنیا (هێرشێکی تەمبێکارانەیە) بەڵام هەموو هێماو بەڵگەکان ئەوە بە دیار دەخەن کە حکومەتی عێراق هەموو توانایەکی وەگەڕ خستوە کە ئەم بۆردومان و تۆپبارانە زۆرترین ناوچە بگرێتەوە. هەروەها زۆر دڕندانە رەفتار لەگەڵ خەڵکی مەدەنی هەندێ لەو شوێنانە کراوە کە حکومەتی عێراقی گرتونیەوە و دەستی بە راگوێزانی کوردەکان کردوە بۆ باشور".

خەڵکی دەربەدەرو ئاوارەی جەنگ، لە هەوەڵەوە بەزۆری روەو سنورەکانی تورکیا و سوریا هەڵدەهاتن. بەڵام تورک سنوری خۆیان داخست و رێیان بە کورد نەدا بچنە خاکی تورکیاوە. سوریاش فەرمانی دا ئەو هەزاران ئاوارەیەی کە چوبوونە خاکی سوریاوە دەربکرێن و هەڕەشەی لێکردن کە تەسلیم بە عێراقیان دەکاتەوە. ئەمە وایکرد خەڵکەکە بە ناچاری روو بکەنە ئێران. سەرەتا چەند گروپێکی کەم لەو ئاوارانە گەیشتنە سنوری ئێران و لە هەردوک رەخی سنورداو بۆ چەند هەفتەیەک مانەوە، بێ ئەوەی ئێران بڕیارێک بدات کە چییان بۆ بکات.

من بە خۆم پتر لە جارێک لە هاوین و پایزی ١٩٧٤و لە بەهاری ١٩٧٥دا لە سنوری عێراقی- ئێرانی یەوە، لە رێگەی خانە- پیرانشار و حاجی ئومەرانەوە هاتوچۆم بووە. لەم سەفەرانەم دا هەزاران ئاوارەم دەبینی لە دەوروبەری مەخفەری سەر سنور پەرت و بڵاو بوو بوونەوە بێ ئەوەی ئەشتەبایان هەبێ کە لە سەرماو باهۆزو بارانیان بپارێزێ بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەر باش بوو چونکە بەلای کەمەوە لەبۆردومانی ئاسمانی عێراقی خەلەسیبوون؛ چونکە ئێران لەوێ، لەسەر سنور قوەتێکی موشەکی (هەنتەر-هۆک)ی فرۆکە شکێنی دانا بوو.

## رێژەی مردن لە نێو منداڵاندا دەگاتە ١٠٠٪

کاتێ ژمارەی ئاوارەکان بەرەبەرە رووی لە زیادی کردو لە هەزارانەوە هەڵی بوارد بۆ دەیان هەزار و (سەدان هەزار لە پایزی ساڵی ١٩٧٤)دا، هەنگێنێ شا داوای لە رێکخراوی (شێروخورشید)ی ئێرانی کرد، کە وەکو رێکخراوی خاچی سوری

وولاتانی ئەوروپا وایە و هەمان ئەرکی ئەوان دەبینێ، کە ئاوارەکان لە دیوی ئێران دا بحەوێنێتەوە و نیشتە جێیان بکات. فەرمانی دا کە سەد ملیۆن دۆلار بۆ ئەو مەبەستە تەرخانبکرێ کە پاشان و لە زستاندا زیادکراو کرا بە ٣٠٠ ملیۆن دۆلار..

بە پێ ی لێکۆڵینەوەی سەفارەتخانەی ئەڵمانی لە تاران: "ئەو ئاوارانەی کە روویان کرد بووە ئێران ٣٠٪ ئافرەت و ٦٠٪ منداڵ و ئەوانی دیکە پیرە پیاوی بەساڵا چوو بوون؛ چونکە ئەو پیاوانەی کە توانای چەک هەڵگرتنیان هەبوو لە کوردستانی عێراقدا مابوونەوە. زۆربەی ئەو ئاوارانە ماوەی ٦٠٠ کیلۆمەتریان بە پێیان بڕی بوو بە تایبەتی ئەوانەی کە خەڵکی ناوچەکانی رۆژاوای کوردستان بوون و لە سەرەتادا روویان کرد بووە تورکیا و تورک رێ ی نەدا بوون بچنە خاکی تورکیاوە ئیدی ناچار بەشی هەرە زۆری روبەری کوردستانیان بە پێ بەرەو ئێران بڕی بوو. ئەو ئافرەت و منداڵانەی کە دەگەیینە ئێران، هێندە داماوو شەکەت و ماندووی رێگاوبانی سەخت و دورو درێژ بوون، مرۆڤ بەزەیی بە حاڵیاندا دەهاتەوە. هەموو سەروەت و سامانێکیان تەنیا جلەکانی بەریان بوو. ئافرەتەکان سەرو مەنجەڵی چێشت لێنان و کیسەیەک ئاردیان پێ بوو. مەگەر یەکێک زۆر بەختەوەر بوایە، پەتۆیەک یان نوێنی خەوتنی پێ بوایە، بەڵام هەر هەموویان وەکو یەک برسی و ماندوو بوون و هەموو پێ وپلیان ئاوساوو بریندار بوو.

بەگوێرەی راپۆری دوو فەرمانبەرە ئەڵمانی یەکەو سەرژمێری رێکخراوی شێروخورشید و پزیشکانی کورد، رێژەی مرن لە نێو منداڵانی شیرەخۆرەدا گەلەک سامناک بوو، و دەگەییە ١٠٠٪، بە تایبەتی لەو ماوەیەی نێوان سەرەتای راکردنەکەیان و گەیشتنیان بە ئێران کە ئیدی بە پێ ی توانا مالیجە دەکران.. سەبارەت بە منداڵانی کەمتر لە دوو ساڵان رێژەکە ٧٠٪ و منداڵانی کەمتر لە پێنج ساڵ ٣٠٪ بوو. هۆیەکانی مردنیان بەزۆری ئەمانە بوون: کەم خۆراکی و بەدخۆراکی، سک چوون ورەوانی، ماندوبوونی زۆرو (کاریگەری دەرەکی). راپۆرەکەی سەفارەتخانەی ئەڵمانی دەڵێ: "هەرچەندە ئاوارەکان رایانگەیاندوە کە فرۆکە عێراقی یەکان بەنزمی یەوە بە سەریاندا فڕیون و بەدەم راکردنەوە بۆردومانی کردون، بەڵام پێدەچێت رێژەی مردن لە سۆنگەی ئەم فاکتەرەوە کەم بووبێ؛ چونکە جوگرافیای کوردستانی عێراقی پەناو پەسێوی زۆری تێدایە بۆ خۆ حەشاردان و پاشان خەلەسێن لە بۆردومان.. لەگەڵ ئەوش دا کوردە ئاوارەکان هیچ زانیاری یەکی گشتی و وردیان نی یە دەربارەی ئەوانەی کە لە رێگادا مردون، چونکە ئامێرێک نی یە ئەو حاڵەتانە تۆمار بکات. هەڵبەتە هەمان حاڵەت سەبارەت بە قوربانیانی بۆردومان و تۆپباران هەیە.

بە پێ ی هەندێ ژمارەو بۆچون، ژمارەی ئەمانە دەگاتە ٢٠-٣٠ هەزار کەس. بەڵام رەنگە ژمارەی راستەقینە و لەگینی ئەمانە بگاتە ٥-١٠هەزار کەس. بەڵام لەگەڵ

ئەوەش دا مەحالە ژمارەی دروستی قوربانیان بزانرێ؛ چونکە زۆر جار گوندێک بە تۆپباران و بۆردومان خاپورکراوەو هەموو خەڵکەکەی قڕکراوە تاقە یەک کەسیان لێدەر نەچووە تا بە خەڵکی رابگەیەنێ کە ژمارەی خەڵکی گوندەکە لە کاتی بۆردومان و تۆپبارانەکەدا چەند کەس بوون. زۆر جار لە رێگاو باندا جەنازەی ئەو زامدارانە دەدۆزرایەوە کە لە بە بریندار بەرەو نزیکترین شارۆچکە یان تیمارستان ملیان ناوە. بە هۆی تووشی ناوچە شاخاوی یەکانی کوردستانی عێراقەوەو چونکە بۆردومان و تۆپبارانی عێراقی دەگەیە ئەو کوێرە گوندە دورە دەستانەی کە لە هیچ سەرژمێری یەکی رەسمی دا تۆمار نەکرا بوون، بۆیە ئەستەمە ژمارەی دروستی قوربانیان دیاری بکرێ".

تا مانگی ئەیلول، پتر لە سەد هەزار ئاوارەی کوردی عێراقی گەیینە ئێران و لە پایزدا هەشتا هەزار کەسی تریشیان چووە سەر. ئەمە جگە لەوەی خەڵکی ناوچە نزیکەکانی شەر، هەڵدەهاتن و دەیان گواستنەوە بۆ هێڵەکانی پشتەوەی شەرگەکان.. بۆیە دەتوانرێ بگوترێ کە لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷۵ دا پتر لە نیو ملێون ئاوارەو دەربەدەری جەنگ هەبوون و ئەمەش دەکاتە شەش یەکی هەموو خەڵکی کوردستانی عێراق.

ئێران، لە سەرەتادا ئاوارەکانی لە ناوچەکانی کوردستانی ئێراندا دامەزراند، واتا لە پارێزگاکانی ئازربایجانی رۆژاواو کوردستان و کرماشان دا دایمەزراندن. پاشان شا کەوتە ناردنی ژمارەیەکی زۆریان بۆ پارێزگای (خوزستان) لە باشور، و لەوێندەر ئوردوگای بۆ کردنەوەو خێوەتی بۆ هەڵدان. دیارە ئەمە وەختێ کرا کە ژمارەی ئاوارەکان زۆر زیادی کردو لە توانای پارێزگاکانی کوردستانی ئێراندا نەما هەموویان بحەوێنێتەوە، لە لایەکی تریشەوە لەبەر هەندێ هۆی سیاسی بوو؛ چونکە شا حەزی نەدەکرد ژمارەیەکی زۆری کوردی عێراقی لە ناوچە کوردنشینەکانی ئێران دا هەبن.

## رێکخراوی (شێروخورشید) فریای ئاوارەکان دەکەوێ

مشورخواردن و تیمار کردنی نەخۆش و زامدارەکان، مایەی خۆشحاڵی و سەرنجی چاودێرانی رۆژاوایی و خودی کوردەکانیش بوو. قەرەوێڵە و تەختی زیادە لە هەر هەموو ئەو خەستەخانە ئێرانیانەی نزیکی سنورەکان دانران؛ ئەمە جگە لە دامەزراندنی خەستەخانەی ناناسایی لە نێو قوتابخانەو خانەی ئەوجەوانان و هەندێ بینایەی رەسمی دیکەدا. نەخۆشی ئێرانی و کورد لە لایەن پزیشکانی ئێرانی و پزیشکانی کوردی عێراقی یەوە وەکو یەک مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا. جیاوازییەکی زۆر هەبوو لە نێوان خەستەخانە مەیدانی یەکانی سەر سنورەکان و خەستەخانەکانی ناو شارەگەورەکانی دوور لە سنورەکانەوە. هەڵبەتە هەندێ نەخۆشی و حاڵەتی خەتەر لە مەرکەزی شارانی وەک: تەورێز، سنە، ئورمێ مالیجە دەکران یان رەوانەی تاران دەکران.. بەڵام

پێشمەرگە زامدارەکان. هەر هەموویان لە خەستەخانەکانی سوپای ئێرانی دا مالیجە دەکران و ڕێگە بە رۆژنامەوانان و فەرمانبەرانی سەفارەتخانە بێگانەکان نەدەدرا لە وێندەر سەردانیان بکەن.. زۆر خەستەخانەی مەدەنی ئێرانی، بە پێ ی پێویست و بە شێوەیەک دەرەقەتی حاڵە تازەکە بێت دەستکاری کران، لێرەدا تەنیا دوو نموونە وەکو بەڵگە باس دەکەین:

- خەستەخانەی (پاوە)، پارێزگای کوردستان: لە حاڵەتی ناساییدا ٣٥ تەختی تێدا بوو، ئوکە کرابوو بە ١٠٠ تەخت. خەستەخانەیەکی هاوچەرخە، ئامێری تیشک و دکتۆری ددان و ئەوشتانەی تێدایە. سێ پزیشکی ئێرانی تێدایە کە هەندێکیان پسپۆڕی هەناوو نەشتەرگەرین، ئەمە جگە لە دوو پزیشکی کوردی عێراقی کە یەکێکیان پیاوەو ئەوی تریان ژنە. هەشت نەخۆشی ئێرانی وچەندین نەخۆشی کوردی عێراقی تێدا بوو.. جۆری نەخۆشی و حاڵەتەکان ئەمانەبوو: پارچە لە دەست و لاق و لەشدا، دوو ئافرەت کە بە بۆمبی ناپاڵم سوتا بوون. چەند منداڵێکی بە پارچە پێکراو، یەکێک لەو منداڵانە چوار ساڵ بوو، و پارچە بەر زکی کەوتبوو. پزیشکە ئافرەتەکە دەیگوت مانی منداڵەکەو تەحەمول کردنی ئەو هەموو ڕێگەیە تا گەیەنراوتە ئێرە خۆی لە خۆیدا سەیرو باوەڕ نەکردەنی یە. چەندین ئافرەتی دێهاتی کە پارچە لە دەست و لاق و لەشیاندا بوو. چەندین پرۆسەی نەشتەرگەری سینەو منداڵ لەبارچوون، کەبە هۆی باری دەرونی یەوە، منداڵەکان دەمرن، لەم خەستەخانەیە ئەنجام دەدرا.

- خەستەخانەی (مەریوان)، پارێزگای کوردستان: لە حاڵەتی ناساییدا ٣٥ تەختی تێدا بووە، ئوکە کرابوو بە شەست تەخت. تەختی تازەلەڕاڕەوو قاوشەکاندا ڕیزکرا بوون. تەنیا چوار نەخۆشی ئێرانی تێدا بوو، ئەوانی دیکە خەڵکی مەدەنی کوردی عێراق بوون. دوو دکتۆری کوردو دوو ئێرانی تێدا بوو. سیمای نەخۆشە کوردەکان دیار بوو کە هیچیان پێشمەرگە نین. جۆری نەخۆشی و حاڵەتەکان ئەمانە بوو: برینداری لاق بە شێوەیەکی گشتی، جگە لە پارچە لە باسک و لاق و سینەدا. دوو ژوور بۆ ئەو ئافرەتانە تەرخان کرا بوو کە پارچەیان بەرکەوتبوو، یان بە هۆی ماندوبونی ڕێگاوە منداڵیان لەبار چووبوو، نەشتەرگەری سینە، هەندێ لە نەخۆشەکان بە هۆی بزردومانەوە تۆشی بارگرژی دەرونی بووبوون. لە نێوئەوانەدا کە پارچە بەر باسک و لاق و سینەیان کەوتبوو، هەرزەکاری تەمەن ١٠-١٤ ساڵ دەبینران. کیژۆڵەیەکی یازدە ساڵان لەوێ کەوتبوو تووشی کەمخوێنی بووبوو؛ خوێنی گروپی (O) دەستنەدەکەوت. لە سەرەتای ڕەوەوە بە کۆمەڵەکەوە (٣٠٠٠) نەخۆش لەم خەستەخانەیەدا چارەسەر کرا بوو، (٧٠٠) حاڵەتیان لە خەستەخانەدا خەوێندرابوون.

زۆربەی هەرە زۆری ئاوارەکان لە ئوردوگای چادرا نیشتەجێ کران. گەورەترین ئوردوگا ئەو دوانە بوو کە لە پارێزگای (ئازربایجانی رۆژا) کرانەوە، هەر یەکەیان دوانزە هەزار ئاوارەی تێدا بوو. چوار ئۆردوگاش لە پارێزگای کرمانشان کرانەوە کە بە هەموویان (٣٠) هەزار ئاوارەیان تێدا بوو. ئەمە جگە لە چەندین ئوردوگای دی کە لە پارێزگای خوزستانی باشوری گەرمەسێردا کرا بوونەوە.

رێگە بە پیاوانی لە شەست ساڵ هێروەتر نەدەدرا بە بەردەوامی لە ئوردوگادا بمێننەوە، تەنێ بۆ قەتاندنی مۆڵەتەکانیان رێگە دەدران. زۆربەی دانیشتوانی ئۆردوگاکان ئافرەت و منداڵ و پیرەمیر بوون. هەڵبەتە حکومەتی ئێران بۆیە ئەوەی دەکرد تا ماڵباتە کوردەکان هەوڵنەدەن بە یەکجارەکی لە وولاتی ئێراندا بمێننەوە. یەکێک لەو کەسانەی کە سەردانی ئەم ئۆردوگایانەی کردبوو، لە نوسینێکی دا دەڵێ: "زۆر ئاسایی بوو هەموو ئێوارەیەکی هەینی دیمەنی خەمینی دوعاخوازی و بەرێکردن دوبارە بێتەوە: ژنانی چاو بە روندک، منداڵانی خۆ هەڵواسیو بە قەدی باوکانی لە سەر سەفەر بۆ شەرگە".

کە رۆژان تێپەرین و زستان بەردەرکەی لە عالەم گرت، ئێرانی یەکان دیقەتیان دا چاریان ناچارە، خانو بەرە بۆ حەوانەوەی ئەو ئاوارانە دابین بکەن. بۆیە لە سەرەتای تابی ١٩٧٤وە دەست بە گواستنەوەی ئەو ئاوارانە کرا،کە زستان هەرەشەی لێدەکردن بۆ چەند ئوردوگایەک کە هەریەکەیان ٥-١٥ هەزار کەسیان دەگرت و خەرجی دروست کردنەکەیان یەک ملیۆن دۆلاری تێ چووبوو. ئەم ئۆردوگایانە لە نزیکی ناوچە نیشتەنی یەکانی ئێران دا دروستکرابوون، تا ئەگەر ئاوارەکان گەرانەوە بۆ عێراق، ئێران سودی لێ بدینێ و خەڵکی خۆیانی تێدا ئاکنجی بکەن. هەڵبەتە دروستکردنی ئەم ئوردوگایانە بەو دەست و بردەو بەوهەموو پارە زۆرەوەکە تێ ی چووبوو، بەلای زۆربەی چاودێرانی رۆژاواییەوە، کارێکی زۆر مەزن و رێک وپێک و جێگەی تەقدیر بوو، چونکە زۆربەی ئەو چاودێرانە باوەریان نەدەکرد ئێران توانای جێبەجێکردنی پرۆژەیەکی وەها مەزنی هەبێ. چونکە بەر لە هەموو شتێک دەبوایە کەرەستەو تفاقی بیناسازی لە دوری سەدان کیلۆمەترەوە بهێنرێ. هەروەها پرۆژەکە لە ماوەیەکی زۆر خێرادا هاتە ئەنجامدان؛ رۆژی ٢٠/١٠/١٩٧٤ یەکەمین ئۆردوگای ئەم پرۆژەیە تەواو بوو، و ئامادە بوو تا خەڵکی بچنە ناوی.

کۆمەکی ئێرانی بەرادەیەک فراوان بوو، تەنانەت ئەو گروپە هەوادارەی بارزانی، کە رۆژێ لە رۆژان باوەریان بەو قسانەی ئێران نەبوو کە گوایە کوردو ئێرانی هاوچارە نوسن، ناچار بوون بێدەنگ بن و چ هەنجەتێکیان بە دەستەوە نەمێنێ تا بەردەوام بن لە سەر گومان کردن لە هەڵوێستی ئێران. یارمەتی دانی ئاوەرەکان و ناردنی کۆمەکی چەک و ئازوقە بۆ پێشمەرگە، کارێکی وایکرد هەست بکەن لە مەینەتی

بەکانیاندا تەنیا باڵ نین و بە لای کەمەوە دۆستێک هەیە دەستی پێیانەوەیە، ئەویش محمد رضا پەهلەوی شاهنشای ئێرانە. ئەوە بوو شا، جارێکی دیکەو لە رۆژی ١٤/١/١٩٧٥دا، لە دیمانەیەکی دا لەگەڵ تەلەفزیونی ئەمسادا، ئاماژەی بۆ چارەنوسی هاوبەشی ئێران و کورد کردو گوتی: "کورد، هاونەژادی ئێرانی یەکانن و هەموو هاوسۆزییەکیان لەگەڵ دەکەین و هەرچی یەکیان پێویست بێ دەیاندەینێ تەنیا چەکی قورس نەبێ، ئەمەش ئاساییە: چونکە جێگەی تانک و فرۆکەیان لەکوێ بوو؟"

## هنری کیسنجر خۆی لە وەڵامدانەوە دەبوێرێ

تا لەم کاتەدا، هەندێ هێمار ئاماژە هەبوون، نیشانەی ئەوە بوون کە کۆمەڵێک گۆرانکاری گرینگ بە دەستەوەیە، لە پشت پەردەی سیاسەتی دەولی یەوە کاری بۆ دەکرێت و دوور لە هەراو وهەنگامەی راگەیاندنی بەرواڵەت هاوسۆزو ئامەزرۆی کۆمەکی مرۆڤانی بۆ کورد و دوور لەو قسە زلانەی باسی "خەباتی برایانەی هاوبەش دژی رژێمی عەسکەری بەعس" دەکەن.. کوردی دڵپاکی خۆشباوەڕیش، کە گفت وبەڵێنی شەرەف سەنگی مەحەکە بۆ هەر مامەڵە و سەودایەکیان، بێ ئاگا بوون لەم گۆرانە چارەنوس سازانەی کە بە دەستەوە بوون.

بەڵام دەبوایە بارزانی هەر لە هەفتەکانی هەوەڵی دەستپێکردنەوەی شەڕەوە هەستی بە رووداوەکان بکردایە: ئەو کۆمەک و یارمەتیيانەی کە ئەمریکی وئێرانی یەکان بەڵێنیان دابوو بە کوردی بدەن، لە هەفتەی چوارەمی شەڕەکەوە، رێک لە کۆتایی مانگی نیسان و سەرەتای مانگی مایسەوە لەکەمی داو ئەو شتانەی کە لە سنوری ئێرانەوە دەهاتن بە شێوەیەکی پچرپچرو بەوەجبەی کەم دەگەیشتن، دیار بوو هیچ نیازێک لە گۆرێ نەبووکە کورد بگەیەنرێتە ئاستێک بتوانی بنکەیەکی لۆجستی بۆ خۆی رۆبنێ و یەدەکی خۆی هەبێ، مەبەست لەمە ئەوە بوو کە چاویان لە دەستی ئێران و ئەمریکا بێ و نەتوانن بە شێوەیەکی سەر بەخۆو کارا لە شەڕەکاندا بجوڵێن، ئەوە بوو سەرکردایەتی شۆڕش، دوو نوێنەری بۆ واشنتون نارد تا قسە لەگەڵ لایەنی ئەمریکی گفتوگۆکەی نێوان کورد و ئەمریکادا بکەن کە بریتی بوون لە (کونالی) و (کیسنجر)و پێیان بڵێن کە پەلە بکەن لە ناردنی ئەو کۆمەکە عەسکەرییانەی کە لە سەری رێکەوتبوون.

بەڵام کیسنجر، لەو سەروبەندەدا سەرقاڵی دۆزینەوەی چارەسەرێکی کاتی نێوان میسرو ئیسرائیل بوو لە سینا، ئەمە هەوڵێک بوو کە حکومەتی بەعسی سوری زۆر بەتوندی دژایەتی دەکرد. بۆیە کیسنجر سەیری کرد کاریگەرترین گوشار بۆ سەر سوریا ئەوەیەکە گوشار لە سەر عێراق کەمبکرێتەوە، چونکە بەغدا یەکەمین هەڤرکی سوریا

بوو له سەر ڕێبەری کردنی گروپە توندڕەوەکەی وولآتانی عەرەبی. دیارە ئەمەش وایدەخواست ڕێ بە کوردەکان نەدرێ بەرادەیەک بە هێزبێن کە ببنە مایەی خەتەری جدی بۆ سەر حکومەتی عێراقی. لە بەرهەر هەموو ئەم هۆیانە کیسنجر، پێشوازی شاندی کوردانی نەکرد، بۆیە کۆمەڵێک بەڵێنی ڕەوتەنی ئەوتۆ بە شاندی نێوبراو درا کە ئەمریکا بە شێوەیەکی پێویست پابەند نەکات پێیانەوە. ئیدی شاندەکە بۆ کوردستان ڕەوانکرایەوە. دیارو ئاشکرابوو کە ئەمریکی یەکان کەوتنە خۆ دزینەوە لەو بەڵێنانەی دابوویان و گوتبوویان لە حاڵی هەڵگیرساندنەوەی شەڕدا، دەچنە ژێر باری هەر شتێک کە بەسەر کوردا دێت و ئەوان مەسئولیەتەکەی هەڵدەگرن.

لەوکاتانەدا کە لەشکری پێشمەرگەی بارزانی خۆراگرانە لە سەنگەرەکانیاندا دامەزرابوون و بەو پەری فیداکاری و قارەمانی یەوە بەگژ سوپای عێراقی دا دەچوون، ئەو سوپایەی کە یەکێتی ی سوڤیەت هەموو پێداویستی یەکانی زۆر بە زیادەوە بۆ دابیندەکرد، سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هەستی دەکرد راسپێردراوە کە لەبری هەموو جیهانی ڕۆژاوا شەڕ بکات، و ئەمەیان لە لایەن واشنتون و تارانەوە پێ ڕاگەیەنرا بوو. لەوکاتانەدا کە شارە کوردییەکان یەک لە دوای یەک لە ژێر بۆردمان و تۆپبارانی عێراقی دا هەرەسیان دەهێنا، کیسنجر، ئیدی نەگەڕایەوە سەر ئەو شەترەنجە کوردییەی کە لەوێندەرەوە گەمە سیاسی یە نهێنی یەکەی خۆی دەستپێکرد.

## ئاشکرا بوونی سیاسەتی "نەسەرکەوتوو، نەژێرکەوتوو"

کیسنجرو نیکسون، پاش دەستپێکردنەوەی ئەو شەڕەی کە ڕاستەوخۆ بەشدارییان لە هەڵگیرساندنەوەی کرد، کەوتنە پەیڕەو کردنی سیاسەتی نەسەرکەوتوو و نەژێرکەوتوو. ئەمە پاشتر لە ڕاپۆری لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی ئەمریکی لەمەڕ (اللجنه المنتجه للاستخبارات)دا بە دیارکەوت. لە ڕاپۆری لیژنەی نێوبراودا بە شێوەیەکی ڕەمزی ئاماژە بۆ ئەوە کرا بوو کە: "ئەو بەڵگەنامانەی دەست لیژنەکە کەوتبوون بە ئاشکرا دەریدەخەن کە سەرەک، دکتۆر کیسنجر، و شای سەرۆکی ئێران نەیاندەویست وەکیلەکانمان (کورد) سەرکەوتنی بنجبر بە دەست بێنن. بەڵکو سور بوون لە سەر ئەوەی شۆڕشگێڕان هەر هێندەیان توانا هەبێ کە بەرگری لەخۆ بکەن و کەش و هەوای دوژمنکارانە بپارێزن و هەر هێندەیان هێز هەبێ کە بتوانن عێراقی دراوسێ ی ئێرانی هاوپەیمانمان مژول بکەن. هەڵبەتە ئەم سیاسەتە بە وەکیلەکانمان نەوترا، بەڵکو تاقە چالاکی دەرەوەی ئەو سەردەمە، هاندانی بەردەوامی کورد بوو.

هەروەها لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٢ی ئاژانسی استخباراتی ئەمریکی دا، واتا بە چەند ڕۆژێک پاش تێکچونی بەینی عێراق و کورد، باسی ئەوەی کراوە کە: ئێرانی هاوپەیمانمان وای بە چاک زانی وەزعەکە بە جۆرێ ڕابگیرێ کە عێراقی دژمنی

نێرانی هاوپەیمانمان لاواز بکرێ، بەوەی کە کورد هانبدرێ ئەو یاسای ئوتونومی یە نیوە چڵە رەفز بکات کە حکومەتی عێراق یەک لایەنە رایگەیاند. نە ئێمەو نە ئێرانی هاوپەیمانمان نەمانویستوە کێشەکە بە جۆرێکی دیکە چارە سەر بکرێ".

## سەدام حسێن، بۆ پەیمانی تازە دەگەڕێ

هەر چەندە واشنتون و تاران هەموو توانایەکیان وەگەڕخست تا وەزع و حاڵە باوەکەی سەرانسەری هاوینی ١٩٧٤ وەکو خۆی رابگرن، واتا لە ناستی مەمری و مەژی دا کۆمەکی سوپایی بۆ کورد بنێرن، جاری بیبڕن و جارێ بینێرن، واتا بە پچڕپچڕی و نیوەچڵی چەک بۆ کورد بنێرن، کەچی بەم حاڵەشەوە وەزعەکە بە ئاشکرا کاری کردە سەر عێراق. کاتێ کێشەی کورد گەییە لوتکە و عێراق ناچار بوو رۆژی دوو ملیۆن دۆلار بکات بە مەسرەفی شەڕو هەموو خەستەخانەکانی وولاتی بۆ بریندارانی سوپا چۆڵکرد، پێکادانی سنوری نێوان سوپای عێراق و سوپای ئێران بوو بە حاڵەتێکی باوی رۆژانە، هەنگێنێ حکومەتی بەعسی بەغدا رووێکردە یەکێتی سۆڤیەتی دوست و هاوپەیمانی، کە بەغدا بە حوکمی (پەیمانی ستراتیژی) نێوانیان چاوەڕوانی زیاتری لێدەکرد. بەغدا داخوازییەکانی خۆی کرد بە دوو خاڵ و خستی یە بەردەم سۆڤیەت: یەکەم، پێویستە لە سەر سۆڤیەت قەرەبوی ئەو چەک و تەقەمەنی و تفاقە جەنگیانە بداتەوە بە عێراق کە لە شەڕی نێوان عێراق و کوردا کاری کردون. و لەمەودوا ئەو چەکانە بە زۆری بنێرێ و بە شێوەیەک بێت کە سوپای عێراقی بتوانێت بەردەوام بێ لە شەڕی دا دژ بە کوردو دژ بە هێزەکانی ئێران لە هەمان کاتدا، دووەم، پێویستە یەکێتی سۆڤیەت هێزەکانی بنێرێت بۆ سنوری نێوان سۆڤیەت و ئێران تا سوپای ئێرانی لەوێندەر ببەسترێتەوەو نەتوانێ راستەوخۆ پشتیوانی کورد بکات.

(هرتنگر)ی رۆژنامەنوسی سویدی لە نوسینێکی دا لەم بارەیەوە دەڵێ بەعسی یەکان پێیان وابوو "پاش رووخانی میسر، بوون بەو هاوپەیمانەی کە سۆڤیەت ناتوانێ لە ناوچەکەدا دەستبەرداریان ببێ و بۆیە دەتوانن ناچاری بکەن لەم بابەتە هەڵوێستە توندە بنوێنێ".

بەلام سۆڤیەت ملی بۆ داخوازییەکانی عێراق نەداو رەفزی کرد کە بە ئاشکرا لایەنگری عێراق بکات لە ناکۆکی نێوان عێراق و ئێران دا، کە ئەمە یەکەم ناکۆکی و دوا ناکۆکی نێوانیان نابێت. دیار بوو ئەو پەیوەندی یە باشەی کە سۆڤیەت لەگەڵ دەوڵەتی شادا هەیبوو، زۆر لەوە گرینگتر بوو مل بۆ داخوازییەکانی عێراق بدات.

هەڵبەتە ئەم داوایانەی عێراق لە یەکێتی سۆڤیەت دەرفەتێک بوو بۆ عێراق تا لە نزیکەوە شارەزای ئەو شێوازە بێ کە سۆڤیەت بڕیارەکانی خۆی سەبارەت بە سەرلەبەری سیاسەتی خۆی لە رۆژهەلاتی ناڤین دا، لە سەر رۆدەنێ. ئیدی رژێمی بەعس بۆ

یەکەمجار لەو ساوەی کە هاتبووە سەر حوکم لە عێراقا. هەستیکرد لە سەرێتی زۆر بە وریایی رەفتار بکات و بریکار (بدیل) بۆ ئەو هاوپەیمانی یەی نێوان خۆی و یەکێتی ی سۆڤیەت بدۆزێتەوەو پەیدا بکات. هەروەها هەستیکرد لە سۆنگەی پشت بەستنی تەواو بەم هاوپەیمانی یە ستراتیژی یەو بە هۆی هەڵوێستی توندی یەوە لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا، دوچاری گۆشەگیری بووە.

بۆیە بەعسی یەکان قرێریان دا دەست بە بیناتنانەوەی پەیوەندییەکانیان بکەنەوە لەگەڵ وولاتانی کەنداوو هەموو جیهانی عەرەبی و وولاتانی بێ لایەن دا. هەر بۆ ئەم مەبستە دەسەلاتداری هەرە بەهێزی عێراق، صدام حسێن لە هاوینی ١٩٧٤ دا تیتو، وهەواری بۆمەدیەنی سەرۆکی جەزایرو شێخی بەحرەین و ئەندێراگاندی بینی. هەروەها پەیوەندییە دبلوماسییەکان لەگەڵ سوریا و میسردا چڕ کرانەوە، بەعس یەکان هەستیانکرد ئەگەر گەرەکیانە لە واقیعی پشت بەستنی تەواو بە یەکێتی ی سۆڤیەت رزگار بێن و لەهەموخۆشی و ناخۆشی یەک دا چارەنوسی خۆیانی پێوە نەبەستن، دەبێ دۆست و هاوپەیمانی تازە بگرن. بۆ وێنە بۆمەدیەن، بەعسی یەکانی بەوە تاوانبار کرد کە خەڵکانێکی سەلبێن، بەلام لەگەڵ ئەوەش دا بەڵێنی دانێ کە لەواشنتون بۆیان تێ بکەوێ و ئەمریکا ئاگادار بکاتەوە کە بەردەوام بوونیان لە سەر یارمەتی دانی کورد، ئاکامی خراپی دەبێت. رەنگە هەر لە سۆنگەی ئەم هەڵوێستەوە بووبێ کە شاندی کورد لەواشنتون کەسی نەبینی و بەناکامی بۆ کوردستان گەرایەوە.

هەروەها صدام حسێن، چ لە دیدارەکانیدا و چ لەو بڕیارەی (UN)وە کە داوای لە ئێران و عێراق دەکرد کێشە سنوریەکانیان بە گفتوگۆی راستەوخۆ چارەسەربکەن، بۆی دەرکەوت کە زۆر زەحمەتە خۆی لە دایەلۆگ و دیداری راستەوخۆ لەگەڵ خەنیمە سەرسەختەکەیدا، واتا لەگەڵ ئێراندا بپوێرێ. بۆیە سەدام ، لە رێگەی ئەنوەر ساداتی سەرۆکی میسرەوە، تارانی ئاگادار کردەوە کە ئامادەی گفتوگۆی بێ قەیدو شەرتە.

لەلایەکی ترەوە چەند نێردراوێکی عەرەبستانی سعودی رای جدی هەردوک ریاض و (واشنتون)یان بە شای ئێران راگەیاند کە ئەو دووانە زۆریان مەبەستە ئێران هەڵوێستی نەرمتری بەرانبەر بە عێراق هەبێ. هەروها بە شای ئێران راگەیەنرا کە ئەم دڕدۆنگی یەی ئێستای نێوان عێراق و یەکێتی ی سۆڤیەت دەشێت زەمینە بۆ ئەوە خۆشبکات کە عێراق بە دووی هاوپەیمانی تازەدا بگەرێ لەبری ئەو تاک هاوپەیمانی یەی کە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا هەیەتی. ئەم هەوڵو کۆششانە لە هەموو لایەکەوە وەگەڕ خران تا کار گەیییە ئەوەی، لە کاتێکا کە موشەکی (هەنتەر-هۆک)ی ئێرانی لە بەر خاتری هاوپەیمانی کوردیان، بەردەوام بوون لە راوکردنی فڕۆکەی توپولیف و سوخوی عێراقی، دیدارێکی نهێنی لە نێوان ئێران و عێراقدا لە ئەستەمۆڵ ئەنجامبدرێ.

## دۆمینەیەکی چارەنوس ساز

شا، لە سەرەتای شوباتی ١٩٧٥وە کەوتە بادانەوەو هەڵوێستی خۆی لەمەڕ کوردان گۆڕی. هاوپەیمانە تورکەکانی بەردەوام دەمیان لە سەری بوو کە واز بێنێ و چیتر یارمەتی بارزانی نەدات، و دەیانگوت ئایا ئەمە راستە کارێکی وابکات کوردی عیراق سەرکەوتنێکی وەها بە دەست بێنن کە تەماح بیانگرێ و توانای ئەوە پەیدا بکەن داوای مافی زۆرتر بۆ کوردی ئێران و تورکیاش بکەن؟! هەروەها هنری کیسنجر، بەخۆیشی کە لەمێژ بوو موغامەرە کوردی یەکەی لە بیر برد بووەوە، سەر لە نوێ کەوتەوە ریزکردن و دانانی پولی دۆمینە سیاسی یەکان؛ ئەویش هاورِەئی شابوو، پێ ی وابوو پێویستە ئێران پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ جیهانی عەرەبیدا چاک بکات؛ بە هۆی ئەو بارودۆخەوە کە لە ئەنجامی بایکۆتی نەوتی عەرەبی و ئاستەنگی ئەنەرژی لە وولاتانی پیشەسازیدا، پەیدا بوو بوو. هەروەها بە هۆی پەیدا بوونی رێکخراوی نوپیک وەکو فاکتەرێکی گرینگ و کاریگەر لە ئابوری جیهانی دا.

(سمیث هیمپیستون)ی نووسەری ئەمریکی بەم جۆرە گوزارشتی لەو بارودۆخە کردووە: "شا، ئامەزرۆ و پەرۆشی هەر جۆرە چارە سەرێکی سیاسی بوو کە ویستەکانی ئەو بەدی بێنێ". هەر ئەو هۆیەش بوو کە هانیدا یارمەتی شۆڕشگێرانی کورد بدات، تا عێراقی دراوسێ ی (ئێران) ناچار بکات مل بۆ داواو مەرجەکانی ئێران بدات کە بە کوتی بریتی بوون لەمانە: "چارسەری کێشە سنوری یەجۆراو جۆرەکان؛ بەتایبەتی کێشەی شەتی عەرەب بە جۆرێک کە بەرژەوەندی یە هەرێمی یەکانی شا وەدی بێنێ". کۆتایی هێنان بە هێرشی (عەرەبستان) کە عێراق لە پارێزگای خوزستانەوە ئاراستەی دەکرد. هەروەها واز هێنان لە هەموو هەڵەکانی دیکەی روخاندنی رژێمی ئێران ، کە عێراق یارمەتی دەدان، وەکو بلوجستان کە چەندین ساڵ بوو، بوو بوویە بنکەی بشێوێنی و هەراو هەنگامە.

ئا بەمجۆرە هەموو فاکتەرو هەلومەرجەکان خۆشبوون بۆ ئەوەی شا بە مەرامەکانی خۆی بگات. تاقە کۆسپی سەر رێگە، کێشەی کوردی عێراق بوو کە شا یارمەتی دەدان و لە سەرەتادا داوای دەکرد کە داخوازییەکانیان جێبەجێ بکرێ و ئازادی و مافی چارەنوسی سیاسییان بدرێتێ، کە چی ئێستە بەو چاوە سەیری هەمان ئەو داخوازییانەی دەکرد کە خەونی سیاسی و هیوا و ئاواتی دورر لە واقیع و ناواقیعن؛
جا لەبەر هەر هەموو ئەو هۆیانە دەبوایە قوربانی بەو داشی دامەیە بدرێ کە لە هاوکێشە تازەکەدا چ بایەخێکی سیاسی نەما: قوربانی بە کوردی عێراق بدرێ کە بە سەرۆکایەتی بارزانی دەخەبتێن.

چارەنوسی کوردی عێراق لە لوتکەی چیایاندا یان لە ڕێڕەوە ستراتیژی یەکاندا یان لە شەڕگەکانی نێو خاکی کوردستاندا، کە لەو وەرزەی ساڵ دا بەفر داپۆشی بوو، یەک لایی نەکرایەوە. بەڵکو نەوەبوو لە دالانەکانی (کۆشکی نەلقەباب)ی ناوازەداو لە یانەی (Club des Pins)ی یەکێک لە گەڕەکەکانی جەزایری پایتەخت دا یەک لایی کرایەوە. لەوێندەر، لە ڕۆژانی ٦و٧/٣/١٩٧٥دا کۆنگرەی بالای هەر سێزدە وولاتی ئەندامی ڕێکخراوی دەوڵەتانی نەوتفرۆش (ئوپیک) گرێ درا. هەڵبەتە ڕێکخراوی ئوپیک لە وەزع و حاڵێکی زۆر خراودا بوو؛ چونکە لە لایەکەوە ولاتانی ئوپیک نەوتی زیاد لە پێویستان دەردەهێناو لە لایەکی ترەوە هەڵئاوسانی دراو و کەمی بەرهەمهێنان لە وولاتە پیشەسازییەکانی ڕۆژاوادا هەبوو.

هەروەها گوتەکانی کیسنجر دەربارەی ئەگەری تێدەخولی نیزامی ڕاستەوخۆی ئەمریکی لە ناوچەی کەنداودا، هێندەی دی هەڵوێست و بارەکەی گرژو توند کرد. وولاتانی ئوپیک هەموو پێیان وابوو پێویستە هەموو ئەندامان یەک ڕیز بوەستن و هەموو کێشە ناوخۆکانی نێوان ئەندامانی ڕێکخراوی ئوپیک چارەسەر بکەن یان بە لای کەمەوە جارێ وەلابینەن. بۆیە کاتێ بۆمەدیەنی سەرۆکی جەزایر هەواڵی ڕێکەوتنی ئێران و عێراقی وەکو موفاجەئەیەک ڕاگەیاند، بوو بە چەپڵە ڕێزانێکی توند لە نێو هۆڵەکەدا: شای ئێران، محمد ڕەزا پەهلەوی و سەدام حسەینی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراقی ڕێکەوتن لە سەر وەلانان و گۆڕنانی هەر هەموو ناکۆکی یە سیاسی وکێشە سنوری یەکانی نێوان هەردوک وولات، بە شێوەیەک کە خزمەتی دۆزی هاوبەشی ڕێکخراوی ئوپیک بکات. ئەوسا، شا هەستایە سەر پێ، متمانە بە خۆ بونێکی زۆر کەوتە سەر سیمای، بێ ئەوەی چ گوزارشتێکی دی لە سیمای دا بخوێنرێتەوە. (سەدام حسێن)ش، لەسەر کورسییەکەی خۆی، کە بە مەخمەلی شین داپۆشرابوو، هەستاو سوکە بزەیەک کەوتە سەر سیمای، هەردووک سەرۆک، کە تلساتێ لەمەوبەر دژمنی سەرسەختی یەکدی بوون، بە هەنگاوی قورس و هێواشەوە بەرەو لای یەکدی چوون و بە پێ ی داب و نەریتی ڕۆژهەلاتیانە یەکتریان لە ئامێزگرت و سەروماچی یەکتریان کرد، ئیدی ماوەیەکی زۆر دەست دەنێو دەستی یەکدی ڕاوەستان و ڕێگە بۆ ئاپورای ڕۆژنامە نوسان کرایەوە.

لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا، وێنەی ئەم ئاشتبوونەوە کوتوپڕو لەنکاوە بە هەر چوارنکالی دنیادا بلاو بوەوەو گەییە دوورترین سوچی ئەم سەرزەمینە. ئەم ڕاموسانەی کە بەلای ئەندامانی ئوپیکەوە (ڕاموسانی برایەتی) بوو، بە لای کوردەوە، کە لە دووری چوار هەزار کیلۆمەتری ڕۆژهەلاتی جەزایر دا بوون، (ماچی مەرگی)

شۆڕشەکەیان بوو: بۆ لای تاران و بەغداوە هەنگاوێکی مێژوویی گرینگ بوو. سەدام حسێن رایگەیاند کە وولاتەکەی ئامادەیە دەستبەرداری نیوەی ئاوی شەتی عەرەب ببێ، کە لە یەکانگیری هەردوو روباری دیجلەو فورات پێک دێت، بۆ ئێران.. هەڵبەتە پێشتر هەموو شەتی عەرەب هی عێراق بوو.

شا، لە ساڵی ١٩٦٩وە داوای نیوەی شەتی عەرەبی دەکرد تا (گەلەکەشتی) بازرگانی و جەنگی وولاتەکەی بە ئاسانی هاتووچۆ بکات. بەرانبەر بەم سازشەی عێراق، شا-ش قایل بوو هاریکاری عێراق بکات بۆ سەرکوتکرن و لە نێو برنی شۆڕشی کوردان: ئەو شۆڕشەی کە شا، بە خۆی لە ساڵی ١٩٧٤دا بەشداری لە هەڵگیرساندنەوەی کردو بە هەموو جیهانی راگەیاند کە پشتگیری و کۆمەکی دەکات. هەروەها گفتی دا دەموودەست یارمەتی لە کوردەکان ببڕێ و سنوری وولاتەکەی لە روویاندا دا بخات. ئەوە بوو هەر کە ڕێکەوتننامەی جەزایر مۆرکرا، شا، بۆ رۆژی دوایی کەوتە جێبەجێکردنی گفت و بەڵێنەکانی، و ئوتومبیلی سوپایی ئێران بە یاوەری چەند هێزێکی گەورەی پیادەوە بەرەو ناوچەکانی نزیکی سنور وەڕێکەوتن و سەربازانی ئێرانی دەستیان بە سەر عەماری چەک و تفاقی یەدەکی کوردا گرت و دەستیان بە سەر هەموو ئەو تۆپانە داگرت کە دەستیان پێ گەیی و هەرچی یەکیان دەستکەت، ئاودیوی ئێرانیان کرد.

## چ گوناحێکمان کردووە؟

کاتێ ناقیلە ئێرانی یەکان کەوتنە کێشانەوەی تۆپە قورسە (١٥٥ ملم)ەکان بۆ ئێران، ترسێکی کوشندە هێزی پێشمەرگەی داگرت و خەڵکەکە تەواو شپرزەو شپرێو بوون، چونکە ئەو تۆپانە کە لە دواشەڕەکاندا پشتیوانێکی بە هێزی کوردان بوو. زمانی حاڵی هەر هەموو خەڵکی ئەوە بوو "چ گوناحێکمان کردووە تا بەمجۆرە مامەڵەمان لەگەڵدا بکرێ؟" توک و نەفرین لە (شای خاین) وجنێوی ئاشکرا بە (کوڕی سەگ) شای مەلعون و وولاتەکەی تێکەڵ بەترس لە ئایندەی خودی و گشتی بوو بوو. تەنانەت دەزگای (پاراستن)ش کە هەمیشە ئاگای لە رووداوەکان بوو، وتۆڕێکی بە هێزی کۆکردنەوەی زانیاری هەبوو، ئەم قەرارەی شای ئێرانی بێ شتێکی کوتوپرو چاوەڕوان نەکراوبوو.

سوپای عێراقی، پاش چەند سەعاتێک لە ماچ و موچی (جوتەبرا)ی نابەرانبەرو بە ماوەیەکی کەم دوای گەڕانەوەی میرو شێخە دەوڵەمەندەکان بەفڕۆکەی تایبەتی خۆیان، لە جەزایرەوە بۆ وولاتی خۆیان، هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر سەنگەرو پێگەکانی پێشمەرگە: ئەو دەمە کورد هەستیان کرد زۆر بەوردی چارەنوسیان یەک لایی کراوەتەوەو زۆر لە مێژە ڕێگە بۆ ئەم (رامۆسانە) خۆشکراوە. بۆیە بە بێ هیچ

چەکێکی قورس و پاش ئەوەی ئێران تۆپە قورسەکانیان لە کوردستان کێشایەوە، رووبەرووی ئەم هێرشە تازەیە وەستانەوە. ئەوەی بە دەست کوردەوە مابوو چەند تۆپێکی ئینگلیزی (٢٥) رەتڵی کۆنەو چەند هاوەنێکی سۆڤیەتی بوو، و برِیاری بنجبری پێشمەرگە بوو لە سەر بەرگری و مقاوەمەت بە بێ چەکی ئێرانی. بەلام گوللەی تۆپە فرۆکە شکێنەکان دوای دوو رۆژ تەواو بوو، و ئیدی رۆژ رۆژی فرۆکە عێراقی یەکان بوو. هەر کە کەشو هەوا لەبار بوایە بەرپەری نزمی یەوە دەهاتن و بێ ترس موشەک و بۆمباکانیان بەسەر ئەو شوێنانەدا هەڵدەرشت کە بیانویستایە.

لە رۆژی ٣/٧ دا هێرش بۆ سەر شەرگەی باشور لە قوڵی سلێمانی، دەستپێکرد. بەلام عێراقی یەکان، روویان کردە شەرگەکانی ناوەراست لە قوڵی رەواندز، لیوایەکی پیادە و چەند وەحدەیەکی جەوەڵی هێرشیان بۆ لوتکەی سەرتیز کردو هەوڵی دا لەوێندەرەوە بەرەو هەدەفە دیاریکراوەکان پێشرەوی بکات، بەلام توشی زەرەرو، زیانی گەورە بوو. هەروەها تانکەکانی عێراق، بەرێگەی هاملتون دا بەرەو ئەوناوچە شاخاوی یە عاسی یە کەوتنە پێشرەوی کە بارەگای سەرەکی بارزانی لێ بوو. بەلام پاش ئەوەی چەند کیلومەترێک چوونە پێشەوە هێزی پێشمەرگە لێیان هاتنە دەست و توانیان پێشرەوییەکەیان رابگرن.

هێزی پێشمەرگە، بەبێ چەکی قورس و بێ کۆمەکی ئێرانی، ئەو شتەیان بە دی هێنا کە چاودێران بە مەحاڵیان دەزانی دەرەقەتی بێن. هێزی پێشمەرگە، بەو هەموو زیانەوە کە لە خۆیان و لە عێراقی یەکان دەکەوت، توانیبیان سوپای عێراقی بالا دەستی پر چەک و تێروپر لە جم و جوڵ بخەن و ناچاریان بکەن بوەستن و بگرە لەزگ بوو بەشێکی گەورەی هێزەکانی عێراق، لە ناوچە دەشتانی یە بەر بەرەلاکانیش دا گەمارۆ بدەن.

(کوینس روبرتس)ی رۆژنامەوانی بەریتانی کە ئەویش ئەم دوا شەرانەی بە چاوی خۆی و لە نزیکەوە بینی بوو، لە گوتارێکی دا، کە رۆژنامەی (فاینانشەڵ تایمز)ی لەندنی بۆی بلاوکردوەوە، بەم جۆرە باسی ئەو حاڵەتەی ئەو دەمەی کردووە: "شەرِی ئەم هەفتە، وەکو هەفتەی شانازی و سەرکەوتنی پێشمەرگە، دەچێتە مێژووی گەلی کوردەوە. شۆرِشگێرانی کورد بوێرانە و ئازایانە هێرشی بێهودەو نائومێدانە دەکەنە سەر سەنگەرو پێگە گرینگەکانی عێراق، بەو هیوایەی گۆرانێکی ریشەیی بەسەر بارودۆخ و رەوشی پر نائومێدییاندا بێت".

## دوا سەردان بۆ لای شاهنشا

راستە هێڵەکانی بەرەڤانی و مقاوەمەتی کورد لەژێر جەزرەبەی هێزەکانی عێراقدا بەلادا دەهاتن، بەلام لەگەڵ ئەوەش دا هەر نەکەوتن و بەرگرییان کرد. لە پاش ئەم

هێرشەگەورەیە، بە شێوەیەکی کاتی و بۆ ماوەی دوو هەفتە شەڕ ڕاگیرا. چونکە عێراقی یەکان پاش بادانەوەی شاو ڕێکەوتنی لەگەڵ سەدام دا، هەر نەیان توانی بەو خێراییەی کە دەیانویست، شەڕەکە یەک لایی بکەنەوە؛ بۆیە پێویستیان بەم ئاگر بەستە کاتی یە هەبوو تا زۆرترین ژمارەی هێزکۆ بکەنەوە ئەوجا شەڕەکە یەک لایی بکەنەوە.

صدام حسین، پاش پێنج ساڵ دوای شەڕەکە، پەردەی لەسەر شتەکان لاداو رادەی شپرزەیی و ماندویەتی سوپای عێراقی ئاشکرا کرد، لە ئەیلولی ١٩٨٠دا خوتبەیەکی داو لەو خوتبەیەدا یەک لایەنە ڕێکەوتننامەی جەزایری ڕەت کردەوەو ڕایگەیاند کە چەک و تفاقی جەنگی و تەقەمەنی هێزەکانی عێراق لە تەواو بووندا بوو بە هۆی توندی شەڕەکان لە لایەکەوە بە هۆی خاوەخاوی سۆڤیەت لە ناردنی پێداویستی یە لوجستی یەکان بۆ سوپای عێراقی لە لایەکی ترەوە. صدام لە سەری ڕۆیی و دوپاتی کردەوە کە ئەوە هۆیەک بوو تا عێراق ئەو مەرجانە قەبوڵ بکات کە ئەو دەمە بە سەریا سەپێنراو ڕێکەوتننامەی جەزایری لەگەڵ شادا مۆر کرد؛ چونکە سوپای عێراقی لەوەی پتر خۆی بۆ ڕانەدەگیرا. هەروەها (جەنەراڵی بارزانی)ش پاشتر لە گوتەیەکی دا دەریخست کە: "ئەگەر پشتگیری کردنمان بەردەوام بوایە، دەمانتوانی شەڕەکە یەک لایی بکەینەوەو سوپای عێراقی بەزێنین".

سەرۆکی کورد، لە ڕێگەی تەورێزەوە سەفەرێکی بۆ تاران کرد تا دوا هەوڵی بێهودەی خۆی لەگەڵ ئێرانی یەکاندا وەگەڕ بخات و بەڵکو لەدوا بڕیاریان ژێوان ببنەوە. (شاهنشا) کە تازە لە جەزایر گەڕا بووەوە، دوای دوو ڕۆژان ئەوجا پێشوازی دۆستەکەی دوێنێ ی خۆی کردو بە بارزانی ڕاگەیاند کە سێ ڕێگەی لە بەردەمەو دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرێ:

-کورد یان خۆیان تەسلیمی عێراق بکەن. یان

- لە شەڕی خۆیان بەردەوام بن و بە تەمای هیچ کۆمەکێکی ئێرانی نەبن. یان

-شەڕ ڕاگرن و هەموو کادرو کەسایەتی یە دیارەکان بێنە ئێران.

هەڵبەتە داوای کرد کە ڕێگەی سێیەم هەڵبژێرێ. سەرۆکی بە ساڵاچوی کورد تا مردیش نەیزانی کە ئایا شا دوا پێشنیازی بە ڕاستی بوو یان هەر تەوسێک بوو و هیچی دی. ئەوجا شا، بارزانی بەرێکردو گوتی:

"نزیکی و خزمایەتی لەنێو هەردوو گەلەکەماندا هەیە، من بەو حەساوەی بینای چاوی هەموو ئاریانم، هەموو هەوڵ و توانایەکی خۆم وەگەڕ دەخەم بۆ پاراستنی گەلەکەم و گەلەکەت".

هەر هەمان رۆژ بارزانی گەڕایەوە بۆ بارەگای سەرەکی خۆی لە حاجی ئومەران. هەموو ئەو سەربورو روداوانەی هاتنەوە هزرو بەر چاوان کە بە درێژایی نیو سەدەی رێبەری کردنی خەباتی رزگاریخوازی گەلەکەی بە سەری هاتبوون، کە چی ئەوەتا ئەمڕۆکە بە چاوی خۆی دەبینێ لەو کاتەدا کە کورد بە شێوەیەکی بێ وێنە یەکیان گرتووەو لە باری رێکخراوەیی و توانای شۆڕشگێری یەوە لە هەموو کاتێک باشتر کەوتونەتە سەرپێ، ئا رێک لەو ساتەدا لەبەر خاتری هەندی وولاتانی خودان ئەوت، هیواو ئاواتی کورد بە با دەچێت.

## ئایا بارەگای سەرکردایەتی پەیوەندی بە نوسینگەی کیسنجرەوە هەیە؟

بارزانی، بە حوکمی تەجرەبەو ئەزمونی خۆی و بە حوکمی تەبیعەتی شەخسی خۆی یەکسەر کەوتەگەڕان بەدوی هۆیەکی دیدا بۆ بەردەوام بوون لە شەڕ... ئەگەر ئێران ئایەوێ بەردەوام بێ لە سەر هاریکاری و کۆمەکی کوردان، ئەوا پێویستە هەوڵبدەن پەیوەندی بە دۆستەکەی تریانەوە بکەن، کە لە بنەڕەتدا شەڕەکە لە سەر گفت و بەڵێنی ئەو دەستی پێکردەوە. بۆیە بارزانی هەرکە گەیشتەوە حاجی ئومەران، یەکسەر نامەیەکی نارد بۆ بەر پرسی مەڵبەندی (CIA) ئەمریکی لە تاران، ئەم پیاوە لە سالآنی بوریدا ئەندامی پەیوەندی نێوان کورد و وولاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا بوو. بارزانی لەم نامەیەدا دەڵێ: "شپرزەیی و داڕوخان کەوتۆتە نێو گەلەکەمان و هێزی چەکدارمان. هەڕەشەی قڕکردنی دەستە جەمیمان لە سەرەو هیچ تەفسیرێک نابینین بۆ هەر هەموو ئەمەی روویداوە. بۆیە ئەم بانگەوازمان ئاراستە دەکەین و داوا لە حکومەتی وولاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا دەکەین کە پابەندبێ بەو گفت و بەڵێنانەی کە پێ ی داوین و داوای لێدەکەین بە لەز فریامان بکەوێ و نەیەڵێ شۆڕشەکەمان هەرەس بێنێ و بروخێ. شۆڕشەکەمان لە هەرەس و روخان دەرباز بکات و وەکو دۆست مامەڵەمان لە تەک دا بکرێ".

سەرۆکی بەشی (CIA) لە تاران، بە حوکمی ئەوەی ئەفسەرێکی دەزگای (CIA) بووە، رۆژێک لە رۆژان پیاوێکی هەست ناسک نەبووە، کەچی بۆچونی کوردەکانی پەسند کردو هەستا بروسکەیەکی مورس داری بۆ سەرانی خۆی ناردو پرسیاری ئەوەی لێکردن کە ئایا "بارەگای سەرکردایەتی پەیوەندی لەگەڵ نوسینگەی کیسنجردا هەیە دەربارەی ئەم بابەتە؟"... هەنگاوەکانی شای دۆستمان نەک هەر هیوا سیاسی یەکانی کوردی بە با داوە، بەڵکو بوەتە مایەی ئەوەی ژیانی هەزاران کەس بکەوێتە خەتەرەوە.» ئەم بەرپرسە ئەمریکی یە لستێکی یارمەتی پڕکردەوە و پێشنیاری کرد راستەوخۆ ئەو کۆمەکانە بە کورد بدرێ.. ئەوجا بە تێبینی یەک بروسکەکەی کۆتایی هێنا کە: "هەق وایە حکومەتی وولاتەیەککگرتوەکانی ئەمریکا لەم بارەیەوە شتێک بکات".

بەلام کیسنجر لەو کاتانەدا لە سەفەری رۆژهەلاتی ناڤین دا بوو، و سەرقالی ئەوە بوو ناوبژی ئیسرائیل و سوریا بکات و چارەسەرێکی کاتی بۆ کیشەکەیان بدۆزێتەوە. بارزانی، هەستا نامەیەکی شەخسی بۆ ئەو سیاسەتوانە نارد کە لە سالی ۱۹۷۲دا زەمینەی بۆ ئەم دوا شەڕەی نێوان عێراق و کورد خۆشکرد. جەنەراڵ بارزانی لە نامەکەیدا نوسیبوی: "جەنابی وەزیر، عێراق و ئێران لە سەر حیسابی گەلی کورد رێک کەوتوون. یەکێک لە ئەنجامە ناراستەوخۆکانی ئەم رێکەوتنە لە نێو بردنی گەلی ئێمەیە کە ناتوانێ بەرگری لە خۆی بکات و هەرگیز هێندەی ئێستا بێ توانا و دەستەوستان نەبووە. چونکە ئێرانی دۆستتان لە کاتێکدا سنورەکانی خۆی داخستوە کە عێراقی دوژمنمان کەوتۆتە هێرش و پەلامارێکی بێ وێنە و هێشتا هەر بەردەوامە. ئەگەر کار وابڕوات بزوتنەوەکەمان سەرکوت دەکرێ و گەلەکەمان بە شێوەیەک قڕدەکرێ کە کەس تەسەوری ناکات، بێ ئەوەی چ کەسێک نارەزایی دەربڕێ".

هەروەها بارزانی ئاماژەی بۆ ئەوەش کردوە کە ئەمریکا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لە روودانی ئەم وەزعە بەرپرسیارەو دەڵێ: "ئێمە پێمان وایە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئیلتزامی ئەخلاقی و مەسئولییەتی سیاسییان لە ئەستۆیە دەرهەق بەگەلی کورد، حکومەتەکەتان بەخۆی گفت و بەڵێنی داوە وابێ ، هەر لەو پێوەندیەوە تکا لە رێزدارتان دەکەین بەزوترین کات کارێک بکەن و فریامان بکەون".

بەلام کیسنجر قوڕقەپی لێکرد: لە بروسکەیەکی سەرۆکی بەشی (CIA) ئەمریکی لە تاران، بۆ (CIA)ی مەرکەزی کە رۆژی ۱۹۷۵/۳/۲۲ نێردراو، ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەو هەڵوێستەی کیسنجر کراوە: "هیچ وەلامێکمان لە وەزیری دەرەوە (کیسنجر) سەبارەت بە نامەکەی بارزانی پێ نەگەییوە".

کیسنجر، لە سالی ۱۹۷۹دا یاداشتنامەکانی خۆی بلاو کردەوە، کیسنجر لەسەرەنجێکی نیمچە بەراوێزیدا یەکەم ئاماژەی بۆ ئەو چارەنووسە کردوە کە بە سەر کوردا هات و دەڵێ: "پێدەچێ سور بونی شا لە سەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بە هاوکاری لەگەڵ عێراقدا (!) لە روانگەی ئەو حەقیقەتەوە بووبێ کە هێزەکانی بارزانی لە حالی بەزین و شکستێکی ناجۆردا بوون". دیارە ئەم سەرنجە پێچەوانەی راوبۆچونی هەموو ئەوچاودێرانەیە کە بەخۆیان لە شوێنی شەڕەکاندا بوون و هەڵبەتە پێچەوانەی رەوتی راستەقینەی شەڕەکانیشە. هەروەها کیسنجر هۆی پشتگوێ خستنی دۆزی کورد دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نەدەکرا بەبێ تەدەخولی راستەوخۆی هێزەکانی ئێران و بەبێ کۆمەکێکی ۳۰۰ ملیون دولاری ئەمریکی، کورد دەرباز بکرێ.

تا بەمجۆرە مەسەلەکە بەلای کیسنجەرەوە چووەخانەی نەبوانەوە. هەروەها سەرۆکی بەشی (CIA) ئەمریکی لە تاران، قەدەغە کرا لەوەی کە چیتر پەیوەندی بە بارەگای سەرکردایەتی کوردەوە بکات.. ئەمیش لە کاتێکی دواتردا هێرشی کردە سەر مەسوولەکەی خۆی وهەڵوێستی ئەمریکی بە هەڵوێستێکی خەجاڵەتباری وەها لەقەڵەم دا کە ئەوی تێدا شەرمەزار بوو. لە دوا بروسکەی خۆیدا کە لەو سەروبەندەدا بۆ واشنتۆنی نارد، دەڵێ: "ئەگەر حکومەتی ولاتەیەکگرتووەکان بە تەمایە هەر هەنگاوێ بنێ کە قساوخانەیەک روو نەدات، ئەوا لە سەرێتی بە بێ (شا)ی هاوپەیمان هەنگاو بنێ". "بەلام واشنتون بڕیاری دا پشتیوانی لەو هەڵویستەی تاران بکات کە لە رۆژی ۳/۲۰ دا بە بارزانی راگەیەنراو داوای لێکرا شەڕ رابگرێ".

## "هەر سەردەکەوین"..

فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە زۆر بە توڕەیی فەرمانی بارزانی یان، سەبارەت بە راگرتنی دەمودەستی شەڕ، خوێندەوە. بەلام ئەلهەقی خەڵکانێک بوون دەیانزانی کە هەموو رێگاو دەرگاکانیان لە رووردا داخراوە. ئەگەر ئەوەش لە گۆڕێ بوو کە شا هەڕەشە و گەفی لێکردبن کە راستەوخۆ لەشکریان بنێرێتە سەرو سەدان هەزار ئاوارەی کورد تەسلیم بە عێراق بکاتەوە ئەگەر شەڕ رانەگیرێ.

سیلەتوانی دیاری کورد سامی رەحمان دروستی ئەو هەڕەشەیەی بۆ دووپات کردەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ژمارەیەکی تریش لە ئەندامانی سەرکردایەتی بارزانی دروستی ئەم کارەیان دووپات کردەوە.

داڕوخانی یەکجارەکی شۆڕشی کورد، لەدوا رۆژەکانی ئازاری ۱۹۷۵دا، دیمەنێکی کارەساتاوی هەبوو: رادیۆی دەنگی کوردستان لە رۆژی ۱۹۷۵/۳/۲٤دا لە کار وەستا و چەند پێشمەرگەیەک تەقاندیانەوە. رادیۆکە لە نزیکی ناوپردان دانرابوو، وەختێ مەسعود بارزانی کوڕی بچوکی بارزانی، گوێ ی لە دەنگی تەقاندنەوەی رادیۆکە بوو دەستی بەگریانکرد. دەنگی تەقینەوە لە حاجی ئۆمەران و لە نزیکی بارەگای سەرکردایەتی شۆڕش دا بەرز بووەوە. مەفرەزەکانی تۆپخانە کەوتنە لە کارخستنی ئەو چەند تۆپە کەمەی بە دەستیانەوە مابوو. دوکاندارەکانیش فرۆشگە بارزگانی یەکانی خۆیان تەقاندەوە، چونکە هیچ کەسێک نەیدەویست ئەو عێراقییانەی بەرەو ناوچەکە دەهاتن، سوود لەو هێلانانە وەربگرن کە کورد بۆ خۆیانیان دروستکردبوو. زۆر پێشمەرگەم بینی کە لە داخ وحەژماتاندا تفەنگەکانیان بە تاوێراند دەکێشا و دەیانشکاندن. لە ئەنجامی ئەوەوە کە شا لە پشت ڕا خەنجەری لە کوردان دابوو و ئەمریکا خیانەتی لێکرد بوون، نا ئومێدی یەکی زۆر بلاو بووەوە کۆمەڵێک پێشمەرگەی هەرزەکار کەوتنە رەفتاری نامەسوولانە. تەنانەت بارزانی، بە

خۆی فەرمانی دا مەفرەزەیەکی تایبەتی بنێردرێ بۆ ئوردوگای یەخسیرە عێراقی یەکان لە نزیکی رایات، تا بیانپارێزن لە هێرش و پەلاماری پێشمەرگەی تورە و داخ لە دڵ.

پاش لێشاوی ئەو ئاوارانەی کە لە مانگەکانی رابردوا رویان کردە ئێران، ئەمجارە لێشاوێکی تری پاشەکشەی پێشمەرگە و هێزی چەکدار بەرەو ئێران دەستی پێکرد. پتر لە ۳۰ هەزار کەس، کۆمەڵ کۆمەڵ چوون بە دیوی ئێراندا. ئەوە بوو لە ئوردوگای گەورە گەورەدا لە نزیکی شاهپورو بە چاودێری ئێران دانران، بەڵام سەبارەت بە چەک و تەقەمەنی، هەرکەسێک پێ ی بوایە، دەبوایە لە سەر سنور تەسلیمی بکردایە.

## زۆربەی هەرە زۆری پێشمەرگە بەبێ چەک دەچونە ئێرانەوە:

هەندێ پێشمەرگە بۆیان بلسکردم کە چەندین عەماری زۆرگەورە، لەو رۆژانەدا، پڕکران لەو چەکانەی کە پێشمەرگەی کورد لەو پەناو پاسارو عەمارە نهێنینیانەدا دەیانشاردنەوە کە دەیان ساڵ بوو لە ئەشکەوتە عاسی یەکانی ناوچە دورە دەستەکاندا دروستیان کرد بوون. دیار بوو سوور بوون لە سەر شاردنەوەی چەک و تفاقی سوپایی، تا لە قۆناغێکی تازەی خەباتیان لە پێناوی ئازادی و سەر بە خۆیی گەلی کوردا بەکاری بینن و سودی لێوەرگرن.

دوا دیمانەی رۆژنامەوانی کە بارزانی لە ناو خاکی کوردستاندا کردی، ئەو دیمانەیە بوو کە من لەگەڵیم کرد و رۆژنامەی (جیهان- Die welt) بڵاوی کردەوە. سەرۆکی تەمەن ۷۲ ساڵە، لە وەڵامی پرسیارەکانی مندا بەمجۆرە پوختەی ئەزمونی خەباتی خۆی باسکرد: "وەکو ئاشکرایە شۆڕشی ئێمە لە بواری عەسکەریدا تێک نەشکا. پێشمەرگەی ئێمە بێ ئەوەی چ کەسێک شکاندبێتی مەیدانی شەڕیان بە جێهێشت. سوپای عێراق، سەرەڕای ئەوەی کە لە هەموو بوارەکاندا هەر باڵا دەست بوو، ئەوجاش نەیتوانی هیچ سەرکەوتنێکی یەک لاکەرەوەو بنجبر بە دەستبێنێ. هێزەکانی عێراق بە درێژایی یەک ساڵ شەڕ، تەنیا دەیان کیلۆمەترێکی کەم پێشڕەوییان کرد. تەنانەت ئەو دەیان کیلۆمەترەش بە زیانی گیانی زۆر گیران...نەخێ... لەبەرەکانی سیاسەت دا قەراری سەرکوتکردن و لە نێو بردنی شۆڕشەکەمان درا، هەروەها نەخشەو پلانی سیاسەتی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی زلهێزەکان لە سەر حیسابی ئێمە داڕێژران. هەڵبەتە حاڵی حازر هەورو هەڵاو تەمی ئەوت ئاسمانی بیرکردنەوەی سیاسی رۆژاوای تەنیوە".

لە وەڵامی پرسیارێکی مندا دەربارەی هەڵەیەکی گەورەی شەخسی کە خۆی کردبێتی، پاش تێفکرینێکی کورت، بە دەنگێکی کەسەردار، جەنەراڵ وەڵامی

# حەمەکەریم عارف

* کەرکوکی یەو لە سالی۱۹۵۱دا لەدایک بووە.
* لە سالی ۱۹۷۵دا کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردوە.
* لە سالی ۱۹۷۷وە بەردەوام نوسین و بەرهەمی ئەدەبی بلاودەکاتەوە.
* نۆ سالی هەرەتی لاوی، بێ وابەستەگی حیزبی، لە پێشمەرگایەتیدا بەسەر بردوەو وەکو بەشداربیەکی عەمەلی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا، شانازی پێوە دەکات و منەت بە سەرکسدا ناکات، چونکە پێ ی وایە رۆلەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی
* جگە لە ناوی خۆی ، بە تایبەتی لەگۆڤاری گزنگ-ی نووسەرانی کەرکوک، نووسەری کوردستان، کەلتور، رۆژنامەی ئالای ئازادی تاژمارە ۲۲۲ ،بە ناوی گزڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محمدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا ،ح.ع بەرهەمی بلاو کردۆتەوە.
* لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکوکی یەکێتی ی نووسەرانی کوردی کردوە.
* زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بلاوکردوتەوە، بەلام زۆربەی هەرە زۆریان بە نوسخەی هێندە کەم بلاو بونەتەوە، لە نرخی نەبوودان.. تەنیا ئەوەندەیە لە فەوتان رزگاربوون و هیچی دی. هەندێک لەوانە:
  - تیرۆز ............ کۆمەلە چیرۆک
  - کۆچی سوور........ چیروک
  - بەیداخ............ چیروک
  - کوچ سرخ........... کۆ چیرۆک بە فارسی.
  - لە خۆبێگانە بوون کۆمەلە چیرۆک.

وەرگێران:

- رێبەر .............. رۆمانی مەهدی حسێن
- نینا ............. ثابت رحمن
- نامۆ ............. ئەلبیرکامۆ
- شکست............. ئەلکساندەر فەدایەف
- هاومالەکان ................................ ئەحمەد محمودەبەرگی یەکەم»
- بێناسنامەکان ................................ عزیرنەسین .

- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی دوو بەرگ
- ئامانجی ئەدەبیات ........................ چیرۆکی مەکسیم گورکی.
- دڵێری ی خۆراگرتن یادداشت ..................... ئەشرف دهقانی.
- مەسەلەی کوردی لەعێراقدا ........................ عزیز شریف
- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد ................. احسان نوری پاشا
- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ مسعود احمد زادە.
- گوزارشتی موسیقا .د.......................... د. فؤاد زکریا.
- دەربارەی شیعر و شاعیری، رەزا بەراهەنی.
- فنسنت ڤان گوک، شانۆنامە ........................ پاول ئایزلەر
- بەدوعا شاعیرەکان، شانۆنامە ...................... جليل القيسي
- جولەکەکەی ماڵتا ،شانونامە،
- بەد حاڵی بوون شانۆنام ............................ ئەلبیرکامۆ
- کورد لە ئەنسکلوپیدیای ئیسلام دا.
- دادەپەروەران، شانۆنامە ............................ ئەلبیرکامۆ
- چاو بە چاو، شانۆنامە ............................. گەوهەر مراد
- ریچاردی سێیەم ، شانۆنامە .......................... شەکسپیر
- هونەرو ژیانی کۆمەڵایەتی ............................ پلیخانوف
- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنوسی ئافرەت.

- لە راپەڕینەوە تائێستا چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی رۆشنبیری کوردی دەکات و بەرهەمێ هەمە جۆری نوسراو و وەرگێردراو بلاودەکاتەوە بە تایبەتی لە رۆژنامەکانی: برایەتی، خەبات، رێگای کوردستان، پەیمان، دەنگی میللەت، هەروەها لەگۆڤاری: رامان، گولان، کاروان، مەتین، گازی، پەیڤ

- زۆر بەرهەمی دەستنوسی ئامادەی بۆچاپ و هەرکەس و گروپ و لایەنێک تەماحی بلاو کردنەوەی هەبێ، ئامادەیە بەخۆڕایی پێشکەشیان بکات، هەندێک لەوانە:
- لێکدانەوەیەک ........................ لە مەڕ رۆمانی نامۆی ئەلبێرکامۆ
- لە مهابادی خوێناوی یەوە بۆ کەنارەکانی ئاراس.
- منداڵە دارینە، ........................ چیرۆکێکی درێژە بۆ منداڵان.
- ئازادی یا مەرگ، ........................ رومانی کازانتزاکیس
- قوربانی ، ........................ رۆمانی هیرب میدو
- هارماڵەکان، ........................ رۆمانی ئەحمەد محمود بەرگی دووەم
- دووره وولات، ........................ رۆمانی ع .قاسموف
- دوژمنان، ........................ دوو کۆ چیرۆکی چیخەف.

- ژ نەفسانەین گریکی و رۆمانی .
- فاشیزم چی یە ؟ ..................................   کۆ چیرۆک بۆ منداڵان، یەلماز گونەی
- شوانە بچکۆلەکە، ..............................   چیرۆکێکی درێژە بۆ منداڵان، چینی یە .
- هەڵبژاردەی چیرۆکی فارسی «١» ......   کۆ چیرۆک
- چوار چیرۆک و هەڵسەنگاندنیان، ......   کامۆ، مۆپاسان، پیراندیللو، چیخەف.
- چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، ......   حمەکریم عارف
- فەرهەنگی فارسی کوردی پیتی «آ و ا» ، ......   حمەکریم عارف
- نوسینێت پەراگەندە «کۆمەڵە ...........   نوسینێکی هەمە جۆرە» ، حمەکریم عارف
- چەند چیرۆکی هەمە جۆری بێگانە.